# وتارو وتاربێژ



## جۆرەکانی وتار - چۆنێتی وتاردان
## شەست وتاری ئامادەکراو بۆ بۆنە جۆراوجۆرەکان

نوسینی
عمر أحمد نظامی
پێشنوێژی مزگەوتی بێخود لە سلێمانی

# وتار و وتاربێژ

جۆرەکانی وتار ـ چۆنێتی وتاردان ـ
کۆمەڵە وتارێکی ئامادەکراو بۆ بۆنە جۆراو جۆرەکان


نووسینی
عمر احمد نظامي
پێش نوێژی مزگەوتی بێخود لەسلێمانی



چاپی سێیەم

١٤٢٥ ك    ٢٠٠٤ ز

بسم الله الرحمن الرحيم

كتێب :وتارو وتاربێژ

نووسەر: عمر احمد نظامي

ژمارەی سپاردن( ٤٧٥ ) ی ساڵی ٢٠٠٢ی دراوەتێ.

چاپی سێیەم

تیراژ: ( ٥٠٠ ) دانە

ساڵی چاپ: ١٤٢٥ك ـ ٢٠٠٤ز

کۆمپیوتەر : ( پەیڤ ).

# پێشەکی چاپی سێیەم

لەسەرمە لەم پێشەکییەدا زۆر سوپاسی خوای گەورەبکەم کەئەمڕۆ ئەم کتێبە ئامادەدەکەم بۆ چاپی سێیەم دوای ئەوەی چاپی یەکەمو دووەمی لەبازاڕدا نەما:

نوسەر هەتا زیاتر ماندووببێت بەکتێبەوە زیاتر حەزدەکات بەبڵاوبونەوەی، بەڕاستی ئەم کتێبەش زۆر منی ماندووکرد، بۆیە زۆرم پێخۆشە بڵاوببێتەوەو خەڵکی بەگشتیو ماموستایانی [illegible]وکارو عاو[illegible] ئەنگەری مینبەرو بەتایبەتی سوودی لێوەرگرن بەهەڵکی لەدۆعاکانیشیاندا منو دایكو باوكو ماڵو منداڵو ماموستاو فەقێکانم لەیادنەکەن.

منیش بەدەوری خۆم دیسانەوە سوپاسو دۆعای خێرو بەکوڵم دوبارەو سێبارەش دەکەمەوە بۆ هەموو ئەوکەسانەی لەم کتێبەو کتێبەکانی تریشدا یارمەتیان داوم ئایا بەنوسینەوەبێت یان بەپێداچونەوەو هەڵەگیری یان بۆ لەچاپدانو بڵاوکردنەوەەی لەناو ئەوانەیشدا چەند موسڵمانێك کەبەم کتێبەیان زانیبوو هەریەك بەگوێرەی توانای خۆی چەند نوسخەیەکیان کڕیو وەقفیان کرد لەهەردوو چاپی ڕابردوودا منیش بەنرخێکی زۆر هەرزانتر لەنرخی بازاڕ دەمدابەوان هەتا گەورەترین ژمارە بە(وەقف) دابەشبکرێت بەشێوەیەك (الحمدالله) لەچاپی یەکەمدا نزیکی(٢٧٥)نوسخەو لەچاپی دووەمدا زیاتر لە(٣٠٠)نوسخە بەشێوەی(وەقف) دابەشکرا بەسەر زانایانو ماموستایاندا، وەئەم دابەشکردنە شارەکانی هەولێرو مەریوانو بانەو پاوەو بێژۆیو کەرکوکیشی گرتەوە، لەڕێی چەند ماموستایەکی بەڕێزەوە.

نوسینی ئەم تێبینییەشم بەهیوای ئەوەیە پڕۆژەی(وەقف)و خەمخۆری کتێبی ئایینیو نوسینی بەسود لەنێو موسڵماناندا زیاترو پتەوتربێت چونکە بەڕاستی ئەمڕۆ قەڵەمو ڕاگەیاندن بەهەموو جۆرەکانیەوە گەورەترین کاریگەری هەیەو ڕاگەیاندنی نەیارانی ئایینی ئیسلام لەدەرەوەو ناوەوەی جیهانی ئیسلامی زۆر بەوردیو نەخشەی کاریگەر کاردەکەن بۆ وەرچەرخاندنی ڕەوڕەوەی مێژو و ئاڵوگۆڕی فیکریو عەقیدەییو کلتوریو کرداری دڵو دەروونو هەڵسوکەوتی وەچەی نوێو تازە پێگەیشتووانی ئوممەتی محمد(ﷺ) تابەتەواوی پەیوەندیان بپچڕن لەم ئایینەو وەك هەویرێکی شلیان لێبێت بەدەستیانەوە چۆنیان ویست هەڵیان بسوڕێنێ بۆیە ئالێرەوە هاواری خۆم دەگەیەنم بەوکەسانەی زمانڕەوانو قەڵەم ڕەوانو دڵسۆزن بەم دینە کەدرێغی نەکەنو چەندە دەتوانن ئەم تەمومژە فیکریو ڕەوشتییە لەوەچەی نوێو لاوەکانی ئوممەتی محمد(ﷺ) بڕەوێننەوەو دەستیان بگرنو لەلیتاوی ئەم زەمانە دەریان بهێنن.

وەهەروەها بەوکەسانەیش کەتوانای ماڵیان هەیە تادرێغی نەکەنو ماڵو سامانیان لەپێناو ڕاگەیاندنی ئیسلامیداو بڵاوکردنەوەی کتێبو گۆڤارو ڕۆژنامەو قوتابخانە ئایینییەکانو ئەو کەناڵانەی خزمەت بەئایینی پیرۆزی ئیسلام دەکەن بەخت بکەن، چونکە بەڕاستی ئەمە لەئەمڕۆدا

کارێکی پێویستەو گەر فەرزی عەین نەبێت گومان لەوەدانی‌یە فەرزی کیفایەیە لەسەر ئەو دووتاقمەی باسمان کردن.

خوێنەری بەڕێزیش ئاگاداردەکەم لەم چاپەدا هیچ دەستکارییەکی ئەم کتێبەم نەکردووە مەگەر تەنها چاککردنی هەندێ وردە هەڵەی چاپ.

خوایش یارویاوەری هەموولایەکمان بێت و لەدنیاوقیامەت سەرفرازمانکات............آمین

والحمدلله رب العالمين

**عمر أحمد نظامی**

**سلێمانی/ مزگەوتی بێخود**

**٦/صفر/ ١٤٢٥ ك = ٢٠٠٤/٣/٢٧ز**

# پێشەکی چاپی دووەم

وەك سەعدیو گولستانەکەی دەڵێم:

(هەر هەناسەیەك کەهەڵیدەمژین ژیان دەبەخشیو ، کەدێتە دەر سرەوتو پشوو دەبەخشی ، کەوابوو لەهەر هەناسەیەکدا دوو نیعمەت هەیەو ، بەرانبەر بەهەر نیعمەتێك شوکرێ واجبە لەسەرمان).

بۆیە گەر هەزار زمانمان هەبێت(حەمدو سەنای) خوای پێ بکەین هێشتا یەك لەهەزاری ئەرکی سەرشانمان ئەنجام نادەین (یا ربنا لك الحمد کما ینبغي لجلال وجهك وعظیم سلطانك).

ئەوەندەی هەناسەی گیانلەبەرانو گەڵای دارانو تنۆکی بارانو ... صەلاتو سەلامیش دیاری بێت بۆ دیداری (فەخری عالەم)و گەورەی نەوەی ئادەمو سەرجەم یارانیو شوێنپێ هەڵگرانی تا رۆژی قیامەت.

خوێنەری ئازیز چاپی یەکەمی (وتارو وتاربێژ) کەلەسەرەتای رەمەزانی(١٤٢٣)دا کەوتە بازارەوە لەقەوارەی (٢٥٠) لاپەڕەو تیراژی (٥٠٠دانە) هەرچەند (٢٥٠) دانەی موسوڵمانێك پێشتر پارەکەی دابوو وەقفی باوکی کردبوو - خوالێی وەرگرێت - بەڵام نیوەکەی تریشی هەر لەڕەمەزانو شەشەڵاندا تەواو بوو، ئەمەیش دەگونجێ بەرەکەتی رەمەزان بووبێ ، بەڵام ئەو خێرا تەواو بوونەو داوای هەندێ لەمامۆستایانیش پاڵیان نابەمنەوە تا بۆجاری دووەم چاپی بکەمەوە بەڵام لەقەوارەیەکی گەورەترداو بەدەسکاریەکی زۆرەوە ، چونکە وتارەکانی چاپی یەکەم (٣٤)وتاربوو بەڵام چاپی دووەم(٦٠) وتارە.

زیاد لەمەیش دوو فەسڵم بۆ زیاد کردووە (بانگەواز بۆلای خواو ، ئادابی گوێگر) کەدەگونجێ هەردووکیان بکرێنەوە بەوتار. لەهەمانکاتدا (٥) وتاری چاپی یەکەمم لابردووە کەبەپێویستم نەزانیوە بۆ ئەم رۆژگارە.

لەپێشەکی چاپی یەکەمدا ئاماژەم پێکردبوو کەبیرۆکەی کۆکردنەوەی وتارەکانمو چاپکردنیان دەمێکە خولیای سەرمە ، بەتایبەت دوای ئەوە چەند جارێك مامۆستایانی گوندەکان دەهاتن داوای وتاری ئامادەکراویان لێدەکردمو زۆر کات لەبەر سەرقاڵی نەمدەتوانی بچم بەدەمیانەوە.

ئەوەی زۆر جێگای داخمە زۆربەی وتارەکانی رابووردووم کە(٨) ساڵی مزگەوتی بێخودو ، زیاتر لەدوو ساڵی مزگەوتی گەورەی خورماڵو (٤)مانگی مزگەوتی تاسلۆجەو (٣)مانگی ئۆردوگاکانی (دووئاوو، نەوسوود)و چەند ساڵێکی کوتو بچڕی گوندەکانی (بەلەکجارو ، ئەستێڵی سەروو، بەردێ) ی قەرەداغو صەدان وتاری تر لەبۆنەو جێگای جیاجیادا، فەوتانو تۆمار نەکران).

بەلأم لەلایەکی تریشەوە سوپاسی خوای گەورە دەکەم کەنزۆرێك لەو وتارانە بەتەواوی ، یان سەر دێرەکانیان لەلام ماون و هەر ئەوانەیش سەرچاوەی ئەم کتێبەیە لەگەلْ هەندێ دەسکاری پێویست کە زمانی نووسین و بلأوکردنەوە داخوازی دەکات.

هەر لەم پێشەکی یەدا حەزدەکەم خوێنەر ئاگادار بکەم کەنزیکەی صەد وتاری مزگەوتی بێخودم پارێزراوە ، بەدەنگ لەچوار سیدی (MP3) دا کەلەتۆمارگای خەلأت و دەریا دەسدەکەون.

زیاد لەم کتێبەیش (٥٠) وتارێکی تر ئامادەیە (انشاء الله) لەفرسەتێکی تردا بەئومێدم چاپیان بکەم ، هەندێ وتاریشم لەکتێبەکانی (کلّپەی دەروون و ، شێوازی دۆستیەتی و برایەتی و ، توێشووی بانگخوازان و ) گۆڤارەکانی ( پەیامی راستی و ، دوانگەو ، پەیڕەوو ، سرووت)دا بلأوکردۆتەوە ئومێدەوارم جێگای سوودبن بۆ وتاربێژەکان.

لەم کتێبەی بەردەستیشدا چەند خالّێکم رەچاو کردووە حەزدەکەم خوێنەری ئازیزی لێ ئاگادار کەم :

١ ـ ئەم کتێبە یەکەمین تاقیکردنەوەیە بۆ گرێدانی دوولایەنی جیابەیەکەوە: یەکەم ئاداب و مەرجەکانی وتار و وتاربێژ و مەشق و راهێنان لەم بارەوە ، بەو هیوایەی وتاربێژەکان خۆیان بتوانن وتار دارێژن و رەچاوی بارودۆخی خۆیان بکەن و، پەیوەست نەبن بەنووسراوی رابوردووەوە.

دووەم: چەند وتارێکی ئامادەکراوی لەخۆگرتووە بۆئەوانەی لەبەر هەر هۆیەك بێت توانای دارشتنی وتاریان نیە.

٢ ـ لەم کتێبەدا بەتایبەت لەوتارەکانی ـ مردن و زیندوبوونەوەدا ـ زۆر سوودم لە(احیاء علوم الدین )ی غەزالی ـ رەحمەتی خوای لەسەر وەرگرتووە ، بەلأم ئەو فەرموودانەی (احیاء)هێناونی هەتا تەماشای (المغني عن حمل الاسفار)ەکەی پەراوێزی (احیاء)م نەکردبێ و لای ئەوپەسەند نەبووبێ نەمنوسیون ، ئەگەر (احیاء)لەگەلْ (المغنی)دا جیاوازیان هەبووبێ لەدەقی فەرموودەکەدا دەقەکەی (المغنی)م نوسیوە.

٣ ـ لەم چاپەدا هەولّمداوە مێژوو شوێنی هەندێ لەوتارەکان ـ ئەگەر لای خۆم هەبووبێ ـ دامناوە بەکۆچی یان زاینی بۆئەوەی خوێنەر سوود لەلایەنە مێژووەکەیشی وەربگرێت.

ئەگەر وتارێك سالأنە وترابێتەوە وەك: یادی مەولوود ، یادی میعراج ، مالّئاوایی رەمەزان ، من هەریەکێکیانم نوسیوە.

٤ ـ بۆچاپی دووەم: زیاتر خۆم ماندووکردووە هەلّەگیری چاپی یەکەمم کردو هەولّمداوە کەم هەلّەبێت ، بەلأم ـ جگە لەقورئان ـ هیچ نامەیەك بێ هەلّەو پەلّە نابێ ، بۆیە دەلّێم : هەر دلّسۆزێك رەخنەی هەبوو پێم خۆشە بۆم بنێرێ ، سوودی لێوەردەگرم و دوعای خێری بۆ دەکەم.

ئەوەندەم بەسە مەگەر هەر خوا بزانێت لەم کارەدا چەندە ماندوبووم و چەندە گلەیی و بناشتم هاتۆتە سەر ، چونکە دەیانجار وازم لەدیدەنی و ، پرسەو ، سەردانی نەخۆش و ، سیلەی رەحم و ، تەنانەت خزمەتی ماڵ و منداڵی خۆم هێناوە بۆ ئەوەی هەرچی زووترە بگەمە مەنزڵ ، نەکو باو بۆرانی زەمانە ، یان مەرگی کوت و پڕ رێ بەکاروانم بگرێت .

لەکۆتاییدا دەستی بەندایەتی و زەبوونی بەرزدەکەمەوە بۆ بارەگای خوای گەورە ئەم نووسینەو نووسینەکانی تریشم لێ وەرگرێت و بیکا بە(صدقە جاریە)و توێشووی قیامەتی خۆم و دایک و باوکم و ، مامۆستاو دڵسۆزانم.

ئەگەر هەرکەسیش جۆرە دیارییەکی هەبێت بۆ دۆست و خۆشەویستانی ، ئەمەیش دیاری منە بۆ برا خۆشەویستەکانم لەئێستاو داهاتوودا ، بەو ئومێدەی لەدوعا بەکوڵەکانیان ـ بەتایبەت لەدوعای کۆتایی وتارەکانیاندا ـ خۆم و دایک و باوک و رۆڵە و ئازیزانم لەیادنەکەن.

**عمر أحمد نظامي**

**٢٤/صفر/ ١٤٢٤ ك ـ ٢٠٠٣/٤/٢٥**

**سلێمانی ـ خەبات ـ مزگەوتی بێخود**

# بەشی یەکەم
# مانای وتارو پایەو مەرجەکانی

فەسڵی یەکەم/بانگەواز بۆ لای خوا

فەسڵی دووەم / ریشەی وشەی( الخطبة )

فەسڵی سێیەم / مێژووی وتاربێژیی و گەشەکردنی

فەسڵی چوارەم / کاریگەریی وتار

فەسڵی پێنجەم/ جۆرەکانی وتار

فەسڵی شەشەم / پایەو مەرجە فیقهیەکانی وتار

# فەسڵی یەکەم

## بانگەواز بۆلای خوا( الدعوة الى الله )

بانگکردن بۆلای خوا جوانترین و بەجێترین وتارو گوفتارە بەدەقی قورئان: ﴿ومن احسن قولاً ممن دعا الى الله وعمل صالحاً وقال انني من المسلمين ﴾ فصلت:٣٣.

واتە: کێ هەیە گوفتاری لەوە شیرینتر بێت کەخەڵك بۆلای خوا بانگ دەکاتو کردەوەی چاك ئەنجام دەداتو دەڵێ من لەموسوڵمانانم.

((بێگومان بانگەواز بۆلای خوا هۆی مانەوەو ژیانی ئاینە ،وەهیچ ئاینو هیچ بیرو رێبازێك بەبێ بانگهێش بڵاونەبوەتەوەو دانەمەزراوەو ، بناغەی هیچ کۆمەڵگاو هیچ میللەتو نەتەوەیەك لەبن نەهاتووە مەگەر بەهۆی وازهێنانیەوە لەبانگەوازو بڵاوکردنەوەی.

مێژوو ئەوەی سەلماندووە هەرکەسێك لێبڕابێو خەڵکی بانگ کردبێ بەدڵسۆزی بۆ رێبازێك یارمەتی دەروو پاڵپشتی بۆ پەیدابووە ، ئیتر ئایا بەرەو راستی چووبن یان بەرەو ناڕاستی ، وا ئەمڕۆیش بەچاوی خۆمان دەبینینو ، بەگوێی خۆمان دەبیستین ئاینی خوایی راستو دروست لەپاشەکشەو لاوازییدایە لەزۆر شوێندا بەهۆی کەمتەرخەمیو ساردبوونەوەی زانایانو هەڵگرانی ئەم دینەوە))[1].

چاو پیاخشانێکی ورد بۆ ئایەتەکانی قورئانو فەرموودەکانی پێغەمبەر(ﷺ) هەروەها هەڵوێستەیەکی خەمخۆرانەو بەرپرسانە لەبەردەم ژیاننامەی پاکی پێغەمبەرو(ﷺ) یارانیدا لەسەرەتای ئیسلامدا بۆمان روون دەکاتەوە کەحاڵی ئەمڕۆی موسوڵمانان زۆر دوورە لەو واقیعەی ئیسلام لەئێمەی دەوێو پێغەمبەر(ﷺ) بەشێوەیەکی عەمەلی پیشانی داوین.

جا بۆئەوەی زیاتر ئەم راستیەمان لا ڕوون بێت ـ هەرچەند شتێکی بەڵگەنەویستە ـ چەند ئایەتو فەرموودەیەك دەکەین بە دەستەگوڵی ئەم باسە:

١ ـ خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ ولتكن منكم امة يدعون الى الخير ويأمرون بالمعروف وينهون عن المنكر واولئك هم المفلحون ﴾ ال عمران:١٠٤.

بالەناو ئێوەدا کۆمەڵێك هەبن خەڵکی بەرەو چاکە بانگ بکەنو وەفەرمان بەهەموو شتێکی رەواو دروست بدەنو، رێ لەهەموو شتێکی ناڕەواو نادروست بگرن ، هەر ئەوانیش بەختەوەرن کەبەو شێوەبن.

[1] هداية المسترشدين في الوعظ والخطابة : الشيخ علي محفوظ :١٤.

٢ ـ خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إن الذين يكتمون ما انزلنا من البينات والهدى من بعد مابيناه للناس في الكتاب اولئك يلعنهم الله ويلعنهم اللاعنون ، الا الذين تابوا واصلحوا وبينوا فاولئك أتوب عليهم وانا التواب الرحيم﴾ البقرة: ١٥٩ ـ ١٦٠.

بەڕاستی ئەو كەسانەی ئەو بەڵگەو ڕێنماییيانەی ئێمە نازڵمان كردوون دەيشارنەوە بەخەڵكی ڕاناگەيەنن، ئەوانە خوايش نەفرينيان لێدەكاتو، ئەو خەڵكە نەفرين كارانەيش هەر نەفرينيان بۆ دەنێرن ، مەگەر كەسانێكيان تەوبە بكەنو خۆيان چاك بكەنو ڕاستی ڕوون بكەنەوە ئەوانە ئێمە تەوبەيان وەردەگرين من زۆر تەوبە وەرگرو خاوەن سۆزم.

هەروەها خوایگەورە بەتوندی هەڕەشە لەوكەسانە دەكات واز لەبانگەواز بۆ لای خواو ڕێگری لەخراپە دەهێنن، كەدەفەرموێ: ﴿لعن الذين كفروا من بني اسرائيل على لسان داود وعيسى ابن مريم ، ذلك بما عصوا وكانوا يعتدون ، كانوا لايتناهون عن منكر فعلوه لبئس ماكانوا يفعلون﴾ المائدة:٧٨،٧٩.

ئەو كەسانەی بێباوەڕبوون لەگەڵ بەنی ئيسرائيل لەسەر زاری داودو عيسای كوڕی مەريەم نەفرينيان لێكراوە ، ئەوەيش بەهۆی ياخی بوونيان لەخواو زوڵمو ستەميان لەبەندەكانی خوا، وە ئەوان بەشێوەيەك بوون كەڕێگايان نەدەگرت لەوكارە ناڕەوايانەی كەلەناوخۆياندائەنجاميان دەدا بەڕاستی ئەم ڕەوشتەيان زۆر خراپ بوو.

وشەی(فعلوه) لەئايەتەكەدا ئەوە دەگەيەنێ واجبە پياوچاكانو زانايان بەئاگاو وريابن بەرانبەر كۆمەڵگاو دەوروبەری خۆيان، وەهەركارێكی ناڕەوای تياكرا زوو بەزوو بچن بەگژيداو بێدەنگ نەبن لەئاستيدا ، وەشێوازی فەرمان بەچاكەو ڕێگری لەخراپە لەهەموو چەرخێكدا دەبێ شياو بێت.لەگەڵ كاتو شوێنی خۆيدا ئايەتی:﴿وانذر عشيرتك الاقربين﴾ئەم واتايە دەگەيەنێ كەپێويستە ئێمە دوای چاك بوونی خۆمان يەكەم هەنگاومان بۆ ئاگاداركردنو بەرەوباش بردنی قەومو خوێشی خۆمانو گەلو وڵاتی خۆمان بێت، دوای ئەوانيش ئەگەر توانيمان پلەبەپلە تا پێيەك زياتر لێمان نزيك بێت دەبێت ساتێك زووتر ئاگادارييان بكەينەوە.

(ابن مسعود) ـ ڕەزای خوای لێبێت ـ دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ان أول مادخل النقص على بني اسرائيل انه كان الرجل يلقى الرجل فيقول يا هذا اتق الله ودع ماتصنع فأنه لايحل لك ، ثم يلقاه من الغد وهو على حاله فلا يمنعه ذلك ان يكون اكيله وشريبه وقعيده ، فلما فعلوا ذلك ضرب الله قلوب بعضهم ببعض ، ثم قال: لعن الذين كفروا ـ الى قوله فاسقون )ثم قال(ﷺ) (كلا والله لتأمرن بالمعروف وتنهون عن المنكر ثم لتأخذن على يد الظالم ولتأطرنه على الحق اطراً ،

ولتقصرنه على الحق قصراً أو ليضرب الله على قلوب بعضكم ببعض ثم يلعنكم كما يلعنهم) (رواه ابوداود والترمذي وحسنه)[1].

واته: يەکەمجار کەناتەواوی ڕووی کردە بەنی ئیسرائیل ئەوەبوو پیاوێك دەگەیی بەپیاوێکی‌تر پێی دەوت: ئەی فلآن کەس لەخوا بترسە واز لەوکارە بێنە حەلآڵ نییە بۆت ، سبەینێش یەکیان دەبینییەوە کابرای بەدکار هەر لەسەر کاری خۆی مابوو کەچی ئەم بەدکاری‌یەی وای نەدەکرد لەهاوڕێکەی هاوبەشی نەکات لەخواردن‌و خواردنەوەو دانیشتن لەگەڵیدا ـ واتە ڕووی لێ گرژ نەدەکرد ـکاتێ کەئەمەیان کرد خوای گەورە دڵەکانی دان لەیەك ـ واتا بێ‌تاوانەکانیش بەهۆی تاوانبارەکانەوە دڵیان ڕەش بوو ـئەمجا پێغەمبەر(ﷺ) ئەم ئایەتەی خوێندەوە:﴿لعن الذين كفروا ... تا فاسقون ﴾و فەرمووی: وانابێ سوێند بەخوا دەبێ فەرمان بکەن بەچاکەو ڕێگری بکەن لەخراپەو دەستی ستەمکار بگرن و بەزۆر بیگێڕنەوە بۆ ڕاستی‌و لەسەر ڕاستی بیوەستێنن یان خوا دڵەکانی ئێوەش ئەدا بەیەکداو نەفرینتان لێدەکات وەك خوا نەفرینی لەوانکرد.

*زانایان میراتگری پێغەمبەرانن(عليهم الصلاة والسلام):

ئەوەیش کەبەسەر پێغەمبەردا(ﷺ) هات لەسەرەتای ئەم بانگەوازەوە کەقورەیش چەند ئازاریاندا گاڵتەیان پێدەکرد ڕیخۆڵەو ناوسکی حەیوانیان بەسەردا ئەکرد لەکاتی سەجدەدا لای هەموو زانایەك ڕوونەو هەموویشی لەپێناوی بانگەوازدا بووە.

دوای پێغەمبەر(ﷺ) زانایان‌و کاربەدەستان دەبێ جێگری ئەوان بن بۆ بانگەوازی خوایی، زانایان دەستەلآتیان بەسەر دڵ‌و دەروونی خەڵکدا هەیە ، دەستەلآتدارو پادشاکانیش دەسەلآتیان بەسەر لاشەو ماڵی خەڵکدا هەیە ، لەهەر کات‌و شوێنێکدا ئەم دوو دەسەلآتە یەکبگرن‌و بەرەو یەك مەبەست هەنگاو هەڵگرن ئەو کۆمەڵگایە بەختەوەر دەبن‌و بانگەوازی خوایش بەهێزو بەڕێز دەبێت ، بەلآم لەهەر شوێنێکدا سیستمی دەسەلآت ساردو کەمتەرخەم بوو بەرانبەر بانگەوازی دڵسۆزانە بۆ ڕێگای خوایی‌و کۆسپ‌و لەمپەری لەڕێگادا دادەنا ، ئەوە بێگومان بانگەواز بەرەو لاواز بوون دەچێت‌و لەسەریەك قاچ دەمێنێتەوەو زانایانیش یان خەودایان دەگرێت‌و دڵیان بەلاوازی خۆیان‌و بیرو باوەڕەکەیان گڕ ناگرێ، یان دەکەونە ژێر فشارو ئەشکەنجەو ئازارو بەرکەنار دەکرێن‌و لەکۆمەڵ دادەبڕێن ، زانایانی ئیسلام لەهەر لایەکدا بن‌و بەهەر ناونیشانێ لەناو کۆمەڵدا بژین دەبێ هەوێنی ماستی(دعوة) بن بێ ئەوان ئەو ماستە ناگرسێ‌و بێ‌ئەوان کاری بانگەواز بەڕێ ناچێ، بۆیە هەمیشە دەبێ بپارێزینەوە ئەوان تووشی نەخۆشی‌و کەم پێیی نەبن‌و لەم کاروانە دوا نەکەون ئەگینا کاروانەکە بێ‌دەلیل وێڵی بیابانی سەرگەردانی دەبێ.

---

[1] هداية المسترشدين :٢٢،٢١ تفسير ابن كثير سورة المائدة :٧٩.

زانایانیش وەختێ دەتوانن ببنە سەرقافڵەی کاروانی بانگەواز کەبەدڵو بەگیان لەگەڵیا بژین ، دڵیان بۆی بسووتێ بەکاری خۆیانی بزانن ، مەبەستیان تیایدا ڕەزامەندی خواو سەرفرازی پاشە ڕۆژ بێت ، وتو وریاو چاوکراوەبن ، دۆستو دوژمنی ئەم دینە بناسن ، ئاگایان لەکاتو شوێنی خۆیان بێت ، بەدوای ڕووداوەکاندا بچنو بەراورد لەنێوانیاندا بکەن ، بەناهەق بەگژ کەسدا نەچنو ، لەسەر حسابی حەقیش ماریفەت و مەرایی بۆ کەس نەکەن ، پێشڕەویان ئەم فەرموودەی پێغەمبەربێ(ﷺ) کەبوخاریو موسلیم ریوایەتیان کردووە لەعوبادەی کوڕی صامیتەوە(ڕەزای خوای لێبێت) کەدەفەرموێ: (بايعنا رسول الله(ﷺ) على السمع والطاعة في العسر واليسر والمنشط والمكره ، وعلى اثرة علينا وعلى أن لاننازع الامر اهله الا ان تروا كفراً بواحاً عندكم من الله فيه برهان ، وعلى أن نقول بالحق اينما كنا لانخاف في الله لومة لائم)[1].

واتە: ئێمە بەڵێنمان دا بەپێغەمبەر(ﷺ) کەگوێڕایەڵی فەرمانەکانی بینو بەقسەی بکەین لەکاریگرانو ئاسانداو لەوشتەی پێمان خۆشەوپێمان ناخۆشەو لەکاتێکیشدا هەست بەبەش خوراوی بکەین، مل ملانێ نەکەین لەگەڵ پێشەواو گەورەکانماندا ، مەگەر بەئاشکرا کوفر ببینین ، کەبەڵگەمان پێبێت بۆ لای خوا کەکوفر بووە ، هەروەها بەڵێنمان داوە لەهەرلایەکدا بووین ڕاستی بڵێین لەڕێی خوادا ، نەترسین لەلۆمەی لۆمەکاران.

غەزالی ـ ڕەحمەتی خوای لێبێت ـ دەفەرموێ: فەرمان بەچاکەو ڕێگری لەخراپە جەمسەری هەرە گەورەی ئاینەو ئەوکارە گرنگەیە کەخوای گەورە پێغەمبەرانی بۆ ناردووە ، ئەگەر ئەم بەڕەیە بپێچرێتەوە زانستیو کارپێکردنی پشت گوێ بخرێ ئەوە کاری پێغەمبەران دەوەستێو ئاین لەنێو دەچێ، بێئاینی دنیا دەگرێ، گومرایی بڵاودەبێو نەزانی بەرپا دەبێ شارو وڵات وێران دەبێ، بەندەکانیش تیا دەچن بەڵام تا ڕۆژی قیامەت بەخۆیان نازانن ...)[2].

کاری بانگخوازی بەوە تەواو نابێ هەفتەی جارێ یان چەند جارێ مامۆستای بانگخواز لەڕۆژی هەینیو چەند شوێنێکی تایبەتیدا ساتێك یان چەند ساتێك ئامۆژگاریو قسەی خێر بکات ، بەڵکو پێویستە هەمیشە بەو خەمەوە بژینو لەدڵمان دەرنەچێ، بەکاری سەرەکیو هەرە گرنگی خۆمانی بزانین لەهەر کوێو لەهەر شوێنێکدا ڕێکەوت درێغی نەکەین.

ئەوەیش بزانین کاری فەرمان بەچاکەو ڕێگری لەخراپە هیچ جیاوازی نیە لەکاری بانگەواز بۆ ڕێی خوا هەردووکیان هەر یەکن بەڵکو فەرمان بەچاکەو ڕێگری لەخراپە گرانترە لەبانگەواز چونکە بەگژاچوونی خەڵکی تیایەو زۆر کات ئەوکەسەی پێی هەڵدەسێ بەرەنگاری دەبنەوەو تووشی ئازار دەبێ ، بۆیە پێویستی بەخۆگریو لێبووردەیی زیاتر هەیە ، دەتوانین بڵێین: فەرمان

---

[1] رياض الصالحين ، با الامر بالمعروف والنهي عن المنكر :١٢٦.

[2] احياء العلوم باب الامر بالمعروف والنهي عن المنكر : ٢/٢٨٠.

بەچاكەو ڕێگری لەخراپە لەگرنگترین جۆرەكانی بانگەوازەو بەدەمەوە چوونی ڕووداوەكانە لەكاتی ڕوودانیاندا ، بۆیە زیاتر كاریگەرە و بەرهەمدارە، شوێنەوارەكانیشی زەقتر دیارە ، بۆیە حەزرەتی لوقمان كوڕەكەی لەگرنگی ئەم كارە ئاگادار دەكات:﴿یا بني اقم الصلاة وامر بالمعروف وانه عن المنكر واصبر علی ما اصابك ان ذلك من عزم الامور ﴾ لقمان:١٧.

ئەی كوڕی شیرینم نوێژەكانت بەجوانی بكەو فەرمان بەچاكە و ڕێگری لەخراپە بكەو، خۆگربە لەسەر ئەو ئەشكەنجەو ئازارەی لەوڕێناوەدا تووشت دێت، بەڕاستی ئەم خۆگریە لەكارە گرنگەكانە.

لەیاسای جیهانیی ئەمڕۆیشدا لەزۆر شوێنداكاری فەرمان بەچاكەو ڕێگری لەخراپە ڕەچاو دەكرێت ، بۆ نموونە:لەیاسای مەشقی سەربازیدا زۆرجار ئەفسەرێك سزای یەك فەوج سەرباز دەدات لەبەرئەوەی كەسێك یان چەند كەسێكیان تیایە سەرپێچی فەرمانەكان دەكەن ، یان لەگۆڕەپانی مەشقدا قسەیەك دەكەن ، یان لەكاتی(استاعیدو استاریح)دالەكۆمەڵ دوا دەكەون، ئەفسەری سەركردە پێیان دەڵێ: یان دەبێ ئەو سەربازە سەرپێچیكەرە دەركەن لەناوخۆتانو دەستنیشانی كەن یان سزای هەمووتان دەدەم.

یان بۆ نموونە لەگەڕەكێكدا یان لەگوندێكدا تاوانێك دەكرێت یاسا پەروەرانو دادوەران دوای لێكۆڵینەوە دەگەنە ئەو ئەنجامەی خەڵكی ئەو گەڕەكە ئەزانن كێ تاوانبارەو دەیشارنەوە لەیاسا ، یاسا پەروەران بۆیان هەیە هەڕەشە بكەن لەخەڵكی ئەو گوندو گەڕەكە ئەگەر ڕاستی نەڵێن: هەمووتان سزادەدرێن ئەمەیش پێی ناوترێ ستەم.

كەوابوو ئەوپەڕی دادوەرییە كەخوای گەورەسزای گەلێك بدات كەوازیان لەفەرمان بەچاكەو ڕێگری لەخراپە هێناوە، چونكە ئەوكاتە هەموویان تاوانبارن: تاوانباران بەكاری تاوانیان ، بێتاوانەكانیش بەبێ دەنگیو ڕازی بوونیانبەو تاوانانە.

## *ئایا كاری بانگەواز بۆلای خوا پێویستی بەمۆڵەتی دەوڵەت هەیە ؟

زۆر كەس دەیانەوێ ئەم پرسیارە بكەنە كۆسپێك لەڕێگای ئەو كەسانەدا كەدەیانەوێ بۆ خوا لێ ببڕێنو دەڵێن: هەموو كەس بۆی نیە خۆی بكاتە مامۆستاو ڕێنمایی خەڵكی بكات هەتا بەشێوەیەكی ڕەسمی دەسەڵاتیوەخت ڕێگەی پێ نەدات، ئایا ئەم قسەیە چەندێكی ڕاستە؟ لەبەرگرنگی ئەم باسە لەم ڕۆژەدا حەزم كرد زیاتر لێی بكۆڵمەوەو لەژێر ڕۆشنایی ئایەتو فەرموودەو بۆچوونی زانایاندا ئەم وەڵامە بنووسم:

یەكەم/ ئەو ئایەتانەی لەپێشەوە نووسیمان هەر هەموویان بەڵگەن، ڕوونن لەسەر ئەوەی هەموو تاكێكی ئەم كۆمەڵە بەرپرسە لەم دینەو هەر كەس شایەتمانی هێنا بەگوێرەی زانستیو توانای خۆی دەبێ بكۆشێ بۆ بانگەوازی خواو وەهەركەس زانستییەكانی بشارێتەوە بەرنەفرینی خواو

نەفرینکاران دەکەویٚ ...هتد ، بیٚئەوەی هیچ جیاوازییەك بخات لەنێوان تاکەکانی کۆمەلٚ ئایا مۆلەتی دەسەلاٚتی وەختیان هەیە یان نا؟

ویٚـرای ئـەو ئایەتانـەی لەپێشـەوە تەفسـیرمانکرد ئـەم مەبەسـتە بـەڕوونتر دیـارە لـەم ئایەتەدا﴿والمؤمنـون والمؤمنـات بعضـهم أوليـاء بعـض يـأمرون بـالمعروف وينـهون عـن المنكـر ويقيمون الصلاة ...﴾التوبة:٧١.

واتە: باوەڕداران پیاوانو ئافرەتانیان هەندێکیان دەبنە خەمخۆرو سەرپەرشتیار بۆ هەندێکی تریان فەرمان دەکەن بەچاکەو ڕێگری دەکەن لەخراپە، وەنوێژەکانیان بەجوانیو ڕێکی دەکەن...

مەبەستەکە زۆر بەجوانی دیارە لەئایەتەکەدا پێویست بەلێکۆلێنەوە ناکات.

دووەم/ فـەرموودەکانی پێغەمبـەر(ﷺ) زیـاتر ئـەم ڕاسـتییە دووپـات دەکەنـەوەو پێمـانی دەسەلمێنن کەهیچ موسولمانێك دەرباز نابیٚ لەم واجبە پیرۆزە وەهەرکەس بەگوێرەی توانای خۆی دەسەلاٚتدار بەکردەوە، زانا بەزمانو ئامۆژگاری ، خەلکی تریش هەر کەس بەگوێرەی توانای خۆی ، ئەگەر هیچ توانای نەبوو بەدلٚ پێی ناخۆش بێت، وەك دەردەکەویٚ لەفەرموودەی: (من رأى منكم منكراً فليغيره بيده فأن لم يستطع فبلسانه فان لم يستطع فبقلبه ) رواه مسلم.

لەڕاڤەی ئەم فەرموودەدا هاتووە: واجبە گۆڕانـی کـاری نـاڕەوا بـەو هۆکـارەی بۆمـان دەگونجـیٚ چونکە ڕێگری لەخراپە کارێکی هاوبەشە لەنێو تاکەکانی ئوممەتی ئیسلامیدا وە ئەم کارە فەرزی کیفایە ئەگەر چەند کەسیٚ ئاگاداری بوون ، وەفـەرزی عەینـە ئەگـەر تەنـها یـەك کـەس پێـی زانـیو واتە دەبیٚ ئەو یەك کەسە خۆی هەولی گۆڕانی بدات چونکە هەر ئەو پێی زانیوە[1].

سـێیەم/ غـەزالی ـ ڕەحمـەتی خـوای لێبێـت ـ بـەجوانی وەلاٚمـی ئـەم پرسـیارەی نوسـیوە کەدەفەرمویٚ: هەندیٚ کەس بەمەرجیان گرتووە ئەو کەسەی هەلٚدەستیٚ بەکاری فەرمان بەچاکەو ڕێگری لەخراپە دەبـیٚ ڕێگـەی پێدرابیٚ لەلایـەن کاربەدەسـتی وەختـەوە، ئـەم مەرجـە پووچەلـە ، چونکە ئەو ئایەتو فەرموودانەی باسمانکردن بەلگـەن لەسـەرئەوەی هـەر کـەس کارێکی نـاڕەوای بینیو بێدەنگ بوو لەئاستیدا تاوانبـار دەبـیٚ، وە لەهـەر لایـەکدا و بەهـەر شێوەیەك وەهـا کـارێکی دی واجبە ڕێگری لیٚ بکات ، کەوابوو بەستنەوەی ئەم واجبە بەڕێگە پێدانی کاربەدەستی وەختەوە فتوایەکە بنـەڕەتی شـەرعی نییـە ...بـەلکو گـەورەترین جـۆری جیـهاد وشـەیەکی ڕاسـتە لەبـەردەم پادشایەکی ستەمکاردا ، وەك لەفەرموودەدا هاتووە جا کە دروست بێت پەرچ دانـەوەی پادشـای وەخـت لەسـەرکردەوەی نـاڕەوای ئیـتر چـۆن دەبـیٚ بلێـین پێویسـتی بەفـەرمانی ئـەو هەیـە ، پێشـینانیش بەم شێوە بوون لەگـەلٚ کاربەدەسـتاندا : دەگێڕنـەوە مـەروانی کـوڕی حەکـەم پێـش نوێـژی جەژن خوتبـەی خوێنـدەوە ، کابرایـەك پێـی وت: خوتبـە دوای نوێـژە ، مـەروان وتـی: واز

[1] شرح الاربعين النووية ، محي الدين مستو:٧٦.

لەوەبێنـە (ابـو سـعيد) وتـی: کـابرا پێویسـتی سەرشـانی خـۆی گـەیاند بـەگوێرەی فـەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ) (من رای منکم منکرا ...هتد)[1].

هەروەها دەگێڕنەوە (هارون الرشيد) چوو بۆ سەيران و سەفا لە(دەوين) پياوێكی لەگەڵ بوو بەناوی (سليمان بن ابی جعفر) هارون پێی وت: كەنيزەكێكت هەبوو گۆرانیخۆشی دەوت بۆمانی بهێنە باگۆرانی بڵێ، كاتێ هات گۆرانی وت هارون بەدڵی نەبوو پێی وت چيتە؟ وتی: قوربان عودەكەی خۆم پێ نيە، هارون بەخزمەتكارەكەی وت بچۆ عودەكەی خۆی بهێنە ، كابرا رۆيشتو عودەكەی هێنا لەوسەرەوە تووشی پياوێكی پير بوو سەر رێگاكەی گرتبوو گلكوو خواردەمەنی ژێر زەمينی هەڵدەكەند، پێی وت: ئەی پير رێگەكەم بۆ چۆڵكە ، پيرەكە سەری هەڵبڕی (عودە)ەكەی دی بەدەس كابراوە لێی سەندو دای بەئەرزا و شكاندی ، خزمەتكارەكە پيرەكەی گرتو دايە دەست وشترەوانی خەليفەو وتی: ئاگات لێی بێ سەرگەورەی موسوڵمانان داوای دەكات ، وشترەوانەكە پێی وت: لەبەغادا پياوی ئاوا لەخوا ترسی تيا نيە بۆ چ گەورەی موسوڵمانان داوای دەكات؟ كابرا وتی: ئەوەی من پێت دەڵێم لەگوێی بگرە ، كاتێ گەڕايەوە لای هارون بەسەرهاتەكەی بۆ گێڕايەوە هارون ڕقی هەستاو چاوی سووربوو، سلێمانی كوڕی جەعفەر پێی وت: بۆ چ ڕقت هەڵدەستی دەی بنێرە بۆلای وشترەوانەكەت با بدا لەگەردنی و فرێی داتە ديجلە ، وتی: نا دەنێرين بەدوايداو گفتو گۆی لەگەڵدا سازدەكەين، چوون بەدوايدا وتيان: خەليفە داوات دەكات ، فەرمووی: بەڵێ نێرراوەكە پێی وت: سواربە وتی نا ، بەپێ هات هەتا گەيشتە دەرگای كۆشكو هارون ئاگاداركرا ، خۆيان بۆ ئامادەكردو جێدانيشتنەكەيان رێكخست دوور لەشتی بێشەرعی ، پاشان رێگايان دا هاتە ژوورەوە كيسەيەك دانەوێڵەی ژێر زەوی خستبووە باخەڵی ، خزمەتكارەكە پێی وت: ئەو كيسە لەباخەڵت دەربێنە ئەمجا بچۆ ژوورەوە وتی: نانی ئێوارەم لەو كيسەيە ، وتی: ئێمە نانی ئێوارەت دەدەينێ، وتی پێويستم بە نانی ئێوە نيە ، هارون گوێی لەم مشتو مڕە بوو بانگی كرد : لێی گەڕێ چۆن دەيەوێ با بێتە ژوورەوە ، كاتێ چوو سەلامی كردو دانيشت ، هارون پێی وت: ئەی شێخ بۆ چ ئەو كارەت كرد؟ وتی: چيم كردووە ؟ هارون رووی نەدەهات پێی بڵێ: عودەكەت شكاندوين ، هەتا زۆری پێ وت: كابرا وتی: من لەباو باپيرتم بيستووە ئەم ئايەتەيان لەسەر دوانگە دەخوێندەوە ﴿إن الله يأمر بالعدل والاحسان وايتاء ذي القربى وينهى عن الفحشاء والمنكر والبغي ...﴾ النحل:٩٠.

واتە: خوافەرمان دەكات بەدادوەریو چاكەكاریو خزم دۆستی ، وەنەهيش دەكات لەهەموو كارو گوفتارێكی ناشيرينو نارەوا و زوڵم و ستەم ، منيش شتێكی نارەوام دیو لەناوم برد ، هارون پێی وت: لەناوی بەرە ، سوێند بەخوا لەوە زياتری پێ نەوت ، كاتێ رۆيشت هارون

[1] احيا علوم الدين :٢/٢٨٨، ٢٨٩.

کیسەیەك   پارەی دا بەپیاوێك وتی: بکەوە دوای ئەگەر دیت بەسەرهاتی خۆی بۆ خەڵك گێڕایەوە وتی: من وام وت و (امیر المؤمنین)وای وت ئەوە هیچی مەدەرێ، وە ئەگەر دیت قسەی لەگەڵ کەس نەکرد کیسە پارەکەی بدەرێ، بەلاَم کاتێ دەرچوو دەستی کردەوە بەهەڵکەندنی دانەوێڵەی ژێر زەوی، کابرا کیسە پارەکەی بۆ برد پێی وت: (امیر المؤمنین) دەڵێ: ئەم پارە وەرگرە ، وتی: بیبەرەوە بۆی پێی بڵێ لەکوێی هێناوە بینێرێتەوە بۆ ئەوێ، ئەمجا بەدەم گلك هەڵکەندنەوە ئەم شیعرانەی دەخوێندەوە:

اری الدنيا لمن هي في يديه    هموما كلما كثرت لديه
تهين المكرمين لها بصغـــر    وتكرم كل من هانت عليه
اذا استغنيت عن شئ فدعه    وخذ ما أنت محتاج اليه [1]

واتە: دەبینم دنیا ئێش و ئازارە بۆ ئەوکەسانەی وا لەدەستیاندا ، هەرکەس رێز لەدنیا بگرێ دنیا بچووك و بێ رێزی دەکات، وەهەرکەس دنیای لاسووك بوو دنیا رێزی پێ ئەدات ، ئەگەر شتێك پێویستت نەبوو نەتەوێ، شتێ وەرگرە کەپێویستت بێت.

ئەم چیرۆکە هەرچەندە هەندێ درێژبوو ، بەلاَم بۆیە نووسیم تا بەڵگەیەك بێت لەسەر ئەوەی کەزانایان و پێشینانی ئێمە نەوەستاون لەسەر فەرمانی پێشەوای وەخت بۆ کاری(دعوة)و فەرمان بەچاکە چونکە بەپێویستیان نەزانیوە و کاری ئەمان(حسبة)واتە: بۆ خوا بووەو چاوەڕوانی کرێ و پاداشتی دنیایی نەبوون ، بۆیە توانیویانە لەڕووی گەورە پیاوانیشدا بوەستن ، وەدەیان نموونەی لەم شێوەمان هەیە لەهەموو سەردەمە زێڕینەکانی بانگەوازی ئیسلامیدا کەهیچ گومانێك ناهێڵێتەوە کەبانگەوازی خوایی بۆ هەموو تاکێکی موسوڵمان واجبێکی خودکارییەو پێویست بەڕێگە پێدانی هیچ کەسێك ناکات ، تەنها ئەوەندەی پێویستە لەسەرخۆیی و نەرم نیانی بێت تێکەلاَو بەپەندو ئامۆژگاری جوان بێت ﴿ادع الى سبيل ربك بالحكمة والموعظة الحسنة وجادلهم بالتي هي أحسن ...﴾ النحل: ١٢٥.

واتە: بانگەوازی خەڵکی بکە بۆ ڕێگەی پەروەردگارت بەپەندو ئامۆژگاری جوان ، وەلەگەڵیان بدوە بۆ هێنانە سەر ڕێگایان بەجوانترین شێوازی دواندن و گفت و گۆکردن.

### *کاری بانگەواز بۆلای خوا لەسەر زاناو نەزان واجبە:

کاری بانگەواز لەسەر زانایان ـ تەنانەت ئەوانەیش نەخوێندەوارن و تەنها چەند مەسەلەیەکی شەرعی فێربوون ـ واجبە لەم بارەوە دەچینەوە خزمەتی غەزالی لە(احيا) ناودارەکەیدا چەند برگەیەك لەوبارەوە دێنین کەدەفەرموێ: (زۆربەی خەڵك نەشارەزان لەشەرع و دین و مەرجەکانی

---

(١)سەرچاوەی پێشوو : ٢٨٩ ـ ٢٩٠.

نوێژ لەشارەکانیشدا ، دەی ئەبێ گوندو لادێکان چۆن بن؟ ...واجبە هەموو مزگەوت و گەڕەکێك و... هەموو گوندێك زانایەکی تیا بێت خەڵك فێری دینەکەیان بکات ، هەروەها واجبە لەسەر هەموو زانایەك کەلەفەرزی عەینی خۆی لێبوویێتەوە دەرفەتی فەرزی کیفایەی بۆ ڕەخسابێ، دەبێ بڕوا بۆ ئەو شوێنانەی نزیك شارەکەین لەخەڵکی دەوارنشینەکان لەعەرەب و کوردو خەڵکی تریش بۆئەوەی فێری فەرزەکانی دین و شەرعیان بکەن ، وەتوێشوویش لەگەڵ خۆی بەرێ و نانی ئەوان نەخوات چونکە زۆربەی ڕۆزییان داگیرکراوە[1]، ئەگەر کەسێك بەم واجبە هەستا گوناه لەملی خەڵکەکەی تر نامێنێ، بەلام ئەگەر کەس پێی هەڵنەسا هەموویان گوناهبارن زاناو نەزان: زانایان لەبەرئەوەی بەواجبی فێرکردنی خەڵکی هەڵنەساون ، نەزانیشیان لەبەرئەوەی بەدوای فێربوونی دینەکەیاندا نەگەڕاون.

ئەگەر نەخوێندەوارێك مەرجەکانی نوێژ فێربوو پێویستە لەسەری خەڵکی‌تر فێر کات ئەگینا هاوبەشی تاوانی نەزانەکانە ، بێگومان کەس بەزانایی لەدایك نابێ بەڵکو ڕاگەیاندنی ئاین واجبە لەسەر زاناکان ، هەرکەس تەنها یەك مەسەلە فێربوو ئەوە زانایە بەو مەسەلەیە ، بێگومان تاوانی زاناو شەرع ناسەکان گەورەترە لەخەڵکی‌تر، چونکە ئەم کارە بەوان شیاوترە، چونکە پیشەسازەکان ئەگەر واز لەپیشەکانیان بهێنن ڕەوڕەوەی ژیان دەوەستێ، پیشەی زاناکانیش هەمان دەستوورە ، چونکە ئەوان میرات بەری پێغەمبەرانن ، دەبێ وەك پێغەمبەر(ﷺ) پەیامی خوا ڕابگەیەنن. زانا بۆی نیە لەماڵی خۆی دانیشێ و نەچێت بۆ مزگەوت و بەبیانووی ئەوەی خەڵك شەرت و مەرجی نوێژ نازانن، بەپێچەوانەوە ئەگەر زانی وەهایە واجبە دەرچێت بۆ فێرکردنیان و لادانیان لەهەڵە ، هەروا ئەگەر کەسێ دەیزانی لەبازاڕدا گوناهێك دەکرێ لەهەموو کاتێکدا یان لەکاتێکی تایبەتیدا وەئەمیش ئەیتوانی ڕێگری لێبکات ، نابێ ئەم واجبە لەملی خۆی دامالێ بەوەی لەماڵەوە خۆی حەشاربدا و نەڕواتە دەر بەڵکو پێویستە بڕوات بۆ گۆڕینی ، ئەگەر توانای گۆڕینی هەندێکیانی هەبوو واجبە دەرچێ بۆ گۆڕینی ئەو بەشە و ، زیانی نیە ئەگەر چاوی بکەوێ بەو هەندەیش کەناتوانێ بیان گۆڕێ، چونکە ئامادەبوون و بەلاوە وەستانی تاوان کاتێ تاوانە ئەگەر بەنیازێکی چاك نەبێ.

بەکورتی واجبە لەسەر هەموو موسوڵمانێك دەست پێ بکات بەچاککردنی خۆی بەئەنجامدانی شتە فەرزەکان و خۆگرتنەوە لەهەموو حەرام و ناڕەوایەك ، پاش ئەوە ماڵ و منداڵیشی فێر بکات ، پاشان دراوسێ و خەڵکی گەڕەك ئەمجا خەڵکی شارەکەی ئەمجا ئەو گوندو لادێیانەی وان بەدەوری شارەکەیەوە، ئەمجا بۆ دوورتر لەبیابان نشینەکان تا ئەوپەڕی جیهان ،

---

[1] ئەمە لەکاتێکدا بووە ئەو دەوار نشینانە زیاتر خەڵکی ڕێگر بوون ، بەلام ئەمڕۆ وانیە(والحمد لله)هەرچەند ئەمڕۆیش ئەگەر بگونجێ بانگخواز نانی کەس نەخوات باشترە ، نووسەر.

ئەگەر نزیکەکان هەستان بەم واجبە تاوان لەملی دوورەکان نامێنێ. ئەگەر پێی هەڵنەسان دوورو نزیک گوناهبارە، ئەم واجبە کۆتایی نایێت هەتایەك کەس بمێنێ لەسەر ڕووی زەویداو نەزان بێبەفەرزێ لەفەرزی دینەکەی ئەویش بتوانێ خۆی پێ بگەیەنێ بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆیان ناڕاستەوخۆ، بێگومان ئەمە کارێکی گرنگە بۆ کەسێك گوێ بەدین پەروەری بدات، وە ئەم واجبە ئەوەندە گرنگ و لەپێشە هیچ شتێك لێی پێش ناکەوێ مەگەر فەرزی عەین یان فەرزێکی تری کیفایە کەلەم کارە گرنگتر بێت)[1].

ئەگەر ئەمە بۆچوونی غەزالی بێت ـ ڕەحمەتی خوای لێبێت ـ لەکۆتایی چەرخی پێنجەمی کۆچیدا دەربارەی ڕاگەیاندنی پەیامی خوایی بەکەسانی دوورو بێئاگا ، لەکاتێکدا ئەو سەردەمە پەیوەندیو هاتو چۆو شارەو شارکردن زۆر دژوارو گران بووە، هۆکارەکانی گواستنەوەو ئامێری چاپو چاپەمەنیش یان هەر نەبووە یان زۆر کەمبووە، زۆربەی نووسراوەکانیش بەپەنجە و مەچەك نووسراوەتەوەو دابەشکراوە، کەچی غەزالی ــ ڕەحمەتی خوای لێبێت ــ زۆر بەدڵنیاییەوە دەنووسێ: ﴿ولایسقط الحرج مادام یبقى على وجه الارض جاهل بفرض من فروض دینه وهو قادر على أن یسعى الیه بنفسه أو بغیره فیعلمه فرضه ...﴾کەوابوو ئەبێ ئەمڕۆ واجبی سەرشانی موسوڵمانانو باوەڕداران بەگشتی و زانایانی ئیسلام بەتایبەتی چەندە گەورە بووبێ؟ وەبەر پرسیاریو سپاردەی سەرشانیان چەندە فراوان بووبێ؟ چونکە ئەم سەردەمی ئێمە جیا دەبێتەوە لەسەردەمی غەزالی بەچەندین خاڵ تەنها دوانیان دەنوسین:

یەکەم/ ئەمڕۆ هۆکارەکانی ڕاگەیاندنو پەیوەندی ڕاستەوخۆ یا ناڕاستەوخۆ زۆر بووە زانای ئاینی دەتوانێ لەکەناڵێکی ڕادیۆیی یان تەلەفزیۆنی پەیوەندی بکاتو دەنگی یان دەنگو ڕەنگی خۆی بگەیەنێ بەملیۆنەها کەس هەر ئەو کاتەیش کەقسە بۆ جەماوەر دەکات خۆی لەماڵەکەی خۆی دانیشتووەو لەخۆی ورد ئەبێتەوە.

لەلایەکی تریشەوە هۆکارەکانی گواستنەوەو چاپەمەنی زۆر ئاسانتر بووە مامۆستایەك دەتوانێ لەڕۆژێکدا(١٠ ـ١٢) گوند بگەڕێو موژیاریان بکاتو ئێوارەیش لەناوماڵو منداڵی خۆیدا شێو بکاتەوە ، یان دەتوانێ لەهەفتەیەکدا دووسێ باسی گرنگو جوڵێنەر لەناو جەماوەردا بڵاوبکاتەوە کەئەمانە هەمووی ئاسانکارییە خوا ڕەخساندویەتی ئەگەر زانایانی ئاینی بیانەوێ سوودی لێوەرگرنو بانگەوازی خوایی تیا ڕابگەیەنن.

دووەم/ ئەمڕۆ ڕێژەی گوناهو تاوان لەناو کۆمەڵگا ڕوو لەزیاد بوونە(منکر) ی وەها ئەمڕۆ بڵاوەو ئاساییە لەناو خەڵکدا لەکاتی غەزالیدا ناویشی نەزانراوە ، دەزگاکانی تاوان خاوەنی تواناو لێزانن ، گوناهو (منکر) ناوی خۆی گۆڕیووە بەهونەر یاساکانی نێو دەوڵەتی داکۆکی

---

[1] احیاء علوم الدین:٢/٣١٣.

لەتاوانو تاوانباران دەکەن ، زۆر حەرام حەڵاڵکراوە زۆر سنووری شەرع شکێنراوە بەناوی ئازادیو سەربەستییەوە ، ئەمانەو دەیانو سەدان ڕواڵەتی دژ بەشەرعو یاسای ئیسلام لەناو کۆمەڵگای ئیسلامیدا سەری هەڵداوە ، لەبەرانبەر ئەوەیشەوە هێزی خێرو خێرخوازان کەم بووە، دەنگیان کپ بووە خۆشەویستی دنیاو ترسی مردن بەسەر دڵو دەروونی موسوڵمانانیشدا زاڵ بووە، هەڵگرانی ئاڵای تاوان زیاتر جەسوور ئازابوون بەرانبەر بە موسوڵمانانو میرات بەرانی پێغەمبەر(ﷺ)، بۆیە پێویستە ئەمڕۆ خەمخۆرانی راستەقینەی ئەم ئاینە هەوڵو کۆششیان دوقاتو دەیان قات پتەوتر بکەن خۆیان یەکلا بکەنەوە بۆ ڕەزامەندی خواو سەرفرازی پاشە ڕۆژ، شەوو ڕۆژ بدورن بەیەکدا ماندو نەناسانە لەکاردا بن هەر کات ماندو بوون بڵێن تا نەمرین پشوو نادەین ، ئەجرو پاداشتیان تەنیا لەخوا داوا بکەن ﴿وما اسالكم عليه من أجر ان اجري على رب العالمين﴾ویردی ئێوارەو بەیانیان بێت ، لەهەر لایەکدا بۆیان گونجا درێغی نەکەن.

لەمێژووی_جەزائیر) داهاتووە: کە(مەندوبی سامی) فەرەنسی - لەکاتێکدا کەجەزائیریان داگیر کردبوو - مامۆستای مزگەوتێکی بانگ کرد ناوی(عبدالحمید) بووپێی وت دەبێ وازبێنی لەدەرسی مزگەوتو بڵاوکردنەوەی ئەو ژەهرانەی لەدژی ئێمە دەیڕێژی ، ئەگینا سەرباز دەنێرین مزگەوتەکانتان لەسەر داخات.

مامۆستا پێی وت: تۆ ناتوانی من بێ دەنگ کەیت !

رقی هەستا و وتی: چۆن ناتوانم ؟

مامۆستا عبدالحمید پێی وت: من ئەگەر لەشاییدا بووم ئامادەبووان فێری ئاین دەکەم ، ئەگەر لەپرسەدا بووم ئامۆژگاریو دڵنەواییان دەکەم ، ئەگەر سواری شەمەندەفەر بووم دانیشتووەکان فێر دەکەم ، ئەگەر چوومە بەندیخانە ڕێنمایی بەندکراوەکان دەکەم ، ئەگەر بیشم کوژن ئەو خەڵکە دەبزوێنن لەدژی خۆتان، باشتر وایە بۆتان مەچن بەگژ دینو زمانی ئەم خەڵکەدا[1].

بانگەواز بۆلای خوایش جۆرو شێوازی زۆرە ، وەك بانگەواز بەکردەوەو پەروەردە ، بەنووسین ، بەوانەوتنەوە ، بەبڵاوکردنەوەی وتارو پەڕاوو ، بەشانۆو شانۆگەرییو بە ...بە... گرنگترین جۆریش لەم بوارەدا بانگەوازە بەوتار ، ئەو جۆرەیش مەبەستی سەرەکی ئێمەیە لەم کتێبەدا ، بۆیە جۆرەکانیتر کەناردەخەین بۆ قەڵەم دۆستە دڵسۆزەکانی ترو دەچینە سەر باسەکەی خۆمان پشت بەخوا.

---

[1] كيف ندعو الناس ، عبدالبديع صقر./١٢٦،١٢٧.

# فەسڵی دووەم
# ریشەی وشەی(الخطبة)

(الخُطبة)بەواتای وتاردێت ئەگەر پیتی خیّ بۆری هەبێت، ئەم صیغەیە(مصدر)ە فیعلەکەی(خَطَب یخطُب)لەبابی یەکەمە. هەروەها (خَطَبَ) بەواتای خوازبێنی کرد، بەلاّم لەم کاتەدا(مصدر)ەکەی (خِطبة)یە، واتە بە(کسرة)ەی پیتی(خیّ).

(الخَاطب) یان (الخَطیب) بەمانای وتاربێژ دێت، بەلاّم دووەمیان زیاتر بەکاردێت هەردووکیان کۆدەکرێنەوەو لەسەر صیغەی(الخُطَباء) (اختطب)دیسانەوە بەهەردوو مانای(خَطب) هاتووە. (الخِطب) بەژێری(خیّ) واتا: دەسگیران(خوازبێنیکراو) بۆ کوڕو کچ بەکاردێت.(الخَطْب)بەسەری (خیّ) واتە: کاروبار(الخَطابة)دیسانەوە(مصدر)ە و بەمانای وتاردێت (خَطُب) بەبۆری (طیّ) بەمانا: فێری وتاربێژی بوو (الخطاب) واتا: وتاربێژی بەهێزو توانا لەوتاردا[1].

خوتبە لەواتاگشتییەکەیدا: ئەو وتارەیە کەدەخوێنرێتەوە بەسەر کۆمەڵێك خەڵکیدا بەزمانێکی پاراوو رەوانو گونجاو لەگەڵ کاتو شوێندا، بەمەبەستی کاریگەری بۆ سەر دڵو دەروونیانو هەستو بۆچونیان بەوهیوایەی ببنە لایەنگری بۆچوونەکانی وتاربێژ، ئیتر ئایا ئەو وتارە ئاینی بێت، یان رامیاری ، یان کۆمەلاّیەتی،یان بەهەر مەبەستێکی تربێت[2].

کەوابوو (وتار) دەبیّ بەگفتو گۆی رووبەرووبێت، ئیتر ئایا وتاربێژ خودی خۆی راستەوخۆ لەناو کۆمەڵی گوێگراندابێت، یان هەر بەدەنگو رەنگ ،یان هەر بەدەنگ، وەك ئەمڕۆ لەکەناڵەکانی راگەیاندندا بەهەردوو جۆرەکە رادەگەیەنریّ، بەلاّم گومان لەوەدانیە بەهێزترین جۆریان ئەوەیانە وتاربێژ راستەوخۆ، لەناو خەڵکەکەدا بێت، گەروانەبوو واتا: رووبەروو نەبوو ئەوەپێی دەوتریّ نووسین یان شیعر، هەروەها دەبیّ وتار رووبەرووی کۆمەڵێك بێت گەرنا پێی دەوتریّ قسەیان وەسێت، دیسانەوە دەبیّ وتار لەگەڵ بەڵگەدا بێت بۆئەوەی گوێگران بڕوایان بەوتەکانی پتەو بێت، هەروەك چۆن پێویستە وتار تێکەڵ بەسۆزو کڵپە بێت بۆئەوەی گوێگران بهەژێنیّ، ئیتر ئایا دڵخۆشیان بکات یان خەفەتبار.

کەوابوو بناغەکانی وتار: گفتو گۆیە، کۆمەڵە، جۆشدانو قەناعەت پێکردنە[3].

---

[1] لسان العرب، ابن منظور، المُنجد في اللغة، مادة (خطب).

[2] محاضرات في اصول الخطابة، فاروق رسول يحي:. للخطباء والوعاظ ، اعداد: عمر كۆچەر :٤.

[3] فن الخطابة د. احمد محمد الحوفي:٩.

# فەسڵی سێیەم
# مێژووی وتاربێژیی و گەشەکردنی

مامۆستا فاروق رەسول لەسەرەتای نامیلکەی(محاضرات في اصول الخطابة)دا دەنوسێ: کارێکی گرانە گەربمانەوێ کاتێکی دیاریکراو بۆ سەرهەڵدانی وتاربێژی لەمێژووی مرۆڤایەتیدا دابنێین، لەبەر ئەوەی بەڵگەی تەواوو بڕواپێکراومان بەدەستەوەنیە لەم بارەیەوە کەبتوانین پشتی پێ ببەستین، بەڵام ئەوەی جێگای گومان نیە ئەوەیە، وتاربێژی هونەرێکی زۆر کۆنی زمانەوانی‌یە لەدێرین زەمانەوە مرۆڤایەتی بەکاری هێناوە، هەندێ لەفەیلەسوفەکانی یۆنانیش لەسەریان نووسیوە...).

د. عبدالرحمن بدوی لەپێشەکی وەرگێڕانەکەیدا بۆ(الخطابة)ی ئەرەستۆ دەنوسێ: (هەرچەند ئەرەستۆ یەکەم کەسە کەکتێبێکی تێرو تەسەل‌و رێك‌و پێکی نوسیوە لەهونەری وتاربێژیدا – کەئەم کتێبەی بەردەستمانە – بەڵام پێش ئەمیش چەند کەسێك لەم بارەوە شتیان نووسیوەو هەوڵیانداوە.

( بەڵام نیشتمانیی لەدایك بوونی ئەم هونەرە بەلای بەهێزترین راوبۆچوونەوە دوورگەی(صەقەلیە)[1]یە لەو وڵاتەی ناودەبرا بەیۆنانی گەورە، ئەمەیش لەچەرخی پێنجەمی پێش زایندا دوای ئەوەی ستەمکاران و داگیرکەران لەو وڵاتە دەرکران(لەساڵی ٤٦٧ پ.ن).

لەم ساڵەدا زۆر کەس لەو هاووڵاتیانەی دەربەدەر کرابوون‌و سامان‌و زەوی‌و زاریان داگیرکرابوو گەڕانەوەو داوایان بەرز کردەوە بۆ دادگاکان بۆ گەڕاندنەوەی سامان‌و مافەکانیان کەئەو ستەمکارانە دەستیان بەسەردا گرتبوو، وەلەم بارەیشەوە پێویستیان بەکەسانێك بوو لەخۆیان رەوانترو قسەزانترین بۆئەوەی داواکانیان بۆ بەرزکەنەوەو لەبەردەم دادگادا داکۆکیان لێبکەن بۆیە چەند کەسێك ئەم کارەیان گرتە ئەستۆ - وەك پارێزەرانی ئەمڕۆ ناودارترینیان - وەك دەگێڕنەوە - (قورقس‌و تسیاس) بوو کەهەردووکیان خەڵکی شاری (سەرقوسە) بوون کە دەکەوێتە دوورگەی صەقەلیە.

هەرچەندە ریوایەتێکی‌تر لەئەرەستوەوە دەگێڕێتەوە کەداهێنەری هونەری وتاربێژی(انباذ قلیس)ە کەلە(٤٩٠ - ٤٣٠ پ.ن) ژیاوە ئەویش هەر لەدایك بووی صەقەلیەیە.

بەڵام قورقس لەئەنباذ قلیس لەپێش تربووەو لەرۆژانی حوکمی هیرون دا( ٤٧٨ - ٤٦٧ پ.ن) ناوبانگێکی گەورەی بەدەست هێناوە...)[2].

---

[1] صەقەلیە: دوورگەیەکە لەدەریای ناوەڕاست‌و ئێستا سەر بەئیتالیایە.

گومان لەوەیشدا نیە کەسەرجەم پێغەمبەرانی خوا(علیهم الصلاة والسلام) چەکی دەستیان پێش هەمووشتێ ئامۆژگاریو بانگ کردنی قەومەکەیان بوو، بۆلای خواوروونکردنەوەی ڕێگای راستی بووه بۆیان، ئەمەیش هەر لەڕێگای وتارو وتاربێژییەوه بووه[1]. بۆ نموونە دەتوانین چاوێك بەقورئاندا بخشێنین و چیرۆکی پێغەمبەران بخوێنینەوه کەچۆن بانگی قەومەکانیان کردووەو ڕێگایان بۆ روونکردوونەوه.

(( کەوابوو راسترین بۆچوون ئەوەیە: کەلەوکاتەوه ئادەمیزاد کۆمەڵی هەبووه وتاربێژیش هەبووه، چونکە گومان لەوەدانیە هەرکات کۆمەڵ هەبوو جیاوازی راو بۆچوونیش پەیدا دەبێ، وه لەناو ئەم کۆمەڵەیشدا کامیان زیاتر قسەزان بوو، خۆی بەهەق و بەرانبەرەکەی بەناهەق زانی هەوڵ دەدات لەڕێی وتارو ئاخاوتنەوه دڵی تاکەکانی ئەو کۆمەڵە بەلای خۆیدا رابکێشێ و راوبۆچوونەکەی لەدڵیاندا بچەسپێنێ، جا ئەگەر سەرکەوتوو بوو ئەوه وتاربێژەو بەوتەکانیشی دەوترێ وتار لەبەر ئەوەناگونجێ مێژووی هیچ گەلێك خالی بوو بێت لەوتارو وتاربێژ))[2].

دیاره هەرکاتیش ئازادی بەسەر کۆمەڵگادا باڵ بکێشێ وتاربێژییش بەرەو گەشەکردن دەڕوات، چونکە وتاربێژەکان راوبۆچوونی خۆیان بلاّو دەکەنەوەو ناترسن لەسزاو پەلاماری ستەمکاران.

هەروەها هەرکات یاسایەکی کۆمەلاّیەتی، یان رامیاری لەناو کۆمەڵدا دژ بەبەرژەوەندی یەکانی کۆمەڵ و راستی یەکانی عەقیدەو ئاین کاری دەکرد، ئەوه لەوکاتەدا چاکە خوازان ناچار دەبن لەڕێگای وتارو ئاخاوتنەوه هەوڵی چارەسەرکردنی ئەوبارو دۆخە ناهەموارە بدەن و کۆمەڵگا بەرەو بیروباوەڕی راست و ژیانێکی خۆشتر بەرن لەڕێی گەشەپێدانی وتارەوه)[3]. ئەمەش تێمان دەگەیەنێ مێژووی وتاربێژیی لەگەڵ مێژووی مرۆڤدا سەری هەڵداوه، بەلاّم لەهەندێ سەردەمدا وەك سەردەمی یۆنانی یەکان زیاتر بەرەو پێش چووەو یاساو رێبازی بۆدانراوەو بووە بە قوتابخانەیەکی سەربەخۆ، گومان لەوەشدانیە پێغەمبەران(علیهم الصلاة والسلام) باشترین مامۆستای ئەم بوارەن، بەڵگەیشمان بۆ نموونە: بانگەوازی(نوح)ه (علیه السلام) بۆ قەومەکەی کەقورئان بۆمان دەگێڕێتەوه : ﴿ انا ارسلنا نوحا الی قومه ان انذر قومك من قبل ان یأتیهم عذاب الیم ﴾ نوح: ١

واتە: ئێمە نوحمان نارد بۆ لای قەومەکەی و فەرمانیشمان پێدا کەقەومەکەت بترسێنە و بانگی خواییان پێڕابگەیەنە بەر لەوەی سزای سەخت یەخەگیریان ببێت، ئەمجا نوح بانگیان لێدەکاو

---

[2] تلخیص الخطابة، دانراوی ئەرەستو، وەرگێرانی د. عبدالرحمن بدوی: ٩،٨ .

[1] محاضرات في اصول الخطابة:٣.

[2] فن الخطابة: ٤.

[3] هەمان سەرچاوەی پێشوو: ٤٧ .

وتاريان بۆ دەخوێنی: ﴿قال ياقوم اني لكم نذير مبين ، ان اعبدوا الله واتقوه واطيعون يغفر لكم من ذنوبكم ويؤخركم الى اجل مسمى ان اجل الله اذا جاء لايؤخر لو كنتم تعلمون ...﴾ (نوح:٢ـ٤).

هەروەها پێی فەرموون: : ﴿ استغفروا ربكم انه كان غفاراً ، يرسل السماء عليكم مدراراً ، ويمددكم باموال وبنين ويجعل لكم جنات ويجعل لكم انهاراً، مالكم لاترجون لله وقاراً، وقد خلقكم اطوراً، الم تروا كيف خلق الله سبع سموات طباقاً، وجعل القمر فيهن نوراً وجعل الشمس سراجاً، والله انبتكم من الارض نباتاً ، ثم يعيدكم فيها ويخرجكم اخراجاً ، والله جعل لكم الارض بساطا لتسلكوا منها سبلاً فجاجاً ﴾ ١٠.٢٠

ئێمە نامانەوێ لێرەدا تەفسیری ئایەتەکان بکەین تەنها دەمانەوێ ئەم دەقە قورئانییە بکەین بەبەڵگەی ئەوەی کەپێغەمبەرانی خوا بەتایبەت (اولو العزم) ەکان کە نوح( علیه السلام) یەکەمیانە باشترین وتاربێژ بوون ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ وتاربێژی وقەناعەت پێکردن کارێکی پیرۆزە بۆیە پێغەمبەران و پیاوچاکان و فەیلەسوفەکان پەنایان بۆ بردووە رێگایان پێ روونکردۆتەوە.

بەلاَم وەك باسمانکرد. جگە لەپەیامی پێغەمبەران (علیهم الصلاه والسلام) کەلە قورئانداو کتێبە ئاسمانییەکانی تردا هاتووە، وە جگە لە(الخطابة)کەی ئەرستۆ، هیچ شتێکی تر لە بەردەستماندانیە کەبیکەین بەبەڵگەیەکی مێژوویی بۆ باسەکەمان تادەگەینە سەرچەرخی نەفامی (العصر الجاهلی) واتە پێش هاتنی ئاینی پیرۆزی ئیسلام کەزۆر لەوتارەکانی ئەو سەردەمەی نیوەدوورگەی عەرەبی پارێزراون. دوای ئەو سەردەمەیش چەرخی ئیسلامی یەکەم و چەرخەکانی دوای ئەویش وتاربێژیی گەشەی کردو تادەبوو زیاتر بەرەو پێش دەچوو بەهۆی فراوانبوونی رووبەری جیهانی ئیسلامیو زۆربوونی مزگەوت و قوتابخانە ئاینییەکان لەهەموو گوندو شارۆچکەو شارەگەورەکان و بلاَوبوونەوەی زانست و بەرپابوونی بزوتنەوەی کتێب دانان و وەرگێران لەهەموو بوارەکانی ئەو سەردەمانەدا بەتایبەت لەسەردەمی عەباسییەکاندا.

## وتارێکی سەردەمی جاهیلی:

وەك نموونەیەکی مێژوویی حەز دەکەم لێرەدا دەقی وتارێکی سەردەمی جاهیلی بخەمە پێش چاوی خوێنەران، تابزانین رەوانبێژیو زمانەوانی تاچ رادەیەك پێشکەوتو بووە، وەچۆن عەرەبەکان شانازییان دەکرد بەپاراوی زمانەوەو هەرکەس قسەزان و رەوانبێژ بوایە لەپلەی پێشەوە دایان دەنا.

گفت و گۆیەك کەلەنێوان (کیسری) پاشای فارس و، نوعمانی کوڕی مونزیری پاشای حیرەدا روویدا لەم گفتوگۆیەدا کیسرا تانەی لەعەرەبەکان داو توانجی تێگرتن (نوعمانی کوری مونزیر) دوای ئەوەی داوای کرد لە کیسرا کەخەشم و قینی لێنەگرێ و سزای نەدا، بەوتارێکی جوان تانەو تەوانجەکانی کیسرای رەتکردەوە، ئەمجا بەوەیشەوە نەوەستا هەندێ لەرەوانبێژەکانی عەرەبی

بانگهێشتکرد دیاریو بەخششێکی زۆری پێدانو رێزی زۆری گرتنو داوای لێکردن هەریەك وتارێك ئامادەبکاتو لەبەردەم کیسرادا بیخوێنێتەوە بۆنەوەی چیتر بەچاوی سووك تەماشای عەرەب نەکاتو، لەهەمان کاتیشدا رێگای بۆدانان چۆن بیخوێننەوەو،چۆن بچنە بەردەمیو، چۆن سڵاوی پاشایانەی ئاراستە بکەنو کامیان یەکەمبێو کامیان دووهەم...هتد.

ئەمەیش ناوی هەندێکە لەو وتاربێژانە( اکثم) ی کوری (صیفی) تەمیمی،(حاجب) ی کوری (زرارة)ەی تەمیمی،(حرث)ی کوری (عباد)ی بەکری (قیس)ی کوری(مسعود)ی بەکری چەند کەسی تریش هەریەك وتاری خۆی خوێندەوەو زمانزانەکان تەرجەمەیان کرد بۆ کیسرا[1]، ئێمە لێرەدا تەنها وتارەکەی (اکثم)نەقڵ دەکەین چونکە زۆرپەندی جوانی لەخۆگرتووە.

﴿ان افضل الاشياء اعاليها، وأعلى الرجال ملوكها، واعظم الملوك اعمها نفعاً، وخير الازمنة اخصبها، وافضل الخطباء أصدقها، الصدق منجاة، والكذب مهواة، والشر لجاجة، والكذب مركب صعب، والعجز مركب وطيء .

افة الراي الهوى، والعجز مفتاح الفقر، وخير الامور الصبر، حسن الظن ورطة، وسوء الظن عصمة، اصلاح فساد الرعية خير من اصلاح فساد الراعي .

من فسدت بطانته كان كالغاص بالماء، شر البلاد بلاد لا امير لها، شر الملوك من خافه البريء، المرء يعجز لا محالة، افضل الاولاد البررة، خير الاعوان من لم يراء بالنصيحة، احق الجنود بالنصر من حسُنت سريرته، يكفيك من الزاد مابلغك المحل، حسبك من شر سماعه، الصمت حكم وقليل فاعله، البلاغة الايجاز، من شدد نفر، ومن تراخى تالف).

فتعجب كسرى من اكثم وقال: لو لم يكن للعرب غيرك لكفى. قال: اكثم: رب قول انفذ من صول[2].

واتە: بەرێزترین شت پایە بەرزەکانیانە، بەرزترین پیاوان پاشاکانیانە، گەورەترین پاشایش ئەوەیانە سوودی زۆر بڵاو بێت، باشترین کات کاتی هەرزانی، بەرێزترین وتاربێژ راستگۆترینیانە راست گۆیی سەرفرازییە، درۆیش لەناوچوونە، خراپەکاری ملهورییە، درۆیش ولآخێکی سەخت گیرە، نەتوانین ولآخێکی نزمە، ئافاتی بیرورا هەواو ئارەزووە، نەتوانین کلیلی هەژارییە، باشترین کارخۆگرییە، گومانی چاك بردن قوڕولیتەیە، گومانی خراپ بردن خۆپارێزییە، چاککردنی گەندەڵی خەڵکی رەشو رووت چاکترە لەچاککردنی گەندەڵی پاشاو سەرکردەکان.

هەرکەس دەستو پێوەندی خراپ بوون وەك ئەوە وایە لەئاودا نوقم بووبێ، خرابترین وڵات ئەو وڵاتەیە کە گەورەی نەبێ، خراپترینی پاشا ئەوەیە بێتاوان لێی بترسێ، نەتوانین روودەکاتە

---

[1] جمهرة خطب العرب، احمد زكي صفوت، ١٥/١ ــ٢١.

[2] سەرچاوەی پێشوو: ٢١.

مرۆڤ و ئەمە شتێکی مەحاڵ نیە، باشترین منداڵ چاکەکانیانە لەگەڵ دایكو باوك، باشترین پشتگیر ئەوەیە، روپامایی نەکات لەئامۆژگاریدا، لەپێشترین سەرباز بەسەرکەوتن ئەوەیە دەروونی پاك بێت، ئەوەندە توێشووت بەسە کەبت گەیەنێتە مەنزڵ، شەڕ بیستنی سەرو زیادە واتە: دوای مەکەوەو مەیبینە . بێدەنگی حوکمو پەندەکەم کەسیش دەیکات، رەوانبێژی ئەوەیە وشەی کورت بەکاربێنی، هەرکەس توندوتیژبوو خەڵك دەتارێنی، هەرکەس شلگیربێ خەڵکی تێدەئاڵێ).

کیسرا سەرسام بوو لەجوانیئەم وتانە وپێی وت: ئەگەر عەرەب جگە لەتۆ کەسیتریان نەبێ بەسیانە.

(اکثم)وتی: زۆر وتە هەیە کاریگەرترە لەپەلامار واتا پەلاماری سوپا بۆ دوشمنان.

# فەسڵی چوارەم
# کاریگەری وتار

## وتاربێژیی ئەرکێکی گەورەیە:

هەرکەس لەجیهانی وتارو وتاربێژیدانەژیابێتو ئەو کۆڵە گرانەی لەسەرشانی خۆی هەڵنەگرتبێتو، چەند ساڵێ لەتەمەنی و چەند زستانو هاوینێك لەخەمیدانەبووبێت؛ باوەڕناکەم بەتەواوی بتوانێ گرنگی وتارو وتاربێژی هەڵبسەنگێنێو مافی خۆی بداتێ لەکاتێکدا باسی لێکرا.

وتار: وێنەیەکی جوانو بێگەردە، لەئاوێنەی سافی سینەی وتاربێژەوە دەردەکەوێ، رەوشت بەرزیو سۆزو بەزەییو چاکەخوازیو نەرمونیانیو بەختەوەری تاكو کۆمەڵێ تیا ئەدرەوشێتەوە؛ (( بۆیە دەبێ وتاربێژ لەکاتی دانانو خوێندنەوەی وتاردا لە(ساتێکی) لەسەرخۆییو سینەسافیو پاکنیازیو ئیخلاس بۆ خوادابژی، چەندێ جوانە ئەگەر پێش وتارەکە دەمو زمانی بەخوێندنی چەند ئایەتێ لەقورئان خاوێن بکاتەوەو داوای یارمەتیو کۆمەك لەخوا بکات)[1].

وتاربێژ دەبێ باش بزانێ جۆرەکانی جیهاد دوو جۆرە: جیهاد بەشمشێرو جیهاد بەوتە (جهاد بالسیوف، وجهاد بالحروف) بۆیە وتار لەجۆری دووهەمیانە هەندێ کات شان بەشانی جۆری یەکەم دەڕوا، یان شتێ لەوکەمترە، دەگونجێ لەهەندێ کاتو شوێندا لەویش زیاتر بێت وەك پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێ: (افضل الجهاد کلمة حق عند سلطان جائر)[2] ، واتە: گەورەترین جیهاد وشەیەکی راستە لەبەردەم پاشایەکی ستەمکاردا، لەبەر ئەوە وتاربێژیی ماندو بوونی

---

[1] کیف تکون خطیباً، علي محمد الرفاعي: ٤٧.

[2] رواه ابوداود والترمذي وابن ماجه وغیرهم . مختصر منهاج القاصدين ، ابن قدامة المقدسي : ١٥٧.

دەویّ لیّبڕانی دەویّ، شەونخوونی دەویّ، لەخۆترسانی دەویّ، خەڵك زویرکردنی دەویّ ئازایەتی دەویّ، وردبوونەوەو وریایی دەویّ...

(وتارو وتاربیّژیی لەدیّرین زەمانەوە کاریگەرترین چەکی دەستی کۆمەڵی ئادەمیزاد بووە لەئاشتیو لەجەنگدا، یان لەپیّشکەوتنو گەشەکردنیدا لەرەوشتی بەرزو پلەکانی زانستو هەموو بوارەکانی تری ژیاندا.

لەبەرئەوە جیّگای سەر سوڕمان نیە ئەگەر وتاربیّژیی هۆکاری گەیاندنی پەیامی پیّغەمبەران بووبیّ بۆ گەلەکانیان، یان ئەو پەرداخە شەرابە بووبیّ کەسەرکردەکانی جەنگ دەرخواردی سەربازەکانیان دەدەن بۆ ئەوەی بەدەم پیّکەنینەوە ڕابکەن بۆ جەنگی دوژمنان، یان ئەوچڵە زەیتوونە بیّت کەهەڵگرانی ئاڵای ئاشتی لەجیهانی دژایەتیو ئاژاوەدا، بەرزیان کردبیّتەوە یان ئەوهیّزە پڕلەکاریگەریو جادووە بیّت، کەسەرکردە سیاسییەکانو ئاشتیخوازە کۆمەڵایەتییەکان گەلەکانی خۆیانی پیّبەرزدەکەنەوە بۆ گووزەرانیّکی خۆشترو گونجاوتر، یان زمانی پارتە سیاسییەکان بیّت بۆبڵاوکردنەوەی بانگەوازەکانیان ، یان ئەو ڕووناکییە بیّت قازیو دادوەرەکان ڕیّنمایی دەکات بۆ پاراستنی دادوەریو لابردنی ستەم لەسەر ستەم لیّکراوان)[1].

(( وتار دۆزینەوەی هەموو ڕیّگایەکی گونجاوە بۆ قەناعەت کردن بەخەڵکانی بەرانبەر بۆ هەر باسو مەوزوعیّك کەوتاربیّژ بیەویّ ڕایبگەیەنیّ، وە ئەم کاریگەرییەش لەتوانای هیچ هونەریّکیتردا نیە، چونکە هەریەك لەوان تەنها لەیەك لایەندا دەتوانیّ قەناعەت دروست بکات.

بۆ نموونە هونەری پزیشکی تەنها لەلەش ساغیو نەخۆشی دەدویّ، ئەندازیاری تەنها لەتایبەتمەندییەکانی ئەندازە باس دەکات، حساب تایبەتە بەژمارەوە، بەڵام وتاربیّژی توانای هەیە ڕیّگاکانی قەناعەت پیّکردن لەهەموو بواریّکدا روون بکاتەوە...)[2].

## وتار وڵاتیّك داگیر دەکات:

زۆرجار بووە کاریگەری وتار وڵاتیّکی ئازادکردووە، یان شەڕیّکی خویّناوی کوژاندۆتەوە، یان شۆڕشیّکی بەرپاکردووە.

بۆ نموونە هیوستن ساڵی ١٨٣٠ وتاریّکی خویّندەوە لەبەردەم(کۆنگریّس)ی ئەمریکیدا وشەیەکی تیّدا دووبارەنەکردەوە، ئەو خەڵکەی بەردەمی هەموو سەرسام کرد، لەوکاتەدا تازەیش شۆڕشی هیندە سوورەکانی کوژاندبووەوە کیّشی کردبوون بۆ ئەوەی بەڵگەنامەی ئاشتی لەگەڵ ئەمەریکا مۆربکەن.

---

[1] فن الخطابة، ١٠.

[2] الخطابة: ٢٧.

سەرۆکی ئەمریکای ئەوکاتە بانگهێشی کردو پێی وت: ویلایەتی تەکساس سەر بە مەکسیکە، پاشەڕۆژی ئەمریکایش پەیوەستە بەو ویلایەتەوە بۆیە پێویستە هەرچۆن هەیە بخرێتە سەر ئەمریکاو، من ئەوەم لەتۆدەوێ.

هیوستن وتی: باشە من ئەو ئەرکە دەگرمە ئەستۆ، بەلاّم مالّم دەوێت پیاوم دەوێت.

سەرۆك پێی وت: گەر مالّو پیاوم ببوایە تۆم بانگ نەدەکرد بەلّکو دەبێ خۆت بەتەنها بڕۆیت یەك دۆلاریشت نادەمێ، تەنهایەك پاسەوانت لەگەلْ دەنێرم تالەرووباری (مەسیسپی) دەپەڕیتەوە ئیتر ئەو یش دەگەڕێتەوە هیوستن ئەم ئەرکە گەورەی وەرگرت‌و پاسەوانەکەیش لەسەر کەناری دەریا خواحافیزی لێکرد، کاتێ گەیشتە یەکەم شاری تەکساس(نووسینگەیەکی پارێزەری) کردەوە ئەوەندە بەهێز بوو لەبەلّگەو بۆچوون‌و ڕەوانبێژیدا لەبەردەم دادگاکاندا، داواکار(المدعی) لەبەردەمیدا تاوانبار دەکراو، سکالاّ لەدەس کراویش(المتهم) بێ‌تاوان دەردەچوو، هەتا وای لێهات خەلّك دەوریان گرت‌و لەکاتی ڕووداوەکاندا هاواریان بۆدەبرد، ئەویش بەهەست‌و فیکریان یاری دەکرد، بەقسەی ڕەوان‌و شیرین پێی سەلماندن کەدەبێ سەربەخۆیی وەرگرن‌و لەمەکسیك جیاببنەوە بۆ ئەم مەبەستەیش بزوتنەوەیەکی بەهێزی پێکەوەنا هەتا جیابوونەوەکەی پێ ئەنجام دان، ئەمجا پێی سەلماندن کە پێویستە پەنا بەرنە بەر ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، بۆئەوەی بەتەنیا تیانەچن، بۆیە ئەوانیش بەخواستی خۆیان بوون بەویلایەتێك لەویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، دوای چەند سالّێکی کەم هیوستن هات‌و کلیلی تەکساسی دایە دەست سەرۆکی ئەمریکا بێ‌ئەوەی گوللەیەك بتەقێنێ یان دۆلارێك بدۆڕێنێ، سەرۆکی ئەمریکایش سوپاسی‌کردو شارێکی ئەویلایەتەیان ناونا بەناوی هویستن تاناوی نەمرێ وەئەوشارە ئەمڕۆ گەورەترین شاری ئەمریکایەو پایتەختی نەوتیشە لەولاّتدا.

ئابەم شێوە ڕەوانبێژیی وقسەزانی کاری ئاوا ئەنجام دەدات [1].

## کاریگەری وتار لەئەمڕۆدا :

ئەم ڕاستی‌یە لەئەمڕۆدا زۆر بەجوانی دەردەکەوێ تەنانەت زۆر دەزگاو لایەنی جیاجیا داوای یارمەتی لەوتاربێژو پیاوانی مزگەوت دەکەن بۆئەوەی پرۆژە سیاسی‌یەکانیان یان تەندروستی‌یەکانیان سەربگرێت‌و خەلّك بەدەمیانەوە بچێت ماموستا علی الرفاعی دەفەرموێ: لەولاّتی ئێمەدا ـ واتا میصرـ وەزارەتی تەندروستی داوای یارمەتی لەوتاربێژەکان دەکات بۆ قەلاّچۆکردنی نەخۆشیەکان، هەروەها وەزارەتی ناوخۆیش هەر داوا لەوتاربێژەکان دەکات

---

[1] صناعة الحياة، محمد احمد راشد: ٨٨،٨٩.

یارمەتیان بدەن بۆ سەقامگیربوونی ئاسایش و دامرکاندنی خەڵکی یان ناوبژی نێوان کەسانی بەشەڕهاتوو...هتد))[1].

لەکوردستانی خۆیشماندا بەهەمان شێوە وتاربێژەکان دەوری باڵایان هەبووە لەهەموو ڕووداوەکاندا هەردەم لەیارمەتی دەزگاکانی دەوڵەتدا بوون هەریەك بەشێوازی خۆی.

تائێستا چەندین جار وەزارەتی تەندروستی وتاربێژەکانیان کۆکردۆتەوە بۆ ئەوەی لەوتاری هەینیدا خەڵك هەڵبنێن بۆ ئەوەی بچن بەدەم هەڵمەتەکانی کوتانەوەو منداڵەکانیان نەشارنەوە.

لەیادمە لەیەکی لەو دانیشتنانەدا . کەلای خۆم تۆمارم کردووە . ( دکتۆر ئازادو دکتۆر فاتح) هاتن بۆ بەڕێوەبەرایەتی ئەوقاف و هەریەك کورتە وتارێکیان بۆ خوێندینەوە دەربارەی بڵاوبوونەوەی وەبای کۆلێرا لەعەسری ڕۆژی ١٩٩٩/٧/٩دا، وەداوایان لەئێمە کرد هەوڵ بدەین لەڕێگای وتارەوە خەڵکەکە هێدی بکەینەوەو نەترسن چونکە ڕووداوەکە سووکەو زۆر ترسناك نیە وەیەکێ لەقسەکانی د. ئازاد ئەوەبوو وتی:دوو دەقیقە قسەی ئێوە لەسەر مینبەر یەکسانە بە دوو سەعات قسەی من لەسەر شاشەی تەلەفزیۆن...

هەروەها لەیادمە هەر لەم ساڵانەی کۆتایی نەوەدەکاندا ڕێکخراوی (MAG) وتاربێژەکانی سلێمانیان کۆکردەوەو داوایان لێکردین لەوتاری هەینیدا خەڵکی وریابکەینەوە کەدەستکاری مین نەکەن و یاری پێنەکەن، وەیەکێ لەوقسانەی نوێنەری ئەو ڕێکخراوە، ئەوەبوو وتی: ئێمە دوای(حەوت هەشت) ساڵ هەوڵ و تەقەلاو، دوای ئەوەی کوردستان زیاتر لە(٩) هەزار قوربانی مینی هەیە بەو ئامارەی گەیشتووەتە لای ئێمە، ئەمجا ئێمە بۆمان دەرکەوتووە وتەی جەنابتان لەسەر دوانگەکان زۆر لەوتەی ئێمە کاریگەرترە !

لەم ساڵانەی بێ ئاوی و گرانیشدا چەندین جار داوا لەوتاربێژەکان کراوە کە موسڵمانان ئاگاداربکەنەوەو دەست بگرن بەئاوو کارەباو هۆکارەکانی تری ژیانەوە زیادەڕەوی نەکەن و بەگوێرەی پێویست کاری بکەن، وتاربێژەکانیش دریغی یان نەکردووەو بەدەم پیاوانی دەوڵەتەوە چوون، بۆ هەرشتێ خزمەتی کوردو کوردستانی تێدابووبێت، هەقی خۆیشیانەو واجبی سەرشانیانە ؛ کەمیللەت ئاگاداربکەنەوە بۆئەوەی خۆیان بپارێزن لەهەموو خەتەرێك کەڕوویان تێدەکات، یان بەشداری بکەن لەهەموو پرۆژەیەکدا کە چاکەی خەڵکی تێدابێت.

بەڵام لەهەمان کاتیشدا واجبی سەرشانی کاربەدەستان و پیاوانی ڕامیاری یە مامۆستاو وتاربێژو پێشەوایانی ئەم گەلە نەکەن بەداردەستی ڕامیاری و هەوڵی ئەوەنەدەن باری لاری سیاسەتیان پێ ڕاست بکەنەوە، چونکە ئەوکاتە هەردوولا لەبەرچاوی گەل دەکەون و قسەشیان برەوی نامێنێ، لەهەموویشی گرانتر ئەوەیە کەخوایش لەخۆیان دەرەنجێنن!.

---

[1] کیف تکون خطیباً: ٦.

## وتاری هەینی وتەیەکی خاوێن و وانەیەکی هەفتانە:

وتار یەکێکە لەگرنگترین جۆرەکانی بانگەواز بۆ لای خوای گەورە، چونکە وتار شێوەیەکی ئاشکراو بوێرانەیە هەموو کەس دۆست و دوژمن یارو نەیار پێی دەزانێ هەموو کەسیش دەتوانێ ئامادەی ببێت.

وتار سەبارەت بەوتاربێژی هەینی وانە وتنەوەیەکی هەفتانەی واجبە لەسەر هەموو ئەو موسڵمانانەی مەرجەکانیان تیادێتەدی، واتە: مامۆستا فەرزە لەسەری ئەم وانەیە بڵێتەوە، قوتابییەکانیش واجبە لەسەریان گوێ بگرن بۆ نوێ بوونەوەی باوەڕو گەشەی دەروونیان، بۆیە پێویستە دوانگە بەهەموو کەس نەدرێت، بەڵکو زاناترین و ئازاترین و لەخواترس ترین کەس بخرێتە ئەو شوێنە پیرۆزەو رووبکاتە موسوڵمانان و ڕێنماییان بکات، هەر لەبەر گرنگی وتار بووە پێغەمبەری خوا(ﷺ) بۆ ئەم کارە بەدرێژایی تەمەنی هیچ کەسێکی لەشوێنی خۆی دانەناوە، بەڵام زۆرجار جێگری خۆی ناردووە بۆ جەنگەکان، یان جاری وابووە لەدوای هاوەڵێك لەهاوەڵەکانی خۆیەوە نوێژی کردووە))[1] .

وتار ئەو یادخستنەوە پیرۆزەیە کەخوای گەورە لەقورئاندا فەرمانی پێداوە:﴿وذكر فان الذكرى تنفع المؤمنين ﴾ الذاريات: ٥٥. واتە: یادیان بخەرەوە چونکە بێگومان یادخستنەوە سوود بەئیمانداران دەبەخشێت.

وتار ئەو وشە خاوێنە بەرهەمدارەیە قورئان دەربارەی دەفەرموێ: ﴿ الم تر كيف ضرب الله كلمة طيبة كشجرة طيبة أصلها ثابت وفرعها في السماء تؤتي اكلها كل حين باذن ربها ويضرب الله الامثال للناس لعلهم يتذكرون ﴾ ابراهيم : ٢٥.٢٤

واتە: خوای گەورە نموونە دەخاتە پێشچاوتان، وشەی جوان و خاوێن وەك درەختێکی جوان و خاوێن وایە کەڕەگ و ڕیشەی لەزەویدا چەقی بێ و لق و پۆی بەحەوادا هەڵچووبێ و ، هەموو کات بەروبوومی ئامادەبێت بۆ خوازیارانی، بەرەزامەندی پەروەردگارەکەی ، بەم شێوەخوا نموونە بۆ ئادەمیزادەکان دەهێنێتەوە بەڵکو بەهۆش بێنەوە .

وشەی جوانیش هەندێك دەڵێن وشەی شایەتمانە، هەندێك دەڵێن قورئانە، هەندێك دەڵێن یادی خواو تەسبیحاتە هەندێك دەڵێن هەموو وشەیەکی جوان وتەقوا ئامێز دەگرێتەوە[2].

بێگومان ئەم تەفسیرەی دوایی شیاوترە بۆگشتگیریی قورئان و، هەرکام لەم مانایانەیش بگرێت هەر لە ڕێی وتارەوە بەخەڵك رادەگەیەنرێ.

---

[1] منتهى امال الخطباء، مصطفى ابو سيف الحمامي :٤٩٤/١.

[2] مواهب الرحمان في تفسير القران ، الشيخ عبدالكريم محمد المدرس : ٥/ ٥٤.

دیاره هەر لەبەر گرنگی وتار بووە کەبەدرێژایی مێـژوو خـاوەن دەسـتەلاتەکان ویستوویانە وتاربێژەکان لەرەوتی رامیاری ئەوان لانەدەن، چونکە زانیویانە کاریگەری زۆریـان لەسـەردەروونی خەڵك هەیەو دەتوانن ئاڵ‌و گۆڕ بەهەست‌و بۆچوونی خەڵکی بکەن، زۆرجار زانا بەرزەکان دەنگیان کـپ کراوەتـەوە یـان رێگـای وتاریـان‌لێگیراوە یـان تووشـی جۆرەهـا ئەشـکەنجەو ئـازار هـاتوون لەبەرئەوەی هـەق ویسـتانە دواون‌و نەبوونەتە دار دەسـتی هـیچ کەسـێك، مێژووی ژیـانی پێشـەوا ئەحمـەدی کـوری حەنبـەل رەحمـەتی خـوای لێبێـت . باشـترین بەڵگەیـە لەسـەر ئـەم راسـتی‌یە، لەپێشـینانی ئـەم ئوممەتـەدا، هـەروەها ژیـان‌و داسـتانی مامۆسـتا سـەعید نوورسـی لەبـەردەم ئیتحادی‌یەکان‌و پاشان لەبەردەم ئەتاتورك‌و کەمالی‌یەکاندا بەڵگەیەکی نوێی ئەم راستی‌یەیە.

هـەر لەبەر گرنگـی وتـارە کەنوێژی جومعە لـەچوار رکاتـەوە بـووە بـەدوو رکـات‌و سـوورەتێك لـەقورئاندا نـاوی(الجمعـە)ی لێنـراوەو ئایـەتێك بەتایبـەتی بانگهێشـتی موسـوڵمانان دەکـات بـۆ ئامادەبوونی ﴿ یـا ایها الذیـن امنـوا اذا نودي للصـلاة مـن یـوم الجمعة فاسعوا الی ذکـر الله وذروا البیع ذلکم خیر لکم ان کنتم تعلمون ﴾ الجمعة: ٩.

واتە: ئەی باوەڕداران هەرکات بانگی نوێژدرا لەرۆژی هـەینی‌دا بـەدەم یـادی خـواوە بـڕۆن‌و واز لەکڕین‌و فرۆشتن بهێنن ئەمە بۆ ئێوە چاکترە ئەگەر بتانزانیایە.

نـەوەوی لـە(المجمـوع)دا دەفـەرموێ: مەبەسـت لـە(ذکـر) وتـاری هەینی‌یـە[1] هـەر هـۆی ئـەم گرنگی‌یەیـە کەمامەڵـەو کڕیـن‌و فرۆشـتن دوای بـانگی نیـوەڕۆی هـەینی بـەکۆی دەنگـی زانایـان حەرامە.

هـەروەها لەبـەرگرنگی وتـاری جومعەیـە کەئایـەتی کۆتـایی ئـەم سـوورەتە سەرزەنشـتی ئـەو کەسـانە دەکـات کـە لـەکاتێکدا پێغەمبـەر(ﷺ) وتـاری دەخوێنـدەوە وتارەکـەیان جێ‌هێشـت کـە دەفەرموێ: ﴿ واذا راوا تجارة أو لهواً انفضوا الیها وترکوك قائماً قل ما عند الله خیر من اللهو ومن التجارة والله خیر الرازقین ﴾.

رۆژێك پێغەمبەر(ﷺ) وتاری جومعەی دەخوێندەوە دوحیەی کوری خەلیفە لەوکاتـەدا هێشتا موسوڵمان نەبووبوو کاروانێکی بازرگانی گەیاندەناو مەدینـە دای لەتـەپڵ بۆ ئەوەی خەڵکی بـۆ کڕینی کۆببنەوە، موسوڵمانەکان گوێیان لێبوو زانیان تـەپڵی بازرگانی‌یە، رایان کرد بەرەو پیری تەپڵەکەو پێغەمبـەریان بەجێ‌هێشت بەپێوە وتـاری دەخوێنـدەوە تەنـها دوازدە کەسـیان مانـەوە خوای گەورە ئەم ئایەتەی نارده خوارەوە واتـە: (هـەرکات بازرگانی‌یـەك یان گاڵتـەو گـەپێکیان دی

---

[1] المجموع في شرح المهذب للنووي، ٥١٣/٤.

بەپەلە بۆی دەرئەچن‌و بلاوەی لێدەکەن، تۆیش بەپێوە جیّ دەهێڵن، تۆ پێیان بڵێ ئەوەی لای خوایە چاکترە لەگاڵتەو بازرگانی خوایش باشترین رۆزی دەرە)[1]

هەر لەمبارەوەیە کەپێغەمبەری ئازیز(ﷺ) چەندین هەڕەشە دەکات لەو کەسانەی ئامادەی نوێژی جومعە نابن وەك ئەوەی دەفەرموێت: ( لينتهين اقوام عن ودعهم الجمعات او ليختمنَّ اللهُ على قلوبهم ثم ليكوننَّ من الغافلين ) رواه مسلم.

واتە: کۆمەلانێك هەن وازیان لەنوێژی هەینی هێناوە، دەبیّ یان کۆتایی بەوکارە بهێنن ، یان خوا مۆری ڕەش بەسەر دڵیاندا دێنیّ پاشان دەچنە ریزی بیّئاگاو غافڵەکان.

نوێژی جومعەیش دوورکاتی لەنیوەڕۆ کەمترە زۆر روونە ئەوەی گرنگی زیادی پیّبەخشیوەو واجبی کردووە وتارو ئامۆژگاریەکانە، هەر بۆیەش ناوبراوە بە جومعە لەبەر کۆبوونەوەی گشت موسوڵمانانی شار، یان گوند لەو رۆژەدا بۆئەوەی هەموویان بەجاریّ لەهەر ئاستێکی کۆمەلایەتیدا بن، بەبیّ جیاوازی رەگەزو رەنگ‌و پلەوپایە لەیەك سات‌و لەیەك شوێندا کۆببنەوەو رووبکەنە دەمی یەك رابەرو تەنها یەك رێنمایی وەرگرن، پەیمانی برایەتی ویەکریزی‌و یەك دڵییان نویّ بکەنەوەو، ئەگەر تۆزو گەردێك لەماوەی ئەو هەفتەدا لاپەڕەی دەروونی گرتبن یان ناکۆکی‌و ناحەزی‌یەك کەوتبێتە نێوان دوانیان یان زیاتر؛ بەڵکو بەفەرو پیرۆزی وتە بەپێزەکانی مامۆستای رابەریان لابچیّ‌و نەمێنی‌و پەشیمان بوونەوەی هەفتانەیان لەئاستانەی پەروەردگاری مەزندا نویّ بکەنەوەو بۆن‌و بەرامەی پارانەوە بەکوڵەکانی وتاربێژو ئامینی مەئمومەکان هەموو دڵەکان دابگریّ‌و گەردو تۆزی تاوانی لیّبشواتەوە.

وتاری هەینی کۆبوونەوەیەکی پیرۆزی هەفتانەیە چەقیوە لەناخی پەرستشدا، زۆر بەهێزو بەپێزترە لەکۆبوونەوە رامیاری‌یەکان، موسوڵمانەکان بێدارو وشیاردەکاتەوە لەو رووداوانەی لەدەوریان نویّ دەبێتەوە، تابزانن چۆن مامەڵەی لەگەڵدا بکەن. بەتەرازووی شەرعی خوایی ئایا پێویستە خۆیان لەگەڵیدا بشێلن‌و تێکلاویی بکەن، یان لیّی دوور کەونەوەو کەنار گیربن؟[2].

ئەو شوێنەوارە گەورەی وتاری هەینی جیّی دەهێڵیّ لەهەست‌و دەروونی موسوڵماناندا ــ ئەگەر مامۆستای وتاربێژ لێزانبیّ‌و، هەست بەئەرکی سەرشانی بکات‌و بەجوانی‌و دڵسۆزی وتارەکانی ئامادەبکات . دوژمنانی ئاین هەستیان پێکردووەو زانیویانە زۆر کاریگەرە بۆ پوچەڵ کردنەوەی پیلانەکانی ئەوان ئەوەتا یەکیّ لەموژدە دەران(المبشرين) راپۆرتێك دەنووسیّ دەربارەی تێشکانی هەوڵەکانی بەگاورکردن لەولاتانی ئیسلامیدا کەتیایدا هاتووە: (( ئاینی ئیسلام دەمێنیّ وەك بەردێکی سەخت‌و دژوارو، هەرچی کەشتی موژدەدەران هەیە وردو خاش

---

[1] تفسير ابن كثير : ٤/ ٣٦٩.

[2] الفقه المنهجي ١/ ٢٠٠.

دەبیّ لەناستیدا هەتا ئەم سیّ کۆڵەکەیە بمێنن لەنێو موسوڵمانانداﺫ قورئان، کۆبوونەوەی جومعەکان، کۆنگرەی ساڵانەی حەج))[1].

(( وتاری هەینی ئەمڕۆ بووەتە هونەرێکی زۆر گرنگ، پێویستی بەلێکۆڵینەوەو لێزانی تەواو هەیە وتاربێژەکانیش زۆر پێویستیان بەوە هەیە بەوردی شارەزای کۆمەڵگاکەیان بن و بزانن ئەوبیرو بۆچوونە ماددیو بیّباوەڕیانەی لەناوخەڵکدا بڵاوەی کردووە سەرچاوەکەی چییەو بەجوانی لێیان تێبگەنو هەست بەمەترسیو خراپەیان بکەن، وەشارەزای رێبازو شێوازی پیلانەکانی دوشمنانی دین بن، بۆئەوەی بتوانن بەجوانیو بەشێوەیەکی زانستیانەو نەخشە بۆدانراو بەگژیاندا بچن و پیلانەکانیان پووچەڵ بکەنەوە))[2].

# فەسڵی پێنجەم

# جۆرەکانی وتار

ئێمە نامانەویّ لەم فەسڵەدا جۆرەکانی وتار لەهەموو سەردەمەکاندا باس بکەین؛ چونکە هەر سەردەمێك خاوەنی چەند تایبەتمەندییەکی خۆی بووەو خوازیاری چەند جۆرێکی تایبەتی بووە لەوتار.

بۆ نموونە: ئەرەستۆ وتاربێژیی دەکات بەسیّ جۆرەوە:

## ١) ( الخطابة المشورية ) واتا: وتاربێژیی راوێژکاری:

کەوتاربێژ لەم جۆرەدا روودەکاتە خەڵكو ئامۆژگاریان دەکاتو بۆیان روون دەکاتەوە چی چاکەو چی خراپە؟ چی سوود بەخشەو چی زیان بەخشە؟ هەروەها چەمکەکانی دادوەریو ستەمو، جوان ڕەوشتیو بەدڕەوشتیان بۆباس دەکات دەگونجیّ ئەم جۆرە ئەمڕۆ ناو ببریّ بە(الخطابة الاجتماعية)وتاربێژیی کۆمەڵایەتی..

## ٢ )( الخطابة المشاجرية ):

وتاربێژ لەم جۆرەیاندا بەرانبەرەکەی تاوانباردەکات لەبەردەم دادگادا، یان داکۆکی لیّدەکات بۆ ئەو تۆمەتانەی بەرەو ڕووی بۆتەوەو هەوڵی لادانی دەدات وە ئەم جۆرە ئەمڕۆ ناو دەبریّ بە (الخطابة القضائية).

[1] هەمان سەرچاوەی پێشوو: ١٠٩

[2] رضينا بالاسلام دينا، لشيخ ابراهيم النعمة : ١٠٤.

## ٣) (الخطابة البرهانية): واته: وتاربێژیی بەڵگە ئامێز.

وتاربێژ لەم جۆرەیاندا لەڕەوشتی کەسێکی دیاریکراو دەدوێ، یان بەوەسف و پیاهەڵدان، یان بەزەم و تانە لێدان، لەهەردوو باریشدا بەڵگە دێنێتەوە لەسەر دەعواکانی بۆیە ناوی ناوە (الاستدلالی) یان (البرهانی)[1].

ئەمە کورتەیەکی زۆر کورت بوو دەربارەی جۆرەکانی وتاربێژیی لەو سەردەمەدا، باسم کرد وەك ئاماژەیەك بۆ جیاوازی سەردەمەکان، لەهەمان کاتیشدا هەرچەند هەموو سەردەمێك خاوەنی تایبەتمەندی خۆیەتی، بەڵام دەبینی ناشنایەتیەکی زۆر بەهێز هەیە لەنێوان چەرخەکانی ژیانی ئادەمیزاددا بەبەڵگەی ئەوەی ئەو جۆرە وتارانەی ئەرەستۆ ناوی بردوون تا ئەمڕۆ ناوەڕۆکی هەرماوە هەرچەندە ناوی گۆڕاوە، تەنانەت(الخطابة المشاجرية)وەك خۆی ماوە مەگەر چەند گۆڕانێکی سووك بەسەر شێوازی بەکار هێنانیدا هاتبێت ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ وتاربێژیی هونەرێکی زۆر رەسەنەو رەگەزەکانی لەقووڵایی مێژوودا چەقیوە.

دوای ئەم پێشەکییە ـ پشت بەخوا ـ باسی جۆرەکانی وتار دەکەین لەم سەردەمەدا:

## ١ ـ وتاری رامیاری(الخطبة السياسية):

پێم وایە ئەم جۆرە وتارە گرنگترین جۆریانە لەمرۆی ئێمەدا[2]، لەبەرئەوەی رامیاری رووبەری جیهانی داگرتووەو شوێن نەماوە رامیاریو وتاری رامیاری کاریگەری نەبێت لەسەری.

لەلایەکی تریشەوە هەموو جۆرەکانی وتار ئایا کۆمەڵایەتی بێت یان ئاینی پێویستی بەچەمکی رامیاری هەیەو دوورنیە لەوباسە، بەڵکو لەزۆر جەمسەردا یەکدەگرنەوەو تەواوکەری یەکترن.

(وتاری رامیاری) ئەو وتارەیە دەربارەی کاروباری دەوڵەت دەدوێ، وەك ئەو وتارانەی لەپەرلەماندا، یان لەکاتی هەڵبژاردنەکاندا، یان لەبارەگا حزبییەکاندا، یان لەکۆنگرە، نێو دەوڵەتیەکاندا ئاراستەی جەماوەری گوێگران دەکرێت[3].

ئەمڕۆ ئەم جۆرە وتارە زۆر لەبرەودایە بەهۆی زۆربوونی پارتە سیاسییەکانەوە، کە هەریەکەیان دەیانەوێ تەعبیر لەراو بۆچوونو ستراتیژیەتی خۆیان بدەن، داکۆکی لەهەڵوێستەکانی خۆیان بکەن بۆ رازیکردنی گەورەترین ژمارە لەجەماوەری گوێگران.

---

[1] فن الخطابة، الحوفي ٦٦، ٦٧، الخطابة ، ارسطو طاليس، ترجمة : د. عبدالرحمن البدوي :٣٦.

[2] الادب والنصوص، للصف السادس الادبي، الخطابة.

[3] فن الخطابة د. الحوفي :: ٧١.

هەروەها ئەمڕۆ پەیوەست بوونی جیهان بەیەکەوە بەهۆی کەناڵەکانی ڕاگەیاندنەوە(بیسراوو بینراو) ، جیهانی وەك یەك گوندی بچووك لێکردووە، وتاربێژێك دەتوانیٚ لەم سەری جیهانەوە بەئاسانی دەنگی خۆی بگەیەنێتە ئەو سەری جیهان))

(( پێویستە وتاربێژی سیاسی زۆر بەجوانی باسەکەی ئامادە کردبێت، ئاگای لەهەموو چەمکەکانی بێت، ڕۆشنبیرییەکی تەواوی هەبێت دەربارەی مێژوو، ئاینو، یاساکانی کۆمەڵایەتیو، ڕەشتو، پەیوەندییەکانی نێودەوڵەتیو، ئەوکەڵەپیاوانەی کاریگەرییان هەبووە لەمێژووی ئەو شوێنەی ئەو وتاری سیاسیی تیا دەخوێنیٚ؛ بۆئەوەی ئامادەبێت بۆ هەموو بەگژاچوونێك کەلەلایەن گوێگرانەوە بەرەنگاری دەبێتەوە دەربارەی ئەو خاڵانەی لەوتارەکەیدا دایدەبەزێنیٚ، چونکە گوێگران هەندێکیان ئامادەییان تیایە چەندو چوونی بۆچوونەکانی لەگەڵ بکەن گەر ئامادەنەبێت شەرمەزار دەبیٚ، بۆیە پێویستە وتاربێژی سیاسی زەین ڕوونو قسەزان بێتو توانای وەڵام دانەوەی کوتو پڕی هەبێت.

ڕۆژێك وتاربێژێك وتاری دەخوێندەوە بەنوێنەریی پارتێکی سیاسی ؛ ئافرەتێك کەلەپارتێکی تردابوو بانگی لێکرد: گەر مێردی من بوایەیت ژەهرم دەرخوارد دەدایت! کوتوپڕ وەڵامی دایەوە: گەر تۆ ژنی من بوایەیت بەخۆشحاڵی ژاری دەستم دەخواردی)[1].

نموونە زۆرە بۆ وتاری سیاسی لەم ڕۆژەدا، چونکە هەموو ئەو وتارانەی لەبۆنە سیاسییەکاندا دەخوێنرێتەوە وەك: یادی ساڵانەی پارتە سیاسییەکان، یان لەکۆنفرانسو کۆبوونەوەکاندا پێیان دەوتریٚ وتاری سیاسی.

لەمێژووی ئیسلامیشدا وتاری سیاسی زۆر بووە وەك وتاری خەلیفەکانی ڕاشدین لەڕۆژی دەست بەکار بونیاندا.

## دووەم: وتاری دادگایی( الخطبة القضائية ):

ئەم جۆرەیان ئەرەستۆ ناوی بردووە بە(الخطابة المشاجرية) قازیەکانی ئەو سەردەمە خۆیان ڕاقەی یاساکانیان دەکردو یاسایشیان دادەڕێژا، بۆیە پارێزەر(المحامی) دەیتوانی لەدەرەوەی سنووری یاسایش داکۆکی بکات لەتاوانبار، یان سۆزی دادوەرەکان ببزوێنیٚ بۆ هەڵگرتنی سزا لەسەری، چونکە یاساکان لەو سەردەمەدا بەم شێوەی ئێستا گشتگیرنەبوونو هەموو لایەنێکیان نەگرتبوو.

ئەمڕۆیش بەهەمان شێوە داوەرو پارێزەر هەرماون، بەڵام دادوەرەکان، ملکەچی یاسان، پارێزەرەکانیش هەر لەسنووری یاسادا توانای داکۆکیان هەیە لەتاوانبار. ئەمڕۆ پارێزەر خۆی

---

[1] فن الخطابة: ٢٧.

بەرگری لەتاوانبار دەكات وتاری بۆ دەخوێنێتەوە لەبەردەم دادگادا، بەلاَم لای یۆنانی‌یەكان دەبوا پارێزەر وتارەكەی ئامادە بكردایەو تاوانبار بیخوێندایەتەوەو بەرگری لەخۆی بكردایە ، وەزۆربەی ئەو پارێزەرانە لەكۆمەڵی سۆفستائی‌یەكان بوون‌و پیشەی پارێزەرییان كردبووە هۆكاری نان پەیداكردن.

مەبەست لەوتاری دادگایی ئەو وتارەیە: راستی لەناراستی جیادەكاتەوەو، لەكاتی جیاوازی‌و ناكۆكی‌یەكاندا دەتوانێ یارمەتی دادوەری بدات‌و مافی هەموو كەس دیاری بكات‌و یارمەتی ستەم لێكراو بدات بۆئەوەی هەقی خۆی لەستەمكار بسەنێ، هەروەها یارمەتی بێ‌تاوانەكان بدات بۆئەوەی لەهیچی نەبوو تاوانبار نەكرێن‌و سزای نابەجێ‌یان بەسەردا فەرز نەكرێت.

بۆیە پێویستە قازی‌و پارێزەر هەمیشە یارمەتی یەكتر بدەن بۆ دەرخستنی راستی‌یەكان‌و داكۆكی لەستەملێكراوەكان‌و بەگژاچوونی تاوان‌و تاوانبارەكان[1].

دیارە وتاربێژی لەهەموو بوارەكاندا بڕشتی خۆی هەیە بۆیە لە دادگاكانیشدا بەهەمان شێوە كاردەكات‌و دەتوانێ رۆڵێكی كاریگەر ببینێ، ئەرەستو دەڵێ وتاربێژی جۆرێكە لە جەدەل وە بەشێكە لەزانستی رەوشت(علم الاخلاق) دەگونجێ بەراستی ناوبنرێ بەراستی رامیاری، (د. عبدالرحمن بدوی) لەلێكۆڵینەوەی ئەم دەقەی ئەرەستۆدا دەنووسێ: لەكاتێكدا وتاربێژی باس لەكردارو، رەوشت‌و مەردایەتی دەكات زۆر پەیوەست دەبێت بەزانستی رامیاری‌و رەوشتەوە، چونكە رامیاری و رەوشت هەردوو لەخوو نەریتە بەرزەكان دەكۆڵنەوە: یەكەمیان لەئاستی دەوڵەتداو، دووەمیان لەئاستی تاكدا[2].

لێرەوە بەجوانی دەردەكەوێ زۆر نادروستە هەندێ لەپارێزەرەكان ئەو پیشە پیرۆزە بەكاردێنن بەپێچەوانەی ئەو مەبەستەی بۆی دانراوە ئەویش بە دەربازكردنی تاوانباران، یان تۆمەت باركردنی بێ‌تاوانەكان؛ ئیتر ئایا لەبەركۆكردنەوەی ماڵ‌و سامان بێت، یان بۆتێركردنی ئارەزووەكانی نەفس بێت، یان بۆ هەرمەبەستێكی تربێت چونكە وتاری دادگایی شایەتی‌دانە دادوەرو حاكم‌و نوێنەری گشتی‌و پارێزەرەكان بەرپرسن لەهەموو گوفتەیەكیان لەبەردەم ترازووی دادوەریی دنیاو پاشەرۆژدا، تەنانەت بەرانبەر دوژمنانیش دەبێ راست گۆبن وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ یا ایها الذین امنوا كونوا قوامین بالقسط شهداء لله ولو علی انفسكم او الوالدین والاقربین ان یكن غنیاً اوفقیراً فالله اولی بهما فلاتتبعوا الهوی ان تعدلوا وان تلوا او تعرضوا فان الله كان بما تعملون خبیراً ﴾ النساء: ١٣٥.

---

[1] فن الخطابة :٩٤.

[2] الخطابة، ارسطو، ترجمة : د. بدوي ٣٠/٣١.

واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕدارن زۆر ڕاستو ڕەوانو خۆگربن لەسەر دادوەری، شایەتی‌یەکانتان تەنها بۆ خوابێت لایەنگری کەسی تیامەکەن لەبەر هەر هۆیەك بێت، تەنانەت ئەگەر ئەو شایەتی‌یە زیانی بۆ خۆتان یان دایكو باوكتان یان خزمەکانیشتانی تێدابێت، چونکە ئەوکەسەی شایەتی لەسەر دەدرێ، ئەگەر دەوڵەمەند بێت، یان هەژار بێت خوا لەپێشترە لەوان، چی ڕاستە ئەوەبڵێن، دوای هەواو ئارەزوو مەکەونو کاریٚ مەکەن کەواز لەدادوەریو ڕاستی بهێنن، خۆئەگەر شایەتی‌یەکانتان خواربکەنەوە یان ڕاستی‌یەکان بشارنەوە خوا ئاگادارە لەکردەوەکانتان.

## سێیەم : وتاری کۆڕوئاهەنگەکان( الخطابة الحفلية ):

مەبەست بەوتاری ئاهەنگی ئەو وتارانەیە لەبۆنەیەکی کۆمەڵایەتیدا ئاراستەی کۆمەڵی ئامادەبووان دەکرێت، بۆڕێز لێگرتنی پیاوێکی گەورە، یان پیرۆزبایی بۆ ڕووداوێکی دڵخۆشکەر: وەك منداڵ بوون یان ژن هێنان، یان لەبەندیخانە دەرچوون، یان دروست کردنی مزگەوتێك یان شوێنێکی گشتی، یان دڵنەوایی کردن بۆ ڕووداوێکی دڵتەزێن وەك: مردنی کەسێك یان سوتانو لەناوچوونی ماڵو سامانێکی زۆر یان ... یان .

یۆنانی‌یەکان لەدێرین زەمانەوە ئەم جۆرە وتارانەیان تۆمارکردووە، مێژووناسی گەورە(توسیدید) باسی لێوەکردووە لەسەدەی چوارەم پێش زایندا کەیۆنانی‌یەکان ئەم جۆرە وتارانەیان بەکارهێناوە بۆ مردنی پیاوە گەورەکانیان )[1].

وتاری ئاهەنگی جۆری زۆرە ، وەك ئاماژەمان پێکرد. بۆیە پێویستە وتاربێژ بەگوێرەی کاتو شوێن وتەکانی بگۆڕێو بەشێوەیەك بدوێ دڵی گوێگران بهەژێنێو قسەی بەجێ‌بکات.

دەگێڕنەوە مامۆستایەکیان بانگ کرد بۆ ئامادەبوونی ئاهەنگێکی مارەبڕین کاتێ کەوتە قسەکردن وتی: (لقنوا موتاکم لا الـه الا الله) واتە: وتەی (لا الـه الا اللـه) بدەن بەگوێی مردووەکانتاندا، دایکی کچەکە وتی: خوا زوو بتکوژێ ئایە ئێمە تۆمان بۆ ئەمە بانگ کردووە؟)[2].

لەبەرئەوە پێویستە وتاربێژەکان خۆیان ڕابهێنن لەسەر (براعە الاستهلال) واتە: جوانکاری لەدەست پێکردندا، بۆ نموونە: لەباسی مردنی پیاوێکی زاناو لەخواترسدا ئەم ئایەتە بکەن بەپێشەکی ﴿ من المؤمنين رجال صدقوا ماعاهدوا الله عليه فمنهم من قضى نحبه ومنهم من ينتظر وما بدلوا تبديلاً﴾ الاحزاب: ٢٣.

بۆ کردنەوەی مزگەوت ئایەتی: ﴿ انما يعمر مساجد الله من امن بالله واليوم الاخر...الاية﴾ التوبة: ١٨.

---

[1] فن الخطابة:١١٤.

[2] هەمان سەرچاوەی پێشوو:٢١.

بۆ ئاهەنگی مارەبڕین ئایەتی: ﴿ ومن اياته ان خلق لكم من انفسكم ازواجاً لتسكنوا اليها وجعل بينكم مودة ورحمة ...﴾ الروم: ٢١.

هەروەها پێویستە لەهەموو بۆنەیەکدا سوود وەربگیرێ لەوفەرموودانەی پێغەمبەر(ﷺ) یان چیرۆکی پیاوچاکان، یان پەندی پێشینان، یان هەر قسەیەکی نەستەق و جوان کەپەیوەندی بەو باس و بۆنەوە هەبێت.

بێگومان ئەمەیش لەکەسێکەوە بۆ کەسێکی تر دەگۆڕێت چونکە وتاربێژی واهەیە زۆر خوێندەوارو وریایەو پێویستی بەئامادەکردن نیە، لەهەر لایەکدا دانیشت هەر ئەوەندەی بەسە لەسروشتی ئەو کۆڕو کۆمەڵە تێبگات، چاوێك بەدەوروبەری خۆیدا بگێڕێ، ئیتر زۆر بەئاسانی دەتوانێ وتارێکی گونجاو لەسەر لاپەڕەکانی دەروونی بنووسێ و خێراتر لە(کۆمپیوتەر) ئامادەی بکات و دایشی بەزێنێ !

بەلأم هەندێ وتاربێژیش پێویستی بەوەیە پێش وەخت ئاگاداری لەکوڕەکە هەبێ و بزانێت بۆچی ئەنجام دەدرێ وکێ ئامادە دەبێت، بۆئەوەی وتارەکەی لەسەر وەرەقەیەك ئامادەبکات و لەکاتی خوێندنەوەیشدا پابەندی ئەو وەرەقەیە بێت.

هەر جۆرێکیان بێت هەر دروستە بەمەرجێك وتاربێژ زیادەڕەوی نەکات و لەسنوور دەرنەچێت، بۆ نموونە ئەگەر وتارەکە پیاهەڵدان بوو بەچاکەکانی گەورەپیاوێکدا پێویستە وەسفەکانی لەسنووری دڵسۆزی و راستگۆیی دەرنەچێت، دووربێت لەرووپامایی و بەرژەوەندی تایبەتی و کارێك نەکات پیاهەڵدراو لەخۆی بایی ببێت، یان وابزانێت کەس لەخۆی چاکتر نیە، هەروەها ئەگەر پیاهەڵدانەکە بۆ لاواندنەوەی مردویەکیش بێت وتاربێژ بۆی هەیە چاکەی ئەو مردووە باس بکات، یەکەم: بۆئەوەی زیندووەکان چاوی لێبکەن، دووەم: بۆئەوەی وەچەکانی شوێنی کوێرنەکەنەوە[1].

وەك پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێ: ( اذكروا محاسن موتاكم)واتە: چاکەکانی مردووەکانتان باس بکەن، بەلأم هەردەبێ رووپایی و لەسنوور دەرچوونی تیانەبێت، هەروەها لەبۆنەی مارەبڕیندا چاکەی زاوا یان بووك یان بنەماڵەکانیان باس بکات دوور لەزیادەڕەوی و پێوەنان، یان شانازی و خۆهەڵکێشان...

## چوارەم: وتاری کۆمەڵایەتی( الخطبة الاجتماعية )

ئەو وتارەیە: ئاراستە دەکرێت بۆ لێکۆڵینەوەی تەنگوچەڵەمەیەکی کۆمەڵایەتی و ناتەواویەکان باس دەکات لەگەڵ هۆکارو چارەسەرکردنیشیاندا.

---

[1] فن الخطابة:١٠٧.

هەندێ لەم باسانە دەچنە ریزی وتارو هەندێکیشیان ناچن، ئەگەر وتاربێژ تەنها لێکۆڵینەوەی باسەکەی کرد، بێئەوەی کاری وتارگەری تیا بکات ئەوە پێی دەوترێ(محاضر)، بەڵام ئەگەر لەگەڵ لێکۆڵینەوەکەیشدا هەستەکانی بزواندو بەشێوەی وتار دایبەزاند ئەوە وتاربێژە)[1].

نموونەی وتاری کۆمەڵایەتی لەم سەردەمەی ئێمەدا زۆرە، هەموو ئەو وتارانەی لەکۆڕوسیمینارەکاندا ئاراستە دەکرێن دەربارەی مافی ئافرەت، دیاردەی توندو تیژی لەگەڵ ئافرەت، یەکسانی پیاوو ئافرەت، بەگژاچوونی نەخوێندەواری، بنەبرکردنی نەخۆشیەکانی لاشەیی یان دەروونی، چارەسەری بێئاوی‌و بێکارەبایی زیادەڕەوی نەکردن لەهەموو ئەوشتانەی پێویستی کۆمەڵگان...هتد؛ دادەنرێت بەوتاری کۆمەڵایەتی)[2].

وتارە ئاینی‌یەکانیش زۆریان یەك دەگرنەوە، لەگەڵپێناسەی وتاری کۆمەڵایەتیدا چونکە پێویستە وتاربێژی ئاینی لەناو کۆمەڵگادا بژی‌و باس لە تەنگوچەڵەمەکانی بکات بۆیە جەمسەری وتارەکانی کۆمەڵایەتی دەبێت.

باشترین نموونە بۆ شێلاندنی باسە ئاینی‌یەکان لەگەڵ کۆمەڵایەتیدا باسەکانی میحرابن کەماوەی حەوت ساڵە لەلایەن بەرێز حاجی (شەماڵ موفتی)یەوە لەسەردوانگەی دەنگی یەکگرتوو پێشکەشیان دەکات، چونکە بەراستی سەرکەوتووانە توانیویەتی ئەو دوولایەنە گرێ بدات بەگیانێکی نوێ‌و هاوچەرخانە ئاراستەی کۆمەڵگایان بکات، باشترین بەڵگەیش ئەوەیە خەڵکێکی زۆر تامەزرۆی وتارەکانی‌و هەفتانە بەپەرۆشەوە چاوەرێی ئەوساتەن حاجی شەماڵ لەسەرشاشە دەردەکەوێ‌و زۆروتاری لەسەر داوای جەماوەر دووبارە دەکرێتەوە، خوای گەورە زیاتر سەرکەوتووی کات‌و لەوێنە یان زیاد کات لەناو ئەم میللەتەدا . امین .

## پێنجەم : وتاری جەنگی( الخطبة الحربية ) :

ئەو وتارەیە: سەرکردەی جەنگەکان هەستی جەنگاوەرەکانی پێ دەبزوێنن بۆئەوەی هەڵیان بنێن لەسەر فیدارکاری‌و لەخۆبوردن‌و قوربانی دان‌و گیان خستنە سەردەست[3]. تابتوانن بچن بەگژ دوژمنە کانیانداو لەمەبەستی ئەو جەنگە تێبگەن خۆگرین لەبەردەم شاڵاوو زۆر بۆهێنانی دوژمندا، چونکە ئەو قەزیەی ئەوان لەپێناویدا دەجەنگن زۆر لەمردن گەورترەو شایستەیە ئەوان خۆیانی بۆ بەخت دەکەن.

باشترین نموونە بۆئەم جۆرە، وتارەکەی تاریقی کوڕی زیادە کەپێش گرتنی ئەندەلوس ئاراستەی سەربازەکانی کردکە ئەمە هەندێکێتی:

---

[1] فن الخطابة : ١١٤.

[2] الادب والنصوص، الصف السادس الادبي: ٧٨.

[3] فن الخطابة :١٣٦.

(( ئەی خەڵکینە بۆ کوێ رادەکەن؟ دەریا لەپشتانەوەیە، دوشمنیش لەبەردەمتاندایە، سوێند بەخوا جگە لەراستیو خۆگری هیچ شتێك فریاتان ناکەوێ!

باش بزانن ئێوە لەم دوورگەیەدا (حاڵتان خراپترە لەحاڵی هەتیوانێك کەپەنایان بردبێ بۆ سەر سفرەی چاوچنۆكو پیاوخراپان)[1]،ودوژمنیش بەرەو رووتان هاتووە بەسەربازو چەكو رزقو رۆزییەکی زۆرەوە، ئێوەیش کەرەسەی جەنگتان پێنیە جگە لەشمشێرەکانتان، خۆراکتان پێنیە تەنها ئەوەنەبێ لەدەستی دوشمن دەردەهێنن، ئەگەر چەند رۆژیتر بەم شێوەبرواو کارێك بۆخۆتان ئەنجام نەدەن هێزو تواناتان نامێنیو پەلامارتان دەدەن، لەبەرئەوە ئەو ریسوایییە بەسەرخۆتاندا مەهێنن، زۆربەزو بچن بەگژ ئەم ملهوڕەدا چونکە شارە پارێزراوەکەی هێناوەتە بەردەستانو قۆستنەوەی ئەم هەلو فرسەتە گونجاوە بۆتان ئەگەر لەمردنی خۆتان ببورن...)

بیشزانن من یەکەم کەسم دەچم بەدەم ئەم داوای لەئێوەم خواست وەهەرکات ئەو دووکۆمەڵە بەیەك گەیشتن من یەکەم کەسم پەلاماری (لەذریق)سەرکردەی ملهوڕیان دەدەمو ئەیکوژم(انشاء الله) ، ئێوەش لەگەڵ مندا پەلاماریان بدەن، ئەگەر من دوای لەناوبردنی (لەذریق)تیاچووم ئەوە خراپەی ئەو تان لەکۆڵ بوەتەوە قارەمانێکی ژیرتان دەسدەکەوێ بیخەنە جێگای من وە ئەگەر من تیاچووم بەرلەوەی بگەم بەو، ئێوە بەدوای بریارەکەی مندا بێنو خۆتانی پێبگەیەنن گرنگترین کاری گرتنی ئەم دوورگە کوشتنی ئەوە چونکە هەرکات ئەو کوژرا ئەوان تێدەشێکێن ...هتد [2].

## شەشەم: وتاری ئاینی (الخطبة الدينية) :

مەبەستی سەرەکیو بنەڕەتی ئێمە لەنووسینی ئەم پەرتووکەدا ئەم جۆرە وتارەیە، جۆرەکانی تریشمان باس کرد لەبەر دووهۆ:

**یەکەم/** باسەکەمان وتارو وتاربێژییە، لەبەرئەوە بەلامەوە چاکتر وەهابوو هەموو جۆرەکانی وتار باس بکەین، بابەشێوەیەکی کورتیش بێت؛ بۆئەوەی گەورەترین ژمارە سوود لەم کتێبە وەرگرن، ئومێدەوارم کەسانێکی تریش بتوانن زیاتری لەسەر بنووسنو کتێبخانەی کوردی بەم بابەتە پێویستە دەوڵەمەندکەن.

**دووەم/** وتاربێژی ئاینی(الخطيب الديني)پێویستی بەهەموو جۆرەکانی وتار دەبێت چونکە زۆرجار چەمکێکی سیاسی یان پزیشکی، یان یاسایی یان کۆمەلأیەتی، یان ئاهەنگی، لەوتارەکانیدا باس دەکات، بەڵکو وادەبێت وتارێکی تەواو تەرخان دەکات بۆلایەنێك لەم لایەنانە.

---

[1] پەندێکی عەرەبییە بەم شێوە: (اضيع من الايتام في مادب اللئام).

[2] فن الخطابة: ١٣٦ ـ ١٣٧.

ئەوەیش وادەخوازێت وتاربێژی ئاینی بەئاگابێت لەهەموو جۆرەکانی وتار، هەر بۆیەش وام بەباش زانی هەموو جۆرەکانی تر پێش وتاری ئاینی باس بکەم.

وتاری ئایینی: ئەو جۆرە وتارەیە لەرۆژی هەینیو جەژنەکانو نوێژەبارانیو نوێژی خۆرو مانگگیرانو هەموو بۆنە ئیسلامییەکانیتردا مامۆستای وتاربێژ ئاراستەی کۆمەڵی خەڵکی دەکات بەمەستی فێرکردنو ئاگادارکردنەوەیان لەبناغەو لقوپۆکانی( اصل وفرع) ئاین ئیتر ئایا: ئەو وتارە فەرزبێت وەك وتاری هەینی، یان سوننەت بێت وەك وتاری پێش نوێژی جەژنو رۆژگیرانو مانگ گیران، یان هەر بۆ موژدەدان بەبەهەشتو ترساندن لەدۆزەخ(التبشیر والانذار)بێت وەك ئەو وتارانەی لەبۆنەو کۆمەڵەکانی تردا ئاراستەی ئامادەبووان دەکرێت، ئەم جۆرە وتارەیش پلەی سەرکەوتوویيو کاریگەرییەکەی بەئەندازەی پلەی زانیاریو خۆماندوکردنو دڵسۆزی مامۆستای وتاربێژو؛ واقیعییەتی ئەوباسەیە لەگەڵ فامو بیری گوێگرانو ئەو زەمانو زەمینەیە کەتیایدا دەوترێ.

هەرکات ئەمەمان بەجوانی زانی ئیتر هیچ سەرسام نابین لەوەی کەئەمڕۆ وتارە ئاینییەکان کاریگەرییان زۆر کەمە لەناو کۆمەڵگادا؛ چونکە هەرکات زانیمان کاریگەری وتارەکان رەنگ دەداتەوە بەهاتنە دی چەند مەرجێکی بنەڕەتیو پێویست، کەئامادەیی فیکریو پتەوی باوەڕی گوێگرانو، گونجانی زەمینەو واقیع هەندێکن لەو مەرجە زەروریانە؛ ئیتر ئاساییيە لامان ئەگەر وتاربێژ زۆر خۆیشی ماندو بکات بەڵام شوێنەواری کەم دەربکەوێ.

# فەسڵی شەشەم
# پایەو مەرجە فیقهییەکانی وتار

زانایان دەفەرموون: وتارە شەرعییەکان دەوتارن[1]

وتاری هەینی، جەژنی رەمەزان، جەژنی قوربان، خۆرگیران مانگ گیران، نوێژە بارانێ، چوار وتاریش لەرۆژانی حەجدا کەئەمانەن:

١ - رۆژی حەوتەمی (ذي الحجة يوم الزينة) .

٢ . رۆژی وەستانی عەرەفات.

٣ - يوم النحر (رۆژی جەژن).

٤ - يوم النفر الاول.

---

[1] مغني المحتاج : ٣١٢/١.

وه ئەم وتارانە پێویستیان بەکۆمەڵێ پایەو مەرج هەیە . پشت بەخوا . یەك لەدوای یەك باسیان دەکەین.

## یەکەم / خوتبەی هەینی:

### پایەکانی خوتبەی هەینی

زانایان یەك دەنگن لەسەر ئەوەی خوتبە مەرجێکە لەمەرجەکانی دروست بوونی نوێژی جومعە، خوتبەی جومعەیش دووخوتبەیە پێش نوێژ دەخوێنرێتەوە، بەلام زاناکان رەحمەتی خوایان لێبێت جیاوازیان هەیە لەمەڕ پایەو مەرجەکانی خوتبەدا:

پێشەوا شافیعی . رەحمەتی خوای لێبێت . دەفەرموێت: پایەکانی خوتبە پێنجن:

١ـ ستایشی خوا بەوشەی(حمد) لەبەر فەرموودەکەی جابری کوڕی عبدالله کەدەفەرموێت: پێغەمبەر(ﷺ) رۆژی جومعە سوپاسی خوای گەورەی کردو ستایشی کرد وە ئەمەیش دەقی فەرموودەکەیە:

(روى جابر ان النبي(ﷺ) خطب يوم الجمعة فحمد الله واثنى عليه ثم يقول على اثر ذلك . وقد علاصوته واشتد غضبه واحمرت وجنتاه كانه منذر جيَش . ثم يقول : بُعِثتُ انا والساعة كهاتين . واشار باصبعه الوسطى والتي تلي الابهام . ثم يقول: ان افضل الحديث كتاب الله وخير الهدى هدى محمد وشر الامور محدثاتها وكل بدعة ضلالة من ترك مالاً فلورثته ومن ترك ديناً اوضياعاً فاليّ) رواه مسلم [1].

واتە: جابر ریوایەتی کردووە کەپێغەمبەر(ﷺ) رۆژی جومعە وتاری خوێندەوە سوپاو ستایشی خوای کرد، دوای ئەوە دەیفەرموو: لەکاتێکدا دەنگی بەرز بووبوویەوەو زۆر توڕە بووبوو ، کولمەکانی سوور بوبوونەوە، وەك سەرکردەو ترسێنەری سوپایەك پاشان فەرمووی: منو قیامەت وەك ئەم دوانە واین ، ئامارژەی کرد بەپەنجەی ناوەڕاستو ئەو پەنجەیەی لەپەنا پەنجە گەورە دایە لەپاشان فەرمووی گەورەترین فەرموودە پەیامی خوایە، جوانترین رێنمایش رێنمایی محمدە، خراپترینی کارەکانیش شتە تازە داهێنراوەکانن، وەهەموو شتێکی تازەو داهێنراو گومڕاییە، هەرکەس ماڵو سامانی جێهێشت ئەوە بۆ میراتگرانییەتی هەرکەس قەرز، یان منداڵی جێ‌یەلاوە ئەوە بۆمنە ) واتە: قەرزدانەوەو بەخێوکردنی منالەکانی لەسەر منە.

٢ ـ صەلاوات دان لەدیاری پێغەمبەر(ﷺ) لەبەرئەوەی هەر پەرستشێ کەپێویستی بەیادی خوا هەبێ دەبێ باسی پێغەمبەریشی تیادا بکرێت وەك چۆن لەبانگو نوێژدا هەیە، وەلەبەرئەوەیش کەپێشینانو پاشینانی ئەم ئوممەتە یەکدەنگ بوون لەسەر صەڵەوات لەخوتبەدا ئەمەیش تەنها بۆ

---

[1] المجموع للنوي :٥١٦/٤.

فەرز رووئەدا کەیەك دەنگ بن لەسەری نەك بۆ سوننەت ، وشەی صەلاّواتیش دیاری‌یەو نابیّ بگۆڕێت بەشتێکی‌تر وەك: (رحم الله محمداً)[1] واتا دەبیّ بڵیّ: ( اللهم صل علی محمد) یان (والصلاة علی محمد)، هەروەها واجبە ناوی(محمد) بەئاشکرا ببرێت نەك بەڕاناو وەك: (اللهم صل علیه) یان وێنەی ئەوە.

٣ ـ ئامۆژگاری موسوڵمانان بەتەقوا(الوصیة بالتقوی)بەلاّم وشەی ئامۆژگاری‌یەکە دیاری نەکراوە واتا دەگونجیّ بڵیّ: ( اوصیکم بتقوی الله، یان (اتقوا الله) یان (اطیعوا الله) یان هەر وشەیەکی‌تر کەمانای لەخواترسانی لیّ وەربگیریّ ئەمەیش لەبەر ئەوەی مەبەست لەوتاری هەینی ئامۆژگاری‌یە وە لەفەرموودەکەی (جابر)یشدا ئەم مەبەستە بەروونی دیارە (ابن حجر) لە توحفەدا دەفەرمویّ: ( مەبەست لەخوتبە لەخواترسانە کەوابوو بەس نیە بەتەنها داوای ئەوەیان لیّ بکات خۆبپارێزن لەدنیا چونکە بیّباوەڕانیش ئەوە دەزانن کەدنیا بیّبایەخەو پایەدارنیە، بەڵکو پێویستە هەڵیان بنیّ بۆ خواپەرستی‌و بیانترسێنیّ لەپاشە ڕۆژی تاوان، وە ئەگەر تەنها یەك خالّ لەم دوانەیش باس بکات بەسە چونکە هەریەکەیان ئەوی تریانی لەئامێز گرتووە)[2].

لەم فەرموودە وەدەرئەکەویّ وتاربێژ بەهەر شێوەیەك بدویّ بەمەرجیّ هەڵنانی تیا بێت لەسەر خواپەرستی یان ترساندنی تیا بێت لەپاشە ڕۆژی تاوان ئەم ڕوکنەی لەمل دەکەویّ ، فەرموودەکەی جابریش ـ کە لەروکنی یەکەمدا باسمان کرد . زۆر روونە لەم مەبەستەدا چونکە وشەی (اتقوا الله) یان (اوصیکم بالتقوی) یان شتێك لەم جۆرەی تیادانیە بەروونی بەڵکو تەنها بەواتا ئەم مەبەستە دەگەیەنیّ.

٤ـ خوێندنی ئایەتێکی قورئان لەیەکیّ لەدو خوتبەکەدا ئیتر ئایەتەکە هەرەشە ئامێز یان موژدە ئامێز بێت بەمەرجێك مانای تەواو بدات بەدەستەوە، کە وابوو ئایەتی(ثم نظر) یان ( ثم عبس ، وبسر) بەتەنها بەس نیە چونکە پەیوەستە بەئایەتەکانی پێش خۆی‌و دوای خۆی، وەمانای تەواو نابەخشێت.

دروستە ئایەتەکە لەخوتبەی یەکەمدا یان دووەمدا بێت، وتراویشە واجبە لەهەردوو خوتبەکەدا ئایەت هەبێت، بەلاّم ئەو رایەی جێگای موتمانە بێت، تەنها لەیەك خوتبەدا واجبە خوتبەی یەکەمیش باشترە تەنانەت هەندیّ کەس فەرموویانە: واجبە لەیەکەمدا بێت چونکە دووەم تایبەتە بەدووعاوە. ئەوەی پێویستە لێرەدا بووترێ: یەك ئایەت جێگای دووەمەبەست

---

[1] مغني المحتاج ١/٢٨٥.

[2] تحفة المحتاج ٢/٤٤٧.

ناگرێت، وەك ئەوەی ئایەتی﴿الحمد لله رب العالمین ﴾ بخوێنێ بەنیازی سوپاسو ستایشو بەنیازی ئایەتی خوتبەیش لەهەمان کاتدا، بەڵکو دەبێ تەنها یەکێکیانی مەبەست بێت[1].

٥ ـ دوعا بۆ موسوڵمانان لەخوتبەی دووەمدا بەهەر لەفزێك مانای دوعای تیابێت، دەبێ ئەم دوعا بۆ قیامەتیان بێت نەك تەنها بۆ دنیا وەك: (اللهم اغفر للمؤمنین) دروستیشە دوعاکەی تەنها بۆ ئامادەبوان بێت وەك بڵێ (رحمکم الله). پارانەوە بۆ پاشای وەخت بەناونووس سوننەت نیە بەڵکو بیدعەیەو ناشیرینە، بەلأم بۆ کاربەدەستانی ولأتی ئیسلامی بەگشتی. بێناونووس، بۆئەوەی خوا رێنمایی‌یان بکات بۆ دادوەری‌و هەق پەروەری کارێکی باشەو سوننەتە، هەروەها سوننەتە پارانەوە بۆ سوپای ئیسلامو سەرکەوتنی بەسەر سوپای کافراندا.

غەزالی(رحمە اللە) لە(احیاء علوم )دا دەفەرموێ: دروست نیە پارانەوە بۆ میری زاڵم مەگەر ئەوەندە بڵێ: و خوا چاکت کات، خوا رێنماییت بکات بۆ چاکە، بەلأم پارانەوە بۆ تەمەن درێژی‌و مانەوەی دەسەلأتی دروست نیە وەك پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێ: (من دعا لِظالِم بالبقاء فقد أَحَبَّ أَنّ يُعصي الله في أرضه)واتە: هەرکەس بپارێتەوە بۆ مانەوەی ستەمکارێك ئەوە پێی خۆشە بێفەرمانی خوا بکرێت لەزەویدا)[2] .

## مەرجەکانی خوتبەی هەینی:

وێڕای روکنەکان وتار چەند مەرجێکیشی هەیە واجبە بێنەدی بۆ دروست بوونی جومعەو خوتبە.

یەکەم: پێویستە وتار بەزمانی عەرەبی بێت واتا تەنها روکنەکانی چونکە دەم بەدەم بەوشێوەیەمان گەیشتووە لەپێغەمبەرەوە(ﷺ) بەڵێ: ئەگەر کەسیان تیانەبوو عەرەبی بزانێت‌و گونجاویش نەبوو فێری ببن گشتیان یان یەك کەسیان پێش بەسەر چوونی کاتی نیوەڕۆ ئەوە دروستە یەکێکیان بەزمانی خۆیان وتاریان بۆ بخوێنێ هەتا فێردەبن، ئەگەر ماوەیەك بەسەر چوو دەیانتوانی فێر ببن بەلأم هەوڵیان نەدا بۆ فێربوون ئەوە هەموویان گوناهبارن‌و ناتوانن نوێژی جومعەبکەن، بەڵکو دەبێ نوێژی نیوەڕۆ بکەن. بەلأم ئەگەر تەنهایەك کەسیان فێربوو ئەوە وتاریان بۆ بخوێنێ‌و گوناه لەملی ئەوانیتریان لادەچێ.

ئەم مەرجانە تەنها بۆ ئەو پێنج روکنەیە کەپێشتر باسمان کرد، کەوابوو دروستە ئاواخن‌و ئامۆژگاری‌یەکانی نێوان روکنەکان بەزمانی خەڵکەکە بێت، وە ئەو ئامۆژگاری‌یانە هەرچەند درێژیش بن نابنە هۆی دابڕانی روکنەکان لەیەکتر واتا(موالاة) نایچڕێنێ چونکە بێدەنگی زۆر

---

[1] مغنی المحتاج ٢٨٦/١ ، تحفه ابن حجر ٤٤٧/٢.

[2] احیاء علوم الدین ١٣١/٢.

(مـوالاة) ده بچرێنـی نـەك ئامۆژگـاری بابـەزمانی عـەرەبیش نـەبێ. وەك شـێخ عەبدولحـەمیدی شیروانیو (ابن القاسم العبادی) لەپەراوێزی توحفەدا ئەم مەسەلەیان روونکردووەتەوە[1].

دووەم: مـەرجی خوتبـە ئەوەیـە دوای (زوال) بێـت واتـا نوێـژی نیـوەڕۆ بووبێـت دەسـبکات بەخوێندنەوەی وتار.

سێیەم: دەبێ وتـاربێژ بەپێوەبێت ئەگەر توانـای هـەبوو، ئەگەر نەیتوانی دروستە دانیشێت، ئەگەر نەیتوانی دروستە راکشێت، وە ئەگەر بەپێوە وتاری خوێندەوە بەمەرج گـیراوە لـەنێوان دوخوتبـە کەدا دابنیشێتو تۆزێکیش وەقرە بگرێـت، ئەگـەر بەدانیشـتنەوە وتـاری خوێنـدەوە لەونێوانەدا کەمێك بێدەنگ بێت.

چوارەم: دەبێ خەتیب دەنگ هـەڵبڕێت بەئەندازەی ئەوەی چل کـەس لەئەهلی جومعە گوێیـان لەدەنگی بێت، دەبێ ئەو چل کەسەیش گوێی بۆ بگرن.

پێنجەم: فەرموودەی ئاشکراتر(الاظهر) ئەوەیە بەمـەرج گیراوە روکنـەکان ناوبڕەیان نەکەوێت، بەبێ دەنگی زۆر.

شەشەم: ئەوەیە خـەتیب پـاك بێت لـەبێ دەستنوێژیو پیسـیو ، دەبێ عـەورەتی داپۆشراو بێت لەکاتی خوتبـەدا نـەوەوی دەفەرموێت: (اصح) ئەوەیـە تـەرتیب لـەنێوان روکنـەکاندا بەمـەرج نەگیراوە کە وابوو دروسـتە صەڵەوات دان پێش حەمدوسەنا بکـەوێ، یان دوعـا پێش ئایەتەکەو پێش ئامۆژگاری بەتەقوا بکەوێ، تەنها گرنگ ئەوەیە ئەم پێنج روکنە ئەنجام بدرێن[2].

حەوتەم/ بەمەرج گیراوە وتاربێژ پیاو بێتو پێش نوێژیی دروست بێت.

هەشتەم: دەبێ خوتبەکە لەشوێنێکدا بێت کەدروست بێت نوێژی جومعەی تێدا بکرێت.

نۆیەم: دەبێ وتاربێژی زانا بڕوای وەها بێت ئەوەی روکنە لەوتاردا فەرزە، وە ئەوەی سوننەتە فەرزنیە و دەگونجێ نەبێ. وە ئەگەر وتاربێژەکە نەخوێندەوار بوو پێویستە ئەوەندە بزانێ فەرزو سوننەت جیاوازنو فەرز بەسوونەت نەزانێ)[3].

ئەوەیشمان لەیادبێت ئەم پایەو مەرجانەی من لێرەدا نووسیومن راڕەوی پێشەوا شـافیعیـیە ـ رحمه الله ـ چونکە پایەو مەرجەکان جیاوازی زۆریان تیایە لەنێو چوارمەزهەبەکەدا.

بۆ نموونە: لای پێشەوا ابو حنیفه مەرجەکانی وتاری هەیـنی ئەمانـەن: دەبێ وتـار پێش نوێـژ بێت، بەنیازی وتاربێت، لـەکاتی نێوەڕۆدا بێت، بـەلای کەمـەوە یـەك کـەس لەوانـەی جومعـەیان پێدروستە گوێی لێبێت، پابەندەیش بێت، یان نەخۆش ، یـان سـەفەری بێـت، هـەروەها دەبێ

---

[1] تحفة المحتاج / ٤٥/٢، حاشية الشيخ سليمان الجمل على شرح المنهج: ٢٧/٢.

[2] مغني المحتاج ٢٨٨/١.

[3] الفقه الاسلامي وادلته : ١٣٠٧/٢ ، ١٣٠٨.

شتێکی بێگانەو درێژخایەن نەکەوێتە نێوان وتارو نوێژەوە ، وەك: نان خواردن، یان ئەسە زۆرکردن، یان خۆشۆردن.

لای حەنەفییەکان دروستە وتاری هەینی تەنها( سبحان الله) یەك، یان(الحمد لله) یەك بێت، هەروەها دروستە وتار بەغەیری زمانی عەرەبی بێت، بالەبەر پێویستیش نەبێ، یان با خەڵکەکەیش عەرەب بن و وتارەکە زمانێکی تر بێت[1].بەلاَم لەبەرئەوەی کوردەواری زۆربەی چاودێری مەزهەبی شافیعی دەکەن ، هەق وایە وتاربێژەکانیش لەومەزهەبە نەترازێن، مەگەر لەکاتی پێویستیو بەرژەوەندی موسوڵمانانندا.

## سوننەتەکانی خوتبەی هەینی :

سوننەتەکانی خوتبە لەسەر دوانگە(منبر) یان شوێنێکی بەرزبێت و وتاربێژ لەکاتی نوێژدا بکاتە مزگەوت و راستەوخۆ سەربکەوێت بۆسەر دوانگەو نوێژی(تحیة المسجد) سوننەت نییە بۆی چونکە نەبینراوە پێغەمبەر(ﷺ) ئەو نوێژەی کردبێ لەوکاتەدا[2]. هەرکات وتاربێژ گەیشتە سەر دوانگە رووبکاتە خەڵکەکەو سەلامیان لێبکات و پاشان دابنیشێ تا بانگ وێژ بانگ دەفەرموێ، دوای دانیشتن وتاربێژ لەسەر دوانگە، کەتەنها ئەم بانگەیش سوننەتە، بوخاری لە سائیبی کوری یەزیدەوە دەگێڕێتەوە کەفەرموویەتی، ( بانگ دانی رۆژی جومعە لەسەرتاوە تەنها ئەو کاتەبوو کە ئیمام لەسەر دوانگە دادەنیشت لەسەردەمی پێغەمبەردا(ﷺ) وەلەسەردەمی ئەبوبەکرو عومەریشدا، لەکاتێکدا عوسمان بوو بەخەلیفەو خەڵکەکە زۆر بوون، بانگی سێیەمی [3] زیادکرد لەسەر زەوراء،[4]، وەپێغەمبەر(ﷺ) تەنهایەك بانگ وێژی هەبوو) .

سوننەتە وتاربێژ لەکاتی وەستاندا قورسایی دەستی بخاتە سەرە شمشێرێك یان عەسایەك یان شتێك لەو وێنە، لانەکاتەوە بەلای راست و چەپدا، بەڵکو بەملکەچی بوەستێ و خۆی رانەوەشێنێ، هەروەها سوننەتە دانیشتنی نێوان دوو وتارەکەی بەئەندازەی سوورەتی(الاخلاص) بێت، هەروەها سوننەتە وتاربێژ دەنگ بەرزەکاتەوە وەك لە فەرمودەکەی جابیرەوە وەردەگیرێ( علا صوته واشتدّ غضبه)سوننەت وایە خوتبەکان کورت و پڕماناو دارێژراوبن بەشێوەیەکی رەوانبێژی جوان ، خوتبەی دووەم لەیەکەم کەمتر بێت، چونکە پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێ: ( ان طول صلاة الرجل وقصر خطبته مئنة فقهه، فاطیلوا الصلاة وقصّروا الخطبة) رواه مسلم[5] .

---

[1] هەمان سەرچاوەی پێشوو: ٤ ١٣٠ .

[2] المجموع: ٤ /٥٢٩.

[3] بۆیە دەڵێ: بانگی سێیەم چونکە قامەتیش بەبانگێك دانراوە (الفقه الاسلامی وادلته ٢ /١٣١٣.

[4] الفقه الاسلامي وادلته ، زوراء: ناوی شوێنێکە لەبازاڕی مەدینەدابووە. ١٣١٤/٢.

[5] الفقه الاسلامي وادلته: ١٣١٤/٢.

واتـە: درێـژی نوێـژی پیـاوو کورتـی وتارەکـەی نیشـانەی شـارەزایی‌یەتی لـە(فیقـە)دا نوێـژ درێژکەن‌و خوتبـە کـورت کـەن) خوایـاربێت ئـەم خاڵـە زیـاتر روون دەکەینـەوە لـەئادابی وتـاردا سوننەتە وتـاربێژ کۆتـایی وتـاری دووەم بڵـێ بەو تـەی: (استغفر الله لي ولكم ) پاشـان دابـەزێت بەرەو میحراب.

سوننەتە ئامادەبووان گـوێ بگـرن لەخوتبـەکان، فـەرموودەی نوێـی شـافیعی لەسـەر ئەوەیـە قسـەکردن لـەکاتی وتـاردا حـەرام نیـە بەبەڵگـەی ئـەو فـەرموودەی لەصـەحیحی بوخـاری‌و موسـلیمداهاتووە لەئەنەسـەوە دەگێڕنـەوە: ( لـەکاتێکدا پێغەمبـەر(ﷺ) وتـاری دەخوێنـد رۆژی جومعە پیاوێکی دەشتەکی هەستاو وتی: (يارسول الله هلك المال وجاع العيال فادع الله لنا فرفع يديه ودعا)واتە: ئەی پێغەمبەری خوا ماڵمان لەناوچوو، مناڵەکانمان برسیان بوو نزامان بۆبکە ئەویش دوو دەستەی هەڵبڕی و پاڕایەوە.

دەڵێن: ئەگەر قسەکردن حەرام بوایە دەبوو پێغەبمەر(ﷺ) ئەوپیاوەی ئاگاداربکردایە( چونکە دروست نیە فێرکردن دوابخرێت لەکاتی پێویستی) ئەم رایە عوروەی کوڕی زوبەیرو، سەعیدی کوری جوبەیرو، شەعبی‌و نەخەعی‌و ثەوری پاڵپشتی دەکەن.

بەلأم پێشەوایان : مالیك‌و ئەبو حەنیفەو ئەحمەدو ئەوزاعی دەفەرموون: حەرامـە قسـەکردن لەکاتی وتاردا، چونکە خوا دەفەرموێ: ﴿ وإذا قرئ القران فاستمعوا له وانصتوا ﴾واتە: هەرکات قورئان خوێنرا گوێی بۆبگرن‌و بێدەنگ بن ، زانایانی تەفسیر دەفەرموون: ئەم ئایەتە دەربارەی وتاری جومعە هاتووە.

هەروەها پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێ: ( اذاقلت لصاحبك يوم الجمعة أنصت ، والامام يخطب فقد لغوت ) رواه البخاري ومسلم.

واتە: ئەگەر بەهاورێکەت وت: بێدەنگ بە لەرۆژی جومعە لەکاتێکدا پێش نوێژ وتاری دەخوێند ، ئەوە فرەبێژیت کردووە[1].

کاتێ لەبەڵگەی هەردوو لا ورد دەبینەوە دەردەکەوێ بەڵگەی تاقمی دووەم زیاتر لەگەڵ گرنگـی وتاری رۆژی هەینیدا دەگونجێ چونکە وتاری هەینی بۆ سوودی گشتی‌یەو سوودیش وەرناگیرێ ئەگەر هەرکەس بۆ خۆی بدوێ‌و ببێتە گەڕەلاوێژە لەکاتی وتـاردا، بێگومـان ئەگـەر قەسـەکردن حەرام نەبێ هەموو کەس بۆی دەبێ قسە بکات، وتاربێژیش ناتوانێ رێیان لێ بگرێت چونکە شتی حەلاڵ حەرام ناکرێت.

ئەو فەرموودەیەش تاقمی یەکەم کردوویانـە بەبەڵگـە بـەهیچ شـێوەیەك ئـەوەی لێوەرناگـیرێ قسەکردن حەرام نەبێت چونکە کابرای دەشتەکی لەگەڵ راست‌و چەپی خۆی قسەی نەکرد، بەڵکو

---

[1] مغني المحتاج ٢٨٧/١ ،وتحفة المحتاج مع حاشية العبادي :٤٥٤/٢.

ـوی كـرده پێغەمبـەر(ﷺ) داوای پاڕانـەوەی كـرد، پێغەمبـەریش بـۆی پاڕایـەوە بێئـەوەی هیـچ كارێكی سەلبی بكاتـە سـەر وتارەكە، بەڵكو بەپێزتری كرد، وە ئەمە زۆرجیایـە لـەوەی هەركـەس ـەگەڵ راسـتو چەپی خۆیدا قسە بكات كەبەروونی ریوایەتەكـەی بوخـاری و موسـلیم بەڵگەیـە ـەسـەر حەرام بوونـی، ئـەوەی زیـاتر دڵخۆشمان بكات بەبەهێزی رای دووەم ئەوەیە: كە زۆربـەی زانـاو سـەرمەزهەبەناودارەكان پاڵپشـتی دەكـەن تەنانـەت پێشـەوا شـافیعی خـودی خۆیشـی ـەبۆچوونی كۆنیـدا(المذهـب القديـم) هـەمان بۆچوونـی هەیـە: لـەبۆچوونی نوێشـدا قسـەكردن بەلایەوە بێزراو(مكرو)ە.

فەرموودەیـەكی تریـش كـەزۆر بـەروونی دەری دەخـات قسـەكردن حەرامـە بەسـەرهاتەكەی ابوالـدرداء)ە كەدەفـەرموێ: (چوومـە مزگـەوت رۆژی جومعـە پێغەمبـەر(ﷺ) وتـاری دەخوێنـدەوە سوورەتی(براءة)ی خوێندو وتم بە ئوبەیی كوری كـەعب : كـەی ئـەم سـوورتە دابەزیووە؟ وەڵامـی نەدامـەوە، كـاتێ لـەنوێژ بووینـەوە پێـم وت: پرسـیارم لێكـردی وەڵامـت نەدامـەوە، فـەرمووی: لەنوێژەكەت هیچ پاداشتت دەست نەكەوت مەگەر تەنها ئەوفرە بێژییە نەبێ، منیش چووم ئەمـەم بۆ پێغەمبەر(ﷺ) گێڕایـەوە فـەرمووی: ئوبەی راستی كردووە هـەركاتێ بیستت پێش نوێژەكـەت قسەدەكات بێدەنگ بە هەتا ئەو لێدەبێتەوە) رواه احمد والطبراني[1].

لە(مجمـوع)دا هـاتووە: ئـەم فەرموودەیـە صەحیحـە ، بەیهـەقی دەفـەرموێ ئیسـنادەكەی صەحیحە[2].

ئەوەیشـمان لـەیاد نـەچێت قسـەكردن حـەرام بێـت یـان مـەكروە لەهـەندێ حاڵـەتدا دەگـەڕێ بەواجب: وەك ئەوەی كوێرێك خەریكە دەكەوێتە بیرێك، یان منداڵێك لەوانەیە بسوتێت یان تووشی خەتـەرێك بێـت ئەگـەر دەوربـەر ئاگـادار نـەكرێت، یـان دوپشـكێك بـەرەو رووی كەسـێك دەچێـت لەوێنەی ئەم كاتانەدا ئاگاداركردن واجبە، ئەگەر گونجا بەئامارژەو نەیش گونجا بەقسە[3] .

كـاتێك وتـاربێژ لەوتارەكـەی بوویـەوە بـانگ وێـژ لەشـوێنی خۆیـەوە دەس بكـات بەقامـەت، وتاربێژیش هەوڵ بدات لەكاتی تەواوبوونی قامەتدا بگاتە میحراب، سوننەتە لەركاتی یەكەمدا دوای(فاتحە) سوورەتی جومعە، وە لـەدووەمدا سـوورەتی(المنافقون) بەدەنگی بەرز بخوێنـی. وە لەهەندێكاتدا سوورەتی(الاعلی)لەیەكەمداو (الغاشية) لەدووەمدا بخوێنی.

---

[1] فقه السنة، سيد سابق، ١/٣١٣ ، ٣١٤.

[2] المجموع :٤/٥٢٥.

[3] مغني المحتاج : ١/٢٨٧.

## دووەم/ خوتبەی جەژنەکان:

نوێژی جەژنی رەمەزانو جەژنی قوربان سوننەتێکی گەورەیە هەندێك دەڵێن: فەرزی کیفایەیە، سوننەتە گەورەو بچووك، پیاوو ئافرەت بەشداری بکەن، کاتەکەیشی لەنێوان خۆرکەوتن هەتا نوێژی نیوە رۆیە، باش وایە کاتێك بکرێت خۆر بەئەندازەی رمێك بەرزبووبێتەوە نوێژی جەژنەکان دوورکاتە لەرکاتی یەکەمدا پێش فاتیحە(٧)جار (الله اکبر) بکات لەرکاتی دووەمدا پێنج جار، لەنێوان هەموو(الله اکبر) ێکدا بەئەندازەی ئایەتێکی مامناوەندی بوەستێ، چاك وایە لەو وەستانەدا (سبحان الله والحمد لله ولا اله الا الله والله اکبر) بخوێنێ. ئەگەر کەسێ(الله اکبر)ەکانی لەیادچوو دەستی کرد بەخوێندنی فاتیحە ئەوە لەدەستی چووە بۆی نەگەرێتەوە، نوێژەکەیشی دروستە، لەرکاتی یەکەمدا دوای فاتیحە سوورەتی(ق) لەدووەمدا(القمر) بخوێنێ.

ئەوەی ئێمە مەبەستمان بێت زیاتر باسی لێ بکەین وتاری جەژنەکانە، کەدوای نوێژ دەخوێنرێتەوە وە ئەگەر نەخوێنرایەوە نوێژەکە دروستە.

پایەکانی ئەم خوتبەیەش هەروەك خوتبەی جومعەوەهایە، بەلاّم لەمەرجەکاندا هەندێجیاوازیان هەیە، بۆ نموونە: مەرج نیە چل کەس ئامادەبێت یان لەناو مزگەوتو ئاوەدانیدا بێت، وە سەرەتاکەی بە(الله اکبر) دەست پێ دەکات (٩) جار لەخوتبەی یەکەمدا(٧)جار لەدووەمدا یەك لەدوای یەك.

لەخوتبەی جەژنی رەمەزاندا باسی سەرفیترەیان بۆ بکات چی دەرئەکرێ بەکێ دەدرێ؟ وەلەجەژنی قورباندا هەڵیان بنێ لەسەر قوربانی فێری شێوازو ئادابی ئەو سوننەتە گەورەیان بکات[1].

باسکردنی قوربانی بەماڵو بەگیانو، هەڵنانی موسوڵمانان لەسەر لێبران بۆ خواو دانانی هەموو نرخێکی سەنگین لەپێناو رەزامەندی خوداداو، باسکردنی چیرۆکەکەی حەزرەتی ئیبراهیمو اسماعیل، تەفسیرکردنی ئەو ئایەتانەی لەوبارەوە هاتوون بەشێوەیەکی شیرینو هاوچەرخانەو نزیك لەفامو هۆشی خەڵکەکەو، شێلاندنی ئەو چیرۆکە قورئانییە لەگەڵ چەمکەکانی جیهاددا؛ گەورەترین دەور ئەبینێ بۆ هەڵنانی موسوڵمانانو نوێ بوونەوەی وزەو شەوقی دەروونیان بێگومان ئەمەیش بەندە بەلێهاتوویی و دڵسۆزی وتاربێژەوە لەهەموو کاتو شوێنێکدا.

## سێیەم/ خوتبەی نوێژی رۆژگیرانو مانگ گیران

پێشەکی پێویستە بزانین ئەم نوێژە سوننەتێکی گەورەیە بۆ هەموو کەسێ کەداوای نوێژی فەرزی لێبکرێت، پێغەمبەر(ﷺ) هەردوو نوێژەکەی کردووە.

---

(1) مغني المحتاج :١/ ٣١٠ . ٣١٢.

شێوازەکەی بەم جۆرەیە نیەتی نوێژی ڕۆژگیران یان مانگ گیران دێنێ دوای خوێندنی فاتیحەو هەندێ قورئان دەچێتە رکوع، ئەمجا هەڵدەستێتەوە دیسانەوە فاتیحەو هەندێ قورئان کەمتر لەرکاتی یەکەم دەخوێنێ‌و دەچێتەوە رکوع، ئەمجا بەرزدەبێتەوە دەڵێ( سمع الله لمن حمده) ئەمجا دەچێتە سەجدەو دووسەجدە دەبات، ئەمە هەمووی ڕکاتی یەکەمە، ئەمجا هەڵدەسی رکاتی دووەمیش بەهەمان شێوە تەواو دەکات ئەمجا (تحیات) دەخوێنێ‌و سەلام دەداتەوە.

دروست نییە رکوعێك زیادکەیت لەبەرئەوەی خۆر هەڵنەهاتووە، یان کەمی بکەیتەوە ئەگەر خۆر هەڵهاتبوو.

خوێندنی سوورەت دوای فاتیحە واجب نییە، وە ئەگەر سوورەتێکی کورتیش وەك ﴿قل هو الله احد﴾بخوێنرێ دەگونجێ، بەڵام شێوەی تەواوی ئەم نوێژە ئەوەیە لەوەستانی یەکەمدا دوای فاتیحە سوورەتی(البقرة)بخوێنی، لەوەستانی دوەمدا بەئەندازەی دووصەد ئایەت لەو سوورەتە، لەوەستانی سێیەمدا بەئەندازەی صەدو پەنجا ئایەت، لەوەستانی چوارەمدا بەئەندازەی صەد ئایەت، ڕکوعەکانیش درێژ دەکرێنەوە یەکەمیان بەئەندازەی صەد ئایەت، دووەمیان هەشتا، سێیەمیان حەفتا، چوارەمیان پەنجا ، ئەوەوی دەفەرموێ: فەرموودەی راست ئەوەیە سەجدەکانیش بەهەمان شێوە درێژدەکرێنەوە وەك لەبوخاری‌و موسلیمدا هاتووە، وە ئەم درێژەپێدانانە پێویستیان بەرەزامەندی نوێژ خوێنەکانی دوای ئیمام نیە[1].

دوای ئەم نوێژە وتار دەخوێنرێتەوە بەهەمان شێوەی وتاری هەینی لەروکنەکانیدا، بەڵام خەڵکەکە هەڵنێ لەسەر تەوبەو پەشیمان بوونەوەو چاکەکردن‌و گەردن ئازادی‌و ...هتد چونکە رۆژگیران‌و مانگ گیران دوو دیاردەی گۆڕانی یاساکانی بوونەوەرن یادی مرۆڤ دەخەنەوە بەتێکچوونی یەکجاری‌و سەرانسەری رۆژی قیامەت‌و، بێ‌دەسەڵاتی‌و زەبوونی ئادەمیزاد دەردەخات لەبەردەم پەروەردگاری ئاسمان‌و زەمینداو، بەشێوەیەکی روون‌و ئاشکرا بۆیان دەردەکەوێ کەخوای گەورە دەتوانێ رۆژی رووناکیان لێ‌بکات بەشەوی تاریك، بۆیە پێویستە ئەم کاتە ناوازەیە لەدەست نەدرێ‌و جۆرە پەرستشێکی تایبەتی تیابکرێت بۆ خوای ئاسمان‌و زەمین، وە ئەو پەرستشە لەوکاتەدا جۆرە تام‌و چێژێکی تایبەتی هەیە کەئەگەر لەدەست چوو رەنگە بەهەموو تەمەن جارێکی دی دەست نەکەوێتەوە بۆیە ئەم نوێژە سوننەتە بەکۆمەڵ بکرێت‌و وتاری لەدوابێت تاموسوڵمانان بێداربکرێنەوەو ئەو تام‌و چێژە وەرگرن.

ئێمە لەژیانی خۆماندا ئەم رووداوەمان دی کە رۆژی(١٩٩٩/٨/١١) خۆر لەسەر ئاسمانی سلێمانی‌و زۆربەی ناوچەکانی کوردستان‌و هەندێ ناوچەی تری جیهان گیرا لەکاتژمێر یەکی پاش نیوەڕۆ بەدواوە، وە پێشتر کەناڵەکانی راگەیاندن خەڵکیان ئاگادار کردبوو، لەزۆر شوێنی

[1] مغني المحتاج : ٣١٦/١.

جیهانی ئیسلامی نوێژی خۆرگیران کرا، ئێمەیش لەمزگەوتی(بێخود) لەسلێمانی ئەو نوێژەمان کرد خەڵکەکە بەژمارەیەکی زۆر هەروەك ڕۆژی هەینی بەشداریان کرد، ئێمە لەنوێژدا بووین جیهان بەجارێ تاریك بوو وەك شەوە زەنگ، نزیکەی دووخولەك ئالەوکاتەدا کڵپەی گریان بەرزبوویەوە سۆزو دڵنەرمی‌یەکی تایبەتی بەخشی بەوخەڵکە کەئامادەبوون لەوانەیە لەدەیان وانەو وتار ئەوەندە سوودیان وەرنەگرتبێ دیسانەوە شەوی ١٥/شوال /١٤٢١ ك - ٩/١٠ - ١ - ٢٠٠١ مانگ گیرا لەسەر ئاسمانی سلێمانی لەمزگەوتی بێخود (مامۆستا شێخ حسین شێخ حسن) نوێژی مانگ گیرانی کرد بۆ خەڵکەکەو وتاری بۆ خوێندنەوە مزگەوتەکە پڕبووبوو، جێگای داخە خەڵکێکی زۆر نەفامانە دەستیان دایە تەقەکردن و تەقەیەکی زۆرکرا!.

## چوارەم/ خوتبەی نوێژەبارانە:

نوێژەبارانە بەمانا داواکردنی باران و پاڕانەوە لەخوا بۆ ئەم مەبەستە، جا ئەم داوایەش سێ جۆری هەیە:

جۆری یەکەم: تەنها پاڕانەوەیە ئایا تاك تاك بێت یان بەکۆمەڵ وەلەهەرکاتێکدا بێت، وەئەمە خوارترین جۆریانە.

جۆری دووەم: پاڕانەوەی دوای نوێژ فەرزەکان و کاتی خوتبەی جومعەو کاتە پیرۆزەکانە، ئەمەیش جۆری مامناوەندی‌یە.

جۆری سێیەم: ئەوەیە نوێژو خوتبەی بۆ بخوێنرێ و دوعای بەکۆمەڵی لەکاتی خوتبەدا بۆ بکرێت، وە ئەم نوێژو خوتبەیە گەورەترین جۆریانە لەکاتی پێویست دا، دووبارەو سێ بارەو زیاتریش دەکرێتەوە، ئەگەر باران نەباری ، وەئەگەر ئامادەبوون بۆ نوێژکردن، پێش نوێژەکە باران باری کۆدەبنەوە بۆ سوپاس گوزاری خواو، پاڕانەوە بۆ بەردەوام بوونی نیعمەتی[1] .

نوێژەبارانە دووركاتە هەروەك نوێژی جەژنەکان بەڵام تایبەت نیە بەکاتی نوێژی جەژنەوە لەهەرکاتدا بکرێت دروستە، سوننەتە نوێژە بارانێ لەدەرەوەی ئاوەدانی بکرێت لەشوێنی نوێژی جەژنەکاندا، وە خەڵك بەگشتی دەربچن لەگەڵ ئیمامدا بەملکەچی و زەبوونی بەدەم پاڕانەوە بەجلی ئیش وکارەوەو پێشتر تەوبەبکەن و پەشیمان ببنەوەو هەقی یەکتر بدەنەوەو گەردن ئازادی بکەن و سێ ڕۆژ ڕۆژو بگرن و ڕۆژی چوارەم بەزمانی بەڕۆژو بچنەدەر منداڵ و پیرو ئاژەڵیش لەگەڵ خۆیان دەرکەن بەڵکو بەزەیی خوا بجوڵێ بۆیان[2] .

---

[1] مغني المحتاج : ٣٤١/١.

[2] هەمان سەرچاوەی پێشوو: ٣٢٢،٣٢٣.

خوتبەی نوێژەبارانێ هەروەك خوتبەی جەژن وایە بەلآم لەجێگای(الله اكبر) (استغفر الله) دەكات (٩) جار لەپێش خوتبەی یەكەمدا(٧) جار لەپێش خوتبەی دووەمدا.

لەخوتبەی یەكەمدا ئەم دوعایە دەخوێنێ:

(اللهم اسقنا غيثاً مغيثاً هنيئاً مريئاً مريعاً سحاً عاماً غدقاً طبقاً مجللاً دائماً اللهم اسقنا الغيث ولاتجعلنا من القانطين، اللهم انا نستغفرك انك كنت غفاراً فارسل السماء علينا مدراراً)[1].

وتاربێژ دوای دەست پێكردنی خوتبەی دووەمو خوێندنی سەرەتاكەی روبكاتە قیبلەو زۆر بپارێتەوە بەئاشكراو بەنهێنی وەلەوكاتەدا عەباكەی سەرشانی ئاڵوگۆڕ پێبكات( سەروخوارو راستوچەپ) خەڵكەكەیش هەروەك ئەوبكەنو ئامین بكەن بۆ پارانەوەكانی ، بەهیوای قوبوڵ بوونو ئاڵو گۆڕی باری ناهەمواری ژیانیان.

باشتر وایە خوتبەی نوێژەبارانە دوای نوێژەكە بێت، بەلآم ئەگەر پێشخرا دروستە وەك لە(سنن)ی ئەبوداودا هاتووە كە پێغەمبەر(ﷺ) وتاری خوێند ئەمجا نوێژی كرد، بەلآم باشتروایە نوێژ لەپێشدا بێت چونكە زۆربەی جار پێغەمبەر(ﷺ) نوێژی پێش خستووە[2].

لەساڵەكانی كۆتایی نەوەدەكاندا كەم بارانیو باران بڕان كوردستانو زۆربەی جیهانی داگرت زۆرجار نوێژە بارانەمان كردو پاڕاینەوەو هەندێجار خوای گەورە هات بەهانامانەوە، بۆیە دەمەوێ ئەم دوعا بارانە كەلەرۆژی ١١/١٢/١٩٩٨ - ٢٢/ شعبان/١٤١٩ لەمزگەوتی خەبات(چاڵەكە) لەرۆژی هەینیدا خوێندومەتەوەتۆماری بكەم:

( يا الله يارحمان يارحيم انت قلت وقولك الحق : ﴿ وان من شيء الا عندنا خزائنه وما ننزله الا بقدر معلوم ﴾ الحجر:٢١ خوایە گەنجینەكانی دنیاو قیامەت هەرچی خێروخۆشی هەردوولا هەیە هەمووی بەدەست تۆیە تۆی بالآدەس تۆی فریاد رەس فریای ئەم ئوممەتە بێ هیممەتەبكەوەو دەرووی رەحمەتی لێبكەرەوەو بارانی رەحمەتی بەسەردا ببارێنە!

يا ملك ياقدوس ياسلام ! خۆت دەفەرمووی: ﴿ وهو الذي ينزل الغيث من بعد ماقنطوا وينشر رحمته وهو الولي الحميد ﴾ الشورى: ٢٨ پەروەردەگارێكی وەهایە بارانی رەحمەت دەبارێنی دوای ئەوەی خەڵكەكە مەئیوس بوونو ڕەحمەتی خۆی پەخش دەكات، هەرخۆیشی سەرپەرشتیارێكی سوپاس كراوە ( يامؤمن يامهيمن ياعزيز ! ! خۆت دەفەرموی: ﴿ قل ياعبادي الذين اسرفوا على انفسهم لاتقنطوا من رحمة الله ... ﴾ الزمر: ٥٣ ئەی ئەوبەندانەی من كەلەسنوور دەرچوونو ستەمیان لەنەفسی خۆیان كردووە مەئیوس مەبن لەبەزەیی خودا.

---

[1] المنهاج للنووي، باب صلاة الاستسقاء.

[2] مغني المحتاج :٣٢٥/١.

وائێمەش بەکۆڵێ تاوان و گوناهمانەوە هاتووینە بەرقاپی یەکەی تۆو شکاتی لاوازیمان لەدەست نەفسی ئەممارەو شەیتانی لەعین هەرلای تۆدەکەین، گەر تۆ فریامان نەکەویت و لێمان نەبووریت خەسارۆمەندی هەردوودنیا دەبین خوا بێیتە هاوارمان و نزامان وەرگرێت!

ئەگەر پاشای زەمان نوێژەبارانەی نەکرد خەڵك خۆیان بیکەن وەك هەموو سوننەتێکی تر کەپێویستی بەرێپێدانی پاشانیە، وەلەبەرئەوەی ئەوانیش زیاتر لەپێشەوای وڵات پێویستیان بەباران هەیە، بەڵام لەم حاڵەتەدا دەرنەچن بۆبیابان ولەناو مزگەوتەکاندا نوێژەکە بکەن ئەگەر پاشا رێگای نەدان، نەکو ببێ بەهۆی ئاشووب، (اذرعی)ئەم ئاگاداری یەی تۆمارکردووە[1].

سوننەتە خۆدەرخستن بۆ بارانی سەرەتا(جگە لەعەورەت) بۆئەوەی لاشە ئەوبارانەی بەر کەوێت وەك موسلیم ریوایەتی کردووە: پێغەمبەر(ﷺ) جلەکانی هەڵکرد هەتا باران لێی بداو فەرمووی: ئەم بارانە تازە لای خواوە هاتووە).

واتە تازە دابەزیوە، بەڵکو سوننەتە بۆ هەموو بارانێك ئەم خۆ دەرخستنە بەڵام بۆ سەر پەڵە زیاتر.

دیارە مەبەستیش ئەوەنیە خۆمان تەربکەین و خۆمان سەرما بکەین، بەڵکو مەبەست ئەوە یە کەمێك لەوبارانە بەرگیانمان بکەوێت چونکە پیرۆزە .

سوننەتە لەکاتی باراندا بڵێ: ( اللهم صيّباً نافعاً) واتە: خوایە بارانێکی بەسوودبێت ودوای بارانەکە بڵێ: ( مطرنا بفضل الله ورحمته) واتە بارانمان بۆباری بەگەورەیی و بەزەیی خوا ئەگەر خەڵك زیانیان پێ گەیشت بەهۆی زۆری بارانەوە سوننەتە بڵێن: (اللهم حوالينا ولاعلينا) خوایە بیبارێنە بەچوار دەورماندا نەك بەسەر خۆماندا[2].

## وتەیەکی گرنگ دەربارەی نوێژە بارانەو هەندێ پەرستش :

هەروەك لەنوێژی خۆرگیران و مانگ گیراندا ئاماژەمان پێکرد لێرەشدا دووپاتی ئەوە دەکەینەوە ئەم جۆرە نوێژو پەرستشانە کەکاتێکی بۆ دیاری کراوە دەبێ تەنها بەنیازی بەندایەتی و ملکەچی بۆ خوا بکرێت بەومانا نیازی دنیایی هەڵنەر نەبێت بۆ ئەوکارە ئەگینا دڵسۆزی بۆ خوا تیانامێنێ، خوایش کاتێ پەرستشەکانمان وەردەگرێت کەتەنها نیازمان تیایدا رەزامەندی ئەوبێت.

کەوابوو نوێژەبارانە کەلەکاتی نەمان و کەمبوونی باراندا دەکرێت، بەندایەتیەکە تایبەت بەوکاتەوە، هەروەك چۆن نوێژی مەغریب لەکاتی ون بوونی خۆرداو نوێژی بەیانی لەکاتی بەیاندا دەکرێت.

---

[1] مغني المحتاج : ٣٢٥/١.

[2] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

بەم شێوە نوێژە بارانە دەربڕینی ملکەچی و زەبوونیە بەرانبەر بەپەروەردگار، دان پیانانی بەندایەتی و بێدەسەلاتی بەندەیە لەبەردەم ئاستانەی خوای گەورەدا، وەبەرهەمی ئەم بەندایەتی‌یەش دەبێ لەپاشە ڕۆژدا چاوەڕوانی بین، لەبەرئەوە ئەگەر بارانیش نەباری مانای وانیە پارانەوەو نوێژەکانمان وەرنەگیراوە، بەڵکو مانای وایە کاتی ئەونوێژو پاڕانەوەیە بەسەر نەچووەو بێبارانیش ماوەی ماوە ﴿وكل شيء عنده بمقدار﴾هەموو شتێك لای خوا ئەندازەی هەیە.

هەر بەم جۆرە پێویستە تێبگەین لەهەموو پاڕانەو پەرستشێکی تریش کەپەیوەندبێت بەکاتێك یان ڕووداوێکی دیاریکراوەوە وەك ئەو دوعایانەکە دەکرێن بۆ فراوانی ڕزق و ڕۆزی، یان نوێژی(استخاره) یان دوعای شیفا بۆنەخۆش و...هتد

بەم شێوە مرۆڤی موسوڵمان تام و چێژی بەندایەتی دەچێژێ و کارو باری ئەوباڵی خوا دەکاتەوەو ، لەهەمووکارو بارێکیدا خۆی دەسپێرێ بەپەروەردگارو پشتی پێدەبەستێ و کارەکانی خوای هەموو بەجوانی دێتە پێش چاو خۆشیی بێت یان ناخۆشی[1].

## پێنجەم/ وتارەکانی حەج

پێشتر باسمانکرد وتارەکانی حەج چوارن:

### یەکەم/ ڕۆژی حەوتەمی ذي الحجة (يوم الزينة):

سوننەتە لەوڕۆژەدا پیشەوای موسوڵمانان یان جێگرەکەی لەمەککەدا وتارێك بدات بۆحاجی یەکان دوای نوێژی نیوەڕۆ، ئەگەر ڕۆژی هەینی بوو دوای نوێژی هەینی، ئەم وتارە جیایە لەوتاری هەینی، چونکە دەکەوێتە دوای نوێژ، وە مەبەست تیایدا فێرکردنی ئەحکام و هەڵسوکەوتی حەجە واتە: فێریان دەکات: بەیانی زوو بڕۆن بەرەومینا هەرچی واجب و پێویستی‌یەك وا لەپێشیانەوە ئاگاداریان بکات وەك(ابن عمر) ڕەزای خوایان لەسەربێت دەفەرموێ: ( پێغەمبەر(ﷺ) ڕۆژێك بەر لە(ترويه) وتاری دەفەرموو ئاگاداری دەکردن لەکارە پێویستەکانی حەج، بەیهەقی ریوایەتی کردوە، بەسەنەدێکی چاك).

دیارە ئەو ڕۆژە ڕۆژی حەوتەمە چونکە (ترويه) ڕۆژی هەشتەمە، حاجی‌یەکان لەوڕۆژەدا ئاویان هەڵگرتووە بۆیە ئەوناوەی وەرگرتووە[2].

### دووەم/ وتاری ڕۆژی عەرەفە:

دوو وتارە ڕۆژی نۆهەمی ذالحجة دوای لادانی خۆر لەناوەڕاستی ئاسمان دەخوێنرێتەوە دوای ئەوە نوێژی نیوەڕۆو عەسر بە(کۆ) دەکەن لەخاکی عەرەفاتدا[3].

---

[1] سوود وەرگیراوە لە (محاضرات في اصول الخطابة) ، فاروق رسول يحيى : ٢٣.

[2] مغني المحتاج : ٤٩٥/١.

لەم وتارانەدا ئیمام باسی واجبەکانی حەج و گەورەیی عەرەفەو دوعاکردن لەو شوێنە پیرۆزەداو ئەو دەرسانەی وەردەگیرێن لەو وەستانە لەکێوی عەرەفات بەجلی سپییەوە بکات، چونکە ئەو دیمەنە گەورەترین دیمەنی زیندووە کەیادی قیامەت و زیندووبوونەوەو گۆڕەپانی مەحشەر دێنێتەوە یادی ئەو ملیۆنە ها کەسەی کەلەوشوێنە پیرۆزەدا وەستاون و لەهەموو جیهانی ئیسلامییەوە ڕوویان کردۆتە ئەو شوێنەو، ئەوانەیش کەچاویان لێیە بەگواستنەوەی ڕاستەوخۆی کەناڵەکان.

بەڕاستی ئەگەر وتاربێژی دڵسۆز ڕێگا بدرێ لەوشوێنانەدا قسەبکات و موسوڵمانان هەڵبنێ گەورەترین وانە دەبەخشی بەو جەماوەرەی لەوشوێنەدا گردبوونەتەوە.

**سێیەم/ خوتبەی ڕۆژی دەیەم (یوم النحر) :**

ئەم وتارەش دوای نوێژی نیوەڕۆ دەخوێنرێتەوە ئیمام باسی ئەوەیان بۆ دەکات چۆن بگەڕین لەدەوری کەعبە(الطواف) چۆن بەرد بارانی شەیتانەکان بکەن، وەچۆن قوربانی یەکانیان سەربڕن[1] .

دیارە هەریەك لەم ڕوکنانەی حەجیش چەندین پەندو حیکمەتی تێدایە، بۆ نموونە بەردبارانی شەیتانەکان( رمی الجمرات) مانای وایە ئیتر حاجی دەبێ بەتەواوی دابڕێ لەشەیتانی نەفرین لێکراوو بەگوێی نەکات و دژایەتی لەگەڵدا ئاشکرابکات.

لەدەورگەڕانی ماڵی خوایش(الطواف) مانای حاجی لاشەی خۆی دەکاتە پەروانەو وەك فریشتە دەفڕێ و پەیوەندی دەکات بەجیهانی ئاسمانیەوە ﴿وترى الملائكة حافين من حول العرش يسبحون بحمد ربهم ...الاية﴾ الزمر: ٧٥.

واتە: دەبینی فریشتەکان چوار دەوری عەرشی خوایان گرتووەو تەسبیحاتی خوا دەکەن.

قوربانی سەربڕینیش دووپات کردنەوەی چیرۆکی ئیبراهیم و ئیسماعیله( على نبينا وعليهم الصلاه والسلام) کەچۆن باوك لەجگەرگۆشەی خۆی دەبوری و چەقۆ لەملی کوڕی نازدارو تاقانەی دەنێ؟ چۆن کوڕیش لەبەرخاتری خوا لەبەردەم باوکی دڵسۆزیدا ڕادەکشێ و ملی بۆ چەقۆی خوا ڕادەکێشێ؟[2]

بەم شێوە هەموو پایەکانی تری حەج هەریەکەیان دەتوانین چەندین دەرسی لێهەڵگۆزین وتاربێژی سەرکەوتوویش دەتوانێ لەهەر هەڵوێستێکدا هەندێ لەم دەرسانە بەهەزاران کەس ڕابگەیەنێ.

---

[3] هەمان سەرچاوەی پێشوو /٤٩٦.

[1] مغني المحتاج :٥٠٧/١.

[2] قوراب النجاة ، فتحي يكن ، ١٠٦ ــ ١٠٩ .

## چوارەم/ خوتبەی(یوم النفر) رۆژی سێیەمی جەژن :

لەوڕۆژەدا وتارێك دەخوێنرێتەوە باسیماڵئاوایی‌و سوودەكانی حەج‌و ئامۆژگاری حاجیانی تێدا دەكرێ كەپاش گەڕانەوەیان پەیمان نەشكێنن‌و خۆگربن لەسەر خواپەرستی‌و هەموو كات یادی پەیمانی ماڵی خوابكەنەوە.

هەروەها پێشەوا پێیان رابگەیەنێ كەدروستە دوای بەردبارانی رۆژی دووەم ئیحرام بشكێنن بۆ كەسێك پەلەی بێت، بەڵام ئەگەر لەخاكی (منی) دەرنەچوون بەر لەنوێژی مەغریب ئەوە واجبە ئەوشەوەیش لەخاكی(منی) دا بمێنن‌و رۆژی سێیەمی (ایام التشریق) یش بەردەبارانی هەرسێ جمرە)كە بكەن ئەمجا بڕۆن.

بەڵام جێگای داخە ئەم وتارانە هەندێكیان هەرنەماون، هەندەكەی تریشیان وەك پێویست نەماون !.



# بەشی دووەم
# ئادابی وتارو وتاربێژ و گوێگر

# فەسڵی یەکەم
# ئادابی وتار

پێشتر باسمانکرد پەیوەندیەکی پتەو هەیە لەنێوان وتارو بانگەوازدا ، بەڵکو وتمان وتاربێژیی جۆرێکی گرنگە لەجۆرەکانی بانگەوازی گشتی، بۆیە پێویستە وتارەکان چەند مەرجێکی مەعنەوی لەئامێز بگرن، هەتا زیاتر کاریگەربن و رەنگ بدەنەوەو بچنە ناو ناخ و دەروونی گوێگرانەوە.

من وادەزانم تەنانەت مەرجەفیقهی‌یەکانی وتاریش کەپێشتر باسمان لێوەکرد بەدرێژی . هەر بۆ سوویات کردنەوەی ئەم مەبەستەیە، واتا بۆ زیاتر کاریگەری یە لەدەروونی ئامادەبواندا، هەربۆیە نەبینی هەندێ جیاوازی هەیە لەنێوان زاناکاندا دەربارەی مەرجەفیقهی‌یەکان، بۆ نموونە(الوصیة بالتقوی) کەلای پێشەوا شافیعی مەرجێکە لەمەرجەکانی دروستی وتار، بەلاّم لای حەنەفی‌یەکان بەمەرج نەگیراوە، دیارە مەبەستی پێشەوا شافعی (رحمە اللە) ئەوەیە وتار بریتی‌یە لەئامۆژگاری نابێ تەنها چەند وشەیەکی(ذکر) بێت و بەس، بۆئەوەی شوێنەوار جێ بهێڵێ‌و دەوری هەفتانەی خۆی ببینێ لەناو کۆمەڵگادا.

کەوابوو بەراستی ئەگەر وتاربێژێك هەر ئەوەندە لەمانای ﴿اوصیکم بتقوی اللە﴾ تێگەیشتبێ کەوشەکە بەرووتی بڵێ بێ‌ئەوەی هیچ درێژەیەکی پێبداو خۆی، ماندوو بکات لەروونکردنەوەی ئەو وشە . پرواتایەدا بۆ گوێگران ئەوە لەمانای وتار نەگەیشتووەو مەبەستەکەی پێغەمبەریشی(ﷺ)نەپێکاوە کەروونکردنەوەی رێگایە بۆ خەڵکی، بەپێچەوانەیشەوە ئەگەر وتارێکیش ئەو مەرجەی بەزەقیش تیانەبێ، بەلاّم ناوەرۆکەکەی فەرمان بەچاکەو نەهی لەخراپە بێت و خەڵکی بەرەو خواو بەرەو ترس لەقیامەت دەسکێش بکات ئەوە دروستەو مەبەستەکەی پێغەمبەری(ﷺ) پێکاوە، هەروەها ئەو مەرجەی کەدەفەرموێ: دەبێ چل کەس گوێیان لەخوتبەکە بێت هەر لەبەر ئەم مەبەستەیە واتا بۆ زیاتر کاریگەری وتارەکەیە لەدەروونی ئامادە بواندا بۆئەوەی وتارەکە دەوری خۆی ببینێ بۆیە دەتوانین بەدارشتنی ئەمرۆ بڵێین وتاری هەینی فێرکردنێکی بەزۆر(تعلیم اجباری)ە.

دیارە کاری وتار خوێندنەوەو گفت و گۆ لەگەڵ جەماوەردا کارێکی ئاسان نیە، بەڵکو پێویستی بەئامادەبوونێکی زۆرهەیە، ئەم ئامادەبوونەش بەتەنها خودی مرۆڤەکە نایەتەدی‌و پێویستی بە تەوفیقی خوایی هەیە، بۆیە حەزرەتی موسی کاتێ خوا داوای لێکرد بچێت رووبەرووی فیرعەون ببێتەوەو بانگی بکات بۆلای خوا، ترسا لەوئەرکە گەورەو پارایەوە لەخوا سەرکەوتووی بکات و، هاروونی برایشی بکات بەپاڵپشتی لەم کارە گرنگەدا وەك قورئان بۆمان دەگێرێتەوە.

﴿ رب اشرح لي صدري ، ويسرلي امري، واحلل عقدة من لساني، يفقهوا قولي، واجعل لي وزيراً من اهلي، هارون اخي اشدد به ازري، واشركه في امري ﴾ طه : ٢٥ ــ ٣٢.

واته: ئەی خوایە دڵم گوشادو نورانی بکە، کاری ئەم بانگەوازەم بۆ ئاسان بکە، گرێی سەرزمانم لاببە، با خەڵکی لەگوفتەم حاڵی بن، لەکەس و کاری خۆم یارمەتی دەرێکم بۆ برەخسێنە کەهاروونی برام بێت، پشتمی پێبگرەو بیکەرە هاوبەشم لەکاری پێغەمبەرایەتی و راگەیاندنی فەرمودەکانی تۆدا.

کەوابوو ئامادەبوون بۆ وتار بناغەو بنەڕەتە بۆ سەرکەوتنی وتاربێژ، بەبێ ئەو ئامادەبوونەدەروونی یە لەوانەیە وتارەکەی زیانی زیاتربێت، یان نەتوانێت هیچ جووڵەو وزەیەك لەگوێگراندا دروست بکات و بەرەو مەبەستێکی دیاریکراو بیانبات.

( هەر بۆیە کاتێ خوای گەورە ویستی محمد بکاتە پێغەمبەر(ﷺ) نایەدڵی ماوەی سێ ساڵ کەنارگیربوو لە خەڵك و بیری لەبوونەوەرو دروستکاری بوونەوەر دەکردەوە هەتا خوا ئامادەی کرد بۆ هەڵگرتنی سپاردەی هەرەگەورە .

هەرکەسێکیش بیەوێ گۆڕانکاری لەبارودۆخ و هەڵس وکەوتی کۆمەڵگادا دروست بکات دەبێ خەڵوەت و کەنارگیری و دابڕانی هەبێت تابتوانێ بیربکاتەوەو ئامادەیی رۆحی وەربگرێت)[1].

وائێمەیش ئەو مەرجە مەعنەویانە کەپێویستن بۆ وتار دەخەینە روو (انشاء الله).

## یەکەم/ هەڵبژاردنی سەرباسێکی گونجاو

هەڵبژاردنی ناونیشانی وتار سەختترین و گەورەترین هەنگاوی وتاردانانە، بەشێوەیەك دەتوانم بڵێم، وتاربێژ دوای قاڵبوونی لەسەر دوانگە ئەگەر توانی سەرباسێکی گونجاوی هەڵبژارد مانای وایە وتارەکەی داڕشتووە، ئیتر دوای ئەوە زۆر بەئاسانی دەتوانێ ئەو ئایەت و فەرمودەو سەرگوزشتانەی پەیوەندیان بەو باسەوە هەبێت بەدوایاندا بگەرێ و لەقورئان و پەڕاوەکانی تەفسیرو سیرەو...هتد هەڵیان بژێرێ و بەشێوەیەکی گونجاو دەرهەق بەوکات و شوێنە ڕیزیان بکات و بیانهۆنێتەوە ، ئەمەیش لەکەسێکەوە بۆ کەسێکی تر دەگۆڕێت.

زۆرکات بووە ناونیشانی باسێکم وەرگرتووە لەزاری خەڵك، بۆ نموونە لەیادمە جارێك پیاوێك هات بۆ لام وتی: مامۆستا باسێکی چاوپیس بکە ئەو خەڵکە زۆر حەسوودە بەرانبەر یەکتر، منیش بەقسەم کرد، وتارێکم دەربارەی خوێندەوە خەڵکەکە زۆریان پێخۆش بوو.

بەکورتی ئایەت و فەرموودەو سەرگوزشتەکان وەك کەرەسەی بیناسازی وەهان، دەبێ لەپێشدا ئەندازیارێك نەخشەیەکی وردی بۆ بکێشێ ئەمجا بەپێی ئەو نەخشەیە هەر بەردێك لەشوێنی

---

[1] الرحيق المختوم : ٥٥.

خۆیدا دابنرێت هەتا بەجوانترین شێوە مەبەستی نەخشە ڕێژ بەرهەم بێت، لەم بوارەیشدا وتـ ربێژ هەر خۆی ئەندازیارو هەر خۆی بیناسازە.

## دووەم/ دەبێ وتار لەئاستی گوێگراندابێت:

پێویستە وتاربێژ زۆر بەوردی تەماشای حاڵی گوێگرانی بکات لەچەند ڕوویەکەوە بۆ نموونە شوێنەکە شارە یان لادێیە؟

ئاستی تێگەیشتنی زۆربەی گوێگران چەندە؟ ئایا خوێنـدەوارن یان نا؟ ئەگەر خوێنـدەوارن ئاستی خوێندنیان چەندە؟ تەمەنیان چەندە؟ زۆربەیان گەنجن یان پیر؟ گوێگـران ئافرەتیـان تیایە یان هەرپیاون ...هتد

وەلەسەر بناغەی ئەم لایەنانەو چەند لایەنی تریش وتاربێژ دەبێ وتارەکەی ئامادە بکاتو هەر جارەی چەپکێك زانستیو ئامۆژگاری نوێ بخاتە بەردەم گوێگرانی بەشێوەیەك دڵیـان ڕوونـاك بکاتەوەو بیانخاتە ڕێ بەرەو کاروانی خواویستیو خۆئامادەکردن بۆ قیامەتو باوەش نەکردن بەژیانی دنیادا.

بۆ بەدیهێنانی ئەم خاڵەیش پێویستە لەسەر مامۆستای وتاربێژ خوتبەکەی هەڵقوڵاوی ئەو واقیعو بارو دۆخەبێت کە کۆمەڵی دانیشتوانی خوتبەکەی تێدا دەژی، بەواتایەکی ڕوونتر دەبێ باس لەڕووداوێکی ئەو هەفتە بکات، یان لەنەخۆشینێك لەنەخۆشینەکانی کۆمەڵەکەی، یان هەڵیان بنێ لەسەرکارێکی خێر کەپێداویستی ئەو ڕۆژو سەردەمە داخوازی بکاتو هێنابێتیە سەر زەمینەی واقیع، وە هەموو ئەو باسانەیش دەبێ بەشێوەیەکی ڕوون باس بکات و هەڵوێستی ئیسلامیش لەئاستیاندا ڕوون بکاتەوە.

مامۆستا عەلی رفاعی دەفەرموێ: وتاربێژێکم دی لەمزگەوتی (ابی العباس) لەئەسکەندەرییە بەدرێژایی هەفتەکە سووڕی دەخوارد بەجادەکانی شاردا لەڕۆژی هەینیشدا وتاری دەخوێندەوە هەموو ئەو تاوانو خراپانەی باس دەکرد کەلەهەفتەکەدا دیبووی چارەسەریشی بۆ دەستنیشان دەکـرد ئـەو زانایـەش نـاوی شـێخ محمـد البوریـنـی بـوو (ڕەحمـەتی خـوای لێبێـت) خـەڵك لەهەمولایەکەوە دەهاتن بۆ ئەوەی سوود لەخوتبەکانی وەرگرن[1].

بۆیە پێویستە وتاربێژ ئاگای لەگۆڕانکاریـیەکانی سەر گۆڕەپانی جیهانی ئیسلامی بێت بەتایبەت ئەو ڕووداوانەی نزیك بەکۆمەڵگاکەی خۆیەتی لەڕێگای خوێندنەوەی ڕۆژنامەو گۆڤارو گوێگرتن لەو کەناڵانەی هەواڵەکانی جیهان بڵاوی دەکەنەوە.

---

[1] كيف تكون خطيباً /١١.

بەكورتی دەبێ خوتبە هەڵقوڵاوی ئەوكاتو شوێنە بێت نەك وتاربێژ لەشوێنێكدا بێتو ڕووداوەكانی ئەو ڕۆژەیش لەشوێنێكیتردا[1].

## سێیەم: یەكباسی وتار: (وحدة الموضوع)

هەندێ وتاربێژ هەن بەهۆی دڵسۆزیانەوە كەدەیانەوێ باسەكەیان هەمە لایەن بێت، یان بەهۆی ئامادەنەكردنی باسێكی چڕوپڕ كەلەژێر یەك ناونیشاندا بێتو هەموو كاتەكەدابگرێت، دەیانەوێ چەند باسێكی جیاجیا لەیەك وتاردا پێشكەش بكەن، بەشێوەیەك وتارەكەیان وای لێدێ نەسەری دیارەو نەبنی، گوێگری هەژاریش سەرگەردان دەبێ، گەر لەدواییدا پرسیاری لێبكرێ وتاربێژ باسی چی بۆ كردن؟ سەرسام دەوەستێ.

من بەهۆی تاقیكردنەوەی بیست ساڵی ڕابووردووی خۆمەوە لەبواریوتارو ئامۆژگاریدا(والحمد لله) بۆم دەركەوتووە ئەم جۆرە وتارانە ڕەنگ دانەوەیان زۆركەم دەبێو خەڵكەكەیش زوو لێی بێتاقەت دەبنو لەمامۆستا دووردەكەونەوە.

وتاری هەینی زۆر دەشوبهێ بەوانەی قوتابییەكی پێشكەوتوو لەبواری خوێندندا، دەبێ هەر لەسەرەتای وانەكەوە سەرباسەكەی دیاربێت مامۆستاو قوتابیش بزانن ئەمرۆ باسیان لەچییە؟ بۆیە دیاری كردنی ناونیشانو دارشتنی پێشەكییەكی كورت لەپێداویستییەكانی وتاری سەركەوتووە.

ڕاستە زۆرجار وتاربێژ ناچاردەبێ لەناوەڕۆكی باسەكەی لابداو (وەك دەڵێن قسە قسە دێنێ) ئاماژە بەهەندێ لایەن بكات لەدەرەوەی بازنەی باسەكەی یان هەندێ پەندو ئامۆژگاری لەوئایەتو فەرموودانە دەربهێنێ كەلەباسەكەیدا هاتووەو بیان بەسێتەوە بەواقیعی خەڵكەوە بێگومان ئەمەیش پێویستی بەهەندێ لادانو چوونە دەرەوە دەبێت، بەڵام گرنگ ئەوەیە وتاربێژ سەرباسەكەی لەیاد نەچێت، لادانەكانی كەمو كورت بێت، بۆ خزمەتی ئەو مەبەستە بێت، یان بۆ ئاماژەیەكی پێویست بێت كەلەوكاتەدا دێتە وەیادیو نایەوێ لەدەستی بدات، ئەمەكارێكی باشە بەمەرجێ وتاربێژ سەری لێ نەشێوێو فێر بووبێ چۆن دەردەچێو چۆن دەگەڕێتەوە سەرباسی سەرەكی ئەویش بۆ خۆی كارێكی ئاسان نیەو پێویستی بەلێهاتووییو قاڵبونێكی تەواو هەیە لەبواری وتارو منبەردا.

---

[1] ڕضينا بالاسلام ربا/١٠٣ ، هەروەها كيف ندعو الناس /٥٣ .

## چوارەم : روونی وتـار (وضوح الموضوع):

پێویستە وتاربێژ ئاستی فیکریی و زانستی گوێگرەکانی بزانێ و بەگوێرەی ئەوان وتارەکەی دابڕێژێ، بێگومان زۆربەی کات هەموو جۆرەکانی لەوتاری هەینیدا کۆدەبنەوە، بۆیە دەبێ خەطیب لەئاستێکدا بدوێ هەموویان لێی تێبگەن یان لەزۆربەی تێبگەن.

بەکارهێنانی داڕشتنی گران و وشەی ئاڵۆزو نەزانراو لەناو وتاردا کارێکی جوان نیە وتاربێژ لەبەرچاوی جەماوەر قورس دەکات، چونکە وتار(محاضرة)یەك نیە پێویستی بەڕۆچوون و بەڵگەهێنانەوەی قوڵ و لێکۆڵینەوەی وردەکاری هەموولایەنەکان بێت وەك باسێکی زانستی، هەتا ئێمە ناچاربین زاراوەی زانستی و مەوزوعی تیا بەکار بهێنین و متمانە بەخوێنەر پەیدابکەین.

وتار گفت و گۆیەکەدوای دامەزراندنی لەسەر بناغەی چەند ئایەت و فەرموودەیەك زیاتر پێویستی بەسۆزو بزواندنی هەستەکانی ناودەروونە، بۆ ئەوەی گوێگر بێ ماندووبوونی فیکری و زمانەوانی وەختێ بەخۆی بزانێت دەروونی شێلراوە لەگەڵ وتەکانی وتاربێژداو فرمێسك لەچاوانی دەڕژێنە خوارو پەشیمانە لەکردارەکانی ڕابوردوی یان دڵی دەسوتێ بۆ ئەو باسانەی وتاربێژ دەیانخاتە روو، بێگومان ئەمەیش ناگونجێ لەگەڵ وشەی گران و دوور لەفامی جەماوەردا، یان لەگەڵ باسکردنی فەلسەفەو، باسە ئاڵۆزەکانی زانستی کەلام و(منطق)و گێڕانەوەی مێژووی ئەو کۆمەڵ و گرۆهانەی ئەمڕۆ تەنها بەناو ماون و ناوەڕۆکیان نەماوە وەك(معتزله) و (جبریه)ەو (خوارج)و ...هتد.

## پێنجەم: نوێکاریی لەوتـاردا[1]

وتاری بەهێزو سەرکەوتوو ئەوەیە رازاوەبێت بەشێوازی نوێ، واتە هەموو هەفتەیەك چەند شتێکی نوێ باسبکرێ نەك تەنها دووبارەکردنەوەو سێ بارەکردنەوەی باسەکانی رابوردوبێت، ئەمەیش بەوە دەبێ مامۆستا وتاربێژەکان خۆیان ماندوبکەن، بەوردی باسەکانیان ئامادە بکەن و سەرچاوەی پێویست لەدەوری خۆیان جەم بکەن و سوودیان لێوەرگرن لەکاتی ئامادەکردنی باسەکاندا، زۆر فەرمودەی پێغەمبەر(ﷺ) هەیە تا ئێستا نەدراوە بەگوێی خەڵکدا چونکە لەسەرچاوەکانی بەردەستدا:

وەك(ریاض الصالحین) یان (تیشکی مینبەر )یان (وتاری هەینی)دانیە.

مامۆستایش خۆی ماندو ناکات لەسەرچاوەکانی فەرموودەو تەفسیر دەریان بهێنێ و سوودی تازەیان لێ هەڵگوزێ.

---

[1] رضینا بالاسلام دینا، ١٠٦، ١٠٧.

سوپاس بۆ خوا ئەمڕۆ خەڵکی زۆربەیان خوێندەوارنو ڕۆشنبیری‌یەکی ئیسلامی جوانیان وەرگرتووە، ڕابوونی ئیسلامی خۆی گەیاندوەتە هەموو کونجو قوژبنێك، گۆڤارو ڕۆژنامەو چاپەمەنی نوێ دەورێکی باڵایان دیوە بۆ وریاکردنەوەی لاوەکان، لەخەتەری ئەوجەنگە فیکری‌یەی ڕووبەڕووی لاوەکان بوەتەوەو فیکری لێڵکردوون، بۆیە پێویستە مامۆستای وتاربێژ زۆر زیاتر لەوگەنجانە لەخەمی ئیسلامدابێتو بەردەوام خوێندنەوەو بەدواداچوونی هەبێت، نەخۆشیە نوێکانی ناو لاوەکان دیاری بکاتو لەسەرچاوەی بێگەردی قورئانو فەرموودەو پەراوە فیقهی‌یەکان چارەسەریان بۆ بدۆزێتەوە، خەمی ناتەواوی‌و لادانی ئەوگەنجانە بەکاری سەرەکی خۆی بزانیو دڵسۆزانە لەهەوڵی چارەسەرکردنیدا بێت بەوتەی شیرینو بەڵگەی جوانو سۆزی ئیخلاص هەستیان ببزوێنیو بیانگرێنی، نەك بەوتەی ناخۆشو توورەبوون دڵیان بشکێنیو لەمزگەوت بیانتارێنی، یان باسەکەی هیچ تازەکاری‌یەکی تیا بەدی نەکرێتو پەیوەندی بەو ڕۆژەوەنەبێت.

دەگێڕنەوە ئەفسەری پایەبەرز (مەحمود شیت خطاب)خوالێی خۆشبێت هەوڵێکی زۆر دەدات لەگەڵ کۆمەڵێ ئەفسەردا تا ببنە ئەهلی مزگەوت، ئەوانیش بڕیار دەدەن ڕۆژی هەینی دەست بەنوێژ بکەن، لەگەڵ ناوبراو دەچن بۆ مزگەوتو لەڕیزی پێشەوە لەبەردەم مامۆستادا دادەنیشن، مامۆستا هەڵدەستێ دەست بەوتاردان دەکات ئەفسەرەکان تەماشا دەکەن پەڕەیەك کاغەزی کۆنی بەدەستەوە گرتووە بەبەرواری کۆچی هی(١٧)ساڵ پێش ئەوکاتە بووە، باسەکەی زۆر کۆنو دوور لەواقیع دەبێت ئەفسەرەکان لەیەکتر ورد دەبنەوە کاتێ دێنە دەرەوە بڕیاردەدەن واز لەنوێژ بهێنن)[1].

بەکورتی زانای وتاربێژ دەبێ وەك پزیشك وابێت، ئاگاداربێت بەنەخۆشیەکانو دەستنیشانیان بکات ئەمجا دەرمانیان بۆدابنێ، بۆئەوەی چارەسەرو بنەبڕی بکات، یان هیچ نەبێت هەندێ ئازاری سووك بکات.

لێرەوە بۆمان ڕوون دەبێتەوە پلەی ڕێنمایی کردنی موسوڵمانانو بەرزبوونەوەی سەردوانگەکان پلەیەکی سەختو پرسامو هەیبەتە، وەهەرکەس شیاوی ئەو شوێنە نەبێتو بۆی سەرکەوێت خۆشی‌و خەڵکیش تووشی تاوانو تاقیکردنەوەیەکی سەخت دەکات[2].

منیش لەژیانی بیست ساڵەی وتاربێژی خۆمدا بۆم دەرکەوتووە هەر وتارێك سەرەتا لەلاپەڕەکانی پەڕاو دەرم هێنابێت بێ‌ئەوەی تەماشای لاپەڕەکانی کۆمەڵگاو دەوروبەرم کردبێت، یان سەرکەوتوو نەبووە یان ناتەواوبووە، بەڵام هەر وتارێك سەرەتا لەلاپەڕەکانی کۆمەڵگاوە هەڵم

---

(١) گۆڤاری دوانگە، ژمارە٤ /١١،١٠ باسێك لەژێرناونیشانی وتاری سەرکەوتوو .

(٢) تاج الخطب المنبرية ، مصطفى ابو سيف الحمامي /٣٠٢.

بژاردبێت ئەمجا تەماشای پەراوم بۆکردبێتو چارەسەرم بۆ دۆزیبێتەوە لەئایەتو فەرموودەکان ئەوە زۆر سەرکەوتوو بووەو ڕەنگی داوەتەوە.

ئەمەیش وادەگەیەنێ دەبێ وتاربێژ ئاگای لەگۆڕانکاری ڕۆژگاری خۆی بێت، ڕۆژنامەو گۆڤارەکان بخوێنێتەوە، یان هیچ نەبێ گوێ بگرێت لەچەند کەسێ کەئاگایان لەڕووداوە تازەکانە بۆی باس بکەنو هەرشتێکی گرنگ هەبوو لەڕووداوی نوێ ئاگاداری بکەن، ئەگەر وانەکات وتارەکانی لەکاروانی ژیان دوا دەکەونو کاریگەریان کەم دەبێتەوە.

## شەشەم: جوانکاری لەوتاردا:

ئەمەیش بەوەدەبێ وتاربێژ زۆر بەوردی لەدەوروبەری خۆی وردببێتەوە و چاودێری کاتو شوێنو حاڵی گوێگرانی بکات بەکام شێوە بەلایەوە گونجاو بوو بەوشێوەیە لەگەڵیان بدوێ، بزانێت گەنجیان پێویستی بەچی هەیەو پیریان بەچی؟ مافی هیچ گرۆهێ پشت گوێ نەخات، لەهەر بۆنەیەکدا باسێکی گونجاو ئاراستە بکات گوێگران بێداربکاتەوە ئاگاداریان بکات بەئەرکی سەرشانیان بەرانبەر بەو ڕووداوە، یان بەوکاتە نوێیە، بۆ نموونە: لەنوێ بوونەوەی ساڵی کۆچیدا باسی کۆچی پێغەمبەر(ﷺ) و یارەکانی بکات بۆ مەدینەو ئەو پەندانەی لەو کۆچە وەریدەگرین. لەنوێبونەوەی ساڵی زاینیدا باسی حەزرەتی عیسی(سەلامی خوای لێبێت) بکاتو ئاشکرای بکات ئێمە نزیکترین بەعیسی لەم گاورانەی ئەمڕۆ خۆیان بەودا هەڵواسیوە. لەنوێ بوونەوەی ساڵی خوێندندا باسی گەورەیی زانست بکات لەئیسلامداو، مەرجەکانی مامۆستاو قوتابی ڕوون بکاتەوە، لەکاتی جەژنەکاندا ئادابی جەژنو نوێژی جەژنو جەژنە پیرۆزەو ئاشت بوونەوە ڕوون بکاتەوە...هتد.

(هەروەها لەجوانکاری وتارە کەلەسەر یەك نەغمەو وەتەر نەبێت، بەڵکو هەر ڕستەیەك پێویستی بەشێوازێکی تایبەتی هەیە بۆ دەربڕینی: بۆ نموونە کاتێك دەتەوێت پرسیارێك بکەیت دەبێت لەسەر شێوازی پرسیارکردن بێت، وەکاتێ ڕستەیەکی سەر سوڕمان بەکاردێنێت دەبێت بەشێوەیەکی تایبەتی بێت، وەکاتێك دەتەوێت بانگ لەخەڵکی بکەیت دەبێت لەسەر شێوەی بانگکردن بێت...هتد)(1).

هەروەها لەجوانکاری‌یە گۆڕینی شێوازی وتارەکانو ئەو سەرچاوانەی لێیان هەڵدەگوزرێت، بۆئەوەی گوێگران تووشی بێزاری نەبن، بۆ نموونە: چەند وتارێك گرنگی بدرێت بەلایەنی ڕۆحی، دوای ئەوە چەند وتارێك باس لە مردنو زیندوو بوونەوەو بەهەشتو دۆزەخو چۆنێتی پردی سیراتو تەرازوی کردەوەو وەستانی گۆڕەپانی قیامەتو ...هتد بکرێت.

---

(1) گۆڤاری دوانگە ژمارە(2) باسێك بەناونیشانی وتاری سەرکەوتوو.

ئەمجا چەند مانگێك وتارەكان تەرخان بكرێت بۆ لایەنە كۆمەڵایەتی یەكان ئەمجا باسە فیقهی یەكان ...هتد .

## حەوتەم/ دیاریكردنی كاتی وتار

ئیمامی موسلیم دەگێڕێتەوە لە(جابر)كەفەرموویەتی: پێغەمبەر(ﷺ) دوو وتاری هەبوو دادەنیشت لەنێوانیاندا، قورئانی دەخوێندو ئامۆژگاری خەڵكی دەكرد، نوێژەكەی مامناوەندی بوو، وتارەكەیشی مامناوەندی بوو. ئەمەیش دەقی فەرمودەكەیە:

(روى مسلم عن جابر بن سمرة انه قال: كانت للنبي(ﷺ) خطبتان يجلس بينهما، يقرأ القران ويذكر الناس، فكانت صلاته قصداً وكانت خطبته قصداً)[1].

لەفەرمودەیەكی تریشدا دیسانەوە ئیمامی موسلیم دەگێڕێتەوە كەپێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( ان طول صلاة وقصر خُطبته مئنةٌ من فقهه فاطيلوا الصلاة واقصروا الخطبة)[2].

واتە: درێژی نوێژی پیاو لەگەڵ كورتی وتارەكەی نیشانەیە لەسەر شارەزایی و ئاگاداری ئەو كەسە لەبواری دیندا. نوێژەكان/ درێژ بكەن و وتارەكان كورت بكەن.

تا ئێستا هەرچیم خوێندوەتەوە دەربارەی وتاری هەینی یان هەر كەسێ باسی لێكردووە دەبینم ئەم دوو فەرمودەیە بەتایبەت دووەمیان دەكەن بەبەڵگە لەسەر ئەوەی كە گوایە وتاری هەینی دەبێ زۆر كورت بێت و كورت تر بێت تەنانەت لەنوێژەكەیشی.

سەیر ئەوەیە تەنیا بەمەوە ناوەستن بەڵكو دێن ئەونوێژە كەم و كورتەی ئەمڕۆی ئێمە دەكەن بەتەرازووی نوێژێكی تەواو بەراوردی دەكەن لەگەڵ واتای فەرموودەی دووەمدا، بۆئەوەی یەكسەر بریار بدەن كەدەبێ وتاری هەینی لەنوێژەكەی ئێمە كورت تر بێت بێ، ئەوەی هیچ بەراوردێ بكەن لەنێوان ئەم فەرموودەو فەرموودەكانی تر كەدەربارەی وتاری هەینی هاتوون، كەئەوانیش لەپلەی ئەم فەرموودانە كەمتر نین، یان بێ ئەوەی بیربكەنەوە لەوەی(قصر وطول)لەفەرمودەكەدا ڕێژەیی یەو دەرهەق بەكات و شوێن دەگۆڕێت ، هیچ نەبێ دەبێ مانای مامناوەندی لێ بگیرێ وەك لەفەرموودەی یەكەمدا بەروونی فەرموویەتی(قصدا) واتە: مامناوەند بووە.

ئەو فەرموودانەی تریش كەزیاتر ئەم باسەمان بۆ ڕوون دەكەنەوە ئەمانەن:

- (روى مسلم عن عمرة بنت عبدالرحمن عن اختها قالت: اخذت ق والقران المجيد من في رسول الله (ﷺ) يوم الجمعة وهو يقرء بها على المنبر من كل جمعة).

---

[1] منتهى امال الخطباء: ١/٢٦.

[2] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

واتـه: (عمره) ی کچـی(عبدالرحمـن) دەگێڕێتـەوه لەخوشـکەکەی کەوتویـە: مـن سـوورەتی(ق والقران المجیـد) م لـەدەمی پێغەمبـەر(ﷺ) وەرگرتـووه لـەرۆژی هـەینیدا ئـەو سوورەتەی دەخوێنـد هەموو رۆژێکی هەینی لەسەر دوانگە.

- ( وروی مسلم کذلك عن ام هشام بنت حارثة بن النعمان قالت: ماحفظت ق الا من فيّ رسول الله يخطب بها كل جمعة )[1].

واتـه: دایکـی هیشـام، کچـی حاریسـەی کـوری نـەعمان دەفـەرموێ: مـن سـوورەتی قـافم لەبەرنەکردووه لەدەمی کەس مەگەر لەزاری پێغەمبەر نەبێ(ﷺ) کەدەیکرد بەوتار لەهەموو رۆژێکی جومعەدا[2].

هەروەها پێشەوا بوخاری بۆمان دەگێڕێتـەوه: ( ان عمر بن الخطاب(ﷺ) قرأ يوم الجمعة على المنبر بسورة النحل حتى اذا جاء السجدة نزل فسجد وسجد الناس، حتى اذا كان الجمعة القابلة قرابها حتى اذا اتى السجدة قال: يا ايها الناس انما نمر بالسجدة فمن سجد فقد أصاب ومن لم يسجد فلا اثم عليه ولم يسجد عمر(ﷺ))[3].

واتـه: عومـەری کـوری خـەتتاب ــ رەزای خـوای لێبێـت ــ رۆژی جومعـە لەسـەر دوانگـە سـوورەتی(نحل)ی خوێنـد هـەتا گەیشـتە ئایـەتی جومعـە دابەزی‌یـە خـوارەوه سـەجدەی بـردو خەڵکیش سەجدەیان برد، لەرۆژی جومعـەی دواییـدا دیسـانەوه ئـەو سـوورەتەی خوێنـد هـەتا گەیشتە ئایەتی سەجدە، فەرمووی: ئەی خەڵکەکە ئێمە تێدەپـەڕین بەئایـەتی سـەجدەدا هەرکەس سەجدەی برد باشی کردوە، هەرکەس سەجدەی نەبرد گوناهی لەسەر نیە، عومەر خۆی سەجدەی نەبرد رەزای خوای لێبێت.

مـن حەزدەکەم هـەموو مرۆڤێکی شارەزا بەزمانی عـەرەبی بـەراوردێکی ئەم فەرموودانە بکـات بـاش لێیـان تێبگـات، نـەك تەنـها فـەرموودەی( ان طـول صـلاة الرجـل وقصـر خطبتـه ) لەبەرچاوبگرێت‌و ئەمجا(قصر) یش بەئارەزووی خۆی راڤەبکات.

مـن خـۆم دوای خوێندنـەوەی ئـەم فەرموودەیـە: بەشـێوەیەکی مامنـاوەندی لـەنێوان پەلـەو لەسـەرخۆییدا سـورەتی (نحل)م خوێنـد تـا ئایـەتی سـەجدە کەپـەنجا ئایەتـە، یـازدە خولـەك‌و دەچرکەی خایاند. ئەمە وێڕای ئەوەی چەند خولەك خەریك بووه بەسەرەتای وتارو وسوپاس‌و ستایشـەوه؟ چـەند خولـەك تەفسـیری ئایەتـەکانی کـردووەو دەرهـەق بـەوکات‌و شـوێنە دواوەو

---

[1] المجموع : ٥١٨/٤، منتهى امال الخطباء : ٢٦/٢.

[2] المجموع: ٥١٨/٤.

[3] منتهى امال الخطباء: ٢٧/٢.

فەرموودەو بەسەرهاتو ڕووداوی تری تێهەڵکێش بەباسەکەکردووە؟ چەندی خایاندوە تا دابەزیوەو سەجدەی بردووەو گەڕاوەتەوە سەر مینبەر؟

دوای ئەویش چەندێکی تری لەو سوورەتە خوێندەوەو چەندیتر وتاری داوە؟ وە لەخوتبەی دووەهەمدا چی باس کردووەو چەندی خایاندووە؟ چونکە گومان لەوەدانیە سوورەتی(نحل) تەنها لەیەك وتاردا بووە؟

ئایا دەگونجێ عمری کوری خەططاب کەدووەم جێنشینی پێغەمبەر بووە(ﷺ) و دەساڵی ڕەبەق لەپشتی ئەوەوە نوێژی جومعەی کردووە ئەوەندەی ئێمە شارەزای نوێژی جومعەو وتاری جومعە نەبوبێت؟

یان ئایا دەگونجێ(عمر) بەپێچەوانە ی سوننەتو ڕەوشتی پێغەمبەرەوە (ﷺ) کاری کردبێ؟!

خۆگەر کەسێکیش توانی بڵێت من بۆم هەیە سەرپێچی عومەربکەم، ئەی چی دەکات لەو فەرموودەی موسلیم ڕیوایەتی کردووە کە دووان لەیارانی پێغەبمەر(ﷺ) دەفەرموون ئێمە سوورەتی قافمان لەسەر دوانگەی پێغەمبەر لەبەرکردووە لەدەمی پیرۆزی خۆی(ﷺ) سوورەتی قافیش(٤٥) ئایەتە لەگەڵ ئەو هەموو پێشەکیو دوعاو ئامۆژگاریيانەی هەموجارێ لەگەڵ ئایەتەکانی قورئاندا کەپێغەمبەر(ﷺ) تێکلاوی کردووە؟

ئەوەیشمان لەیادبێت ئەو وشەی لەدەمی پێغەمبەر(ﷺ) دەردەچوو یەك بەملیۆنیش بەراورد ناکرێت لەگەڵ وشەی کەسێکیتردا، واتە: وشەکانی پێغەمبەر(ﷺ) ئەوەندە کاریگەرن بەملیۆنەها جار زیاتر لەوشەکانی ئێمە، لەولایشەوە ئەو یارانەی لەخزمەتیدا بوون ئەوەندە ئاسمانی هەستو دەروونیان سافو بێگەرد بووە بۆ وەرگرتنی ڕاستیو فەرموودە جوانەکانی پێغەمبەر(ﷺ) یەك بەهەزاریش بەراورد ناکرێن لەگەڵ دڵو دەروونی ئێمەدا کەپڕ بووە لەکینەو تاوانو خۆشەویستی دنیاو ...هتد [1].جا پێغەمبەرێك(ﷺ) بەوپیرۆزییە ئەوەندەیش درێژەی دابێت بەوتارەکانی بۆچ ئەمڕۆ وتاربێژەکانی ئێمە بۆیان نەبێت چاوی لێبکەن؟[2] .

شتێکی تر ماوە پێویستە لەم هەلەدا باسی لێوەبکەینو بەسەریدا نەڕۆین، ئەویش ئەمەیە: ئەمڕۆی ئێمە زۆر ئاڵۆزو و تێکەڵ بووە، دەروونەکان بەجۆرەها تاوانو خراپە تێکەڵ بوون، دڵیش وەك جلوبەرگ وەهایە تا زیاتر چڵکن بێت ماندو بوونی زیاتر دەوێ بۆ پاك بوونەوەی ، لەبەر ئەوە پێویستە وتاربێژەکانمان زیاتر لەباسەکانیان بکۆڵنەوەو سەروبنی ببەستن بەیەکەوە، هەرباسێکیش بکەنەوە ئایا: بانگ کردن بێت بۆ چاکە، یان دوورخستنەوە بێت لەخراپە، یان هەردووکیان بێت پێکەوە، پێویستیان بەکاتێکی زۆر هەیە تائەو ئایەتو فەرموودەو وتەی

---

[1] منتهى امال الخطباء : ٢٧/١.

[2] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

ییاوچاکانەی لەوبارەوە هاتوون گرنیان بدە بەیەکدا هەتا ئامادەبووان سوودی لێوەرگرن، بێگومان ئەمەیش بەچەند وشەو چەند ڕستەیەك پێك نایەن، بۆیە پێویستە کاتێکی فراوان دیاری بکرێت بۆ وتار هەتا وتاربێژ بگاتە ئامانج و ئامادبووانیش سوودی لێ وەرگرن و دڵیان جۆش بخوا پێی.

خوێنەری بەرێز دەگونجێ هێشتا دڵت جێگیر نەبووبێ لەسەر ڕاستی ئەم بۆچوونە، چونکە من ئەمەوێ بازێکی گەورە بدەیت، بۆیە حەزدەکەم، زیاتر ئەم باسەت بۆ روون بکەمەوەو بەم فەرموودەی(عەبدی کوری حەمید) دەیگێرێتەوە لە(ابن عباس)ە( ان رسول الله (ﷺ) قرا في خطبته بالمائدة والتوبة)[1].

واتە: پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەوتارەکەیدا سوورەتی مائیدەو تەوبەی خوێند.

خۆگەر بمانەوێ لەبواری رۆژی هەینی دەرچین بۆ بواری وتاری گشتی ئەوە باگوێ بگرین لەم فەرموودەیە کەئیمامی موسلیم ریوایەتیکردووە: ( عن عمرو بن اخطب(ﷺ) قال: صلى بنا رسول الله(ﷺ) الفجر وصعد المنبر فخطبنا حتى حضرت الظهر، فنزل فصلى ثم صعد المنبر فخطبنا حتى حضرت العصر، ثم نزل فصلى ثم صعد المنبر فخطبنا حتى غربت الشمس فاخبرنا بما كان وبما هو كائن فأعلمنا احفظنا)[2].

واتە: عەمری کوری ئەخطەب ڕەزای خوای لێبێت . دەفەرموێ: پێغەمبەر(ﷺ) نوێژی بەیانی بۆ کردین و چووە سەر دوانگە وتاری خوێندەوە هەتا نوێژی نیوەڕۆ، ئەمجا دابەزی نوێژی کرد سەرکەوتەوە سەر دوانگە وتاری خوێندەوە هەتا نوێژی عەسر ئەمجا دابەزی نوێژی کرد سەرکەوتەوە هەتا نوێژی مەغریب هەواڵی داینێ بەوەی کە بووەو بەوەیشی کە هەیە زاناترینمان ئەوکەسەیە زیاتری لەبەر کردبێت).

ئەوەم ماوە بڵێم : دڵگران مەبە بەوەی درێژەم دا بەم لێکۆڵینەوە، چونکە ویستم ڕاستییەکەت وەك خۆی پێ بگەیەنم، بەڵکو بەرێزیشت دوای من بەخەڵکی رابگەیەنیو لەسەری رایان بهێنی، ئەوەیشت لەیادبێت مەبەستم بەم وردەکارییە ئەوەنیە وتاربێژی ئەم رۆژە بەوشێوەیە درێژەبدات بەوتارەکان، چونکە خەڵکی ئەمرۆ ئەوەندە بەئارام و خۆگرنین کوت وپڕ ئەو گۆڕانەیان بەسەردا بێت و بەم زوانە بتوانن قوبوڵی ئەم واقیعە بکەن، بەڵام واجبە ئەوەیش بزانن کەپێغەمبەری خوا(ﷺ) وتارەکانی ئەم شێوەیشیان بەزۆری تیابووە، ئەگینا چۆن یارەکانی سوورەتی قافیان لەکاتی وتاردا دەرخ دەکرد.

لەکۆتادا حەزدەکەم پوختەی ئەم خاڵەت بۆ کورت کەمەوە لەچەند دێرێکدا:

---

(١) هەمان سەرچاوەی پێشوو.

(٢) التاج: ٥/٣٠٥.

( پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەهەندێ فەرموودەدا هەڵیناوین بۆ ئەوەی وتاری هەینی کورت و مامناوەند بێت، بەلاَم لەهەندێ فەرموودەیشدا رێگای پێداوین وتاری هەینی درێژبکەینەوە بەگوێرەی پێویست، تەنانەت ئەگەر لەیەك وتاردا هەموو سوورەی قاف بخوێنین لەسوننەت لامانەداوە، بۆیە پێویستە وتاربێژ زیرانە مامەڵە بکات لەگەڵ ئەم فەرموودانەداو وتارەکانی لەنێوان کورت و درێژدا داڕێژێ، کارێك نەکات گوێگران لێی بێزار ببن، کارێکیش نەکات ئەوەندە کورت بێت باسەکان روون نەکاتەوەو مافی خۆیانیان نەداتێ، بەشێوەیەك دەگونجێ بڵێین وتاری هەینی بۆ ئەمرۆی کوردستان لەکاتی ئاساییدا لەبیست دەقیقە کەمتر نەبێت و لەنیوسەعاتیش زیاتر نەبێت، بەلاَم لەکاتی نائاساییدا وەك شوێنێکی زۆرگەرم یان زۆر سارد یان کاتی ترس و لەرز دەتوانی بە(۳) دەقیقە کۆتایی پێ بهێنی، کەوابوو درێژی و کورتی وتار شتێکی رێژەیی(نسبی)یە بەگوێرەی کات و شوێن و ئاستی فیکری و توانای وتاربێژو گوێگران پێویستە گۆڕانکاری تیابکرێت، وەهیچ کەس بۆی نیە کاتێکی دیاریکراو فەرز بکات لەسەر وتاربێژ !

# فەسڵی دووەم

# ئادابی وتاربێژ

ئەو ئادابانەی باسمان کرد بۆ وتار هەندێکیان دەگونجێ بکرێنە سیفەتیش بۆ وتاربێژ چونکە وتارو وتاربێژ شێلراون بەیەکدا هەروەك چۆن ئاردو ئاوو خوێ پێکەوە تێکەڵ دەکرێن جوان دەشێلرێن تاهەویرێکی باشی لێ پێکدێ، بۆیە هەر وتارێك هەڵقولاَوی ناو ناخی وتاربێژ نەبوو، یان لەکەسێکی تری وەرگرتبوو لەگەڵ قولاَیی یەکانی هەستی خۆیدا نەیشێلابوو کاریگەری تەواوی نابێت لەسەر هەستی گوێگران.

(هونەری وتار داڕێژیی و وتاربێژیی هونەرێکی زیندووەو زیندوبووە بەدرێژایی مێژوو، بۆیە ئەو کەسانەی دەیانەوی جڵەوی کاریگەری بۆ سەر خەڵکیان بەدەستەوە بێت، پێویستە زۆر بەجوانی فێری ببن. ئەوەیش بزانن خوێندنەوەی ئەم پەڕاوە بەتەواوی فێری ئەو هونەرەیان ناکات، بەڵکو ئەمە سەرەتای کاروانەکەیانەو دەبێ بێوچان سەرگەرمی مومارەسەو راستکردنەوەی هەڵەکانیان بن بۆ ئەوەی هەفتە لەدوای هەفتە کارامەیی و وریایی و گورج و گۆڵیان بەرەو زیادبوون بڕوات)[1] .

---

[1] ٥٥٥ وصية وطريقة ، ٤٧ .

## ئەو سیفەتانەیش کە پێویستی وتاربێژن ئەمانەن:

### یەکەم/ ئیخلاص بۆ خوا :

واتە: وتاربێژ لەوتەکانیدا تەنها مەبەستی ڕەزامەندی خوابێت ئیتر بەتەمای پاداشتی دنیایی و شۆڕەت پەیداکردن و پلەو پایەو پیاهەڵدان نەبێت، بەڵکو ویردی هەمیشەیی ئەم ئایەتەی قورئان بێت کەلەسەر زاری هەموو پێغەمبەران بوو، (علیهم السلام) ﴿ وما اسئلكم عليه من اجر ان اجري الا على رب العالمين ﴾ الشعراء: ١٠٩،١٢٧،١٤٥، ١٦٤،١٨٠.

واتە: من لەسەر ئەم بانگەوازو ئامۆژگاریی و ئەمر بەچاکەو نەهی لەخراپەیە داوای هیچ کرێو پاداشتێك لەئێوەناکەم پاداشتم تەنها لەخوا دەخوازم.

ئەمەیش نابێ ئەوەی لێ وەربگیرێ و تاربێژ ئەگەر فەرمانبەری میری بوو نابێ هیچ وەربگرێت چونکە مەلایش ماڵو منداڵی هەیەو میوانی لەهەموو کەس زیاترە، بەڵکو مەبەست ئەوەیە نابێ بازرگانی بەئایەتو فەرموودەو ئامۆژگاریی‌یەکانی بکات.

### دووەم / نەرمونیانیو لەسەرخۆیی( المرونة ).

راستەوتاربێژ لەهەندێ کاتدا پێویستی بەجۆرێك دەنگ هەڵبڕین یان تووڕەبوون هەیە، بەڵام نابێ ئەوەی لەیادبچێت بەگشتی دەبێ لەسەر خۆبێت، بەنەرمی لەگەڵ گوێگرانی هەوڵ بدا بەبەڵگەو نموونەی جوان وردە وردە دابەزێتە ناو دەروونیانو هەستو ویژدان زیندووبکاتەوەو وابکات بەشداری خەمی ئەم بن، وەك ئەم هەست بەخەتەری ئەو تاوانو خراپانە بکەن کە گەمارۆی نەفسی خۆیانو کۆمەڵگاکەیانی داوە.

مامۆستا (عبدالبديع صقر) دەڵێ: دەروونی خەڵك دەشوبهێ بەئەشکەوتێکی تاریك دەبێ وردە وردە چاوی تیابکەیتەوەو ڕێگاو کونەکانی بدۆزیتەوە یان پێویستە سروشتی زەویەکە بزانین دواتر تۆوی تیابچێنین، هەندێ پارچە زەویش هەیە هەر لێی گەڕێین باشترە)[1].

پێشەوا غەزالی ڕەحمەتی خوای لێبێت ـ دەفەرموێ: ( يجب ان يكون واعظ الخلق متلطفاً ناظراً الى مواقع العلل معالجاً لكل علة بما يضادها لا بما يزيد فيها)[2].

واتە پێویستە ئامۆژگاری کار زۆر نەرمو هێژابێت، تەماشای جێگا نەخۆشیەکان بکاتو بۆ هەموو نەخۆشییەك دەرمانێك دابنێت دژایەتی بکاتو لەناوی بەرێت نەك پەرەی پێبدات.

هەر لەم بارەوە پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێ:

( ان الرفق لا يكون في شيء الازانه، ولايُنزع من شيء الا شانه) [3] رواه مسلم.

---

[1] كيف ندعو الناس ٢٦ .

[2] احياء علوم الدين ١٣٦/٤.

واتە: بەڕاستی نەرمی لەهیچ شتێکدا نابێت ئیللا جوانی دەکات‌و، لەهیچ شتێك هەڵناگیرێت ئیللا ناشیرینی دەکات.

یان دەفەرموێ: (من يُحرم الرّفق يُحرم الخيرَ كله) مسلم. واتە: هەرکەس لەنەرم‌ونیانی بێ‌بەش کرابێ لەهەموو چاکەیەك بێ‌بەشکراوە.

نەرم‌و نیانی وتار پێویستی بەوە هەیە وتاربێژ رووخۆش‌و کراوەبێت لەگەڵ گوێگرانیدا، وشەیەك بەکارنەهێنێ یەکێك لەگوێگرانی، یان گروهێك یان بنەماڵەیەك بریندار بکات‌و پەردەیەك دروست بکات لەنێوان خۆی‌و ئەواندا، بۆئەوەی گەورەترین ژمارە سوودی لێوەربگرن‌و لەدەوری جەم بن.

ئەمەیش مانای وانیە وتاربێژ لەبەر دڵی گوێگران راستی‌یەکان روون نەکاتەوە یان پاڵپشتی نادادی‌و بێ‌شەرعی بکات؛ بەڵکو شێوازی روونکردنەوەی راستی جۆری زۆرەو داڕشتن‌و تەعبیر لێدان دەورێکی کاریگەری هەیە بۆ راگرتنی دڵی خەڵکی، بێگومان هەڵبژاردنی وشەی جوانیش لەوتارێکی نیوسەعاتیدا پێویستی بەخۆماندوکردن‌و بیرکردنەوەو خوێندنەوەی زیاد هەیە، بۆئەوەی بتوانێ بەجوانی پەیامەکەی رابگەیەنێ‌و چاو لەپێغەمبەرەکەی(ﷺ) بکات کەخوا دەربارەی دەفەرموێ: ﴿ فبما رحمة من الله لنتَ لهم ولوكنت فظاً غليظ القلب لأنفضوا من حولك فاعف عنهم واستغفر لهم ﴾ (ال عمران/ ١٥٩).

واتە: بەهۆی سۆزوبەزەیی خواوەیە تۆ نەرم بوویت بۆیارەکانت، ئەگەر تۆ وشك‌و دڵڕەق بوویتایە هەموو لەدەورت دەتەکینەوە، لێیان ببورەو داوای لێخۆشبوونیان لەخوا بۆ بکە..

بەم شێوە وتاربێژ تاچ رادەیەك لەم بارەیەوە سەرکەوتووبێت ئەوەندەش کاریگەری لەناو خەڵکدا دەردەکەوێت‌و خەڵکی خۆشیان دەوێت، خۆشەویستیش گەورەترین هۆکارە بۆ وەرگرتنی وتارو ئامۆژگاری‌و ئاگاداری‌یەکانی ؛ وەك شافیعی ـ رەحمەتی خوای لێبێت ـ دەفەرموێ:

لو كان حُبُكَ صادقاً لأطعته ان المحب لمن يحب مطيع [1]

واتە: گەر خۆشەویستی تۆ بۆئەوەی باسی دەکەیت راست بوایە ؛ ئەوا گوێڕایەڵ دەبوویت بۆی ، چونکە خۆشەویست گوێڕایەڵە بۆ ئەو کەسەی خۆشی دەوێت.

پێشینانیش فەرموویانە: (قسەی خۆش مار لەکون دێنێتە دەر).

دەگێڕنەوە مامۆستایەك چووە لای هارونە رەشید ویستی ئامۆژگاری بکات زۆر بەتوندی لەگەڵی دواو قسەی رەق بوو لەئاستیدا هارون پێی وت: مامۆستا ئامۆژگاری وەها نابێت، خوای

---

[3] رياض الصالحين باب الحلم والاناة والرفق/٣٠٢.

[1] ديوان الامام الشافعي ، قافية العين .

گەورە(موسی)و (هارونی) نارد ــ کەچاکتربوون لەتۆــ بۆلای فیرعەون کەخراپتربوو لەمن ـ پێی فەرموون ﴿ فقولا له قولاً ليناً لعله يتذكر او يخشى﴾طه: ٤٤.

واتە: ئەی موساو هاروون بەوتەیەکی نەرم ونیان لەگەڵ فیرعەون بدوێن بەڵکو بیربکاتەوە یان بترسێ لەخوا[1] .

بۆیە مامۆستای وتاربێژ دەبێ سیرەتی پێغەمبەر(ﷺ) جوانترین سەرمەشقی بێتو قورئانو فەرموودە مامۆستای بێت رێبازو بۆچوونی خۆی هەر چۆن بێت دەبێ دڵی نوێژخوێنانی مزگەوتەکەی گەنجو پیرو ژنوپیاو رابگرێو زویریان نەکات، ئەگینا لەرۆژی قیامەتدا یەخەگیری دەبنو دەڵێن: ئەی مامۆستا ئێمە بەئاسانی هاتینە بەردەستت، لەجیاتی ئەوەی پەروەردەمان کەیتو تێمان بگەیەنێتو خۆت ماندووبکەیت لەگەڵمان کەچی بەقسەی فلانو فیسار دڵت بریندار کردینو دەرت کردین!.

بەکورتی هەتا مامۆستا زیاتر نەرمونیان بێتو پەنابەرێتە بەر بەڵگەی جوانو نموونەی واقیعیو زانستیانە؛ هەتا زیاتر خۆی ماندو بکات لەئامادەکردنی وتارەکانیدا، هەتا زیاتر دڵسۆزی بۆ خوا بنوێنێ زیاتر جەماوەری لەدەور گرددەبێو وتەکانی لەدەروونو هەڵسوکەوتیاندا رەنگ دەداتەوە.

### سێیەم: دەبێ وتاربێژ دەمو دڵو کردەوەی یەک بێت :

واتە دەبێ وتاربێژ پێشتر وتەکانی خۆی لەدەرونیدا جێکردبێتەوەو بەجوانی جۆشی خواردبێت لەگەڵ هەستو نەستەکانی خۆیدا، بڕوای پتەوی بەو باسانە هەبێ کەدەیانخاتە ڕوو خەڵکیان بۆ بانگ دەکات، لەناخی خۆیدا چەسپاوبێت بەکردەوەیش هەنگاوی بۆنابێت .

بۆنموونە : گەر وتاربێژێك ویستی رۆژوی سوننەتی (٣) رۆژ لەمانگێکدا ، یان رۆژووی عەرەفە زیندوکاتەوە، دەبێ پێشتر خۆی چەند مانگێك ئەوسێ رۆژەی گرتبێت وەئامادەبێت رۆژی عەرەفە خۆیشی بەرۆژو بێت.

لێرەدا هەموو کەسێك دەزانێ ئەگەر وتاربێژێك لەرۆژی جومعەی پێش رۆژوی عەرەفە باسی گەورەیی رۆژووی عەرەفەی کرد، وە بەخەڵکی راگەیاند کەپێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێ: (رۆژوی رۆژی عەرەفە دەبێتە کەفارەتی ساڵی رابوردو داهاتوو) وە لەورۆژەدا خۆی بەرۆژو نەبوو بێئەوەی هیچ عوزرێکی رەوا بخاتە روو، بێگومان هەڵوێستی ئەو خەڵکە بەرانبەری دەگۆڕێو دڵیان لەئاستی وتارەکانی سارد دەبێتەوە، چونکە لەم حاڵەتەدا . گەرچی رۆژوی عەرەفە سوننەت بێت ـ بەڵام مامۆستا دەیەوێ ئەو سوننەتە گەورەیەی پێغەمبەر(ﷺ) زیندوبکاتەوە بێگومان خۆی لەهەموو

---

[1] رضينا بالاسلام دينا ١٠٧.

کەس لەپێشترە کەمامۆستا ئەو قوتابخانەیە بێت، بۆ ئەوەی چەند کەسێ بەقسەی بکەن‌و بناغەی ئەو خێرە دارێژنەوە.

هەروەها لەبەرگری لەخراپەدا (النهي عن المنكر)

واتە: دەبێ مامۆستا خۆی سەرقافڵەی کاروانی وازهێنان بێت لەشتە نارەواکان بۆ نموونە: ئەگەر مامۆستایەك دڵی گرگرتی بۆ ئەم بارە ناهەموارەی ئەمرۆی ئافرەتان کەسەروملو قاچو قول روتی هەموو کوچەو کۆڵان‌و و شوێنەگشتییەکانی داگرتووە؛ دەبێ مامۆستا پێش هەموو کەس قسەکانی لەناوخێزانی خۆیدا رەنگ بداتەوە و کاری پێبکەن، گەروانەبوو بۆی نیە گلەیی لەکەسیتر بکات گەر نەچوون بەدەم وتارەکانییەوە،لەم واتایەدا پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێ:

( يُؤتى بالرجل يوم القيامة فيُلقى في النار فتندلق أقتاب بطنه فيدور بها كما يدور الحمار في الرحا فيجتمع اليه الناس فيقولون : يافلان مالك؟ ألم تكن تامر بالمعروف وتنهى عن المنكر؟ فيقول: بلى ، كنت امر بالمعروف ولا اتيه وانهى عن المنكر واتيه)[1] متفق عليه.

واتە: رۆژی قیامەت پیاوێك دەهێنن فڕێی ئەدەنە ناو ئاگری دۆزەخ ریخۆڵەکانی سکی دەردەپەڕێن‌و سووڕ ئەخوابەدەوریاندا وەك چۆن گوێدرێژی بەرداش بەدەوری بەرداشەکەدا سوڕ دەخوا، خەڵکی دۆزەخ لێی گرد دەبنەوەو دەڵێن: ئەی فلان کەس ئەوەچیتە؟ ئایا تۆ فەرمانت نەدەکرد بەچاکەو نەهیت نەدەکرد لەخراپە؟

دەڵێ: بەڵی فەرمانم دەکرد بەچاکەو خۆم نەمدەکرد، نەهیم دەکرد لەخراپەو خۆم دەمکرد. بوخاری و موسلیم ریوایەتیان کردووە.

ئەمەیش نابێ وای لێ تێبگەین موسڵمان ئامۆژگاریکەس نەکات هەتا تەواو خۆی پاك دەبێتەوە لەگوناه، چونکە بێگوناهی هەر بۆ فریشتەو پێغەمبەرانە( عليهم الصلاة والسلام)بەڵکو مەبەست ئەوەیە وتاربێژو بانگخواز دەبێ چاکەیان غاڵب بێت بەسەر خراپەیاندا، بەکردەوە وتەکانیان بسەلمێنن ، بیروباوەڕیان بەڕێبازی ئیسلام پتەوبێت، ئیتر ئەگەر وردە گوناهیشیان هەبوو یان زۆر هەوڵیان دەدا خێزانی خۆیان بەقسەیان نەدەکردن وەك حەزرەتی لوط(عليه السلام)ئەوەنابێ ڕێیان لێ بگرێ لەقسەی خێر.

وتیان: بەحەسەن فلان کەس فەرمان بەچاکەو رێگری لەخراپە ناکات‌و، دەڵێ دەترسم شتێ بڵێم خۆم نەیکەم، فەرمووی: جاکێمان هەیە ئەوەی کەدەیڵێین بیکەین، شەیتان زۆری پێخۆشە ئەگەر ئەم فێڵەی بۆ بچێتە سەر ، چونکە ئەوکاتە کەس ئەمر بەچاکەو نەهی لەخراپەی بۆ ناکرێت[2].

---

[1] رياض الصالحين تغليظ عقوبة من خالف قوله فعله.

[2] لطائف المعارف، ابن رجب الحنبلي ٥٥.

## چوارەم: وتاربێژ دەبێت خۆگربێت(الصبر):

وتاربێژیی کارێکی ئاسان نیە، وتار واتە: روونکردنەوەی راستی، وتاربێژ دەبێ وتەکانی تەرازوبن دادو ناداد بکێشن، دوانگەی وتاربێژ لە(منصە)ی دادگا پیرۆزترە، نابێ هەواو ئارەزوو یان خزمایەتی و چینایەتی کاریگەری هەبێت لەسەری، بەڵکو چی راست بوو، لەسەرچاوەی قورئان و فەرموودەو ئیجتهادی زانایان سەرچاوەی گرتبوو ئەوە زمانی دوانگەیە.

ئەم ئەرکە گەورەیەش هەروا بەئاسانی ناپوات بەرێوە بەڵکو زۆرجار داوا لەوتاربێژ دەکرێت کەهەڵوێستێ دەربڕێت خۆی باش دەزانێ رەوانیەو نادادیە، ئالەم کاتانەدا پێویستی بەوە هەیە زۆر لەخواترس بێت، رەزامەندی خوابخاتە پێش رەزامەندی هەموو کەس.

دەبێ زۆر باوەڕ پتەوو بەرزبێت دڵ و دەمی یەکبخات، ئەوەی بەراستەو رەوای نازانێ نەیڵێ، ئەگەر قسەی پێکرا لەئاژاوەو ئاڕێکی نێوان دووکەس یان دوولایەن، دەبێ حاکمانە قسە بکات، چاکەو خراپەی هەردوولا ئاشکرا بکات ، تادەتوانێ ناوبژی بکات نەك ئاگر خۆش کات، وە ئەگەر زانی لەشوێنێکدا راستی بۆ ناوترێ بێدەنگ بێت، ئەگەر نەیتوانی داکۆکی لەستەم لێکراو بکات، بەلای کەمەوە ئەوەندە بکات نەبێتە داردەستی ستەمکارو کۆڵی ستەملێکراو قورستر نەکات.

زۆرکات وتاربێژ لەرووونکردنەوەی راستییەکاندا هەندێ کەس یان هەندێ لایەنی لێ زویر دەبن و تووشی جۆرەها ئەشکەنجەو ئازارو تانەو تەشەرەو لەکار دوورخستنەوە دەبێت.

ئەمە کارێکی زۆر ئاساییە بۆیە قورئان لەچەندین ئایەتدا ئاگادارمان دەکات، وەك دەفەرموێ:
﴿ فاصبر كما صبر اولوا العزم من الرسل ولا تستعجل لهم ...﴾ الاحقاف:٣٥.

واتە: خۆ بگرە ئەی(محمد)(ﷺ) هەروەك چۆن پێغەمبەرانی خاوەن عەزمی پێش تۆ خۆگربوون وەك : نوح، ابراهیم ، موسى ، عیسى ، (علیهم السلام) وە پەلەت نەبێ بۆ دابەزینی سزا بۆ سەر ئەو بێ باوەڕانە چونکە ئەو سزایە کاتی دیاری کراوی هەیە هەر دەبێ ببێ[1].

هەروەها قورئان لەسەر زاری لوقمان بۆمان دەگێڕێتەوە کەچەند ئامۆژگاریەکی زۆر جوانی کوڕەکەی کردووە یەکێ لەوانە:

﴿ یا بني اقم الصلاة وامر بالمعروف وانه عن المنكر واصبر على ما اصابك ان ذلك من عزم الامور ﴾ لقمان: ١٧ .

واتە: ئەی کوڕی شیرینم نوێژەکانت بەجوانی و ملکەچییەوە ئەنجام بدە لەکاتی خۆیدا، فەرمان بکە بەچاکەو رێگری بکە لەخراپەو خۆیشت بگرە لەسەر ئەو تەنگو چەڵەمەیەی لەم پێناوەدا توشت دێت، بەڕاستی ئەم خۆگرییە لەوکارە پێویستانەیە کە بڕیاری لەسەردراوە[2].

---

[1] صفوة التفاسير/ محمد علي الصابوني.

گەربمانەوێ ئایەت و فەرموودە لەم بارەوە بنووسین زۆر زۆرن بەڵام ئەوەیشمان لەیادبێت، کەلەخاڵێکی پێشتردا روونمان کردەوە: ئەم خۆگرییە ئەوە ناگەیەنێ وتاربێژ بچێتە سەر دوانگەو هەر لەخۆیەوە قسە فڕێ بدات و تەنگ‌وچەڵەمە بۆ خۆی و دەوروبەری بسازێنێ، بەڵکو دەبێ هەمیشە بپارێتەوە خوا لەبەلا دووری بگرێت، زۆر ژیرانە بدوێ بەدەستی ئەنقەست خۆی تووشی بەڵانەکات چونکە کەم کەس بەرگەی بەلا دەگرن بۆیە پێشەوامان(ﷺ) دەفەرموێ: (لاینبغي للمؤمن ان يُذل نفسه، قالوا وكيف يُذل نفسه يارسول الله ؟ قال: ان يتعرض للبلاء لما لايطيق) رواه الترمذي.[1]

واتە: پێویست ناکات موسڵمان خۆی زەلیل بکات، وتیان: چۆن خۆی زەلیل دەکات ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی بەو شێوەی خۆی بدا بەدەم بەڵایەکەوە توانای نەبێ لەسەری.

بەڵام ئەگەر دوای هەموو خۆپارێزیی و سەلامەتخوازیی و ژیرکارییەك خواستی خوا وەهابوو تووشی تاقیکردنەوەی بکات ئەوکاتە وەك پێشینان فەرمویانە: (قەزا مەێی بەلا مەێی ، ئەگەر هاتی بەخێر بێی)!

دڵنیاش بێت هاتنی بەلا لەم کاتانەدا سڕینەوەی گوناهو سەربەرزی دنیاو پایەبەرزی قیامەتە ئەگەر خۆی بگرێت!

### پێنجەم/ ڕەوشت بەرزیی و بەویقاریی :

وتاربێژ پێشەواو سەرقافڵەی کاروانی ڕەوشت بەرزانە، بۆیە دەبێ خۆیشی زۆر ڕەوشت بەرزبێت، نەرم و نیان بێت، سینەفراوان بێت، بەرێز بێت چاو نەبڕێتە ماڵ و ناموسی کەس خێروبێری لەخوا بوێت.

دەبێ لەئاستی موسوڵمانانندا مل کەچ بێت، ئەم فەرمودەی پێغەمبەر(ﷺ) مامۆستای بێت کەدەفەرموێ: ( وما تواضع احد لله الا رفعه الله...) واتە: هیچ کەس ملکەچی نانوێنێ لەبەرخاتری خوا ئیلاخوا پلەی بەرز دەکاتەوە.

ئەمەیش مانای وانیە خۆی بەسووك بگرێت، یان تێکەڵاو بەکۆڕی هەرزەو نەفام و سەرسووچ و کۆڵان بێت، بەڵکو مەبەست ئەوەیە: فیزی زل نەبێت ( هەرکەس زەڕەیەك فیز لەدڵیدابو ناچێتە بەهەشت).

---

[2] صفوة التفاسير.

[1] التاج الجامع للاصول: ٥ / ٣٠٤.

دەروون بەرزیو کەم تەماعیو بیٚنیازی لەدەستی خەڵك ناچێتە ڕیزی فیز زلیەوە، بەڵکو بانگ خوازو وتاربێژی پێ بەرز دەبێتەوە خەڵکی زیاتر خۆشیان دەوێت پێشەوامان لەم بارەوە فەرموویەتی: (ازهد في الدنيا يحبك الله وازهد فيما عند الناس يحبك الناس)[1] حديث حسن.

واتە: چاومەبڕە دنیاو دڵی پێ دامەێنە خوا خۆشی دەوێیت، چاو مەبڕە ماڵی خەڵك ، خەڵکیش خۆشیان دەوێیت.

خەتەرناکترین جۆری وەرگرتنی دیاریو ماڵو سامان ئەوەیە وتاربێژ لەپاشاو گەورە پیاوانی وەردەگرێت، زیاد لەموچەی بڕدراوی خۆی بۆیە پێشینانی ئەم ئوممەتە بەتایبەت پێشەوا شافیعی سەرمەزهەبی، ئێمە زۆر بێنیازو دورە پەرێز بوون لەگەورە پیاوانو دەستەلاتداران وەك خۆی دەفەرموێ:

| | |
|---|---|
| رأيت القناعة رأس الغـنى | فصرت بأذيالها متـمسـك |
| فلا ذايراني على بابه واقفا | ولاذا يراني به منهمـــك |
| فصرت غنياً بلا درهـــم | أمر على الناس شبه الملـك[2] |

واتە: بینیم قەناعەت سەری دەوڵەمەندیە، بۆیە بەتوندی دەستم گرت بەدامێنییەوە، لەبەردەرگای کەسدا ناوەستم خۆیشم بەکەسەوە خەریك ناکەم، دەوڵەمەندبووم بەبێ درهەم تێدەپەڕم بەلای خەڵکدا لەشێوەی پاشادا.

دەگێڕنەوە: ڕۆژێك (ابراهيم پاشا) چووە مزگەوت خەڵکی مزگەوت هەموو لەبەری هەستان (شێخ سەعیدی حەلەبی)یش لەوکاتەدا لەناو مزگەوتەکەدا قاچی درێژکردبوو هیچ خۆی تێك نەداو قاچیشی کۆنەکردەوە، پاشا زۆرقینی هەستا دوسیجار بەبەردەم شێخ سەعیددا تێپەڕی هەندێ خۆی خوارکردەوە، شێخ سەعید نەجولا، ئەمجا پادشا کیسەیەك پارەی دایە دەستی یەکێك لەپیاوەکانیو وتی: بیبە بۆ شێخ، کابرا پارەکەی برد، لەکۆشی شێخدا داینا، ئەویش فەرمووی: بڕۆ بەگەورەکەت بڵێ: ئەوکەسەی قاچی درێژ دەکات دەستی درێژ ناکات)[3] .

## شەشەم/ دەبێ وتاربێژ پلەی زانستی بەرز بێت:

مەبەستم بەپلەیزانستی ئەوە نیە وتاربێژ خاوەنی بڕوانامەی ماستەر یان دکتۆرا بێت هەرچەند ئەمە لەهەندێ ولاتدا بەمەرج گیراوە بۆ پلەی وتاربێژیی، لەیادمە کاتێ ئێمە لەکۆلیجی شەریعە دەمانخوێند قوتابییەکی ئەندەنوسی یان مالیزی بوو؛ لەوکاتەدا کرابوویە پێشنوێژی

---

[1] الاربعين النووية : ٣١.

[2] ديوان الامام الشافعي ، قافية الكاف.

[3] کاریگەری عەقیدە ، عمر احمد نظامي/ ٧٤.

بەیانیانی مزگەوتی گەیلانی لەبەغداد، نـاوی (عبدالفتـاح بوخـاری)بـوو دەیـوت: لـەوڵاتی ئێمـە هەرکەس خاوەنی بڕوانامەی ماستەرنەبێت ناکرێت بە(خطیب).

راستە ئەمە بۆ ئـەمڕۆی کوردسـتانی ئێمـە دەس نـادات، بـەڵام ئـەبێ ئەوەیشـمان لـەیادبێت، بڕوانامەی مەلایـەتی ناوچـەی کـوردەواری(الاجـازة العلمیـة) کەمتر نـەبووە لەماسـتەرەکانی ئـەمڕۆ ئەگەر زیاتر نەبووبێت، تەنانەت وشـەی (لیسـانس) هـەر بەمانا ئیجازە دێت، وشـەی(دکتـور)یش بەکەسێك دەوترا زانستی‌یەکی ئاشکرای هـەبێت، هـەرلێرەوە جولەکەکان بەحاخامـەکانیان دەوت: دکتۆر، واتـە: ئـەو زانایـەی ئاگادارە لەشـەریعەتی تـەورات، گاورەکـانیش(دکتـۆر) یـان بەکەسـێك دەوت:کەراڤەی ئینجیلیان بۆ بکات، ئـەم وشـەیە لەچەرخی دوازدەیەمدا زانکـۆی پۆلۆنیا بـەکاری هێنا بۆ قوتابی‌یەکانی خۆی دوای دەرچوونیان، دوای ئەو زانکۆی پـاریس بەکاری هێنـا[1] ئـەمجا زانکۆکانی تـری جیهان بـەکاریان هێنـا، کـەوابوو ئـەم وشـانە لەبنـەڕەتدا لـەئاینی جولەکـەو گـاور وەرمان گرتووەو بڕوانامە پیرۆزەکانی خۆمان پێ‌کوژاندەوە[2] .

لێرەدا ئێمە نامانەوێ لەشانی ئەم وشانە کەم بکەینەوە چونکە بنەڕەتیان هەرچۆن بێـت ئـەمڕۆ رەمزی زانستین، بەڵام پێویستە ئێمـەی موسـڵمانیش بزانین لـەمێژووی ئیسـلامدا بڕوانامـەی زۆر لەوە بەرزتر هەبووە، کەچی بەداخەوە ئەمڕۆ خۆیشـمان رێـزی لێنـاگرین و بەکەم بایـەخ تەماشـای دەکەین، بەڵکو ئەمڕۆ وەك نەخوێندەوارو بێ بڕوانامە حسابیان بۆ دەکەین!.

کەوابوو وتاربێژ پێویستە بڕوانامەی مامۆستا پێشینەکانی پێ‌بێت، یان بڕوانامـەی کۆلێجـی زانسـتە ئیسـلامی‌یەکانی پـێ‌بێـت، وەهـەرکامیان بـوو گرنـگ ئەوەیـە ئاگـاداربێت لـەقورئان و فـەرموودەکانی پێغەمبـەر(ﷺ) ئاگـاداربێت بەشـەرع و زانسـتەکانی رەوانبێـژی و لۆژیـك و(اصـول الفقه)و (علوم الحدیث) و، زمانی عەرەبی بەتایبەت (نحو وصرف) .

هـەروەها دەبێ بەگوێرەی پێویستی کارەکەی ئاگاداری مێژوو جوگرافیـاو زانسـتەکانی تـری سەردەم بێت، هەروەك چۆن پێویستە ناوی ئەو ئامێرو کەناڵە جیاجیانە بزانێت، کەئەمڕۆ بوونەتە هۆکاری راگـەیاندنی جیهانی، بەڵکو هەقە دەورەیـان لەسـەر ببینـێ‌و تاڕادەیـەك شـارەزایان بێـت بۆئەوەی بەرچاو ڕوونانە لێیان بدوێت و سوودو زیانەکانیان بەخەڵك بڵێ.

لەیادمە مامۆستایەك ئامۆژگاری کۆمـەڵێکی دەکـرد، ئـەم فـەرموودەی بـۆ راڤەکردن: ﴿اتـق الله حیثما کنت ، واتبع السیئة الحسنة تمحها ...﴾[3].

---

[1] منهج البحث الادبي ، د. علي جواد الطاهر، لا: ٣٩.

[2] هەمان سەرچاوەی پێشوو/٤١،٤٢.

[3] الاربعین النوویة.

بەلاَم ئەو بەرێزە دەیخوێندەوە:﴿واتَّبِع السيئةَ﴾ کەماناکەی سەرەو نخون دەکات، چونکە: یەکەمیان بەمانا ئەوەیە ئەگەر خراپەیەکت کرد چاکەیەکی بەدوادا بنێرە چاکەکە خراپەکە دەسرێتەوە، بەلاَم بەشێوە خوێندنەوەی دووەم مانای : دوای گوناه بکەوە.

مامۆستایەکی‌تر لەبەغداد بۆی گێرامەوە وتی: ڕۆژێ وتاری هەینیم دەخوێندەوە لەمزگەوتێکی زۆر قەرەباڵغدا لەباسەکەدا وشەی (فِي القُمة) م بەکارهێنا بە(ضمة) ی قاف، د. عبدالستار الجواری ـ ڕەحمەتی خوای لێ بێت ـ لای من نوێژی جومعەی دەکرد، کاتێ نوێژمان کرد هاتە لام و فەرمووی: ( یا شیخ لا تَقل القُمة بل القِمة) واتا وشەکە بە(کسرە)ی قاف بڵێ نەك بە(ضمّة) چونکە بە(ضمّة) مانای : زبڵدانە بەلاَم بە(کسرة)بەمانای سەرلوتکەی هەرەبەرزە لەهەموو شتێکدا کەوابوو بەیەك بزوێن ئەوەندە ماناکە دەگۆڕێ.

خۆیشم شایەتی ئەدەم ڕۆژێك لەپشتی مامۆستایەکەوە لەسلێمانی نوێژی جومعەم کرد کاتێ وتارە عەرەبی‌یەکەی خوێندەوە نەیتوانی یەکدێڕ عەرەبی بەڕاستی بخوێنێتەوە، لەهەموو وتارەکەیدا یەك ئایەتی تیابوو ئەویشی بەهەڵە خوێندەوە. بۆیە دەبێ وتاربێژ وێڕای ئەم زانستیانەیش باسمان کرد دەبێ ئاگای لەڕۆشنبیری و بارو دۆخی سەردەم بێت هەتا ئەرمانەکانی شیفابەخش بن.

## هەوتەم/ وتاربێژ دەبێ ڕەوانبێژو دەم پاراوبێت:

ئەم مەرجە هەندێکی لەدەستی وتاربێژەکە خۆیدایە، بەلاَم زۆربەی لەدەستی خۆیدانیە بەومانایە پێویستە وتاربێژ زمانی ڕەوان و پاراوبێت بۆ دەربڕینی وشەکان، گرتنی تیانەبێت، پیتەکان لەهاویژگە(مخرج) ی خۆیانەوە دەربکات پیتێك نەگۆڕی بەپیتێکی‌تر وەك هەندێ کەس (ز) دەگۆڕن بە(ذ) یان (س) بە(ث) یان(ر) بە(غ) وە ئەم توانایە بەهرەیی‌یە، واتە خوا دەیبەخشێ بەهەندێکو نایبەخشێ بەهەندێکی‌تر، بۆیە دەستەلاَتی ئێمەی تێدانیەو بەهەوڵ و کۆشش بەدەست نایەت.

بەلاَم هەندێ شتی‌تر لەڕەوانبێژیدا لەتوانای وتاربێژیدا هەیە: وەك ئەوەی خۆی ماندو بکات ئەو ئایەت و فەرموودەو سەرگوزشتانەی پەیوەندی بەباسەکەیەوە هەیە جوان لەبەریان بکات ئامادەیان بکات چەند جار بیانخوێنێتەوە، یان لەشوێنێکی چۆڵدا پێشتر بەدەنگی بەرزو وتارەکەی بیخوێنێتەوە. هەتا ڕابێت لەسەری، یان لەناو کۆمەڵێکی کەمدا لەدۆست و یارەکانی یان فەقێکانی خۆی بیخوێنێتەوە هەتا شەرمی بشکێ و هەڵەکانی ڕاست بکاتەوە، چونکە وەك پێشینان فەرموویانە: ( هیچ کەس لەپڕێ نابێتە کوڕێ) یان ( سوار تانەگلێ نابێتە سوار) وە چەندین پەندی تر لەم بارەوە هەیە.

بۆیە زۆر ئاسایی‌یە ئەگەر وتاربێژ لەجاری‌یەکەمدا بپەشۆکێ یان گیانی بلەرزێ، یان قسەی بۆ نەکرێت، وەنابێ ئەم جۆرە شتانە کاربکەنە سەردەروونی بەشێوەیەکی سەلبی‌و دووری بخەنەوە لەوکارە پیرۆزە، بەڵکو پێویستە زۆر بەژیرانە خۆی رزگار بکات‌و بەوشەیەکی جوان کاتەکە بگوزەرێنێ وەك ئەوەی دەگێرنەوە:

حەزرەتی عوسمانی کوڕی عەففان ـ رەزای خوای لێبێت. کاتێ کرا بە خەلیفە بۆیەکەم جار چوویە سەر دوانگە زمانی گیراو قسەی بۆنەکرا فەرمووی: ( ایها الناس ان اول مرکب صعب وان اعِش تاتکم الخُطب علی وجهها وسیجعل الله بعد عسریسراً)[1] .

واتە: ئەی خەڵکینە یەکەم سوار بوون سەختە، ئەگەر ژیام وتارەکانتان بەشێوەی خۆی پێدەگات خوای گەورە دوای کاری سەخت ئاسانی دەنێرێ.

هەروەها (ثابت کوڕی قطنة)چووە سەر دوانگە لەسجستان کاتێ ویستی قسە بکات قسەی بۆ نەهات وتی: ﴿ وسیجعل الله بعد عسر یسراً وبعد عیّ بیاناً وانتم الی امیر فعّال احوج منکم الی امیر قوّال )[2].

واتە: خوای گەورە دوای سەختی ئاسانی دەبەخشێ وە دوای زمان گیران زمان رەوانی ، ئێوە پێویستتان بەگەورەیەکی کردار رەوان زیاترە لەگەورەیەکی گوفتار رەوان.

وە هەندێ جار وتاربێژ لەکاتی وتاردان یان دوای وتار پرسیارێکی لێدەکرێ یان رەخنەی لێدەگیرێ یان رووداوێکی چاوەروان نەکراو بەرەو رووی دەبێتەوە دەبێ زۆر حازو زەین‌و بەدەستو برد بێت بۆ چارەسەری ئەوحاڵەتانە بەوەڵامێکی جوان یان بێدەنگی یەك مانای ژیری‌و لێوەربگیرێ، چونکە بێدەنگی لەهەندێ کات‌و بەرانبەر بەهەندێ کەس کاریگەرترین وەڵامە.

بۆنموونە دەگێرنەوە یەکێ لەخەلیفە عەباسی‌یەکان چووە سەر دوانگە وتاربخوێنێتەوە مێشێك نیشتەوە بەرومەتی‌یەوە، دەری کرد هاتەوە، دیسان دەری کرد هەر هاتەوە، چەند جارێ ئەمە دووبارەو سێ بارەبوویەوە تەنگەتاوبوو زەینی شڵەژاو ئەم ئایەتەی خوێندەوە:

﴿ یا ایها الناس ضُرب مثل فاستمعوا له ان الذین تدعون من دون الله لن یخلقوا ذباباً ولو اجتمعوا له وان یسلبهم الذباب شیئاً لایستنقذوه منه ضعف الطالب والمطلوب ﴾الحج / ٧٣ دوای ئەوە دابەزی، خەڵکەکە ئەم هەڵوێست‌و خۆ دەربازکردنەیان زۆر بەلاوە جوانبوو[3].

---

[1] فن الخطابة د. احمد محمد الحوفي/ ٢٠.

[2] فن الخطابة/ ٢٨ ، ٥٥٥ طريقة وصية /٢١ .

[3] فن الخطابة : ٢٨ .

یان دەوگێڕنەوە: ( عد ی کوری زیاد الایادی) لەوتارێکدا وتی: من پێتان دەڵێم وەك چۆن پیاوە صالحەکە بەهۆزەکەی خۆی گوت: ﴿ ما اریکم الا ما اری وما اهدیکم الا سبیل الرشاد ﴾ غافر : ٢٩

یەکێ لەئامادەبووان وتی: ئەمە وتەی فیرعەونە نەك پیاوە صالحەکە(عدی) وتی: وتەی هەرکەس بێت چاکی وتووە.

بەکورتی وەك عەرەب دەڵێن: ( کل صارم ینبو وکل جواد یکبو) هەموو شمشێرێکی بڕندە کول دەبێ، هەموو ئەسپێکی خۆش ڕەویش سەرسمت دەدات و دەکەوێت، بەڵام گرنگ ئەوەیە ڕۆژ بەڕۆژ جار بەجار وتاربێژ بەرەو پلەوپایەیەکی بەرزتری ڕەوانبێژی هەنگاوبنێت و هەڵەکانی زۆر کەم بکاتەوە.

## هەشتەم/ جوانی جلوبەرگو دیمەن:

جوانی جلوبەرگو رێك و پێکی شێوەو دیمەن کاریگەریەکی زۆری هەیە بۆ سەر هەست و دەروونی گوێگران، مەبەستیش بەجوانی جلوبەرگ تازەیی و گرانبەهایی نیە، مەبەستیشمان بەجوانی دیمەن بالأی بەرزو چاوی ڕەش و کوڵمی سورنیە، چونکە ئەم جۆرەشتانە بەدەستی مرۆڤ نیە، هەرچەند بونیشیان جوانی یەکی زیاتر دەبەخشێ بەوتاربێژ، بەڵام ئەگەر نەیشبوو تەنها نەبوونی ئەم شتانە وتاربێژ ناشکێنی، مەگەر ناتەواویەکی تری تیابێت ئەوکاتە ئەمانەیشی بۆ دەکرێتە پاڵپشت.

بەڵکو مەبەستمان بەجوانی جلوبەرگو دیمەن ئەوەیە وتاربێژ پۆشاکێکی گونجاو لەبەرکات بگونجێ لەگەڵ پلەوپایەو کات و شوێنەکەدا بەشێوەیەکی نامۆو دوور لەعورفی ئەو سەردەمە نەچێتە بەردەم جەماوەر، چونکە هەر کۆمەڵێك بەرگێکی تایبەتی خۆی هەیەولەناو خەڵکدا پێی ناسراون ئەگەر ئەو بەرگەیان دانا ڕێزیان دادەبەزێت، بۆ نموونە گەر پزیشکێك لەخەستەخانە (صدریە) سپی یەکەی دابنێ و قاتێکی کوردی لەبەرکات سام و هەیبەتی خۆی لەدەست دەدات.

وەلەم بارەوە پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێ: ﴿ ان الله جمیل یحب الجمال ﴾ واتە: خوا جوانەو جوانی خۆش دەوێ.

(جاحظ) دەڵێ: (زەیدی کوری جندب) دانەکانی ڕەش و چڵکن بوون ئەگەر وانە بوایە لێهاتووترین وتار بێژی عەرەبەکان بوو.

لەگەڵ ئەمەیشدا زۆر جار لێهاتوویی وتاربێژو ڕەوانبێژی و دەنگ بڵندی یەکەی زاڵ دەبن بەسەر نەگونجانی دیمەنیدا، وەك دەگێڕنەوە: پاشای (حیرە) (نعمان)ی کوری (منذر) هەواڵی(ضمرة)ەی موعەیدی بیستبوو بەچاکی و لێهاتوویی، خۆزگەی دەخواست ببینێ، کاتێ بینی لاوازو

ناشیرین   بوو بەسوك تەماشای كردو وتی: (تسمع بالمعيدي خير من ان تراه )[1].واتە: موعەیدی هەواڵی ببیستی  باشترە لەوەی ببینی(ضمرة) لەوەلامیدا وتی: ( ابيت اللعن) واتە: دوور بیت لەكارێك لۆمەت بكرێ لەسەری پیاوان ناپێورێن بەكەوو بێژنگ ، بەڵكو مرۆڤ بەدووشتی بچووكی دەپێورێ دڵی و زمانی[2].

## نۆیەم/ كۆڵنەدان:

یەكێكی‌تر لەسیفاتی وتاربێژی سەركەوتوو كۆڵنەدان و دەس هەڵنەگرتنە، حەزرەتی نوح(عليه السلام)(٩٥٠)ساڵی ڕەبەق بانگەوازی كرد لەناو قەومەكەیدا، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ ولقد ارسلنا نوحاً فلبث فيهم الف سنة الا خمسين عاماً فاخذهم الطوفان وهم ظالمون ﴾ العنكبوت:١٤

واتە: ئێمە نوحمان نارد بۆ ڕێنمایی قەومەكەی(١٠٠٠) ساڵ جگە لەپەنجا لەناویاندا مایەوە بانگی دەكردن هەر كۆڵی نەدا دوای ئەوە دوعای لێكردن و خوا خنكاندنی بەلافاو.

ئێمەیش ئەگەر وەك پێغەمبەرانیشمان پێ‌نەكرێت و ئەوەندەی نوح تەمەنمان نەبێت، پێویستە لەوتەمەنە كورتەی خوا بەئوممەتی محمدی بەخشیوە خۆگریمان هەبێت و بڕوامان پتەوبێت بەوەی سەركەوتن هەر بۆ ئاینی ڕاستی‌یەو ڕاستی‌پەروەرانە ﴿ولينصرنَّ الله من ينصره ان الله لقوي عزيز﴾ الحج: ٤٠

واتە: بەدڵنیایی خوا ئەوكەسە سەردەخات كەهەوڵ بدات بۆ سەرخستنی ئاینی خوا بەراستی خوا زۆر بەتواناو خاوەن دەسەڵاتە هەروەها دەبێ دڵنیابین مانەوەو ڕەگ داكوتان هەر بۆ وشەی جوان و خاوێنە، وشەی چەپەڵیش بێ‌ڕەگ و ڕیشەیەو بنكی نیە لەزەویدا، وەك قورئان ئەم ڕاستی‌یەمان بەڕوونی تێدەگەیەنێ كەدەفەرموێ: ﴿ ضرب الله مثلاً كلمة طيبة كشجرة طيبة اصلها ثابت وفرعها في السماء، تؤتي اكلها كل حين باذن ربها ويضرب الله للناس لعلهم يتذكرون، ومثل كلمة خبيثة كشجرة خبيثة اجتثت من فوق الارض مالها من قرار ﴾ ابراهيم: ٢٤ . ٢٦

واتە: خوای گەورە نموونە دێنێتەوە : وشەی خاوێن وەك درەختێكی جوان و خاوێن وەهایە بنك و ڕیشەكەی لەناخی زەویدا چەقیوەو لق و پۆكانی هەڵچووە بۆ ئاسمان، وشەی خاوێن(لا اله الا الله) یە درەختی خاوێن باوەڕدارو لایەنگرانی ئەو وشەیەن، بەڵام وشەی پیس هەردەڵی‌ی درەختێكی پیسە وەك درەختی گوژاڵك كەبنكەكەی لەزەوی كێشرابێت تەمەنی كورتەو بەرقەرار نابێت) .

---

[1] ئەمە پەندێكی عەرەبی‌یە دەوترێ بەكەسێك هەواڵی پێشینی باشتربێ لەشێوە و دیمەن، ئەم پەندە یەكەم كەس (منذر)ی كوری (ماء السماء)وتی: بە(مشقه)ی كوری(ضمرة)ی معیدی كاتێ كەبینی ناشیرین بوو ( المنجد : فرائد الادب)

[2] فن الخطابة / ٤٠.

مەبەست ئەوەیە وتاربێژ نابێ کوڵ بداو ساردببێتەوە ئەگەر بینی خەڵك زۆر نەهاتن بەدەمیەوەو قسەکانی کاریگەرنەبوون.

لێرەدا حەزدەکەم چەند دێڕێکی تەفسیری(فی ظلال القران)نەقڵ بکەم بۆ خوێنەری بەڕێز کەلەسەر ئەم ئایەتانە نوسیویەتی کەدەفەرموێ:

( وشەی خاوێن وشەی راستی وەك درەختێکی خاوێن و بەرزو بەردار چەقیوە لەناخی زەویدا؛ گێژەڵوکەو گەردەلوول نایجوڵێنێ و بنکەنی ناکات، پاچ و قوڵنگی ستەمکاران بنکوڵی ناکاتو پەی بەرەگو ریشەی نابات، چونکە ریشەو تۆوەکەی رۆژ بەرۆژ لەدڵاندا زیاتر رەگ دادەکوتێ و سەوز دەبێ، باهەندێ کەسیش وابزانن هێزی خراپەو بەدکاری بەرەنگاری بووەو لەوانەیە لەناوی بەرێت.

بەڵام وشەی پیس و چەپەڵ وەك درەختێکی پیس وەهایە، کە رەگو ریشەی لەزەوی برابێت بێگومان مانەوەی نابێت هەرچەند هەڵچێ بەحەواداو لق و پۆکانی بچن بەناویەکداو هەندێ کەس گومان وابەرن بەرزو بڵندترە لەدرەختی خاوێنی باوەڕ، چونکە درەختێکی کلۆرو کرمۆڵەو لەبنی زەوی بچڕاوەو بەرقەرار نابێت.

مامۆستا محمد احمد راشد دەڵێ: ڕۆژێك لەگەڵ د. عادل الشیوخ ـ رحمه الله ـ باسی ئەوەمان کرد کەخەڵك گەرمو گوڕییان نەماوە لەگوێگرتنی وتارەکانمان پرسیارو گەشەیان پێوەدیار نیە لەکاتێ قسەکانی ئێمەدا، بۆیە هەردووبڕیارمان دا ئیتر بێدەنگ بین و وتار نەدەین، خوای گەورە ویستی دەرمان بێنێ لەو هەڵەیە، ڕۆژێك هەردووکمان لەفرۆکەخانەی ئەستانبوڵ دانیشتبووین چاوەڕێی سەفەر بووین، گەنجێك هاتە لامان خۆی دانەواندو لەمنی پرسی: تۆ محمد ئەحمەد راشدی؟ وتم:بەڵێ، ئایا پێشتر یەکمان دیوە؟ وتی: نەخێر من تۆم دیوە لەکاسێتی ڤیدیۆدا.

وتم: تۆکێی؟ وتی: ناوم (خالد الموساوی)یە خەڵکی (وادی سوف)م لەجەزائیر، کەهەزار کیلۆمەتر دوورە لەپایتەختەوە لەسەر کەنارەکانی بیابانی ئەفریقیا نزیك مەرزەکانی تونس، ئێمە لەوێوە پەڕاوەکانت دەخوێنینەوەو گوێ لەکاسێتەکانت دەگرین، پێشوازی گەرممان لێکردو چەند پرسیارو وەڵام کەوتە نێوانمان لەپاشدا هەناسەیەکی قوڵی هەڵکێشاو وتی: هێشتا نیوەی ئاواتەکەم نەهاتۆتە دی چونکە د. عادلم نەناسیوە؟ !

وتم: دەڵێی چی گەر لەگەڵ خۆم بتبەم بۆ (دبی) تا عادلت پێ بناسێنم ؟ وتی: ئەو رۆژە جەژنی منە چونکە ئێمە گوێ لەدەرسەکانی دەگرین و تائێستا وێنەیمان نەدیوە.

لێرەدا د. عادل ـ رەحمەتی خوای لێبێت ـ هاتە گۆو پرسیاری ئەو دەرسانەی کرد کە گوێی لێ بووە ئەویش سەرباسەکانی پێوت د. عادل لێی پرسی : فلان دەرس چی دەڵێ؟ کورتەی دەرکەسەی لەبەربوو وتی: ئاواو ئاوا، تاچەند دەرسێکی لێ پرسی ، وەڵامی هەمووی دایەوە

بەجۆرێك سەرسامی کردین، ئەمجا کەزانیم راستەکات لەئاواتەکەیدا وتم: دەی ئەوە(عادل)ە والەبەردەمتاو تاقیت دەکاتەوە،گەنجەکە باڵی گرت لەخۆشیداو سەرسام بوو لەو قەدەرە کورت وپڕەو چاوەڕوان نەکراوە، لەپاشدا پەڕاوی (الموافقات)ی لەهەگبەکەی دەرهێناو وتی: ئەم کتێبەم بۆیەکڕیوە چونکە گوێم لێت بووە لەدەرسێکدا زۆر وەسفت کردو فەرموت: پێویستە هەموو بانگخوازێك بیخوێنێتەوە[1].

منیش بۆیە ئەم بەسەرهاتەم نوسی تاوتاربێژە بەڕێزەکانمان کۆڵنەدەن و لەهەر لایەکدا گونجا قسەی خێری خۆیان بکەن، مەرج نیە، تەنها لەجومعەدا بەڵکو لەپرسەو مندالْ ناونان و شایی و هەموو کۆڕو کۆمەڵێکدا، گرنگ ئەوەیە تەنها(اخلاص) لەدەس نەدەن، پشت بەخوا لەهەموو وتارێکدا چەند کەسێك سوودمەند دەبن و چەند نەمامێکی جوان دەڕوێن بائێمەش پێیان نەزانین، سبەی رۆژ ئەوانە دەبن بەخێری نەبڕاوە بۆمان و لەکاتێکدا ئێمە هاوڕازی گڵین لە( دار العمل) دا نەماوین بەشداری چاکەی ئەواندەبین چەند خۆشە بتوانین بەخۆمان یان بەهۆی خێرەومەندانەوە وتارەکانمان تۆمار کەین لەسەر رووبەری کاغەزو کاسێتی تەسجیل و ڤیدیۆ ...هتد بۆئەوەی بەمردنی خۆمان ئەوان نەمرن و شوێنەواری دەنگ و رەنگمان لەناو خەڵکدا بمێنێ بەڵکو ئەوانیش لەیادمان نەکەن و پەیتا پەیتا بۆمان بپاڕێنەوە.

# فەسڵی سێیەم
# چۆنێتی داڕشتن و ئامادەکردنی وتار

(وتیان: بە(عبدالملك کوڕی مەروان) بۆچی زوپیربوویت ئەی میری موسڵمانان؟ وتی: چۆن زوو پیر نەبم کەمن هەموو جومعەیەك جارێك یان دووجار عەقڵی خۆم ئاراستەی خەڵکی دەکەم. یان وتی: سەرکەوتن بۆسەر دوانگەکان و ترسی هەڵەکردن پیری کردم.

---

[1] د.عادل الشیوخ: ساڵی ١٩٤٦ ، لەناوچەی(ابو الخصیب) لەبەصرە لەدایك بووە، لەزانکۆی بەغدا فیزیای خوێندوە، وانە شەرعییەکانیشی لەکولیجی(الدراسات الاسلامیە) ی هەمان زانکۆ خوێندوە، پاشان کۆچی کردووە بۆ بەریتانیاو دکتۆرای لەفیزیادا بەدەست هێناوە، چەند ساڵێك لەزانکۆی(ریاض) وانەبێژ بووە، هەر لەوێش ماجستێری لە(اصول الفقە)دا بەدەست هێناوە، لەکۆتاییدا لەوڵاتی (الامارات العربیة)نیشتەجێ بووەو شورەتێکی زۆری پەیدا کردووە، خۆشەویستی بانگەوازەکەی و خۆشەویستی کوردستان هەڵیدەنێ بۆ سەردانێك بەیاوەری د. علی قەرەداغی) و چەندین وتاری لەسلێمانی و دەورووبەر پێشکەش کرد، تا لەرۆژی شەممە ١٤ صفر /١٤١٤ ، ٢٤/تەمموز/١٩٩٣ز بەڕووداوێکی سەیارە لەرێگای دوکاندا گیانی سپاردو تەرمەکەی لەگۆڕستانی (شێخ ئەحمەدی هیندی) ئەسپەردەکراو بوو بەدراوسێی کوردەکان هەزاران رەحمەتی خوای لەسەربێت!.بڕوانە: (مسافر في قطار الدعوة) د. عادل الشیوخ، ل٩ ـ ١١ .

راستە وتاربێژ عەقڵی خۆی شیی دەکاتەوە بۆ گوێگرانی، مەودای وتەکانیشی فراوانو بێ سنوورە...چونکە لەکاتێکدا باس لەرامیاری دەکات پێویستی بەمێژووە، پێویستی بەئاینە پێویستی بەیاسایە، کاتێ باس لەئاین دەکات دیسانەوە پێویستی بەم شتانەیە ، پێویستی بەشارەزایی کۆمەڵگایە، لەکاتێکدا باس لەحوکمو بریار(القضاء)دەکات دەبێ ئاگاداریشەرعو یاساو زانستی دەروونو... تاد بێت، لەهەموو ئەم لایەنانەیشدا ناتوانێ سەرکەوتووبێت تاشارەزایی تەواوی لەزمانو ئەدەبو رەوانبێژیدا نەبێت، وەهەتا زانستییەکانی فراوانترو چڕو پڕتر بێت وتارەکانی بەتامو چێژتر دەبنو بەڵگەکانی بەهێزتر دەبن و کاریگەری زیاتری دەبێت)[1].

بۆیە بەڕاستی ئامادەکردنی وتار کارێکی ئاسان نیە، دەبێ وتاربێژ زۆر ماندوبێت تا ئەو وتارە لەهەستو زەینو دەروونی خۆیدا جوان پێبگاو لەسەرخۆ بکوڵێت، ئەمجا دەرخواردی هەستو بیری گوێگرانی بدات، ئەگینا وتەکانی کرچو کاڵ دەبنو سوودیتەواو ناگەیەنن، یان هەندێ جار زیانیشیان دەبێت، (چونکە ئەوە زۆر گرنگ نیە تۆ چەندێك دەزانی، هەر چەند ئەوەیش گرنگە. بەڵام ئەوە زۆر گرنگە تاچەندێك دەتوانی ئەو زانیارییەی کەهەتە بیگەیەنی بەوانەی کەنایزانن)[2].

## ئامادەکردنی وتار بەتایبەت وتاری هەینی پێویستی بەدوولایەن هەیە:

**لایەنی یەکەم:** ئامادەکردنی زانستی، ئەویش بەوە دەبێ وتاربێژ زۆر بەوردی باسەکەی بخوێنێتەوە لەسەرچاوەکاندا، بۆ ئایەتەکان بگەڕێتەوە بۆ قورئانی پیرۆزو بەجوانی لەبەریان بکات یان بیاننوسیو سەروبۆریان بۆدابنێت، بۆ فەرمودەکان بگەڕێتەوە بۆ پەڕاوەکانی فەرموودە، ئەوانەی کەجێگای متمانەن وەك: ریاض الصالحین ، تاج الاصول، اقتران النیرین، یان سەرچاوە بنەڕەتییەکان وەك صەحیحی بوخاری، صەحیحی موسلیمو سونەنی نەسائی و ابن ماجەو ...هتد.

پێویستە وتاربێژ زۆر وریابێت لەبواری فەرمودەدا، فەرموودەی هەڵبەستراو (الموضوع) نەخاتە ناو وتارەکەی، بۆ فەرموودەی لاوازیش (الضعیف) تەنها لەوشوێنانەدا ئاماژەیان پێ بکات کە دروستە کاریان پێ بکرێت وەك زانایان بڕیاریان داوە فەرموودەی لاواز بەسێ مەرج دروستە کاری پێبکرێت:

**مەرجی یەکەم:** نابێ زۆر لاوازبێت.

**مەرجی دووەم:** دەبێ یاسا بنەڕەتییەکانی شەرع پاڵپشتو یارمەتیدەری بێت.

---

[1] فن الخطابة، / ٢٢.

[2] ٥٥٥ طريقة ووصية :٤٣.

**مەرجی سێیەم:** نابێ لەباسی حوکمو حەڵاڵو حەرامو دروستو نادروستدا بێت، بەڵکو هەڵنان بێت بۆکردەوەی چاكو رەوشتی بەرز[1].

ئەو چیرۆكو سەرگوزشتانەیش تێهەڵکێش دەکرێن لەناوەڕۆکی وتارەکەدا ئایا کۆن بن یان نوێ دەبێ لەسەرچاوەی باوەڕپێکراوەوە وەرگیرابن، ئیتر سەرچاوەکان کتێب بن یان گێڕانەوە، یان دەگونجێ وتاربێژ خۆی دیبێتی، وەهەروەها دەبێ گونجاو بێ لەگەڵ باسو شوێنو کاتەکەدا. پێویستە وتاربێژ ئەوباسانەی پەیوەندی بەوتارەکەیەوە هەیە هەمووی بخوێنێتەوە ئەمجا تەتەڵەی بکات ئەوەی پێویست نیە یان ناگونجێت نەیخاتە ناو وتارەکەی، ئەوەیشی دەگونجێت بەجوانی دایبڕێژێتو ئامادەی بکات.

ئامادەکردنی وتار جۆری زۆرە هەندێ کەس دەینووسنەوە وەك باسێکی زانکۆیی لەسەر لاپەڕە، هەندێ کەس لەدڵی خۆیاندا بیری لێدەکەنەوە هەر بەخەیاڵ ئایەتو فەرموودە پێویستەکان لەسەر لاپەڕەی دەروون ئامادە دەکەن لەساتێکی بێدەنگیو دوور لەئاڵۆزیو قاڵەقاڵدا، وە هەندێ کەس تەنها ئایەتو فەرموودەو سەرباسە گرنگەکان دەخەنە سەر وەرەقەیەکی بچووكو بەدەستییەوە دەگرنو لەکاتی پێویستدا بۆی دەگەڕێنەوە، باشترین رێگەیش بۆ ئامادەکردنی وتار ئەوەیە باسەکە بنوسرێتەوەو ئامادە بکرێت، ئایەتو فەرموودەو خاڵە گرنگەکانی لەبەردەم وتاربێژدا دابنرێت، بەڵام وتاربێژ پەیوەستیش نەبێ بەوونوسراوە بەڵکو وردبێتەوە لەئامادەبوانو بەگوێرەی داخوازییەکانی کاتو شوێن گۆڕانکاری تێدا بکات وە ئەگەر شتێکی لەیادچوو بەخێرایی تەماشای بەردەمی بکاتو زوو سەرهەڵبڕیتەوە بەشێوەیەك ئامادەبوان زۆر هەستی پێنەکەن[2].

ئەوەشمان لەیادبێت زۆر کات وتاربێژ ناچار دەکرێت لەرۆژی هەینیدا یان لەبۆنەکانی تردا بۆ وتاردان بێ ئەوەی هیچ ئامادەییەکی هەبێت، ئەم جۆرە پێی دەوترێ وتاری کتوپڕ(الخطبة الارتجالية) ئەم جۆرە وتارە بۆ هەموو کەس دەس نادات، بەڵکو پێویستی بەوە هەیە ئەوتاربێژە جۆرە ئامادەییەکی گشتی تیا هەبێت لەلایەنەکانی زانستیو زمانەوانیو رەوانبێژیو قاڵ بووبێ لەبواری وتارداو زەین روونو دڵ پتەووچاو نەترس بێت، چونکە ئەگەر جارێك لەبەردەم جەماوەردا تێشکاو تەزیقبویەوە، بەگران جارێکی دی خۆی دەگرێتەوە.

زۆرجار وادەبێت وتاربێژی لێهاتوو لەوتارێکی کتوپڕدا ئەوەندە سەرکەوتوو دەبێت گوێگران سەرسام دەکات زیاتر لەوتارێکی ئامادەکراو چونکە دەتوانێ سوود وەربگرێت لەقسەی وتاربێژەکانی پێش خۆی، بەوشێوە درێژە بەباسەکانی ئەوان دەدات یان تەنها خاڵێکی لێدەگرێ

---

[1] الشيخ عائض بن عبدالله القرني ، ثلاثين وقفة في فن الدعوة ، چاپی ١٤١٢ ك ، لا ٢٣ ، ٢٤.

[2] فن الخطابة، لا ٢١٧.

وشی دەکاتەوە، یان لەو بۆنەو شوێن‌و کۆمەڵە ورد دەبێتەوە دڵی دێتە جۆش‌و وتارەکەی بەدڵ هەڵدەقوڵێ، یان لەدیواری ئەو هۆڵ‌و جێگایەدا پەندێك یان شیعرێك دەبینێ‌و دەیکات بەسەر باسی وتارەکەی، یان ئەو پەڕەیەی پێش دەسپێکردنی ئاهەنگ دابەشی دەکەن بەسەر بەشداربواندا دەگونجێ خاڵێکی لەخۆگرتبێت بتوانێ لەسەری بدوێ ... یان ... یان[1].

مامۆستا شێخ محمەدی قەرەداغی (خطیب)ی پێشووتری مزگەوتی گەورەی سلێمانی لێهاتووترین کەس بوو لەوتاری کوت‌و پڕدا، لەچەند شوێندا لەخزمەتیدابووم ئامادەبووانی سەرسام دەکرد، دەتوانم بڵێم لەکوردو عەرەبدا لێهاتووی وەك ئەوم نەدیوە، رەحمەتی خوای لێبێت! خۆزگە کەسەکانی وتارەکانیان بەچاپ دەگەیاند.

ئەوەیشمان لەیادبێت هەرچەند ئێمە لەچاکەکانی وتاری کتوپڕ بدوێین بۆ هەندێ کەس، بەڵام بۆ ئەمڕۆی ئێمە حاڵەتێکی زۆرئاسایی نیە، لەبەرئەوەی وتاربێژی هونەرێکی سەربەخۆیەو بناغەو رێبازی تایبەت بەخۆی هەیەو پێویستە وتاربێژەکان بەجوانی دیراسەی بکەن‌و وتارەکانیان بەپێی ئەو بناغانە دابڕێژن‌و، زۆر ئاگایان لەبارو دۆخی رامیاری دەورووبەربێت، قسەیەك نەڵێن لەدوا لەسەریان بکەوێت، دیارە ئەم تێبینیانەیش لەوتاری کتوپڕدا بەئاسانی رەچاو ناکرێت[2].

بەکورتی‌و بەکوردی دەبێ بۆداڕشتن‌و ئامادەکردنی وتارزۆر ژیرانە بیربکاتەوە باس لەنەخۆشیەکانی کۆمەڵگاو ئەو رووداوانە بکات کەلەوکات‌و شوێنەدا یەخەگیری خەڵکەکەبووەو پێویستیان پێی هەیە ، ئەگەر خەڵکەکە هەژاربوو باس لەیارمەتیدانی هەژار بکات، یان خەڵك هەڵبنێ بۆ کردنەوەی کۆمەڵەیەکی خێرخوازی بۆ یارمەتیدانی هەژاران، ئەگەر خەڵك بێ‌ئاوو کارەبابوون باس لەزایەنەکردنی ئاوو کارەبا بکات‌و کاربەدەستانیش هەڵبنێ چارە دۆزییان بۆ بکەن، بەم شێوە دەبێ وتاری هەیەنی لەگەڵ واقیعی خەڵکەکەدا گونجاو بێت چارەسەری شەرعی‌یانە بۆ باس‌و خواستەکانی ئەوان دابنێت.

داڕشتن‌و ئامادەکردنی وتار ئایە لەسەر کاغەزبێت یان لاپەڕەی دەروون پێویستی بەکاتێکی بێدەنگی‌و ئارامی دەروون‌و ئیخلاص بۆ خوا هەیە تابیرەکانی قوڵترو هەستەکانی ناسکترو سۆزەکانی بە کوڵتر بن[3] وەك لەلایەنی دووەمدا روونتر باسی لێوەدەکەین.

بەکورتی وتاری هەینی باسێکی زانکۆیی بچووکە پێویستە باسێکی جوان هەڵبژێری، نەخشەی بۆداڕێژی، خاڵە پێویستەکان لەسەرچاوە باوەڕپێکراوەکان هەڵگۆزێت، ئەمجا

---

[1] ٥٥٥ طريقة ووصية : لا ١٤٠ ، ١٤١.

[2] فن الخطابة، لا٢١٠.

[3] كيف تكون خطيباً، علي الرفاعي، لا ٤٦ ،٤٧.

ڕەشنوس و پاکنووسی بکات، ئەمجا لەچاپخانەی (دوانگە) بەچاپی بگەیەنیّ و بەناو خەڵکی نویّژ خویّن و گویّگردا بلاّوی بکاتەوە.

<u>لایەنی دووەم:</u> بۆئامادەکردنی وتار لایەنی روحی‌یە، وەئەم لایەنە زۆرگرنگترە لەیەکەمیان، چونکە وتاربیّژ ئەگەر لایەنی زانستیشی ناتەواو بیّت بەلاّم دەروونی پاك بیّت تارادەیەکی زۆر سوود دەگەیەنیّ، بەلاّم پیّچەوانەکەی زیانی زیاتر دەبیّ لەسوود.

بۆیە وتاربیّژە ئاینی‌یەکان پیّویستە زۆر ئاگاداری دەروونیان بن، بەتاوان چڵکنی نەکەن، بەتایبەت شەوو رۆژی جومعە دەبیّ زۆر بپاڕیّنەوە لەخوا دڵ و دەروونیان خاویّن بکات، چونکە لەوساتانەی پیّشچوونە سەر دوانگە شەیتانی نەفرین لیّکراو زۆر هەوڵیان لەگەڵ دەدات تاگوناهباریان بکات و کاریگەری وتەکانیان کەم بکاتەوە بۆیە ئامۆژگاری وتاربیّژەکان دەکەم بەم خالاّنە:

١ ـ نیازت خاویّن کە بۆ خوا بەتەمای هیچ پاداشتیّکی دنیایی مەبەلەوتەکانتدا، پاداشت تەنها لەخوا بخوازە ویردی سەرزارت هەمیشە ئەم ئایەتە پیرۆزە بیّت ﴿ وما اسالكم عليه من اجر ان اجري الا على رب العالمين ﴾[1] سورة:الشعراء/١٦٤

٢ ـ دەست بدەرەکارەکەت بەپشت بەستن بەخوا ﴿ ومن يتوكل على الله فهو حسبه﴾، بزانە ئەگەر خوابیەویّت وتەکانت پیرۆز دەکات بەهەموو پیتیّکت دەیان کەس ڕیّنمایی دەکات لەبەرئەوە لەبیرت نەچیّت هەموو کات سەرەتای وتارەکانت بەم ئایەتە دەست پیّبکە ﴿رب اشرح لي صدري، ويسرلي أمري واحلل عقدة من لساني يفقهوا قولي...﴾ طه: ٢٥ ـ ٢٨

٣ ـ لەتاریکی شەودا لەکاتە پیرۆزەکان و کاتی ڕوونی دڵ و دەروونتا زۆر لەخوا بپاڕیّرەوە سەرکەوتووت کات ، وشەکانت کاریگەربن، نووری خۆی بەسەر دڵ و چاوو گویّ و زمان و لای ڕاست و لای چەپت و پشت و بەردەمت و خوارو ژوورو‌تا بباریّنیّ.

٤ ـ هەوڵ بدە تادەتوانی لەکاتی نووسین و ئامادەکردنی وتاردا دەستنویّژت هەبیّ.

٥ ـ تادەتوانی بەر لەوتاردان نان مەخۆ وە ئەگەر ناچاربووی بەخواردن کەم بخۆ، چونکە گەدەی پڕ پەندو ئامۆژگاری و دڵسۆزی لیّهەڵناقولیّ و کویّر دەبیّ وەك پیّغەمبەر(ﷺ) دەفەرمویّ: (ما ملأ ابن ادم وعاء شراً من بطنه حسب ابن ادم لقيمات يقمن صلبه ...)[2].

واتە: بنیادەم هیچ زەرفیّکی پڕنەکردوە خراپتر لەسکی، بەسە بۆ بنیادەم چەند پاروویەك پشتی ڕابگرن.

---

[1] ٥٥٥ طريقة ووصية ، لا ٢٥٧.

[2] سەرچاوەی پیّشوو ٣٤.

٦ ـ زۆرپێویستە ساتەکانی پێش وتار دان دڵی کەس زویر نەکەیت و کەس دڵت زویر نەکات چونکە ئاڵۆزی دەروون و مانەوەی کینە تیایدا کاریگەری سەلبی دەبێت لەسەر وتارەکەت بەتایبەت ئەگەر ئەوناکۆکی و ئاڵۆزییە لەگەڵ ماڵ و منداڵی خۆتدا بێت.

٧ ـ لەکاتی دانیشتندا لەسەر دوانگە دوای سڵاوکردن لەخەڵك، تا هەڵدەستی بۆ وتار لەهەموو کات زیاتر دڵت پەیوەست کەرەوە بەخواو داوای تەوفیق و ئیخلاسی لێبکە.

## سێ نموونە بۆ چۆنێتی دارشتنی وتار:

### نموونەی یەکەم/ سپاردە پارێزی (حفظ الامانة)

هەندێ لەوئایەتانەی لەم بارەوەن:

١ ـ ﴿ انا عرضنا الامانة على السموات والارض والجبال فأبين ان يحملنها واشفقن منها وحملها الانسان انه كان ظلوماً جهولاً ﴾ الاحزاب:٧٢.

٢ ـ ﴿ ان الله يامركم أن تؤدوا الامانات الى أهلها ...﴾ النساء: ٥٨

٣ . ﴿ فليؤد الذي ائتمن امانته وليتق الله ربه ﴾ البقرة: ٢٨٣

**فەرموودەکان:**

١ ـ عن ابي هريرة(ﷺ) ان رسول الله (ﷺ) قال: ﴿( اية المنافق ثلاث: اذا حدّث كذب، واذا وعد اخلف، واذا ائتمن خان ) رواه البخاري ومسلم.

وفي رواية: ( وان صلى وصام وزعم انه مسلم).

٢ ـ عن حذيفة بن اليمان رضي الله عنه قال: حدثنا رسول الله(ﷺ) حديثين قد رايت احدهما وانا انتظر الاخر: حدثنا ان الامانة نزلت في جذر قلوب الرجال، ثم نزل القران فعلموا من القران وعلموا من السنة. ثم حدثنا عن رفع الامانة، فقال: ينام الرجل نومة فتقبض الامانة من قلبه فيظل اثرها مثل الوكت )رواه البخاري ومسلم.

### خاڵە پێویستەکانی ئەم وتارە

دەسپاکی وسپاردەپارێزی :

١ ـ ناونیشانی رێزو راستگۆییە .

٢ ـ دەبێتە هۆی بڵاوبوونەوەی ئاسایش لەنێو خەڵکدا.

٣ ـ خاوەنەکەی رێزی لێدەگیرێ لەناو خەڵکداو جێگای متمانەیان دەبێت.

٤ـ نیشانەی دینداری و باوەری پتەوە.

٥ ـ دەرگاکانی رزق و رۆزی دەکاتەوە لەمرۆڤ.

٦ ـ خاوەنەکەی چاکەی دەوترێ لەژیانداو دوای مردنیش.

٧ ـ بەختەوەری بڵاودەکاتەوە لەنێو تاك و کۆمەڵگادا.

٨ ـ لەژێر سایەیدا ژن بەمێردیو مێرد بەژنی بەختەوەردەبن.

٩ ـ لەژێر سایەیدا منداڵ بەدایكو باوكو دایك بەمنداڵیان بەختەوەر دەبن.

١٠ ـ لەژێر سایەیدا هەموو کەس ئەرکی سەرشانی بەجێ دێنێ بۆ خزمەتی وڵات.

١١ . لەژێر سایەیداماڵو سامانو ناموس پارێزراو دەبن.

١٢ ـ لەسایەیدا کاربەدەست بەزەیی بەژێر دەسەکانیدا دێتەوەو ژێر دەسەیش فەرمانی کار بەدەست بەجێدێنێ.

## دارشتنی وتاری ئەمانەتپارێزی

سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایەی ئەمانەتپارێزی کرد بەنیشانەی پیاوچاکان، زایە کردنیشی کرد بە نیشانەی پیاوخراپان.

درودی خوا لەسەر پێغەمبەرو یارەکانیشی کەرێزی سپاردەیان دەگرتو دەیانپاراست بۆیە خوای گەورە رێزی دنیاو پاداشتی قیامەتی بۆ گەورەکردن.

دوای ئەمە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ ان الله يامركم أن تؤدوا الامانات الى أهلها واذا حكمتم بين الناس ان تحكموا بالعدل، ان الله نعما يعظكم به ان الله كان سميعاً بصيراً ﴾ . النساء: ٥٨ .

واتە: خوای گەورە فەرمانتان پێدەکات کەسپاردەکان بگێرنەوە بۆ خاوەنەکانیان، ئەگەر حوکمو دادوەریتان لەنێو خەڵکدا کرد بەدادو یەکسانی تەماشایان بکەن زوڵمیان لێمەکەن، بەراستی خوا باشترین ئامۆژگاریتان دەکات بەراستی خوا بیسەر و بینایە.

ئامادەبووانی بەرێز پاراستنی ئەمانەت بەڵگەی راستی ئیمانو بەرزی رەوشتە، هەر کۆمەڵگەیەك ئەندامەکانی ئەمانەت پارێز بوون بەراستی بەختەوەری دنیاو قیامەتە بنو متمانەیان بەیەکتر دەبێت ماڵو سامانو نەفسو ناموسیان پارێزراو دەبێت.

گەورەترینو لەپێشترین سپاردە کەلەسەرمان بێت بیپارێزین ئەمانەتی خوایە، هەموو ئەندامەکانی لاشەت ئەمانەتی خوایە لەلات دەبێ بیانپارێزیو بەوشێوە بەکاریان بهێنی کەخوا فەرمانی پێداویت.

دڵت ئەمانەتە دەبێ ئالوودەی کەس نەبێتو کەس بەشایستەی پەرستن نەزانێتو کەس بەگەورەی عیبادەت بۆکردن نەزانێت جگە لەزاتی پاکی (الله) زمانت ئەمانەتە بەکاری مەهێنە لەغەیبەتو بوختانو جنێودانو قسەی پڕوپوچدا، هەروەها ئەندامەکانی ترت.

فەرمانەکانی خوا کە ناردوویەتی بۆ مرۆڤ وەك نوێژکردنو رۆژوگرتنو هەموو واجبەکانیتر ئەمانەتن واجبە بیانپارێزینو زایەیان نەکەین.

ئەو سنورانەی خوا بۆی داناوین ئەمانەتن نابێ بیانشکێنینو لێیان دەرچین.

هەرکەس ئەمانەتی خوای نەپاراست هەرگیز چاوەروانی ئەوەی لێمەکە ئەمانەتی مرۆڤ بپارێزێت، ئەوانەیش ئەمانەتی خوایی زایەدەکەن ئەوانەن قورئان دەربارەیان دەفەرموێ: ﴿ انا عرضنا الامانة على السموات والارض والجبال فابين أن يحملنها واشفقن منها وحملها الانسان انه كان ظلوماً جهولا ﴾ الاحزاب:٧٢

واتە: ئێمە سپاردەمان ئاراستەکرد بۆ ئاسمانەکان و زەوی و چیاکان کەچی هەڵیان نەگرت و لێی ترسان، مەبەست ئەوەیە ئەو کارو باری شەرعی خوایە ئەوەندە گەورەو گرانە گەر ئاراستەی ئەو لاشە گەورانەیش بکرایە هەڵیان نەدەگرت، یان ـ فعلا ـ خوای گەورە هەستی تیا دروست کردوون و ئەم سپاردەی داوە بەسەریاندا بەلاّم نەیانتوانیوە هەڵیگرن، بەلاّم مرۆڤ هەڵیگرتووە بەراستی مرۆڤ زۆر ستەمکارو نەفامە کاتێ ئەو ئەمانەتەی هەڵگرت و زایەی کرد[1].

دیارە ئەم هەڕەشە خوایی‌یە تەنها ستەمکاران دەگرێتەوە نەك ئەوانەی بەجوانی سپاردە دەپارێزن.

ئەمانەتپارێزی‌یە منداڵ بەدایك و باوکی بەختەوەردەکات و دایك و باوك بەتەمای پاشەڕۆژی منداڵەکانیان دەبن.

هەر ئەو هەستە ئاینی‌یەیە بۆ پاراستنی سپاردە وادەکات هەموو کەس هەست بەئەرکی سەرشانی دەکات و ئەنجامی دەدات بچووك ڕێز لەگەورەو سەرکردە دەگرێت و گەورە بەزەیی بەژێر دەستەی خۆیدا دێتەوەو مافەکانی پێشێل ناکات.

هەر ئەو هەستە بەرزەیە وادەکات ئەندامەکانی کۆمەڵگا متمانەیان بەیەکتر دەبێت و ماڵ و ناموس پارێزراو دەبێت و ژن و مێرد لەژێر سێبەری ئەوچەترە دا پێکەوە دەحەوێنەوە.

هەر ئەو هەستەیە وادەکات تەنانەت باڵندەو ئاژەڵ و بێ زمانەکانیش ڕۆڵەکانیان پەروەردە دەکەن، و خەمی ڕزق و ڕۆزیان دەخۆن چونکە لەهەست و بەزەییاندا چەقیوە ئەمانە ئەمانەتی خوان لای ئەوان.

ئەو مرۆڤەی لەخەمی ئەمانەتدابێت لەدنیا خەڵك بەچاوی ڕێز لێی ورد دەبنەوەو لەقیامەتیشدا پاداشتی گەورەیە.

ئەمانەتداری دەرگاکانی ڕزق و ڕۆزی فراوان دەکات و دڵان ڕووناك دەکاتەوە انشاء الله.

زایەکردنی ئەمانەتیش یەکێکە لەنیشانەکانی نزیك بوونەوەی قیامەت وەك پێشەوامان محمد(ﷺ) لەوەلاّمی پرسیاری پیاوێکدا کەوتی متى الساعة ؟کەی قیامەت دێ؟ فەرمووی: ( اذا وسد الامر الى غير اهله فانتظر الساعة ﴾واتە: هەرکات کاروبار سپێردرا بەکەسێك کەشایستەی نەبوو چاوەڕوانی قیامەت بکە.

---

[1] صفوة التفاسير.

## نموونەی دووەم /

## فیتنەی ئاخرزەمان و نیشانەکانی قیامەت (الفتن وعلامات الساعة)

**هەندێ ئایەت لەم بارەوە:**

١ - ﴿ فليحذر الذين يخالفون عن امره ان تصيبهم فتنة او يصيبهم عذاب اليم ﴾ النور :٦٣

٢ ـ ﴿ يسألونك عن الساعة ايان مرساها، فيم انت من ذكراها الى ربك منتهاها ﴾ النازعات:٤٢،٤٤

٣ - ﴿ والذين يؤمنون بما انزل اليك وما انزل من قبلك وبالاخرة هم يوقنون ﴾. البقرة: ٤

### هەندێ فەرموودەلەم بارەوە:

١ ـ جاء في الحديث الذي رواه عمر بن الخطاب(ﷺ) قال: فأخبرني عن الساعة ؟ قال: ما المسؤول عنها باعلم من السائل ، قال: فاخبرني عن اماراتها قال ان تلد الامة ربتها... الخ ) رواه مسلم.

٢ - عن ابي هريرة(ﷺ) عن النبي(ﷺ) قال: ( يتقارب الزمان، وينقض العمل وتظهر الفتن ويكثر الهرج ، قالوا يارسول الله أيهم هو ؟ قال القتل القتل ) رواه الاربعة التاج الجامع للاصول ٥/ ٣٠١ .

٣ ـ عن ابي بكرة (ﷺ) قال ( سمعت رسول الله(ﷺ) يقول: اذا تواجه المسلمان بسيفيهما فكلاهما من أهل النار، قيل : فهذا القاتل فما بال المقتول؟ قال: انه اراد قتل صاحبه ) متفق عليه.

### خاڵە گرنگەکان:

١ - خۆپارێزی لەفیتنە بەکەنارگیری.

٢ـ نیشانە بچووکەکان پێش نیشانە گەورەکان دێن.

٣ـ واجبە بڕوابوون بەهاتنی قیامەت.

٤ - قیامەت کاتی دیاری کراوی نیە.

٥ . موسوڵمان بەشداری شەڕی براکوژی نەکات.

٦ - زۆربوونی کوشتن نیشانەی ئاخر زەمانە.

٧ - هەرکەس زۆر بجوڵێ فیتنەی زۆری تووش دەبێ.

٨ ـزایەکردنی ئەمانەت نیشانەی ئاخرزەمانە.

### داڕشتنی وتاری فیتنەی ئاخر زەمان:

دەچینە خزمەت فەرموودەکەی پێغەمبەر(ﷺ) کەحەزرەتی(عمر)(ﷺ) ریوایەتی دەکات و جبریل چەند پرسیارێك لەپێغەمبەر دەکات، یەکێ لەوپرسیارانە ئەوەبوو: فاخبرني عن الساعة؟ مانای پێم بڵێ قیامەت کەی دێت؟ فەرمووی: پرسیار لێکراو زاناتر نیە لەپرسیارکەر.

ئەمجا فەرمووی: هەواڵم بدەرێ دەربارەی نیشانەکانی قیامەت؟ فەرمووی: ( ان تلد الامة ربتها وان ترى الحُفاة العُراة العالة رعاء الشاء يتطاولون في البنيان ...) مانای نیشانەکانی ئەوەیە کەنیزەك زۆردەبیٚو دەبینی ڕووت و قوت و پیٚپەتییەکان شوانی مەڕەکان کۆشکی بەرز بەرز دروست دەکەن.

نیشانەکانی بەرپابوونی ڕۆژی قیامەت دوو جۆرن هەندێکیان ناودەبرێن بە(العلامات الصغرى) نیشانە بچووکەکان، وەهەندێکیان بە(العلامات الكبرى) نیشانە گەورەکان.

نیشانە بچووکەکان ئەوشتانەن پێش ڕوودانی کارەساتی(قیامة)دەرئەکەون و ئاگادارییەکن بۆ نزیك بوونەوەی بیٚئەوەی دیاری بکرێت چەندی ماوەو کەی دەبێت؟ چونکە زانینی ئەو ڕۆژە بەشێوەیەکی دیاری کراو کاری ئێمە نیەو زانستی کەمو کورتی ئێمە پەی پیٚنابات ﴿ يسئلونك عن الساعة ايان مرساها فيم انت من ذكراها الى ربك منتهاها ﴾.

واتە: بیٚ باوەڕەکان بەگاڵتەوە (پرسیاری قیامەتت لیٚدەکەن و دەڵێن: کەی دێت؟ زانستی هاتنی قیامەت لای تۆنیە هەتا بۆیان باس بکەیت، چونکە بەس خوای تۆدەزانیٚ ئەو ڕووداوەکەی دێت) ئێمە تەنها ئەوەندەمان لەسەرە بەشێوەیەکی چەسپاوو دامەزراو بڕوامان پتەوبێت بەهاتنی قیامەت هیچ دو دڵی و گومانێك دەربارەی هاتنی ئەو ڕۆژە جێگای نەبێتەوە لەناو سوچ و بیچاخی دەروونماندا ﴿...والذين يؤمنون بما انزل اليك وما انزل من قبلك وبالاخرة هم يوقنون ، اولئك على هدى من ربهم واولئك هم المفلحون ﴾.البقرة: ٤ ـ ٥

ئەوانەی باوەڕیان هەیە بەو قورئانەی نازڵ بووەتە سەرتۆو سەر پێغەمبەرانی پێش تۆ وەباوەڕی پتەویان هەیە بەڕۆژی قیامەت ئەوانە وان لەسەر ڕێگای هیدایەتی خوای خۆیان و هەر ئەوانەیش بەختەوەرو سەرکەوتوون.

جا لەم باسەدا هەندیٚ لەو فەرموودانەدەخەینە ڕوو کەنیشانەکانی نزیك بوونەوەی ئەو ڕۆژە سەختەمان بۆ باس دەکەن:

یەکەمیان: ابوهریرة لەپێغەمبەرەوە(ﷺ) بۆمان دەگێڕێتەوە کەفەرموویەتی: ( يتقارب الزمان، وينقص العمل، ويلقى الشح، وتظهر الفتن، ويكثر الهرج ) قالوا: يارسول الله أيهم هو ؟ قال : القتل، القتل ).

کات و زەمانە تەسك دەبێتەوە کات بیٚبەرەکەت دەبێت و کەس بەکاری خۆیدا ناگات. فیتنە ئاشکرا دەبێت و هەرەج زۆر دەبێت. وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا (هەرەج) چییە؟ فەرمووی: ( کوشتن ، کوشتن)

لەفەرموودەیەکیتردا دەفەرمویٚ: ( لەمەودوا چەندین فیتنە بەرپا دەبیٚ تاوای لیٚدیٚ، دانیشتوو چاکترە لەو کەسەی ڕاوەستاوە، ڕاوەستاو چاکترە لەوکەسەی دەڕوا بەڕێدا، ئەوکەسەی ئاسایی

دەڕوات چاکترە لەوکەسەی پەلەپەل دەکات هەرکەس سەری بۆ هەڵبڕێت و بۆی بڕوانێت فیتنە یەخەی دەگرێت، هەرکەس لەو ڕۆژەدا پەناگایەکی دەسکەوت با پەنای پێ بەرێت و خۆی لەفیتنە دووربگرێت)[1].

لەریوایەتێکی تری ئەم فەرمودەیەدا دەفەرموێ: ( ... هەرکات فیتنە داباری هەرکەس وشتری بوو بادوای وشترەکانی بکەوێت، هەرکەس مەڕومالاتی هەبوو بادوایان بکەوێ، هەرکەس زەوییەکی هەبوو بابچێتە سەری ، پیاوێك وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەگەر کەسێ هیچ کام لەمانەی نەبوو چی بکات؟ فەرمووی: باشمشێرەکەی بگرێت بەبەردێك دەمەکەی بکوتێتەوە هەتا بڕشتی نامێنێ ئەمجا باخۆی رزگار کات لەوفیتنەیە ئەگەر توانای هەبوو. ئەمجا پێغەمبەر(ﷺ) (٣) جار فەرمووی: ئەی خوایە ئەوا من گەیاندم... ئەی خوایە ئەوا من گەیاندم ، ئەی خوایە وا من گەیاندم، پیاوێك وتی: یارسول الله ئەی ئەگەر منیان بەزۆر برد بۆ لای یەکێ لەو دوو تاقمەی کەیەکتر دەکوژن پیاوێك شمشێرێکی لێدام یان تیرێك هات کوشتمی؟ فەرمووی: ئەوکاتە بکوژەکەی تۆ تاوانی تۆیش و خۆیشی دەچێتە ملی و دەبێتە خەڵکی دۆزەخ ) موسلیم ابوداود ریوایەتیان کردووە[2] .

لەفەرموودەیەکی تردا دەفەرموێ: ( هەرکات دوو موسڵمان چەکیان لەدژی یەك هەڵگرت ئەوە وان بەسەر لێواری دۆزەخەوە ئەگەر یەکێکیان ئەوی تریانی کوشت هەردووکیان پێکەوە دەکەونەناوی )[3] .

لەفەرموودەیەکی تردا دەفەرموێ: ( خوا تەنگی ئەرزی بۆ هێناومەتەوە یەك رۆژهەلات و رۆژئاوایم دیوە ئوممەتی من تواناو دەسەلاتی ئەگاتە ئەو شوێنانەی من دیومە وەمن دوو گەنجینەی سووروسپیم پێدراوە بەمانای ئالتون. وەمن پاڕاومەتەوە لەخوای خۆم بۆ ئوممەتەکەم بەگرانی گەورەو گشتی لەناویان نەبات و دوژمنی بێگانە لەخۆیان زاڵ نەبێت بەسەریاندا ناموسیان حەلاڵ بکات، وە پەروەردگارم پێی فەرمووم: ئەی موحەمەد من هەرکات بریارێکمدا ناگەرێتەوە،وەمن ئەوەم پێ بەخشیویت کە ئوممتەکەت بەگرانی سەرتاپایی و گشتی لەناویان نەبەمو ، دوژمنی بێگانە زاڵنەکەم بەسەریاندا ناموسیان حەلاڵ بکات و ئابڕویان بەرێت، با هەموو سەر ڕووی زەمینیش لێیان کۆبێتەوە، هەتا خۆیان وایان لێدێت یەکتری لەناو دەبەن و یەکتری بەدیل دەگرن، موسلیم ریوایەتی کردووە.

---

[1] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

[2] هەمان سەرچاوەی پێشوو : ٣٠٢٧/٤.

[3] هەمان سەرچاوەی پێشوو .

لەریوایەتەکەی (ترمذي و ابوداود) ئەمەیشی لەسەرە کە فەرموویەتی: ئەوەی من زۆر لێ‌یترسم بۆ ئوممەتەکەم چەند پێشەواو سەرکردەیەکە گومڕایان بکاتو سەرگەردانیان بکەن)[1] .

هەروەها (ابوداود) بۆمان دەگێڕێتەوە کەپێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: هەموو تاوانێك نزیکە خوالێی خۆش ببێت مەگەر کەسێ بێباوەڕ مردبێ یان باوەڕدارێك باوەڕدارێکی بەناهەق کوشتبێ[2] .

هەروەها دەفەرموێ: ( لا يزال المؤمن في فسحة من دينه مالم يصب دماً حراماً)[3] باوەڕدار هەمیشە مەودای دینداری پانو بەرینە بەمەرجێ تووشی خوێنی حەرامو ناهەق نەبووبێ.

ڕۆژێکیان پێغەمبەر(ﷺ) لەکۆڕێکدا قسەی دەکرد بۆ خەڵکی(اعرابی) یەك هاتە خزمەتی لێی پرسی: کەی قیامەت دێت؟ پێغەمبەر بەردەوام بوو لەسەر وتارەکەی ، هەندێ کەس وتیان : پێغەمبەر گوێی لێبوو بەلاّم پرسیارەکەی پێناخۆش بوو، هەندێ‌تر وتیان: گوێی لێنەبوو، کاتێ لێبوویەوە فەرمووی: کێ بوو پرسیاری کرد؟ کابرا وتی: ها من بووم یارسول الله فەرمووی: هەرکات سپاردە زایەکرا چاوەڕوانی قیامەت بکەن. بوخاری گێراویەتیەوە.

کۆتایی ئەم وتارە دێنین بەم چەند شیعرە هەرچەند نەمزانی شیعرەکان هی کێ‌یە؟

## هەندێ لەنیشانەکانی ئاخر زەمان

ئەمە نیشانەی ئاخر زەمـــانـــە
وادەی دەجـاڵو فیتنەی شەیتانـــە

هەرچی پێغەمبەر خەبـــەری داوە
لـــەباسی کاری دنیاو عوقبـــاوە

فەرمووی نیشانەی تێکچونی جیهان
بـــێ باوەڕیەو زەعیفی ئیمـــان

زۆرکەم ئەمێنێ نوێژو جەماعـــەت
لـــەئەمانەتیش ئەکەن خیانـــەت

عیززەت ئەچێتە لای پیاوی زاڵـــم
قـــەدرو عیززەتی نامێنێ عـــالم

پەرە ئەستێنێ شەرابو قـــومـــار
مـــالگران نـــەبێ لەشـــارو بازاڕ

کوشـــتـــنو دزیو تـــالانو درۆ
فـــەقیرو هەژار ئەخـــاتە ڕۆ ڕۆ

دەوڵەمەند زەکات نادات بـــەاحسان
راستـی نامێنێ زۆر ئەبـــێ بوختان

گۆرانی سووكو قسەی نـــارەوا
پـەسەندتر ئەبـــێ لـەزیکری خودا

پیاو بەئەمری ژنان ئەڕۆن بـــەرێوە
لـەمەجلیسدا نـــان ئەخۆن بە پێوە

---

[1] هەمان سەرچاوەی پێشوو : لا ٣٠٢.

[2] مختصر تذكرة القرطبي ، عبدالوهاب الشعراني، لا ١١٠.

[3] سەرچاوەی پێشوو.

پیاو دانەنیشێ ژنان نــــەگەڕێن | شــەرم نــامێنێ ژن و پیاو هاوڕێن
دایك و باب قەدر یان لای کوڕنامێنێ | کەس لەمەکتەبدا قورئان ناخوێنێ
پیت و بەرەکەت نەڕوا لــەزەوی | کچ و کـوڕێك دێن لەڕووی بێ شەرمی
ڕەحم و بەزەیی لای کەس نامێنێ | هــەرکەس بەشی خۆی لێ دەفڕێنێ

خوایـەگیان ئاخرمـان بـەخێر بگـێڕی دایـك و بـاوك و مردوانمـان عـەفو بکـەیت ، شـیفای نەخۆشەکانمان بدەیت ... امین

## نموونەی سێیەم وتارێکی عەرەبی :

# الامر بالمعروف والنهي عن المنكر

**بعض الايات القرانية حول الموضوع:**

١ ـ ﴿ولتكن منكم امة يدعون الى الخير ويامرون بالمعروف وينهون عن المنكر واولئك هم المفلحون﴾ ال عمران: ١٠٤.

٢ـ ﴿ ليسوا سواء من أهل الكتاب امة قائمة يتلون ايات الله اناء الليل وهم يسجدون ، يؤمنون بالله واليوم الاخر ويامرون بالمعروف وينهون عن المنكر ويسارعون في الخيرات واولئك من الصالحين ﴾ ال عمران: ١١٣ ـ ١١٤.

٣ . ﴿ كنتم خير امة اخرجت للناس تامرون بالمعروف وتنهون عن المنكر وتؤمنون بالله ...﴾ ال عمران: ١١٠.

احاديث حول الموضوع:

١ . روى عن ابي بكر الصديق(ﷺ) انه قال: في خطبة خطبها : أيها الناس انكم تقرأون هذه الاية ، وتؤولونها على خلاف تاويلها ﴿ يا أيها الذين امنوا عليكم انفسكم لايضركم من ضل اذا اهتديتم﴾ واني سمعت رسول الله يقول : ( مامن قوم عملوا بالمعاصي وفيهم من يقدر ان ينكر عليهم فلم يفعل الا يوشك ان يعمهم الله بعذاب من عنده )اخرجه أصحاب السنن[1].

٢ ـ (لتأمرن بالمعروف ولتنهون عن المنكر ، أو ليوشكن الله أن يبعث عليكم عقاباً منه ثم تدعونه فلا يُستجاب لكم ) رواه الترمذي وقال حديث حسن[2].

[1] المغني عن حمل الاسفار في الاسفار : ٢٨٢/٢.

[2] نفس المصدر السابق.

٣ ـ (من راى منكم منكراً فليغيره بيده ، فان لم يستطع فبلسانه ، فان لم يستطع فقلبه وذلك أضعف الايمان)رواه مسلم[1]

٤ ـ قال(ﷺ) سيد الشهداء حمزة بن عبد المطلب ، ورجل قام الى سلطان جائر فامره ونهاه فقتله ) المغني عن حمل الاسفار:٢/٢٨٥.

النقاط المهمة في هذه الخطبة:

١ ـ الامر بالمعروف والنهي عن المنكر ضرورة دينية أوجبتها الايات والاحاديث على من يستطيع القيام بها باليد ثم باللسان ثم بالقلب.

٢ ـ الامر بالمعروف والنهي عن المنكر مهمة كبرى وقطب أعظم في الدين .

٣ ـ من أجل هذه المهمة ابتعث الله النبيين وأنزل الكتب وعليها مدار نشر الدين.

٤ ـ الامة اذا اهملت هذا الواجب ابتليها الله بعذاب بئيس يعم صالحهم وطالحهم.

٥ ـ اذا اهمل هذا الواجب يسلط الله الظالين على الامة ولايستجاب لدعاء الاخيار ، وتتقلب الموازين فيصير المعروف منكراً والمنكر معروفاً.

٦ ـ الامر بالمعروف والنهي عن المنكر خدمة للانسانية جمعاء لأنه اخذ على يد الظالمين والمفسدين وصيانة للامة من الهلاك.

الحمد لله نحمده ونستعينه ونستهديه ونعوذ بالله من شرور انفسنا وسيئات اعمالنا ، من يهد الله فهو المهتد ومن يضلل فلن تجد له وليا مرشدا.

واشهد أن لا اله الله وحده لاشريك له واشهد أن محمداً عبده ورسوله وصفيه وخليله.

اللهم فصل وسلم وبارك على سيدنا محمد وعلى اله وصحبه ومن دعا بدعوته وسار على هديه الى يوم الدين.

ورضى الله عن ساداتنا ابي بكر وعمر وعثمان وعلي ، وعن بقية الصحابة والقرابة والتابعين وتابعيهم أجمعين .

اوصيكم عباد الله ونفسي العاصية اولا بتقوى الله وطاعته فأن التقوى شعار المؤمنين ودثار المتقين ؛ووصية الله في وفيكم اجمعين.

أما بعد اخوة الاسلام فان الامر بالمعروف والنهي عن المنكر هو القطب الاعظم في الدين ، وهي المهمة الكبرى التي ابتعث الله من أجلها النبيين [2]. وانزل الكتب تترى وقد امر الله به في عدة من اياته منها قوله تعالى:﴿ ولتكن منكم امة يدعون الى الخير ويامرون بالمعروف وينهون عن المنكر واولئك هم المفلحون ﴾.

---

[1] الاربعين النووية: رقم:٢٤.

[2] احياء علوم الدين:٢/٢٨٠.

فالامر بالمعروف والنهي عن المنكر واجب على كل فرد من افراد الامة الاسلامية سواء كان رئيساً او مرؤوساً ، تابعاً او متبوعاً ، غنياً او فقيراً ، مأموراً او اميراً ،ولكن كل حسب مقدرته كما يبينه الرسول الاعظم(ﷺ) من رأى منكم منكراً فليغيره بيده ، فان لم يستطع فبلسانه فأن لم يستطع فبقلبه وذلك أضعف الايمان).فهذا الحديث الشريف يرتب الواجب على ثلاث مراتب : المرتبة الاولى هي مرتبة الامراء ومن كان مثلهم في القوةوالمنعة ، فهؤلاء يجب عليهم التغير باليد وذلك بأن يستعملوا قوتهم ونفوذهم لسد الثغرات التي تجئ منها رياح المنكر ، والكف على أيدي الذين يعملون المنكرات صيانة للامة من الفساد والفوضى والدمار.

اما المرتبة الثانية فهي مرتبة العلماء واشباه العلماء فهؤلاء يجب عليهم التبين والايضاح لأحكام الله واوامره ، ونواهيه:﴿واذ أخذ الله ميثاق الذين اوتوا الكتاب لتبيننه للناس ولاتكتمونه...) ال عمران:١٨٧.

اما المرتبة الثالثة وهي التغير بالقلب فهي رخصة شرعية لمن لايتأتى له التغير باليد ولا باللسان فيجب عليه في هذه الحالة ان يغير المنكر بقلبه وذلك بأن يكرهه ولايرضاه وتشمئز نفسه من رؤيته، وهذه هي ادنى المراتب وأضعف الايمان وليس وراء ذلك مثقال حبة من خردل من الايمان . كما جاء في بعض الروايات ـ .

فظاهر الايات والاحاديث تدل دلالة واضحة على وجوب القيام بهذه المهمة وخاصة للامراء والعلماء ، ولاشك ان العلماء هم ورثة الانبياء ، وهم الذين قاموا بهذا الامر العظيم ونشروا الدين في ربوع العالم جيلا بعد جيل (ولوطوى بساط هذا الامر واهمل علمه وعمله لتعطلت النبوة واضمحلت الديانة وعمت الفترة وفشت الضلالة وشاعت الجهالة واستشرى الفساد واتسع الخرق، وخربت البلاد ، ولم يشعروا بالهلاك الا يوم التناد ، وقد كان الذي خفنا ان يكون فانا لله وانا اليه راجعون..)[١].

وتظهر اهمية هذا الامر من كونه سبباً لخيرية هذه الامة ، ومعنى ذلك أن الامة اذا لم تقم بهذا الواجب فلا خير فيها ولابقاء لها كما يبدو ذلك جلياً في قوله تعالى: ﴿ كنتم خير امة اخرجت للناس تامرون بالمعروف وتنهون عن المنكر وتؤمنون بالله...﴾.

وتظهر أهميته ايضا من كونه مندوباً اليه وان أدى ذلك الى قتل القائم به كما قال رسول الله(ﷺ) سيد الشهداء حمزة بن عبدالمطلب ورجل قام الى امام جائر فامره ونهاه فقتله )رواه الحاكم في المستدرك وصحح اسناده[٢].

---

[١] احياء علوم الدين :٢/٢٨٠.

[٢] المغني عن حمل الاسفار:٢/٢٨٥.

كما وان صلاح المرء مرهون بعدة امور بعد الايمان بالله واليوم الاخر ، منها القيام بهذا الواجب كما تشير اليه الاية الكريمة: ﴿ ليسوا سواء من أهل الكتاب امة قائمة يتلون ايات الله اناء الليل وهم يسجدون ، يؤمنون بالله واليوم الاخر ويامرون بالمعروف وينهون عن المنكر ويسارعون في الخيرات واولئك من الصالحين ﴾ ال عمران : ١١٣ ـ ١١٤.

واخيراً اود ان اختم الخطبة بما فهمه سيدنا ابوبكر الصديق (ﷺ) من اية قرانية حيث قال في خطبة خطبها:

أيها الناس انكم تقرؤن هذه الاية وتؤولونها على خلاف تاويلها ﴿ يا أيها الذين امنوا عليكم انفسكم لايضركم من ضل اذا اهتديتم ﴾ واني سمعت رسول الله (ﷺ) يقول: (مامن قوم عملوا بالمعاصي وفيهم من يقدر ان ينكر عليهم فلم يفعل الا يوشك أن يعمهم الله بعذاب من عنده )

نبهني الله واياكم من نومة الغافلين ، وحشرني واياكم تحت لواء سيد المرسلين . وبعد أعوذ بالله من الشيطان الرجيم (ان رحمة الله قريب من المحسنين) الاعراف:٥٦.

## الخطبة الثانية:

الحمد لله ثم الحمد لله ماتوفيقي ولا اعتصامي الا بالله عليه توكلت واليه أنيب .

اللهم صل وسلم وبارك على سيدنا محمد ومن دعا بدعوته الى يوم الدين .

يا أيها الناس اتقوا ربكم وقولوا قولاً سديداً ، وصلوا وسلموا على حبيبكم كما صلى عليه الله في القران حيث قال: ﴿ان الله وملائكته يصلون على النبي يا أيها الذين امنوا صلوا عليه وسلموا تسليماً ﴾ الاحزاب :٥٦.

اما بعد يا أخوة الاسلام هبوا من نومة الغفلة فقد رانت على القلوب اثار الذنوب (واسترسل الناس في اتباع الهوى والشهوات وانها من أعظم الخطوب ، وعز على بساط الارض مؤمن صادق لا تاخذه في الله لومة لائم لأن مداهنة الخلق قد استولت على القلوب)[1].

فطوبى لمن سعى في تلافي هذه الفترة ، وسد هذه الثلمة ، ناهضاً باعبائها ومتشمراً في احياء سنة افضى الزمان الى اماتتها ، ومستبداً بقربة تتضائل درجات القرب دون ذروتها ...)[2].

قال (ﷺ) لتامرن بالمعروف ولتنهون عن المنكر ، اوليوشكن الله ان يبعث عليكم عقاباً منه ثم تدعونه فلايستجاب لكم) (يا أيها المتعطشون الى نور جمال المصطفى صلوا عليه وسلموا تسليماً.

---

[1] احياء العلوم:٢/٢٨٠.

[2] المصدر السابق:٢٨١.

**اللهم اغفر للمؤمنين والمؤمنات والمسلمين والمسلمات الاحياء منهم والاموات من أهل السنة والجمعة والجماعات ، اللهم انصر من نصر هذ الدين ، واخذل من خذل المسلمين ، وانصر جيوش الموحدين على القوم الكافرين والملحدين في مشارق الارض ومغاربها يارب العالمين.**

**اقول قولي هذا واستغفر الله لي ولكم ولسائر المسلمين.**

# فەسڵی چوارەم

# هەڵەکانی وتاربێژ

**وەك وتراوە: (صعود المنبر أصعب من صعود القمر) واتە: چوونە سەر مینبەر سەختترە لەچوونە سەرمانگ ، ئەم وتەیەیش رەنگە زۆر دوور نەبێت لەواقیع چونکە بەڕاستی چوونە سەرمینبەر بۆ یەکەم جار زۆر سەختو دژوارەو ئازایەتی و دان بەخۆدا گرتنی دەوێ.**

**جێگایەکیش ئەوەندە، سەخت بێت هەردەبێ هەڵەی تێدابکرێت، یان مافی تەواوی خۆی پێنەدرێت، ئەمە وێرای ئەوەی کەهەموو کەس شایانی هەڵەیەو وەك پێشینان وتوویانە: ( بەندە بێ عەیب نابێ).**

**بۆیە ئێمەیش لەم فەسڵەدا هەندێ لەو هەڵەو ناتەواویانە دەخەینە روو بەوهیوایەی وتاربێژە بەڕێزەکان تادەتوانن خۆیانی لێدووربگرن، پێویستە ئەوەیش بڵێین زۆر لەم خاڵانە لەمەرجەکانی وتارو وتاربێژدا بەدرێژیی باسمان کردن بۆیە لێرەیشدا بەکورتی دووبارەی دەکەینەوە لەژێر ناونیشانی هەڵەدا هەتا وتاربێژەکان بزانن بەجێ نەهێنانی ئەو مەرجانە ئەمرۆ ناو دەبرێن بەهەڵەو کێشی وتارەکەیان دادەبەزێنی؛ بەڵکو دووبارەکردنەوەکەیشی ببێتە هۆی ئەوەی زیاتر خۆیانی لێ بپارێزن (وفي الاعادة افادة).**

**١ - ئامادە نەکردنی بابەتەکە: واتە: وتاربێژ بابەتەکەی ئامادە نەکردبێتو بەجوانی لەدەروونی خۆیدا گەلاڵەی نەکردبێت، بۆیە دەبینی کاتێ دەچێتە ناوباسەکەی شپرز دەبێت، خاڵەکان لەشوێنی خۆیدا دانانێت زۆر بەشپرزەیی دەیانخاتە روو.**

**٢ - لەبەرنەکردنو پوختە وەرنەگرتنی ئەو ئایەتو فەرموودانەی لەباسەکەیدا پێویستی پێیان دەبێت، بۆیە دەبینی بەهەڵە دەیانخوێنێتەوە یان مانایان باش ناکات، گەورەترین تاوانیش ئەوەیە قورئان لەخۆمانەوە تەفسیر بکەین.**

**٣ - درێژەپێدانی وتار: کورتیو درێژی وتاریش شتێکی رێژەیییەو لەکاتێکەوەبۆ کاتێکیترو لەشوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر دەگۆڕێت - وەك بەدرێژی باسمان کرد - من وادەزانم لەکاتی ئاساییدا وتار لە(٢٠) دەقیقە کەمتر نەبێتو لە(٣٠) دەقیقە زیاتر نەبێت، بەڵام لەکاتی گەرماو سەرمای زۆردا یان لەکاتی ترسو حاڵەتی نائاساییدا دەتوانرێ بەدوو دەقیقەش تەواو بکرێت.**

٤ ـ پشت بەستن بەفەرموودەی لاوازو هەڵبەستراو (الحديث الضعيف والموضوع) یان بەوچیرۆکە خورافیانەی بنچو بناغەیان نیە لەپەراوە پشت پێبەسراوەکاندا پێشتریش روونمان کردەوە کە فەرموودەی لاواز بەسێ مەرج کاری پێدەکرێت.

٥ ـ هەڵەکردنی زمانەوانی: واتە هەڵەی (نحو صرف) ئەمەیش ناشیرینە بۆ مەلاو وتاربێژ، چونکە مەلا یەکسانە بە(نحوو صرف) ئەگەر ئەمەیشی نەزانی ئیتر چی دەزانێت؟

٦ ـ بەکارهێنانی وشەی ئاڵۆزو نامۆ: واتە وشەیەك بخاتە ناو وتارەکەی زۆر لەئامادەبوان تێی نەگەن، چونکە کۆڕی وتار کۆڕی ئەدەبی وشیعرو شاعیران نیە، هەموو چینەکانی خەڵك ڕووی تێدەکەن، دەبێ وشەکانی سادەبن، وەك ئاوی سازگار خۆشڕۆبن بەناخی دەروونندا، بۆیە دەبێ وتاربێژ بەزمانی مامەڵەو ناوبازاڕ وگشتی خەڵکەکە بدوێت، نەك بەلەهجەی ڕەوانبێژان و ئەدەبدۆستان. بۆ ئەوەی گوێگران ڕاستەوخۆ دەسلەملانی سۆزو چێژی وتارەکەی بن نەك بەدوای مانای وشەکانیدا وێڵ بن.

٧ ـ باسکردنی چەند بابەتێکی جیاجیا لەیەك وتاردا: چونکە ئەمەیش گوێگران دەخاتە ناو گێجی خەتەرەوەو سەروبنی وتارکەیان لێ تێك دەچێت.

٨ ـ برینداركردنی هەستی کەسێك یان گرۆهێك یان تیرەیەك لەوتاردا، ئەمەیش وا دەکات زۆرکەس لەوتارەکە دووردەکەونەوە، یان وتاربێژ تووشی گێژاو دەبێت لەسەری.

٩ ـ خراپ دابەزاندنی بابەتەکە: واتە: زۆرجار وتاربێژ بابەتەکەی گەلاڵە کردووە، بەڵام شێوازی دابەزاندنەکەی هەڵەیە، بۆ نموونە: تووڕەدەبێت لەشوێنێکدا تووڕەبوونی ناوێت، یان دەیەوێت لاسایی وتاربێژێکی ناوداربکاتەوەو ناتوانێت، یان وشەکانی بەشێوەیەك دەڵێت خەڵك بێزار دەکات، یان پیرەو دانەکانی کەوتوون، یان دەنگی باریكو لاوازەو بۆ وتار ناشێت هەموو ئەمانە لەڕێزی وتارەکەی کەم دەکاتەوە.

١٠ ـ پشتگیری کردنی ستەمو ستەمکاران: وتار تەرازووی دادپەروەرییە، خوایش دەفەرموێ: ﴿ وزنوا بالقسطاس المستقيم ﴾ الشعراء: ١٨٢.

واتە: بەترازووی ڕێكو یەکسانی کێشانە بکەن. جا ئەگەر ترازووی وتاربێژ نادادی کردو پیاهەڵدانی ستەمو ستەمکارانی کرد، پاساوی کاری ناڕەواو دوور لەیاسای خوایانی دایەوەو تاوانەکانی بۆ پۆشین؛ دەبێ ئیتر چاوەڕوانی چی بکەین لەمەترزترازووی بازرگانو میوە فرۆشەکانو زەرەنگەرەکانو ...هتد ؟ بۆیە جێگای خۆیەتی ئەو خەڵکە لەدوانگەی نادادی پڕ بەپێڕاکەنو دەوری چۆڵ کەن !

١١ ـ خوێندنەوەی وتار لەسەر وەرەقەو کتێب: چونکە ئەمیش وادەگەیەنی کاکیوتاربێژ باسەکەی گەلاڵە نەکردووە، هیچ تازەکارییەکی تیا ئەنجام نەداوەو خۆی بۆماندو نەکردووە. بەڵام

ئەگەر وتارەکە ئامادەبکاتو ئایەتو فەرموودەکانو سەرباسەکان لەسەر وەرەقەیەکی بچووك بگریّ بەدەستەوە بۆ کاتی پێویستی کارێکی چاکە.

١٢ ـ باسکردنی ئەو بابەتانەی جێگای خیلافن لەنێو زانایاندا: وەك خوێندنی فاتیحای دوای بانگ، یان دەستنوێژ لەئافرەت دەشکێت یان ناشکێت؟ یان ئەم جۆرە باسانە پێویستە لەکۆڕی دەرسی مامۆستاو فەقێدا باسبکرێت، نەك لەسەر مینبەری جومعەو وتار چونکە دەبێتە هۆی ئاشوب نانەوە لەنێو موسوڵماناندا[(١)].

١٣ ـ ناشیرینە بۆ وتاربێژ لەکاتی وتاردا یاری بەڕیشی یان پەنجەکانی بکات، یان دەستی زۆر ڕاوەشێنیّو ئاماژەی زۆر بکات مەگەر بەگوێرەی پێویست بۆ تێگەیشتنی گوێگران.

١٤ـ گرنگی دان بەهەندیّ لایەنی ئیسلامو لەبیرکردنی هەندیّ لایەنیتر، وەك ئەوەی هەرباسی نوێژو ڕۆژو پەرستشەکان بکات، ئیتر لایەنەکانی پەروەردەو فەرمان بەچاکەو ڕێگری لەخراپەو، جیّبەجیّکردنی فەرمانەکانی خوا لەهەموو بوارەکانی ژیانداو...هتد پشت گویّ بخاتو باسیان نەکات.

١٥ـ ساردو سڕی لەخوێندنەوەی وتاردا ، واتە: وتاربێژ باسەکەی لەناخی دەروونییەوە هەڵنەقولاّبێتو خۆی لەگەڵیدا نەشێلابێت بەڵکو وەکو وەزیفەیەکی بیّهەستو مەبەست بیەوێت لەکۆڵی بکاتەوەو کات بگوزەرێنێت ، ئیتر بەلایەوە گرنگ نەبێت ئایا ڕەنگدانەوەی دەبێت لەناخی گوێگراندا یان نا؟

بێگومان ئەمە گەورەترین ناتەواوییە لەوتارداو ئەوجۆرە وتارو وتاربێژانەیش ناتوانن ئاڵو گۆڕ لەناخی خۆشیاندا دروست بکەن چ جای کۆمەڵگا.

١٦ ـ بەدوادا نەچوونی بڕگەکانی وتار لەلایەن وتاربێژەوە . واتە: وتاربێژ خۆی بەبەرپرس نەزانیّ لەوتەکانی خۆیو لەهەڵسو کەوتیدا ڕەنگ نەداتەوە، ئەم خاڵە هەرچەند لەدواوە نوسیمان، بەلاّم گەورەترین خاڵی لاوازییە لەوتاربێژانی ئەمڕۆداو. کارێکی وای کردووە خەڵك متمانەی بەزۆریان نەماوە، هەر لەم بارەیەوە کە(اخطل)ی شاعیر دەڵیّ:

لايُعجبنْك من خطيـب خطبة حتـــى يكون مع الكلام أصيلا
ان الكـــلام لفي الفؤاد وانّما جُعلَ اللسان على الفؤاد دليلاً[(٢)]

واتە: سەرسام مەبە بەوتاری هیچ وتاربێژێك هەتا کردەوەکانی لەگەڵ قسەکانیدا یەك نەخات. بەڕاستی وشە لەدڵدایە بەلاّم زمان کراوە بەریّ ڕوونکەرەوە بۆ دڵ .

---

(١) چۆن دەبیتە وتاربێژێکی سەرکەوتوو کاریگەر، انور احمد مصطفی :٣٨ . ٤٠ ، العقد الفريد ابن عبد ربه الاندلسي ٥٢/٤.

(٢) شرح شذور الذهب، جمال الدين ابن هشام الانصاري ، ٣٢.

# فەسڵی پێنجەم / ئادابی گوێگر

وەك لەسەرەتای چاپی یەكەمەوە ئاماژەم پێكردبوو كەلەم چاپەدا شپرزەیی بواری نەدام ئەم فەسڵە بخەمە بەردیدی خوێنەران بەڵام ئەمجارە بەپێویستم زانی ، چونكە هەرچەند ئەم باسە بەشێوەیەكی راستەوخۆ تایبەت نیە بە وتارو وتاربێژەوە ، بەڵام لەبەرئەوەی وتار بۆ گوێگر ئامادە دەكرێت و ، وتاربێژیش خۆی بۆ ئەوان ماندو دەكات ، پێویستە ئەوانیش ئامادەیی تەواویان تیا بێت و بەرلەوەی بێن بۆ نوێژی جومعە ، یان گوێگرتن لەهەر وتارێكی تر ، دەبێ دڵ و دەروونیان وەك پارچە زەوییەكی خۆشكراو لێبكەن ، بۆئەوەی وتەكانی مامۆستای تیا سەوز بێت و گەشە بكات و بەرهەم بدات بەدەستەوە ، خۆگەر گوێگر وانەبوو ئیتر چ سودێك وەردەگرێت لەهاتنی بۆ نوێژی جومعە ؟ یان ئەگەر وانیە بۆ چ خوای گەورە رۆژی جومعەی جیاكردۆتەوەو فەزڵیداوە بەسەر شەش رۆژەكەی تردا و ، نوێژی جومعەیشی كردووە بە شانوێژی(٣٤) نوێژی تر لەو هەفتەداو ، واجبی كردووە بەجەماعەت بكرێت و وتاری تیا بدرێت و ، سورەتێكی لەقورئاندا بەناوی ئەو رۆژەوە ناو زەد، كردووە؟ بۆیە دەمانەوێ چەند ئایەت و فەرموودەیەك لەم بارەوە مانابكەین:

١ ـ چوون بۆ ئەو نوێژە بەخۆشحاڵ و دڵ بێداریەوە :وەك خوادەفەرموێ : ﴿يا ايها الذين امنوا اذا نودي للصلاة من يوم الجمعة فاسعوا الى ذكر الله... الاية ﴾ الجمعة: ١٠

واتە: ئەی باوەڕداران هەركات بانگ درا بۆ نوێژ لەرۆژی هەینیدا بڕۆن بەرەو یادی خواو واز لەمامەڵەو فرۆشتن بهێنن، ئەم چوونەتان بەرەو یادی خوا چاكترە بۆتان ، بەڵكو بەو بۆنەیەوە بەختەوەرو سەرفرازبن.

مەبەست لە(فاسعوا) راكردن و بەپەلە رۆیشتن نیە ، چونكە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانمان پێدەكات بەلەسەر خۆییەوە بچین بۆ نوێژو پەلە نەكەین وەك بوخاری و موسلیم ریوایەتیان كردووە ، بەڵام مەبەست گرنگی پێدانەو بەدڵ چوونە[1] ، بەشێوەیەك ئەو نوێژەمان لاشیرینتر بێت لەهەموو مامەڵەو قازانج و كارێكی تری دنیایی.

٢ ـ بێدەنگی و ئارامی لەكاتی وتارداو جێ بەجێكردنی ئەو ئامۆژگاریەی بانگ بێژەكان رۆژی هەینی دەیدەن بەگوێماندا كەدەفەرموێ: (....الجمعةحج المساكين وعيد المؤمنين ، الخطبتان تقومان مقام ركعتين من الفرض ، فاذا ارتقى الخطيب على المنبر فلا يتحدثن احدكم ، ومن تحدث فقد لغى ، ومن لغى فلاجمعة له، أنصتوا واصغوا لاستماع الخطبتين ).

---

[1] تفسير ابن كثير ، صفوة التفاسير :

واتە: ڕۆژی جومعە ، یان نوێژی جومعە حەجی هەژارەکانەو ، جەژنی باوەڕدارانە ، ئەو دوو وتارەی هەینی لەجێی دووڕکاتە ، هەرکات وتاربێژ سەرکەوتە سەر دوانگە باهیچ کەس لەئێوە قسەنەکاتو ، هەرکەس قسەی کرد ئەوە زیادە قسەی کردووە ، هەرکەسیش زیادە قسە بکات ئەوە پاداشتی دەسناکەوێ لەو جومعەدا ، بێدەنگ بنو گوێ هەڵخەن بۆ بیستنی ئەو دوو وتارە.

لەکاتی نووسینی ئەم دەقەدا تێبینیەکم هەیە حەزدەکەم ـ وەك ئەرکی سەرشانم ـ بەوتاربێژە بەڕێزەکانی رابگەیەنم تکام وەهایە دڵم بۆ بکەنەوەو لێم تێبگەن:

ئەویش ئەوەیە : لەسەر زاری قورئان خوێنانو بانگ بێژانی هەینی وابـاوە کە ئەم دەقە هەمووی فەرمودەی پێغەمبەر(ﷺ) بێتو (ابوهریرة) (ﷺ)لەوەوە ریوایەتی کردبێت وەك دەڵێن:

عن ابي هريرة (ﷺ) قال: قال رسول الله (ﷺ) الجمعة ...هتد).

بەڵام من زۆر گەڕام بەدوای ئەم دەقەدا لەو کتێبانەی لەبەردەستمدان لە(فقه)و (حديث) بۆم دەرکەوت تەنها ئەم ئەندازەی فەرموودەیە: (...فاذا ارتقى الخطيب على العنبر فلايتحدثن احدكم ، ومن تحدث فقد لغى ، ومن لغى فلا جمعة له ...)

ئەو ئەندازەیش بڕگەی یەکەمی بە(لفظ)ێکی‌تر نزیك لەو (لفظ)ە هاتووە، وەك لەسوننەتەکانی جومعەدا مشتو مڕەکەی (ابی)و (ابو الدرداء)مان باس کرد کەچۆن رویداو پێغەمبەریش بە(ابودرداء)ی فەرموو: (اذا سمعت امامك يتكلم فانصت حتى يفرغ )مانای ئەم دەقەیش نزیکە لەدەقی (فاذا ارتقى الخطيب على المنبر فلا يتحدثن احدكم ).

بڕگەی دووەمیش (ومن تحدث فقد لغى) بوخاریو مسلم لە (ابو هريرة)ەوە روایەتی دەکەن بەم لەفزە: (اذا قلت لصاحبك يوم الجمعة انصت والامام يخطب فقد لغوت).

بڕگەی سێیەم : (ومن لغى فلا جمعة له)ئیمامی احمد لەحەزرەتی(علی)ەوە ریوایەتی دەکات بەم لەفزە : (ومن تكلم فلا جمعة له)[1] .

بەڵام ئایا ئەم هەموو دەقە چۆن کرا بەفەرموودەو ؟ چۆن پاڵیان دابە (ابوهريرة)وەو ؟ چۆن زانایانی کوردەواری ئەم مێژووە درێژە لێی بێدەنگ بوون ؟ تکام وایە وەڵامی ئەم پرسیارانە ئەگەر یەکێ لای هەیە بۆم بنێری دوعای خێری بۆ دەکەم ، ئەگەر نیشە هەر وتاربێژێك لەئاستی خۆیەوە بەبانگ بێژو قورئان خوێنەکەی بڵێ: ڕۆژانی هەینی بەم شێوە دەقە کەبخوێننەوە: (الجمعة حج المساكين ... هتد)ئەوکاتە دووردەبین لەو هەڕەشەی پێغەمبەر(ﷺ) کەفەرموویەتی : ( هەرکەس درۆم بەدەمەوە بکات باجێگای خۆی لەئاگردا ئامادە بکات)و ئامۆژگاریەکەیش دەمێنێ.

---

[1] فتح الباري بشرح صحيح البخاري ، العسقلاني : ٢/٤٨١.

٣ ـ گوێگران نەك تەنها قسە نەكەن ، بەڵكو ئەگەر كەسێكیش لەپەنایاندا قسەی كرد ، نابێ بەقسە پێی بڵێن بێدەنگ بە ، بەڵكو دەبێ بەئاماژە ئاگاداری كەن وەك فەرموودەكەی بوخاریو موسلیم بەروونی ئەمەی گەیاند.

٤ ـ دروست نییە گوێگران لەكاتی وتاردا یاری بەتەسبیحوپەنجەو ئەم جۆرە شتانە بكەن یان خۆیان مەشغوڵ كەن بەشتێكی ترەوەو دڵیان لای وتارەكە نەمێنێ وەك فەرموودەی (ومن مس الحصى فقد لغى) رواه مسلم[1] .

واتە: هەركەس یاری بەوردە بەرد بكاتو دەستیان تێوەردات ئەوە قسەی كردووە .

واتە: وەك قسەكردن وەهایە.

٥ ـ دروست نیە ئامادەبووان لەكاتی وتاردا هەستن نوێژیش بكەن جگە لەدوو ڕكات (تحية المسجد)بۆ كەسێك لەكاتی وتاردا بێتە ژوورەوە ئەویش دەبێ بەخێرایی بیكات.

چونكی پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ: (اذا جاء احدكم يوم الجمعة والامام يخطب فليركع ركعتين وليتجوزفيها )رواه احمد مسلم وابوداود[2].

واتە: ئەگەر یەكێك لەئێوە هات ڕۆژی جومعە لەكاتێكدا مامۆستا وتاری دەدا بادووڕكات بكاتو دەستو بردیان تێدا بكات.

خەتیبی شەربێنی دەفەرموێ: (ولايباح لغير الخطيب من الحاضرين نافلة بعد صعوده المنبر وجلوسه وان لم يسمع الخطبة لاعراضه عنه بالكلية ، ونقل فيه الماوردي الاجماع ...واذا حرمت لم تنعقد كما قاله البلقيني لأن الوقت ليس لها ، وكالصلاة في الاوقات الخمسة المكروهة بل أولى للاجماع على تحريمها هنا كما مر بخلافها ثَمَّ ، وتُستثنى التحية لداخل المسجد والخطيب على المنبر فيصليها ندباً مخففة ، وجوباً ، ...هذا ان صلى سنة الجمعة ، والا صلاها مخففة وحصلت التحية ، ولايزيد على ركعتين بكل حال فأن لم تحصل تحية كأن كان في غير مسجد لم يصل شيئاً ، فاطلاقهم ومنعهم من الراتبة مع قيام سببها يقتضي انه لو تذكر في هذا الوقت فرضاً لايأتي به وانه لو اتى به لم ينعقد ...)[3] .

واتە: حەڵاڵ نیە بۆ ئامادەبووان ـ جگە لەوتاربێژ ـ نوێژی سوننەت بكەن دوای ئەوەی ئەو سەركەوتە سەردوانگەو دانیشت ، با ئەوكەسە گوێی لەوتارەكەیشی نەبێت ، چونكە نوێژكردن واتە: پشت كردن لەوتاربێژ بەیەكجاری ، (ماوردی) یەكدەنگی زانایانی لەسەر ئەم مەسەلەیە نەقڵ كردووە ، كە نوێژ ـ لەم كاتەدا ـ حەرام بێت ئەگەر كردیشی دانابەسرێو بەتاڵە وەك بەڵقینی

---

[1] اقتران النيرين ، مامۆستا ملا رشيد بەگی بابان : ٢٢٣/٦.

[2] فقه السنة: ٣٠١/١.

[3] مغني المحتاج :٢٨٨/١.

**فەرموویەتی: چونکە کاتی نوێژ نیە ، وەك نوێژکردن لەپێنج کاتە نارەواکەدا ، بەڵکو ئەم لەبەر تریشە چونکە لێرەدا یەکدەنگی زانایان هەیە لەسەر حەرامی نوێژ وەك باسمان کرد ، بەڵام لەپێنج وەختەکەدا نیە.**

**تەنها(تحیة المسجد) جیادەکرێتەوە لەم حوکمە بۆ کەسێك تازە بێتە ژوورەوەو، بۆ وتاربێژ لەسەر دوانگە کەسوونەتە بیکەن، بەڵام واجبە بەخێراییو دەستو بردبێت ، ئەمەیش بۆ کەسێك سوننەتی جومعەی کردبێت، ئەگەرنا سوننەتەکە بکات بەخێرایی جێگای (تحیة)یشی بۆ دەگرێت، بەهەربارێکیش بوو نابێ لەدوو رکات زیاتر بکات ، ئەگەر شوێنەکە مزگەوت نەبوو هیچ نوێژێك نەکات.**

**گشتگیری وتەی زانایانو رێگرتنیتان لەسوونەتی (راتبە) لەگەڵ هەبوونی هۆکارەکەیشیدا ئەوە دەگەیەنێ ئەگەر کەسێك لەوکاتەدا بیری کەوتەوە فەرزێکی رابوردووی لەسەرە نابێ بیکات ، وەئەگەر کردیشی بەتاڵە).**

**بۆیە درێژەمدا بەم خاڵەو دەقی شەرعەکەیشم نەقڵکرد، چونکە ئەو چەند ساڵەی وتاربێژ بووم (سەرم ئاوسابوو) بەدەست ئەو کەسانەوە لەوەختی وتاردا هەڵدەسانو سوننەتیان دەکرد، دەیانجار پێم رادەگەیاندن وازیان نەدەهێنا.**

**زیاتریش لەوان سوێی هەندێ مامۆستا لەدڵمایە کەوتاری کوردی بەوتار نازاننو لەوکاتەدا سوننەتیان دەکرد !**

**دەبێ کوردی داماو بۆ وتارەکەیشی وتار نەبێ ؟ ئەی ئەگەر وتار نیە پێشینانی ئێمە بۆ دایان هێناوەو ئێمەیشیان فێرکردبووە؟**

**دەی ئەگەر کوردی وتار نیە بابای کوردزمان چ سوودێ وەردەگرێ لەوتاری عەرەبیو (فاعل)و (مفعول)و (فعل التعجب) ؟**

**ئەی ئەو مامۆستا بەرێزانە ناپرسن لەخۆیان فتواو کردەوەی ئەوان رێخۆشکردنە بۆ هەموو خەڵکەکەو چاوی لێدەکەن ، ئەمەیش مانای وایە وتاری کوردی دەبێتە گاڵتەو گرنگی نامێنێ، چونکە هەندێ لەو مامۆستایانە بێپەردە دەڵێن: سوننەتکردن لەوکاتەدا خێرترە لەگوێگرتن، دیارە عەوامی هەژاریش بەدوای (خێرتر)دا دەگەڕێ.**

**من پێم سەیرە مامۆستایەك لەم رۆژە ئاڵۆزەو پرمەینەتیو تاوانەدا ئەوەندە لەوتاری هەینی بگات کەتەنها بریتییە لەو پێنج روکنە.**

**(الحمد لله ، والصلاة علی رسول الله ، (اوصیکم بتقوی الله )خوێندنەوەی ئایەتێكو، دوعایەك بەعەرەبی ، بێئەوەی کەس بزانێ مانای چی ؟**

بەڕاستی ئەگەر ئێمە وا لەم دینە بگەین و لەمانای پڕفەڕی وتاری هەینی بگەین و ، هەوڵبدەین ئەو سەرچاوە پاراوەی بانگەوازی ڕێگای خوا بەدەستی خۆمان وشك بكەین تاكەس لێی پاراو نەبێتەوە، ئەو دەروازە پان و پۆڕەی مێژووی ڕێنمایی و بەگژاچوونەوەی ستەم و ستەمكاران تەسك و بێ دەرفەت بكەین تاكەسی لێ نەیەتە ژوور، ئەوە بێگومان نەیارانی ئەم دینە ئافەرین و دەستخۆشیمان لێدەكەن و ، پیرۆزبایی ئەو قوتابخانە نوێیەی (فیقە)و (اجتهاد) پشمان لێدەكەن.

٦ ـ پێویستە گوێگر ئاگاداربێت ئەو كەسەی لەكاتی وتاردا قسە دەكات پێغەمبەر(ﷺ) خستوویەتی یە ریزی ئەو جوولەكانەوە كەتەوراتیان بۆ هات و كاریان پێنەكرد، وەك دەفەرموێ: (من تكلم يوم الجمعة والامام يخطب فهو كمثل الحمار يحمل أسفاراً ، والذي يقول له انصت ليس له جمعة ) رواه احمد باسناد لابأس به[1].

واتە: هەركەس ڕۆژی جومعە قسەی كرد لەكاتێكدا ئیمام وتاری دەخوێند ئەوە وەك كەرێك وەهایە باری كتێبی هەڵگرتبێت ، ئەوەیش كەپێی دەڵێ: بێدەنگ بە هەر جومعەی بۆ نیە . واتە: خێرەكەی دەسناكەوێ.

هەر ئەم هەڕەشەیش ڕووبەڕووی جوولەكەكان وتراوە: ﴿مثل الذين حملوا التوراة ثم لم يحملوا كمثل الحمار يحمل أسفاراً...﴾ الجمعة:٥.

٧ . (عبدالله)ی كوری (عمر (ﷺ) لەپێغەمبەرەوە دەگێڕێتەوە ؛ كەفەرموویەتی: (يحضر الجمعة ثلاثة نفر: رجل حضرها يلغو وهو حظه منها ، ورجل حضرها يدعو فهو رجل دعا الله عزوجل ان شاء أعطاه وان شاء منعه ، ورجل حضرها بانصات وسكوت ولم يتخط رقبة مسلم ولم يؤذ أحداً فهي كفارة الى الجمعة التي تليها وزيادة ثلاثة أيام ، وذلك بقول الله تعالى من جاء بالحسنة فله عشر أمثالها ﴾ رواه ابوداود وابن خزيمة في صحيحه[2]..

واتە: سێ جۆر كەس ئامادەی نوێژی جومعە دەبێت: پیاوێك ئامادە دەبێت و قسە دەكات ، ئەوە تەنها ئەو قسەی دەسكەوتووە لەو جومعە، پیاوێك ئامادە دەبێت و دەپاڕێتەوە ئەوە پیاوێكە لەخوای گەورە پاڕاوەتەوە ئەگەر ویستی پێی دەبەخشی و ئەگەر ویستیشی پێی نابەخشی ، پیاوێكی تر ئامادە دەبێت ، گوێ هەڵدەخات و بێدەنگ دەبێت ، ئەوە ئەو جومعە بۆی دەبێ بەكەفارەت هەتا جومعەی دوایی و سێ ڕۆژیش لەوە زیاتر ئەمەیش بەفەرموودەی خوا ــ كەهەركەس چاكەیەك بكات دەئەوەندە پاداشتی دەدرێتەوە).

ئەم خاڵی حەوتەمە دەكەین بەخاڵی كۆتایی لەم فەسڵە چونكە زۆر بەجوانی وەڵامی هەموو پرسیارەكان دەداتەوە كەكاتی وتار تەنها كاتی گوێگرتنە، نەك قسەكردن و دوعاكردن و نوێژكردن.

---

[1] سبل السلام بشرح بلوغ المرام ، الصنعاني :٢/٥٠.

[2] التاج الجامع للاصول :٢٨٨/١،٢٨٩.

بەلأم ئايا گوێگرتن لای هەموو مەزهەبەکان واجبە یان نا؟ ئەوە لەسوونەتەکانی خوتبەی هەینیدا باسمانکردو ناگەرێینەوە سەری.

لەم فەسلەدا هەر ئەوەندەمان ویست ئادابی گوێگرتن باس بکەین ، بەلأم ئەو خالأنەی تر کەتایبەتن بەرۆژی هەینیو ئامادەبوانەوە ـ پشت بەخوا ـ هەلی دەگرین بۆ فرسەتێکیتر.

داوایشم ئەوەیە وتاربێژە بەرێزەکان هەر سالەی (دوسێجار) ئەم باسە بکەن بەوتارێکی هەینیو گوێگرانی لێ ئاگادار کەن.

خوای گەورە لەمنیش و ئێوەیش و گوێگرانیشی وەرگرێت ئامین.



# بەشی سێیەم
# وتارەکان

## فەسڵی یەکەم/ مردن و زیندوبوونەوە

## فەسڵی دووەم/ بۆنە ئاینیی و کۆمەڵایەتییەکان

## فەسڵی سێیەم / دوو فەرموودە لەیازدە وتاردا

## فەسڵی چوارەم / چەند وتارێکی جیا جیا

# فەسڵی یەکەم / مردونو زیندوبوونەوە

## ١ ـ یادی مردن *

مردن یەکەم هەنگاوی کاروانی قیامەت لەبەرئەوە پێویستە پێشەکی باسێکی مردن بکەینو ئەو یادە لەدڵماندا زیندووبکەین، وەك خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ وجاءت سكرة الموت بالحق ذلك ماكنت منه تحيد ﴾ ق: ١٩

مردن کارەساتێکە کەئادەمیزاد لەهەموو شتێك زیاتر خۆی لێدەشارێتەوەو لای لێدەگرێ، بەڵام هەر لەچنگی دەرباز نابێت، چونکە مردن پێشو دواناکاتو ڕێگای دیاریکراوی خۆی لێ تێك ناچێت.

مرۆڤ بەیادی ﴿سكرة الموت ﴾گیانی دێتە لەرزەو هەشۆکە کەهێشتا والەژیانی دنیایشدا، دەی ئەبێ حاڵی چۆن بێت لەو ڕۆژەدا کەبەراستی یەخەی پێدەگرێت؟!

لەفەرموودەی(صحیح)دا هاتووە پێغەمبەر( لەکاتی(سکرات)دا عارەقی ڕوومەتی دەسڕیو دەیفەرمو: ﴿سبحان الله ان للموت سكرات ﴾واتە: پاكو خاوێنی بۆ خوا بەراستی گیانەڵەی مردن سەختو گرانە. جا ئەگەر پێغەمبەر(ﷺ) ئەوە حاڵی بووبێت کەخۆی هاوڕێی هەرە بڵندو مردنی هەڵبژارد، دەبێ غەیری ئەو حاڵی چۆن بێت؟

بەڕاستی پێویستە بۆکەسێك کەمردن پاشە ڕۆژی بێتو، توێی گڵ جێگا خەوی بێتو، مارو کرم هاودەمی بنو، (نكيرو منكر) هاوڕازی بن، قیامەتیش دوا مەنزڵی بێت، کەهەمیشە یادی لای مردن بێتو خەریکی خۆئامادەکردن بێت بۆی، ئەمەیش بەوەدەبێت هەمیشە یادەکەی لەدڵیدا تازە بکاتەوە، گوێ هەڵخا بۆئەو باسو خواستانەی کەئەم یادە پیرۆزە لەدڵیدا نوێ دەکەنەوە، وەك پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێ: (الكيس من دان نفسه وعمل لما بعد الموت)[1] مانای: ( ژیر ئەو کەسەیە نەفسی خۆی بگرێو زاڵ بێت بەسەریدا وەکردەوەی چاك بکات بۆپاش مردنی).

( بەڵێ مردن ئەو کارەساتە سەختەیە کەملی ستەمکارانو پشتی کیسراکان دەشکێنێ، کۆشکی هیوای پادشاو قەیسەرەکان دەڕمێنێ، ئەوانەی کەهەمیشە دڵیان لەیادی مردن کوێر بووە تا کتوپڕ یەخەیان پێدەگرێو لەکۆشکی بەرزەوە دەیانبات بەرەو گۆڕی تاریك، لەڕۆشنایی تەختی

---

* ئەم زنجیرە وتارەم لە(١ـ ١١) خوێندەوە لەمزگەوتی گەورەی خورماڵ لەهاوینی ١٩٩٣دا، یەکەم وتاریان هەینی٥/٢٨ بەرانبەر ١٤١٣/١٢/١٧ بۆجاری دووەم لەمزگەوتی بێخود خوێندمەوە لەزستانی ١٩٩٤ و ١٩٩٥ . یەکەم وتاریان ١٩٩٤/١٢/٢ بەرانبەر ١٤١٥/٦/٢٩ بوو. هەروەها خوێندمەوە لەئیزگەی یەکگرتوو لەژێر ناوی (قیامەت نامە)دا.

[1] احياء علوم الدين ، ٤٠٨.

ژیانەوەبەرەو گۆڕیچەی تەسكو باریك، لەیاری كردن لەگەڵ نەوجوان و نازداران و لێو سوران نەیان بات بەرەو هامرازی كرم و ماران، لەتەپاوتلیی ناو جێگای گەرم و نەرم، بەرەو تەپاوتلی ناو خۆڵ و قوڕی سارد و گەرم، لەشیرینی هاوژیانی و تێكەڵاوی بەرەو غەم و پەژارەی بێكەسی و تەنیایی)[1] .

( دەبا هەڵگرانی ئاڵای زانست و پێشەوایانی شارستانیەتی ئەمڕۆ، ئەوانەی كاروان بۆ ئاسمانەكان دەكەن و بارەگایان لەسەر مانگ داناوە، باهەموویان كۆببنەوەو هەرچی تواناو دەسەڵاتیان هەیە بیخەنە كار، هەرچی مانگە دەستكردەكانیان هەیە بیخەنە گەڕ، بەڵكو بتوانن خۆیان رزگار بكەن لەدەست تواناو دەسەڵاتی ئەو مردنەی رۆژێ لەڕۆژان زەلیل و ملكەچیان دەكات و جووڵەیان لێدەبڕێ، جا ئەگەر ئەمەیان كرد ئەوكاتە بۆیان هەیە چەندین بەرزە كۆشكی ستەمكاری و لەخوا یاخی بوون بۆ خۆیان بنیات بنێن، خۆ ئەگەر نەیشیان توانی ئەم كارە ئەنجام بدەن ئەوە باشتر وایە لێ بیڕێن بۆ یادكردنەوە لەو گۆڕیچەی ون دەبن لەناویداو لەوخاكەی درێژ دەكێشرێن لەژێریدا)[2] .

بەڵێ یادی مردن بەدڵ و بەگیان جڵەوی مرۆڤ دەگرێ و نایەڵێ زیادە ڕەوی بكات و لەسنوور دەربچێ و بەژیانی كەم و كورتی دنیا بخەڵەتێ.

بەڵێ یادی مردن بەدڵ و بەگیان وادەكات بەمرۆڤ هەمیشە ساتی گیانەڵای لەیادبێت و خۆی بەكاروانی و كۆچەری بزانێت، هەرچەند دنیاو ئارەزووەكانی دەس لەملانی بن و خۆیانی بۆ بنوێنن ئەو تەنها وەك خەونێك بێتە پێش چاوی، بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) دەیفەرموو: (اكثروا من ذكر هاذم اللذات) واتە: زۆریادی ئەوە بكەنەوە كەزۆر بەكوت و پڕی رابواردن و تام و چێژەكان دەبچڕێنێ.

هەروەها دەیفەرموو: ( ئەگەر ئاژەڵ وەك ئادەمیزاد لەمردنیان بزانیایە گۆشتتان لێنەدەخواردن)

حەسەنی بەصری(رەحمەتی خوای لێبێت) دەیفەرموو: مردن ئابڕوی دنیای بردووەو، خۆشی لەدڵی ژیردا جێ نەهێلاوە.

(عمر)ی كوڕی(عەبدولعەزیز) (رەحمەتی خوای لێبێت) زانایانی كۆدەكردەوەو باسی مردنیان بۆ دەكرد هەتا هەموو دەگریان وەك ئەوەی مردو لەبەردەستیاندا بێت)[3].

(یامحی یا ممیت) هەرچەندە بژیم لەم دنیایە من هەر میوانم، وەختێ دەزانم لەناكاودا مردن یەخەم پێ دەگرێ و كۆچی ئەجەل بارو بارگنەم پێ دەپێچێتەوەو بەرەو مەنزڵگای ڕاستەقینە

---

[1] سەرچاوەی پێشوو.

[2] فقه السيرة ، د. محمد سعيد رمضان البوطي /٥٠٥ ،٥٠٦.

[3] احياء علوم الدين : ٤.

دەمخاتە ڕێ، (خۆشم بێ یان ترشم) لەبەردەم پرسیارو وەڵامی نەکیرو مونکەردا دامدەنێو لەخەوی غەفڵەتو بێ ئاگایی ژیانی دنیاو درێژی هیوا(طول الامل) بێدارم دەکاتەوە، ئیتر ئەو ساتە پەشیمانی هیچ سوودی بۆم نابێ وەك سەعدی دەفەرموێ:

خجل انکس که رفتو کار ساخت

کوس رحلت زدندو بار نساخت

خاب نوشین بامداد رحیل

بازدارد پیادرا زسبیل[1]

واتە:

خەجاڵەت ئەو کەسەیە ڕۆیی و کارێکی ئەنجام نەدا

تەپڵی کۆچ لێدراو ئەو بارو بارگنەی سازنەکرد

خەوی شیرین لەبەرەبەیانی کۆچدا

ڕێبوار لەکاروان دوا دەخات

سا ئەی خوایە دڵمان ئاگادارو بێدارکە! تا پێش ئەوەی مردن یەخەمان پێ بگرێ خۆمانی بۆ ئامادەکەین!

ئەی خوایە خۆشەویستی دنیاو درێژیی هیوا لەدڵمان لابەرە، ئەی خوایە دڵمان ئالوودەی یادی خۆت بکە بەشێوەیەك شیرین ترین کاتی یادی تۆبێت، تاوانو گوناه لەدڵماندا تاڵو قێزەون بکە تا ئارەزووی نەکەینو بەرەو ڕووی نەچین (ئامین) واخر دعوانا ان الحمد لله رب العالمین ...

## ٢ ـ یادی قەبر

گۆڕو گۆڕستان ئەوەندە یادی سامناکە تەنانەت ئینسان بەیادیشی دڵی رادەچڵەکێ، زۆرکەس هەن ئازاو بەجەرگن کەچی توانایان نیە شەو گوزەر بکەن بەناو گۆڕستاندا!

گۆڕمەنزڵگای هەموومانەو هەموو بەرەو ئەوێ هەنگاو دەنێین، جا خۆزگەم بەوکەسەی توێشووی ئەو کاروانەی پێیەو بەدەستی بەتاڵ ناڕوات.

(ڕەبیعی کوری خیثم) گۆڕێکی بۆخۆی هەڵکەندبوو لەماڵەکەی خۆیداو هەرکاتێ هەستی بەڕەشبوونی دڵی بکردایە دەچووە ناو گۆڕەکەوە پاڵ دەکەوتو ئەم ئایەتەی چەند جار دەخوێندەوە ﴿رب ارجعون لعلي اعمل صالحاً فيما تركت﴾واتە: ئەی خوایە بم گێڕنەوە بۆ دنیا بەڵکو کردەوەی چاکە بکەمو تەوبە بکەم لەخراپەو تاوان، لەپاشا خۆی وەڵامی خۆی دەدایەوەو دەیوت: ئەی ڕەبیع وارێکام دای بگەڕێرەوە بۆ دنیاو کردەوەی چاکە بکە.

---

[1] گلستان، سعدی شیرزای/ دیباچە.

(مەیمونی کوڕی مهران) دەڵێ: لەگەڵ عومەری کوڕی عەبدولعەزیز چووم بۆ گۆڕستان، دای بەلای گۆڕی باو باپیریدا گریاو وتی: ئەی مەیمون ئەمە گۆڕی باوپیرمە، هەر دەڵێی بەشداری خەڵکی دنیایان نەکردووە لەخۆشیو رابواردندا[1].

بەڵێ مردن دوا کاروانی دنیایەو گەڕانەوەی بەدوا نایە، کاروانێکە یان بۆ بەختەوەری هەتا هەتایی یان بۆ نەگبەتیو بەدبەختی بێکۆتایی.

لەفەرموودەی پێغەمبەردا(ﷺ) هاتووە: ( هەرکات تەرم دانراو پیاوان هەڵیان گرتە سەر شانیان ئەگەر پیاو چاك بوو دەڵێ زوویم بەن زوو بم بەن، وە ئەگەر ناچاکیش بوو دەڵێ: ئەی وەیلو سزا بۆم بەرەو کوێ دەمبەن؟ هەموو شتێك دەنگی دەبیستێ ئادەمیزاد نەبێ، ئەگەر ئادەمیزاد گوێی لێبوایە گیانی دەردەچوو)[2].

هەروەها لەفەرموودەیەکی تردا دەربارەی پیاوچاك دەفەرموێ: ( ... دوو مەلائیکە دێنە لای دادەنیشنو پێی دەڵێن: خوای تۆ کێیە؟ دەڵێ: خوام ﴿ الله ﴾ یە، پێی دەڵێن ئاینت چییە؟ دەڵێ ئاینم ئیسلامە، پێی دەڵێن: ئەم پیاوە چی بوو نێردرابوو بۆ لاتان؟ دەڵێ: ئەوە پێغەمبەری خوابوو، دەڵێن تۆ چۆن دەزانی؟ دەڵێ: قورئانی خوام خوێندەوەو باوەڕم پێهێناو بەڕاستم زانی، ئەمجا بانگ ئەکرێ لەدانیشتوانی ئاسمان کەبەندەی من ڕاست دەکاتو جێگای بۆ ڕاخەنو دەرگای بۆ بخەنە سەر پشت بەرەو بەهەشت ئیتر شنەو بۆی خۆشی بەهەشت دێ بەسەریاو گۆڕەکەی بۆگوشاد دەکرێ بەئەندازەی بینایی چاوی).

هەروەها پێغەمبەر(ﷺ) دەربارەی خراپەکار دەفەرموێ: (... دوو مەلائیکە دێنە لایو دادەنیشنو پرسیاری لێدەکەن کێخواتە؟ دەڵێ: ها، ها نازانم، دەڵێن ئاینت چییە؟ دەڵێ: ها ، ها، نازانم، دەڵێن: ئەم پیاوە چی بوو نێررابوو بۆلاتان؟ دەڵێ: ها، ها، نازانم، بانگەواز دەکرێ بۆ ئاسمان کەئەم درۆدەکاتو جێگای بۆ ئامادە کەن لەئاگرداو، دەرگای ئاگری بۆ بخەنە سەرپشت، ئیتر گەرماو بڵێسەی دۆزەخ بۆی دێتو گۆڕەکەی تەسكو باریك دەبێتەوە تاپەراسووەکانی تێ دەشکێن بەمل یەکدا)[3].

جا بەڕاستی لەسەرمانە پەلە بکەین بەکردەوەی چاکە، بەڵکو چاکەیەکمان فریای ئەو ڕۆژەمان بکەوێ وەك پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێ: ( پەلە بکەن لەکردەوەی چاك تا یەکێك لەم حەوت کارەساتە یەخەی پێ نەگرتوون: هەژارییەك کەهەموو شتێکتان لەیاد بەرێتەوە، یان دەوڵەمەندیەك گومڕاو

---

[1] احياء علوم الدين ٤٤٢/٤.

[2] ماذا بعد الموت / شاكر عبدالجبار ، ٥٩ ، هەروەها تەفسیری (ابن كثير) ٥٢١/٢ ابراهيم :٢٧ ﴿يثبت الله الذين امنوا ...الاية ﴾.

[3] شاكر عبدالجبار،ماذا بعد الموت / ٦٠.

سەرلێشێواوتان بکات، یان نەخۆشیەك کەلەکارتان بخات، یان پیریەك کەداماوتان بکات، یان مردنێکی کوتوپڕ یەختەتان پێبگرێ، یان هاتنی دەجاڵ کەخراپترین نادیارێکە چاوەڕوان دەکرێت، یان هاتنی قیامەت کەلەهەموویان دژوارترو تاڵترە)[1].

دەگێڕنەوە پیاوێکی زۆر خراپ لەناوچەیەك لەناوچەکانی بەصرە دەمرێت، ژنەکەی دا دەمێنێ بەدەسیەوەو کەس ناچێ بەدەمیەوە بۆ کفن و دفنی، دوو حەماڵی بۆ دەگرێ دەیبەن بۆ بیابانێك تا بیشارنەوە خۆیشی لەگەڵیان دەڕوات، لەو ناوەدا پیاوچاکێك لەخەڵوەیەکدا خەریکی عیبادەتە کەچاوی بەتەرمەکە دەکەوێت دەچێ بەرەو ڕووی تا نوێژی لەسەر بکات، لەشاردا هەواڵ بڵاو دەبێتەوە کەفلاّن خواپەرست نوێژی لەسەر ئەو مردووە کردووە بۆیە زۆریان دەچن و نوێژی لەسەردەکەن، خەڵك سەریان سوڕدەمێنێ و پرسیار دەکەن لەخوا پەرستەکە بۆچ نوێژت لەسەر ئەم لەخوادوورە کرد؟ وتی: لەخەودا پێیان وتم: بچۆ خوارەوە لەخەڵوەکەت بۆ فلاّن شوێن تەرمێك لەوێ دەبینی کەسی لەگەڵ نیە ژنێك نەبێت، نوێژی لەسەر بکە چونکە خوا لێی خۆش بووە خەڵکەکە زیاتر سەریان سوڕما، پیاوچاکەکە ژنەکەی بانگ کردو لێی پرسی: ئەم مێردەت چۆن بووە؟ وتی: بەدرێژایی ڕۆژگار سەر خۆش بووە، وتی: یادبکەرەوە بزانە هیچ چاکەت لێ دیوە؟ وتی: بەڵێ سێ چاکەی بووە.

یەکەم: هەموو ڕۆژێ لەبەرەبەیاندا هۆشی بەخۆیدا دەهاتەوەو جلەکانی دەگۆڕی و نوێژی بەیانی بەجەماعەت دەکردو لەپاشدا دەچوو بۆ مەیخانە.

دووەم: زۆر کات ماڵەکەی هەتیوی دوو هەتیوی تیا بووە زۆر چاکەی لەگەڵ کردوون زیاتر لەمناڵەکانی خۆی خەمی هەتیوانی لەدڵدابوو.

سێیەم: جار جار بەهۆشی خۆیدا دەهاتەوەو لەتاریکایی شەودا دەگریاو دەیووت: ئەی خوایە دەبێ چ سوچێك لەسووچەکانی جەهەننەم پڕکەیتەوە بەم پیسی بەدکارە - مەبەستی خۆی بوو — ئیتر کابرای خوا پەرست ڕۆیشت و زانی ئەمە هۆی لێخۆشبوونی خوایە بۆی[2].

---

[1] ریاض الصالحین ، باب ذکر الموت.

[2] احیاء علوم الدین: ٤/٤٤١.

## ٣ ـ فوكردن بەكەڕەنادا( نفخ الصور )

لەباسەكانی پێشوودا باسی مردنو گیانەڵەو تاریكیو كرمو مارو تەنیایی قەبرمان كردو زانیت، بەلاَم لەمانەیش سەختتر یادی كارەساتی هەرە گەورەی ڕۆژی قیامەتو فووكردنە بەكەڕەنادا[١] بۆ جاری یەكەمو دووەم، كەلەجاری یەكەمدا هەرچی گیان لەبەر هەیە هەموو گیانی دەردەچێت مەگەر كەسانێك خوای گەورە نەیانمرێنێ، وەلەجاری دووەمدا هەموو بەجارێ زیندوو دەبنەوە لەگۆڕ هەڵئەستنو ورد دەبنەوە، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ ونفخ في الصور فصعق من في السموات ومن في الارض الا من شاء الله ثم نفخ فيه اخرى فاذا هم قيام ينظرون ﴾زمر/٦٨. زۆربەی ئادەمیزاد باوەڕ بەقیامەت لەدڵیاندا نەچەسپاوە لەناوەڕۆكی دڵیاندا جێگای خۆی نەكردۆتەوە، بەڵگەیش لەسەر ئەم راستییە ئەوەیە زۆر خۆیان ئامادە دەكەن بۆ گەرمای هاوینو سەرمای زستان كەچی گوێ بەگەرمی ئاگری دۆزەخو سەهۆڵبەندی زەمهەریرەكەی نادەن، هەرچەند زۆر سەختو پڕ كارەساتە، بەڵكو كاتێ باسی قیامەت دەكەن بەزمان دەیڵێنو بەدڵ لێی بێئاگان.

ئەگەر كەسێك دۆستێكی پێی بڵێ: ئەو خۆراكە ژەهراویە، بەزمان بڵێ راست دەكەی، بەلاَم دەست بكات بەخواردنی ئەوەبەزمان بڕوای پێكردووەو بەكردەوە بەدرۆی خستووەتەوە، كرداریش زۆر كاریگەرترە لەگوفتار، بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) لەفەرموودەیەكی قودسیدا دەفەرموێ: ( خوا دەفەرموێت: ئادەمیزاد جنێوی پێداومو بۆی نەبوو جنێوم پێ بدا، بەدرۆی خستمەوەو بۆی نەبوو بەدرۆم بخاتەوە، جنێوەكەی ئەوەیە كەفەرزەندی بۆ من بڕیارداوە، بەدرۆخستنەوەكەیشی ئەوەیە كەدەڵێ خوا زیندوم ناكاتەوە وەك دروستی كردووم).

ئەگەر ئادەمیزاد زاوو زێی گیانلەبەرەكانی بەچاوی خۆی نەدیایەو پێی بوترایە دروستكارێك لەتنۆكێ ئاوی قێزەون مرۆڤێكی جوانكیلەو ژیرو كارامە دروست دەكات زۆر بەتوندی بەرپەرچی دەدایەوەو بڕوای پێنەدەكرد بۆیە خوا دەفەرموێ: ﴿ اولم ير الانسان انا خلقناه من نطفة فاذا هو خصيم مبين ﴾[١] ئایا ئادەمیزاد نابینێ ئێمە دروستمان كردووە لەتنۆكێ ئاو كەچی ئەو ئادەمیزادە كاتێ پێدەگات مشتو مڕ لەگەڵ خوادا دەكاتو داوای بەڵگەو دەلیل دەكات !).

( چەند جوانە ئەم بەڵگە سادەو ئاسانە سروشتییە ئەم زمانە گۆیایە واقعییە نزیكە، ئایا تنۆكێ ئاو چی زیاترە لەئێسكی پەرتوكاوو ڕزیو؟ ئایا مرۆڤ لەوتنۆكە ئاوە بەدی نەهاتووە بۆ

---

[١] احياء علوم الدين ، ٤/٤٦٥.

[١] يس: ٧٧.

یەکەم جار؟ ئایا ئەو کەسەی ئەو تنۆکە ئاوەی کردوە بە مرۆڤێکی تەواو توانای نیە ئێسکە ڕزیوەکان بکاتەوە بە دروستکراوێکی تازەو زیندو؟

کارەکە زۆر لەوە ڕوونترە کەشایستەی مشتو مڕو قاڵە قاڵ بێت ﴿ قل يحيها الذي انشاها أول مرة وهو بكل خلق عليم ﴾[1]

( بەڵێ لەدروستکردنی ئادەمیزاددا بۆ یەکەم جار بەم شێوە جوانەی لەئەندامەکانیدا دەردەکەوێ چەندین شتی سەرنج ڕاکێشو سەر سوڕهێنەر بەدی دەکرێ زۆر زیاتر لەوەی لەزیندو بوونەوەیدا هەیە بۆ جاری دووەم، کەوابوو کەسێ یەکەمی دیبێ چۆن بڕوا بەدووەم ناهێنێ؟

جا ئەگەر باوەڕت لاوازە یاد لەدروست کردنی یەکەم بکەرەوە تا باوەڕت بەهێز بکەیت، چونکە دوەمیش هەروەك یەکەم وەهایە، وە ئەگەر باوەڕت بەهێزە یاد لەو هەموو کارەساتە ترسناکەی نەفخی صورو ڕۆژی قیامەت بکەرەوە تا پەندی لێ وەربگریو دڵت بەژیانی دنیا خۆش نەکەیتو خۆت ئامادە بکەیت بۆ ئەو ڕۆژەی ئاراستەی خوا دەکرێیتو بزانە کەدەنگی فووکردن بەکەڕەنادا بۆ دانیشتوانی گۆڕستان زۆر سەختو سامناکە بەیەك دەنگو یەك جار هەموو گۆڕەکانی سەر زەوی دەم دەکەنەوەو مردووەکان بەجارێ ڕاست دەبنەوە، دەی خۆت دانێ بەیەکێ لەوان، ڕاست بوویتەوە پەشۆکاوو ڕوومەت هەڵقرچاو لەترسا، لاشە خۆڵاوی لەپەنجەی پێ تا تەوقی سەر گوێت هەڵخستووە بۆ ئەو بانگەوازەی بانگ لەئادەمیزاد دەکاتو بەرەو دەشتی مەحشەر بەڕێیان دەکات ﴿ ونفخ في الصور فاذا هم من الاجداث الى ربهم ينسلون * قالوا ياويلنا من بعثنا من مرقدنا هذا ما وعد الرحمن وصدق المرسلون﴾يس: ٥١، ٥٢ [2].

واتە: (فوودەکرێ بەکەڕەناداو زۆر بەپەلە لەگۆڕەکانیان دەردەچنو دەڕۆن بەسەر لێشێواویو ترسو لەرزەوە دەڵێن: ئەوەکێ ئێمەی هەستان لەجێگە خەوەکانمان؟ ئەمجا دەڵێن: ئەمە ئەو ڕۆژەیە خوا بەڵێنی پێداینو پێغەمبەران ڕاستیان کرد).

بەڵێ ئەمە ئەو ڕۆژەیە پێغەمبەر(ﷺ) دەربارەی دەفەرموێ: ﴿ كيف انعم وصاحب الصور قد حنى جبهته واصغى بسمعه ينتظر ان يؤمر ان ينفخ في الصور فينفخ؟﴾

واتە: چۆن دڵخۆش بم لەکاتێکدا خاوەنی کەڕەنا سەری داخستووەو گوێی هەڵخستووەو ئامادەو چاوەڕوانە پێی بوترێ فوو بکە بەصوردا بۆ ئەوەی فووی پیا بکات)[3].

---

[1] في ظلال القران :٥

[2] احياء علوم الدين :٤٦٦/٥.

[3] مختصر منهاج القاصدين ، ابن قدامه المقدسي / ٥٠٤.

بوخاریو موسلیم ریوایەتیان کردووە کە پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێ: ( خوای گەورە ئەرز دەگرێتەوەو کۆتایی پێدەهێنێو، ئاسمان دەپێچێتەوە بەدەستی راستی. پاشان دەفەرموێ: منم پاشا کوان پاشاکانی سەرزەوی ).

لەریوایەتێکی تردا دەفەرموێ: ( خوا ئەرزو ئاسمانەکان دەپێچێتەوە بەدەستی قودرەتی پاشان دەفەرموێ : ( منم الله ، منم پادشا، ئەمڕۆ موڵكو سامان بۆکێیە؟ کەس نابێ وەڵامی بداتەوە، خۆی وەڵام دەداتەوە ﴿ لله الواحد القهار ﴾[1].

لەو رۆژەدا هەموو کەس زیندوو دەکرێتەوە لەسەر ئەو نیازو حاڵەی لەسەری مردووە، وەك پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێ: (هەموو بەندەیەك زیندو دەکرێتەوە بەو حاڵەی لەسەری مردووە).

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر(ﷺ) لەپێغەمبەری خوای(ﷺ) دەپرسی دەربارەی(جیهاد) ئەویش دەفەرموێ: ( ئەی عەبدوڵڵا ئەگەر کوژراوی بەخۆگریو مەبەستت ڕەزامەندی خوابوو خوا زیندووت دەکاتەوە بە خۆگریو نیازپاکیيەوە، ئەگەر کوژرایتو مەبەستت رووپاییو ماڵ زۆرکردن بوو بەرووپاییو ماڵ زۆرکەر زیندو دەکرێیتەوە، لەسەر هەر حاڵێك کوژرایت خوا بەو حاڵە زیندوت دەکاتەوە)[2].

## ٤ ـ گردبوونەوە ( الحشر )

رۆژی قیامەت یان ڕۆژی حەشر ئەوەندەی ناو هەیە لەقورئانو فەرموودەکانی پێغەمبەردا(ﷺ) کە ئینسان ئەگەر بەوردی بیریان لێبکاتەوە سەرسام دەبێت. ئیمامی غەزالی لە(احیاء)کەیدا زیاتر لەصەد ناوی ژماردووە بۆ ڕۆژی قیامەت، کەزۆربەیان لەقورئان دەری هێناون وەك: (یوم القیامة، یوم الندامة، یوم الحسرة، یوم الصاعقة، یوم الواقعة، یوم الازفة، یوم الفراق، یوم التلاق،...هتد)[3].

دیارە زۆری ناو بەڵگەیە لەسەر سەختیو دژواری کارەساتی ئەو رۆژە نەك تەنها دوپاتکردنەوەو ناو زۆر کردن، بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) کاتێ باسی قیامەتی دەخوێندەوە پیر دەبوو وەك خۆی دەفەرموێ: (شیّبتني هود وأخواتها )بەڵام وەیلو بەدبەختی بۆ ئێمەی دڵ مردوو بێئاگا کەقورئان دەخوێنینو تەنها زمانو لێومان پێی دەجوڵێو لاپەرەو ئایەت دەژمێرین، بێئەوەی دڵمان ببزوێ بەو هەموو هەڕەشەو ترساندنەی لەناوەرۆکی ئایەتەکاندا هەیە وەك قورئان خۆی دەفەرموێ: ﴿ اقترب للناس حسابهم وهم في غفلة معرضون ، مايأتيهم من ذكر من ربهم محدث الا استمعوه وهم يلعبون * لاهية قلوبهم ... ﴾ (الانبياء: ١ ـ ٣) .

---

[1] مختصر تذكرة القرطبي، باب يفنى العباد ويبقى الملك لله / ٣٩.

[2] سەرچاوەی پێشوو (باب يبعث كل عبد على مامات عليه ) /٤١.

[3] احياء علوم الدين : ٤/٤٧٠.

واتــە: وانزیــك بوویــەوە لــەئادەمیزاد لێپرســینەوەی دوارۆژیــان کــەچی ئــەوان هــەروان لەبێئاگاییداو دڵ بۆ قورئان نەرم ناکەن، هەر ئایەتێکی تازەو هەر بەڵگەیەکی نوێ یان بۆ دێتو بەگوێی خۆیان دەیبیستن کەچی هەر خەریکی گاڵتەوگەپو یاری دنیابازین، دڵیان بێئاگایەو غافڵە لەیادی قیامەت)[1].

بەڵێ بەڕاستی بێئاگاین لەو ڕۆژە بەدڵ یادی لێناکەینەوە ئەگینا ئارام مان لێدەبڕێو، وەقرەمان نامێنێ، ئەو ڕۆژە ڕۆژێکە خوا دەربارەی دەفەرموێ: ﴿ يوم تكون السماء كالمهل ،وتكون الجبال كالعهن، ولايسأل حميم حميما، يبصرونهم يود المجرم لو يفتدي من عذاب يومئذ ببنيه، وصاحبته واخيه، وفصيلتيه التي تؤويه، ومن في الارض جميعاً ثم ينجيه﴾(المعارج:١٤.٨).

واتە: ڕۆژێکە ئاسمان وەك ئاسنی تواوەی لێدێ، چیاکان وەك خوری شیکراوەو ڕەنگاو ڕەنگیان لێدێ، لەو ڕۆژەدا خزمو کەس پرسیار لەیەکتری ناکەنو نایانپەرژێتە سەریەك، هەرچەند چاویان بەیەك دەکەوێ، لەوڕۆژەدا تاوانکار خۆزگە ئەخوازێ بەوەی کوڕەکانیو خێزانیو براو هۆزەکەی بکاتە قوربانیو بەختیان بکات لە پێناوی ڕزگار بوونی خۆی لەسزا، بەڵام خوا بەتوندی بەوشەی﴿کلا﴾بەرپەرچی دەداتەوەو دەفەرموێ: ﴿ انها لظى ﴾بەڕاستی ئاگری دۆزەخەو خاوەن بڵێسەیە ﴿نزاعة للشوى﴾پێستی سەر دادەڕنێ.

﴿ يوم تُبدل الارضُ غير الارض والسماوات وبرزوا لله الواحد القهار ﴾ (ابراهيم:٤٨).

ڕۆژێکە ئەم ئەرزە دەگۆڕێ و بەم شێوەیە نامێنێ، درەختو چیاو تەپۆڵکەو شێوەکانی تەخت دەبێ، ئەرزێکی سپیو بێ هەردوو دۆڵو خوێن تیانەڕژاوو تاوان تیانەکراو دێتە کایەوە، ئەستێرەو مانگو ڕۆژ دەکوژێنەوەو دەکەونە خوارەوە، هەتاو بەشێوەیەکیتر زۆور سەری ئادەمیزاد دەگرێو زۆر نزیك دەبێتەوە، سێبەر نامێنێ جگە لەسێبەری خوای پەروەردگار، لەو ڕۆژەدا ئادەمیزاد هەموو دەچن بەیەکداو کەس سەرکەسی ناپەرژێو باوك لەفەرزەندی ناپرسێو، لافاوی عەرەق هەڵدەنیشێو، هەرکەس بەگوێرەی تاوانی لەناو لیتاوی عەرەقدا ڕۆدەچێ، وەك پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێ: خۆر لەئەرز نزیك دەبێتەوە ڕۆژی قیامەت ئادەمیزاد عەرەق دەکەن هەیە تاپاژنەپێی، هەیە تا نیوەی ئەژنۆی، هەیە تا ئەژنۆی، هەیە تا ڕانی، هەیە تا لاکەلەی، هەیە تادەمی ـ وەلەم کاتەدا پێغەمبەر(ﷺ) دەستی برد بۆ دەمی ـ هەیە عەرەق تەواو دایدەپۆشێ، وەلەم کاتەدا پێغەمبەر دەستی برد بۆ سەری(ﷺ) [2] .

جابرایان خۆشەویستان ئەوەی لەسەختیو گەرماو چاوەڕوانی نەبڕاوەی ئەو ڕۆژە ڕزگارمان کات تەنها خۆماندو کردنمانە لەپێناوی خوادا، با لەم ژیانە کەمەی دنیاماندا، خۆمان ماندو

---

[1] احياء علوم الدين : ٤٧٠/٤.

[2] احياء علوم الدين : ٤٧٠/٤.

بكەین خۆمان بگرین لەسەر بەجیٚهێنانی فەرمانی خواو پێغەمبەری خوا، هەروەها خۆمان بگرین لەسەر دوورکەوتنەوەمان لەتاوان و خراپە. ئەگەر بیربکەینەوە لەسەختی ئەو ڕۆژە خۆگری ئەم ژیانە کەم و کورتەی دنیامان لاسووك و ئاسان دەبێت، بەڵکو تەمەنی هەموو دنیا بەرانبەر چاوەڕوانی پەنجا هەزار ساڵ لەڕۆژی قیامەتدا زۆر کەم و کوورتە)[1].

جابرایان خۆشەویستان با لەترسی گەرماو هەتاوی زۆر گەرمی ئەو ڕۆژە نەبراوە هەوڵ بدەین بەر ئەو مژدەی پێغەمبەرە بکەوین کەدەفەرموێ: ( حەوت کەس هەن خوادەیانخاتە ژێر سێبەری خۆیەوە لەڕۆژێکدا هیچ سێبەرێ نیە جگە لەسێبەری ئەو نەبێ: پادشایەکی دادگەر، لاوێك کەلەپەرەستشی خوادا گەورە بووبێت، پیاوێك دڵی بەندی لای مزگەوتەکان بێت، دووکەس کەلەبەرخوا یەکیان خۆشویستبێ، لەسەر ئەو خۆشەویستی‌یە یەکیان گرتبێ و لەسەر ئەو خۆشەویستی‌یە جیابووبنەوە، پیاوێك کە ئافرەتێکی خاوەن شان و شەوکەت و جوانی بانگی بکات بۆ خراپەکاری ئەویش بڵێ من لەخوا دەترسم، وەپیاوێك خێرێك بکات و بیشارێتەوە بەشێوەیەك دەستی چەپی نەزانێ دەستی ڕاستی چی بەخشیوە، پیاوێك کەبەتەنیا لەگۆشەیەکدا یادی خوا بکاتەوەو لەترسی ئەو ئاو لەچاوەکانی بێتەخوارەوە)[2].

خوایە تو ناوە جوانەکانی خۆت بمانگێرە لەو حەوت کەسەو لەڕۆژی قیامەتدا خۆت داڵدەمان بدەو بمانخە ژێر سێبەری خۆت (ئامین).

## ٥ ـ مشت و مڕی ڕۆژی حەشر

خوای گەورە دەفەرموێ:﴿انك میت وانهم میتون ثم انكم یوم القیامة عند ربكم تختصمون﴾(الزمر: ٣٠ ـ ٣١) .

بەڵێ مشت و مڕو من و تۆی ڕۆژی قیامەت ڕاستەو ڕۆژێکە چاکەو خراپەی مرۆڤ هەمووی دێتەوە بەردەست ﴿ فالیوم لاتظلم نفس شیئاً ولاتُجزون الا ماكنتم تعملون﴾(یس:٥٤) . لەم ڕۆژەدا کەس ستەمی لێناکرێ و تەنها پاداشتی کردەوەکانی خۆتان وەردەگرن، بۆیە حەزرەتی عومەر دەیفەرمو: ( حاسبوا انفسكم قبل أن تحاسبوا وزنوها قبل أن توزنوا )پرسیار لەخۆتان بکەن پێش ئەوەی پرسیارتان لێ بکرێت، و خۆتان کێشانە بکەن بەر لەوەی کێشانە بکرێن.

ئەمەیش بەوشێوە دەبێت مرۆڤ لەکردەوەکانی خۆی وردبێتەوە، ستەمی لە هەرکەس کردووە ماڵی هەرکەسی بەناهەق خواردوە بیداتەوەو باسی هەرکەسی بەخراپە کردووە گەردنی خۆی پێ

---

[1] (احیاء علوم الدین): ٤٦٩/٤.

[2] ریاض الصالحین ، باب الوالي العادل.

ئازاد بکات، چونکە ئەگەر لەم دنیا فریای خۆی نەکەوێ لەوێ خاوەن هەقەکان دەیگرنو داوای هەقی خۆیان دەکەن[1].

ئەبو هورەیرە دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (ئایا دەزانن هەمانە خاڵی(مفلس) کێیە؟) وتیان: هەمانە خاڵی لای ئێمە کەسێکە دراوو ژێواری نەبێت، فەرمووی: هەمانە خاڵی لەئوممەتی من کەسێکە ڕۆژی قیامەت دێت نوێژی هەیە، ڕۆژوی هەیە زەکاتی دەرکردووە بەڵام جنێوی داوە بەمو ماڵی ئەوی خواردووەو بوختانی درۆی بۆ فلان کردووەو خوێنی ناهەقی فیسار کەسی ڕژاندووەو بەناهەق لەفلانیداوە، هەریەکێ لەمانە بەقەدەر هەقی خۆیان لەچاکەکانی دەبەن، خۆ ئەگەر چاکەکانی بڕانەوە بەر لەوەی هەقی ئەوان بداتەوە، ئەوا تاوانی ئەوان فڕێ دەدرێ بەسەر ئەمدا ئەمجا فڕێی دەدەنە ناو دۆزەخ). (موسلیم ریوایەتی کردووە)[2].

ئەمەیە مانای ئەو فەرموودەیەی قورئان: ﴿ ولا تحسبن الله غافلاً عما يعمل الظالمون انما يؤخرهم ليوم تشخص فيه الابصار* مهطعين مقنعي رؤوسهم لايرتدّ اليهم طرفهم وأفئدتهم هواء ﴾ ( ابراهيم: ٤٢ ، ٤٣).

واتە: گومان وانەبەیت کەخوا بێئاگایە لەکردەوەو ستەمی ستەمکاران بەڵکو دوایان دەخات بۆ ڕۆژێ کە چاوانی تیا ئەبڵەق ئەبن، لەو ڕۆژەدا زۆر بەپەلە دەڕۆن بەرەو دادگای خوایی‌و سەریان کردووە بەحەواداو ناتوانن تەماشای بەرپێی خۆیان بکەن دڵەکانیان بێهۆش‌و گۆشەو لەجێگای خۆیان نەماون.

لەو ڕۆژەدا خوای گەورە دەفەرموێ: (انا الملك الديّان لاينبغي لأحد من أهل الجنة أن يدخل الجنة ، ولأحد من أهل النار عليه مظلمة حتى اقتصه منه، ولا لأحدٍ من أهل النار أن يدخل النار ولأحد من أهل الجنة عنده مظلمة حتى اقتصه منه حتى اللطمة)[3].

من پادشای هەق سێنم ناگونجێ هیچ کەسێ لەئەهلی بەهەشت بچێتە بەهەشت، وەهەقی کەسێکی لابێ لەئەهلی دۆزەخ هەتا لێی لێوەرنەگرمەوە بۆی، وەناگونجێ هیچ کەسێ لەئەهلی دۆزەخ بچێتە ناو دۆزەخ وە هەقی کەسێکی ئەهلی بەهەشتی لابێت هەتا لێی وەرنەگرمەوە بۆی، تەنانەت بۆ کزێکیش بەدەست، لەوڕۆژەدا مەڕی بێ شاخ هەقی خۆی وەردەگرێت لەمەڕی شاخدار، ئەبوزەڕ دەگێڕێتەوە جارێکیان پێغەمبەر(ﷺ) بینی دوو مەڕ شەرەقۆچیان دەکرد،

[1] احياء علوم الدين، ٤/٤٧٤.

[2] رياض الصالحين باب تحريم الظلم ، ٢١٨.

[3] مختصر تذكرة القرطبي، باب ماجاء في قصاص يوم القيامة : ٥٢.

فەرمووی: ئەی ئەبوزەڕ دەزانی ئەو دوو مەڕە بۆچ شەڕە قۆچ دەکەن؟ وتم: نەخێر فەرمووی: بەڵام خوا دەزانێ، وە لەڕۆژی قیامەتدا دادگایان بۆ دادەنێ[1].

ئەنەس بۆمان دەگێڕێتەوە: جارێکیان پێغەمبەر(ﷺ) لەناوماندا دانیشتبوو بینیمان پێکەنی هەتا دانەکانی پێشینی دەرکەوت، (عمر) پێی وت: بۆچ پێدەکەنێ ئەی پێغەمبەری خوا؟ دایك و باوکم فیدات بێ فەرمووی: ( دوو پیاو لە ئوممەتم چۆکیان دادابوو لەبەردەم پەروەردگاردا، یەکێکیان وتی: ئەی خوایە هەقەکەم بۆ وەرگرە لەبراکەم، خوای گەورە فەرمووی: بەدوو هەمیان ئەو ستەمەی لێت کردووە بیدەرەوە، یەکەمیان وتی: خوایە هیچ نەماوە لەچاکەکانی تابمداتەوە خوای گەورە فەرمووی: دەی چی دەکەی گەرچاکەی نەمابێ؟ داواکار وتی: (یارب) با هەندێ لەتاوانەکانی من هەڵگرێ ـ لەم کاتەدا فرمێسك هەڵتیشت لەچاوانی پێغەمبەر(ﷺ) ـ پاشان فەرمووی: بەڕاستی ئەو ڕۆژە ڕۆژێکی زۆر سەختە، ڕۆژێکە ئادەمیزاد ناچار دەبن تاوانیان بۆ هەڵگیرێت، پاشان خوای گەورە فەرمووی: بەکابرای ستەم لێکراو سەرت هەڵبڕەو تەماشای بەهەشتان بکە، کاتێ سەری هەڵبڕی وتی:خوایە گیان چەند شارێکی زیوینی بەرزو بڵندو، چەند کۆشکێکی ئاڵتونی ڕازاوە بەگەوهەر دەبینم، ئەمانە هی کام پێغەمبەرە، یان هی کام راستگۆو پیاوچاکە؟ یان هی کام شەهیدە؟ خوا فەرمووی: هی ئەو کەسەیە نرخەکەیم بداتێ، کابرا وتی خوایە گیان کێ‌دەتوانێ نرخەکەی بدات؟ خوا فەرمووی: تۆدەتوانی ، کابرا وتی: نرخەکەی چی‌یە؟ خوا فەرمووی: لێبوردنتە لەبراکەت، کابرا وتی خوایە گیان والێی بوردم، خوا فەرمووی: دەی دەستی براکەت بگرەو بیبەرە ناو ئەو بەهەشتەوە، ئەمجا پێغەمبەر فەرمووی: (اتقوا الله واصلحوا ذات بینکم فان الله یصلح بین المؤمنین )واتە: لەخوابترسن‌و ناکۆکی نێوانتان چاك بکەن بەڕاستی خوا ناوبژی دەخاتە نێوانی باوەڕداران)[2].

دەی تۆش یادێ بکەرەوە لەخۆت بۆ ئەو ڕۆژە سەختە، ئەگەر نامەی کردەوەت هیچ ستەمی تیا نەبێت، یان خوا بەلوتفی خۆی لێبوردنت پێ ببەخشێ‌و بەختەوەری نەبڕاوەت دەسگیرببێ ئای چەندە دڵخۆش‌و بەختەوەر دەبێت کاتێ دەردەچێت لەگۆرەپانی دادگای خوا بەرەو خۆشبەختی‌یەك کە کۆتایی نابێت، بەرەو نازو نیعمەتێك کەهەرگیز بەسەر ناچێت، ئالەو کاتەدا دڵت دەسرەوێت ڕومەتت دەدرەوشێتەوە وەك مانگی چواردە، دەڕۆی بەناو خەڵکی قیامەتدا بەسەر بەرزی‌و بێ‌کوڵ‌و باری تاوان، بریسکەی ڕەزامەندی خواو نازی بەهەشت لەناو چاوانتا دەدرەوشێتەوە، سەرجەمی ئادەمیزادەکان پێشینان‌و پاشینان لێت ورد دەبنەوەو خۆزگە بەحاڵت دەخوازن، فریشتەکان لەبەردەم‌و لەدواتەوە دەڕۆن‌و بەدەنگی بەرز ناوت دەخوێننەوە: ئەمە فلانی

---

(1) المغني عن حمل الاسفار في الاسفار على احياء علوم الدين :٤/٤٧٥

(2) احياء علوم الدين، باب صفة الخصماء ورد المظالم.

کوڕی فلانە خوا لێی ڕازی بووەو ، ڕازی کردووەو، بەختەوەرییەکی پێداوە هەتا هەتایە بەد بەختی بەسەردا نایەت.

جاتوو خوا برای موسڵمان ئەم پلەو پایە گەورەیە، یان ئەو پلەو پایەی بەرپوپایی‌و دووڕوویی لەدڵی خەڵکدا دروستی دەکەیت بۆ خۆت؟

ئەگەر پلەوپایەی یەکەمت بەلاوە گەورەترە هەوڵ بدە تاپێی بگەی بەئیخلاص‌و نیازپاکی‌و ڕاست گۆیت لەگەڵ خوادا، چونکە لەم ڕێگاوە نەبێ هەرگیز پێی ناگەی !!

وە ئەگەر نامەی کردەوەت تاوانێکی تیابوو، تۆ بەسوکت زانیو بەلام لای خوا گەورەبوو، بو بەهۆی خەشم‌و قینی خوا بۆت خوا پێی فەرموویت: لەعنەتت لەسەر ئەی بەندەی بەدکار، هەر لەگەڵ بیستنی ئەم وتەیەدا ڕووت ڕەش دەبێت‌و فریشتەکان خەشم‌و قینیان دەخەنەکارو دەڵێن: دەی لەعنەتی ئێمەیش‌و گرۆی مەخلوقاتیت لەسەربێت، ئا لەم کاتەدا زەبانی‌یەکانی دۆزەخ کەقینیان لێهەڵگرتووی لەبەرقینی خوا بەدەنگی ناسازو، دڵی ڕەق، و شێوەی ناشیرینیانەوە لێت دێنە پێش‌و، دادەبارن بەسەرتاو، لەسەر ناوچەوان ڕات دەکێشن، بەناو گرۆی مەحشەردا هەموو لە ڕوو ڕەشیت ورد دەبنەوە، تۆیش هاواردەکەی بۆ نەگبەتی‌و چارە ڕەشی خۆت‌و پێت دەڵێن: ﴿لا تَدْعوا اليوم ثبوراً واحداً وادع ثبوراً كثيرا﴾.

فریشتەکان هاوار دەکەن ئەمە فلانی کوڕی فلانە خوا نهێنی دەرخستووەو ڕیسواو بەدبەختی کردووە بەهۆی کردەوەی پیسی خۆیەوە، وە بەدبەخت‌و چارەڕەش بووە بەشێوەیەك هەرگیز خۆشبەخت نابێ، لەوانەیشە ئەم تاوانەی تۆ تاوانێك بێت بەدزیەوە کردبێتت لەترسی خەڵك یان لەبەر ئەوەی ڕیسوا نەبیت لەبەر دەمیاندا، یان لەبەر ئەوەی پلەوپایەت لای ئەوان دانەبەزێت، کەچی بوو بەهۆی ڕیسوایی پاشە ڕۆژت! ئای چەند نەفام‌و نەزانی کەدەترسی لەڕیسوایی‌یەکی کەم لەبەردەم کۆمەڵێکی کەم لەبەندەکانی خوا، بەلام ناترسی لەڕیسوایی هەرەگەورەی ڕۆژی گردبونەوە لەبەردەم پێشینان‌و پاشینانی سەر ڕووی زەمین‌و لەپاشان بەکێش کردنت بەدەستی زەبانی‌یەکان بۆ ناو جەرگەی دۆزەخ[1].

## ٦ ـ پردی دۆزەخ ( صراط )

دوای ئەم کارەسات‌و چاوەڕوانی‌یە سەختەی ڕۆژی قیامەت ئەو خەڵکە ڕوو ئەکەنە پردێك کە درێژ کێشراوە بەسەر دۆزەخدا لەموو باریکترو لەشمشێر تیژترە هەرکەس لەم دنیا لەسەر ڕێگای ڕاستی خۆی گرتبێت‌ولارەکەی نەکردبێت لەوێش زۆر بەئاسانی ڕزگاری دەبێت، وە هەرکەس لەم ژیانەدا لەڕێگای ڕاستی لایدابێت کۆڵی سەر پشتی بەتاوان قورس کردبێت لەوێش لەیەکەم

---

(١) هەمان سەرچاوەی پێشوو.

هەنگاودا سەرنگووم دەبیٚو بەسەردا دەکەوێتە ناو دۆزەخ ـ خوا پەنامان بدات ـ ئەمە ئەو ڕۆژەیەخوا دەربارەی دەفەرمویٚ: ﴿فاهدوهم الى صراط الجحيم* وقفوهم انهم مسؤولون﴾(الصافات: ٢٣، ٢٤).

جابرای موسڵمان یادیٚ بکەرەوە بەدڵ لەو ڕۆژە سەختە سامناکە کاتیٚ چاوت بەو پردە تیژە باریکە دەکەوێت و ناچاری بەسەریدا بڕۆی، بڵێسەی دۆزەخیش لەژێرەوە شاڵاوت بۆ دێنیٚ دڵت لەسەر هەزار لیٚدەدات کوڵت قورسی تاوانەکانتە، پێی‌یەکەمت چۆن دادەنێیت و بارسایی دەخەیتە سەری تاپێی دووەمت هەڵبڕی لەبەر چاویشت هەزاران کەس بەردەبنەوە خوارەوەو هاوارو ناڵەی پەشیمانی هەردوو گوێی کاس کردوویت، درک و داڵو قولاپی ناو دۆزەخ قولی بەدکاران دەکێشنەوەو سەرەو نخوونی ناو دۆزەخیان دەکەن، پێغەمبەریش دەپاڕێتەوە (یارب سلم سلم)ئەی خوایە رزگاریان بکە[1].

ئەبو سەعیدی خودری دەفەرمویٚ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموی: ( ئادەمیزاد تێدەپەڕن بەسەر پردی دۆزەخدا کەچەندین درک و داڵو قولاپی ئاسنینی لەسەرە قاچی بەدکاران دەگریٚو بەراست و چەپدا دەیانخاتە خوارو لەم لاولایەوە چەند فریشتە وەستاون دەپاڕێنەوە: ( ئەی خوایە دەریانکە ئەی خوایە دەریان کە، هەندیٚ وەك برقی ئاوێنە تێدەپەڕن، وەهەندیٚ وەك ئەسپی خۆشڕەو، هەندیٚ ڕادەکەنو هەندیٚ ئاسایی دەڕۆن، وەهەندیٚ بەگاگۆڵکیٚو هەندیٚ بەسکە خشیٚ دەڕۆن...هتد )[2].

ئەمەیە کارەساتی سەختی ئەوپردە، بۆیە پێویستە زۆر یادی لیٚبکەینەوە، خۆشبەخت ترین کەس لەو ڕۆژەدا کەسێکە زۆریادی لیٚ کردبێتەوەو زۆر لێی ترسابێت.

مەبەستیشم لەترس دڵنەرمی‌و گریان نیە وەك گریانی ئافرەت ، تەنها ئەو تۆزە لەیادت بێت کەبۆت باس دەکرێت ئیتر زوو لەیادت بچێتەوەو، دەست بکەیتەوە بەگاڵتەو گەپ و دنیاپەرستی.

بەڵکو مەبەستم ترسێکە لەتاوان بتگرێتەوەو هەڵت بنیٚ بۆ خواپەرستی چونکە هیچ قەڵایەك نیە مرۆڤ پەنا بدا لەکارەساتی دڵتەزێنی قیامەت جگە لەوشەی(لا اله الا الله) کەبەراستی بەدڵو بەزوبان بیڵیٚ، بەشێوەیەك تەنها خوای لەدڵدابێت، لەهەواو ئارەزووە دووربێت، چونکە هەرکەس ئارەزوو پەرست بێت، ئەوە ڕاست ناکات لەیەکتاپەرستی خوادا، خۆ ئەگەر ئەمەیشت پیٚناکریٚ پێغەمبەرت خۆشبویٚ سووربە لەسەر سوننەت و ڕەوشتی، دڵی پیاوچاکانی ئوممەتی ڕابگرە، بەهیوای پیرۆزی نزاو پاڕانەوەیان، بەڵکو پێغەمبەرو پیاوچاکان تکات بۆ بکەن[3].

---

[1] احياء علوم الدين: ٣/٥٢٤.

[2] متفق عليه / المغني عن حمل الاسفار في الاسفار :٣/٢٥٢.

[3] احياء علوم الدين، ٣/٥٢٦.

لەفەرمودەی(صحیح)داهاتووە (هەرکەس لەخراپەی براکەی دوابێتو غەیبەتی کرد بێت لەسەر پردی(صراط) گیر ئەدرێتو پێی دەڵێن: ئەوەی وتت دەربارەی براکەت دەبێ ئیسپاتی کەیت، ئەگەر ئیسپاتی نەکرد پێی هەڵەخزێنە ناو دۆزەخ)[1].

دەگێڕنەوە ( ابن الجوزی)( رەحمەتی خوای لێ بێت) دەیفەرمو:حاڵتان چۆنە بێت ئەی برایان کاتێ قولاپە ئاسنینو ئاگرینەکانی پردەکە ئالآیەقاچتان سەر بەرەو خوار هەڵی واسین بەناو دۆزەخدا؟ ئای چەند حاڵەتێکی ناهەموارو ڕێگایەکی سەختە؟ دەی لەم پاشماوەی تەمەنتاندا زۆر لەخوا بپاڕێنەوە داوای لێبووردنی لێ بکەن بەڵکو لێتان ببورێ ئەو ڕێگا سەختەتان بۆ ئاسان کات[2].

قورتوبی لە(تذکرة)کەیدا دەفەرموێ: ابو جعفر(رەحمەتی خوای لێبێت) دەیفەرموو: لەخەودا بینیم وەستاوم بەسەر پردی دۆزەخەوەو کارەساتێکی زۆر سەختم بینی، یادم لەوە دەکردەوە چۆن تێپەڕێم بەمڕێگە سەختەدا؟ یەکێك لەدوامەوە هاواری لێکردم ئەی عەبدی خوا کۆڵەکەت دانێو بچۆ ئەوبەر وتم: کۆڵەکەم چی‌یە؟ وتی: دنیا دانێو بچۆ ئەوبەر[3]. خوایە پەنامان بدەیتو دنیا دەسخەڕۆمان نەکات ...(ئامین).

## ٧ ـ تکاکاری (الشفاعة)

شەفاعەت مانای تکاکاری پێغەمبەر( و پیاوچاکانو زانایانو شەهیدەکان، بۆ ڕزگاربوونی هەندێ لە گوناهکاران لەئاگری دۆزەخ.

بەڵگەی شەفاعەت کردن لە قورئانو فەرموودەکانی پێغەمبەردا زۆرن وەکو خوای گەورە لەقورئاندا دەفەرموێ: ﴿ ولسوف یعطیك ربك فترضى ﴾هەندێك بەپلەی شەفاعەت تەفسیریان کردووە[4].

عەبدوڵلای کوڕی عمری کوڕی عاص دەفەرموێ: ( ڕۆژێکیان پێغەمبەر(ﷺ) ئەم ئایەتەی خوێندەوە ﴿ رب انهن اضللن كثيراً من الناس فمن تبعني فانه مني ومن عصاني فانك غفور رحيم﴾هەروەها ئایەتی ﴿ ان تعذبهم فانهم عبادك ﴾لەپاشدا دەستی بەرزکردەوەو فەرمووی: (امتی ، امتی) لەپاشا گریا، خوای گەورە فەرموی: ئەی جبریل بچۆ بۆلای محمد پرسیاری لێبکە: بۆچی دەگریت؟ جبریل هاتە لایو پرسیاری لێکرد ئەویش هەواڵی پێدا: خوایش ئاگادارترە

---

[1] لەکوردەواریشتدا دەڵێن: (هەڵیگرە بۆ سەر پردەکە) مەبەستیان ئەم حاڵەیە. نووسەر.

[2] سەرچاوەی پێشوو.

[3] سەرچاوەی پێشوو /٦٤.

[4] تفسیر ابن کثیر /٥٢٣.

بەنیازی دڵی . ئەمجا خوایش فەرموی: ئەی جبریل بچۆرەوە بۆ لای محمد و پێی بڵێ ئێمە ڕازیت ئەکەین لەئوممەتتداو دڵت ناشکێنین (ئیمامی موسلیم ڕیوایەتی کردووە)[1].

مامۆستا شێخ محمدی خاڵ(خوا لێی خۆش بێت) لەسەر ئایەتی: ﴿ منذ الذي يشفع عنده الا باذنه ﴾دەفەرموێ: کێ هەیە ئەو کەسەی کەبتوانێ لەو ڕۆژەدا تکا بکات لەبارەگای خوادا بۆ ڕزگارکردنی یەکێك لەوسزایەی کەخوا بۆی دانابێ، مەگەر بەئیزن و فەرمانی خوا،...کاتێك کەدەریای بەخششی خوا هاتە جۆش و خرۆش ئەیخاتە دڵی پێغەمبەرەوە کە تکا بکات بۆ گوناهبارانی ئوممەتی(خوا لەشەفاعەتی پێغەمبەر بێ بەشمان نەکات)[2].

هەروەها پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێ: من پێنج شتم پێبەخشراوە هیچ کەس بەر لەمن پێی نەبەخشراوە مانگێ ڕێگا دوژمن لێم دەترسێ، تالانی شەڕو غەزا بۆ من حەلاڵکراوەو بۆ کەسیتر بەر لەمن حەلاڵ نەبووە، زەمین هەمووی بۆ من مزگەوتەو گڵەکەی پاکە، هەرکەسێ لەئوممەتی من لە هەرلایەکدا نوێژبوو نوێژەکەی بکات، تکا کاریو شەفاعەتم پێدراوە، وە هەر پێغەمبەرێك تەنها بۆ هۆزەکەی خۆی ڕەوانەکراوە، بەلام من ڕەوانەکراوم بۆ لای هەموو ئادەمیزاد) هەروەها فەرمویەتی: ( لكل نبي دعوة مستجابة وانا اختبيء دعوتي شفاعة لأمتي يوم القيامة )متفق عليه[3].

هەموو پێغەمبەرێك دوعایەکی لێ قبوڵ دەکرێ بەلام من دوعاکەم هەڵدەگرم بۆ تکای ئوممەتم لەڕۆژی قیامەتدا) خوا لەوتکا بێبەشمان نەکەیت!

هەروەها لەحەدیسی صەحیحی پێغەمبەردا(ﷺ) بەدرێژی باسی ئەوە دەکات کەلەڕۆژی قیامەتدا خوای گەورە ئادەمیزاد بەگشتی خڕدەکات و خۆر لێیان نزیك دەبێتەوەو توانایان نامێنێ، دەچنە لای پێغەمبەران ئادەم و نوح و ئیبراهیم و موسی و عیسی داوای شەفاعەتیان لێدەکەن، بەلام هیچیان توانایان نابێ و هاواردەکەن(نفسي ، نفسي) تادێنە خزمەتی محمد(ﷺ) ئەویش لەژێر عەرشی خوادا سەجدە دەبات و زۆر سەنای خوا دەکات تارێگای شەفاعەتی ئوممەتی پێدەدات[4].

شەفاعەت هەروەك بۆ پێغەمبەر(ﷺ) ڕێگا دەدرێ بۆ هەندێ پیاوباش و زانای ئوممەتی هەر ڕێگا دەدرێ هەرکەس بەگوێرەی چاکەو کردەوەو عیلمی خۆی وەك لەحەدیسی پێغەمبەردا(ﷺ)

---

(1) المغني عن حمل الاسفار في الاسفار: ٤/٤٧٩.

(2) تەفسیری خاڵ :١١/٣.

(3) المغني عن الاسفار في الاسفار :٤/٥٢٦.

(4) سەرچاوەی پێشوو : ٥٢٨.

هاتووه: ( يدخل الجنة بشفاعة رجل من امتي اكثر من ربيعة اومُضر) اسناده حسن[1]. واته: دەچێته بەهەشت بەتكای یەك پیاو لەئوممەتی من زیاتر لەهۆزی رەبیع یان هۆزی(مضر).

زانایان فەرموویانە ئەم پیاوە عوسمانی كوری عەفانە(ڕەزای خوای لێ بێت) وەهەندێك دەڵێن: ئووەیسە. لەفەرمودەیەكی تردا دەفەرموێت: ( ان من امتي من يشفع للفئام ومن يشفع للقبيلة )(رواه الترمذي).

لەئوممەتی من كەسی واهەیە تكا بۆ كۆمەڵێك دەكات هی وایش هەیە تكا بۆ هۆزێك دەكات.

بەكورتی بڕوا بوون بەشەفاعەت بەشێكە لەعەقیدەی ئەهلی (سوننەتو جەماعەت)وە ئەو حەدیسانەی دەربارەی هاتوون . وەك هەندێكیانمان نووسی . ئەوەندە زۆرن هیچ باوەڕدارێك ناتوانێت بەربەرچیان بداتەوە یان تەئویلی ناڕەوایان بكات، چونكە هەندێكیان(متفق علیە)یەو هەندێكیان (بخاری) یا(مسلم) یان(ترمذي) گێراویانەتەوە.

بەلاَم پێویستە لێرەدا ئەوەیش لەیادنەكەین كەمانای شەفاعەت ئەوە نیە كەسێ پاڵی لێبداتەوەو گوێ بەو هەموو هەڕەشە توندو تیژانەیخوای گەورە نەدات كەلەئایەتەكانی قورئانو فەرموودەكانی پێغەمبەردا هاتوون دەربارەی تاوانباران و لەخوا یاخی بوانو بڵێ من ئوممەتی محمد یان وەچەی محمدم شایەتمانم بەشانی ئەو هێناوە، كەوابوو هەرچی بكەم ئەو شەفاعەتم بۆ دەكاتو ڕزگارم دەبێ.

هەندێ كەس گومان وادەبەن هەڕەشەكانی خوا تەنها بۆ ترساندنە یان گومان وادەبەن ئاگری دۆزەخ وەك ئاو وادەبێ، یان وەك گەرمای هاوین، بێشەرمانە ئەیانەوێ بێوادەییو بەڵێن شكاندن پاڵبدەن بەخوای گەورەوە(سبحانه وتعالى مما يقولون علواً كبيرا).

خوا خۆی دەفەرموێ: ﴿ أم نجعل الذين امنوا وعملوا الصالحات كالمفسدين في الارض ام نجعل المتقين كالفجار ﴾

ئایا ئەوانەی كەباوەڕیان هەیەو كردەوەی چاكە دەكەن، وەكو ئەوانەی كە ئاشووب دەگێڕن لەئەرزدا مامەڵەیان لەگەڵدا دەكەین؟ یان ئەوانەی لەخوا دەترسنو تەقواكارن وەك دروزنان و بێڕەوشتەكان پاداشتیان دەدەینەوە؟

یان لەئایەتێكیتردا دەفەرموێ: ﴿ أفنجعل المسلمين كالمجرمين مالكم كيف تحكمون﴾(ن:٣٥،٣٦).

ئایا موسوڵمانان وەك تاوانباران تەماشا دەكەین لەقیامەتدا؟ ئایا چیتانە چۆن حوكمی ئاوا ناڕەوا دەدەن؟

---

[1] سەرچاوەی پێشوو .

ئەو ئایەتانەی دەربارەی شەفاعەت هاتوون هەموو مەرجیان داناوە وەكو دەفەرمویٚ: ﴿ یومئذ لاتنفع الشفاعة الا من أذن له الرحمن ورضي له قولاً ﴾لەو رۆژەدا شەفاعەت سوودی نابێت مەگەر بۆ كەسیٚ خوا ریٚی پیٚبدات‌و رازی بێت بەوەی قسە بكات‌و تكا بۆ خەڵكی بكات، كەوابوو تكاكاریش‌و تكا بۆكراویش پێویستیان بەئیزنی خوا هەیە، شەفاعەتی پێغەمبەر(ﷺ) لەو رۆژەدا بۆ كەسانێكە لەناخی دڵیانەوە دوای زەیدو عەمری دوور لەئیسلام نەكەوتوون، بەراستی باوەشیان بەئیسلامدا كردووە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا وردە تاوانیان هەبووە یان تەنانەت لەوانەیە هەندیٚ جاریش تاوانی گەورە رووی دابیٚ لێیان بەڵام زوو هاتونەتەوە بەخۆیانداو تەوبەیان كردووە ئەم جۆرە كەسانە بەهیوای شەفاعەتی پێغەمبەربن‌و زۆر نزیكە ئەم جۆرە كەسانە پێغەمبەر(ﷺ) تكای لیٚ بوردنیان بۆ بكات وەك خۆی دەفەرمویٚ: ( اسعد الناس بشفاعتي يوم القيامة من قال لا اله الا الله خالصاً من قبل نفسه )[1].

بەختەوەرترین كەس بەتكای من لەقیامەتدا كەسێكەی بڵیٚ(لا اله الا الله) بەدڵێكی پاك‌و خاوێن و دوور لە دووڕوویی‌یەوە.

پووختەو كورتەی ئەم باسە شەفاعەت وەك ئەوە وایە . ولله المثل الاعلى ـ قوتابی یەك لەهەموو وانەكانیدا دەرچووە بەڵام لەوانەیەكدا یان دوو وانە نەختیٚ لاوازەو گەر بەوەڵامی خۆی لەگەڵ بكەن دەرناچێت ساڵەكەی دەفەوتێت یان لەوانەیەكدا دەكەوێت‌و پێویستە خولی دووەم بگەڕێتەوە. بەڵام مامۆستایەك لای لیژنەی مامۆستایان تكای بۆ دەكات‌و دەڵیٚ ئەم قوتابی‌یە لەهەموو وانەكاندا سەركەوتووە پلەی رەوشتیشی لەقوتابخانەو پۆلدا بەرزەو یاسای قوتابخانەی نەشكاندووە، رێزی لە مامۆستایان‌و هاورێیانی گرتووە، زۆربەی ئەركەكانی سەرشانی ئەنجام داوە، زۆر جێگای خۆیەتی گەر ئێمەیش یارمەتی بدەین‌و بۆ وانەیەك یان دوو وانە ساڵێك لەتەمەنی دوای نەخەین.

ئیتر لەكۆتاییدا ئەو یاسا گەورەی ئیسلام لەیادنەكەین كەپێغەمبەرمان (ﷺ) خۆی بریاری داوە: ( من بطأ به عمله لم يسرع به نسبه)[2].

هەركەس بەكردەوە دواكەوتو بێت پشت‌و باوباپیر پێشی‌ناخەن.

خوایە كردەوەمان چاك كەیت‌و بەرشەفاعەتی پێغەمبەر بكەوین(ئامین).

---

[1] ماذا بعد الموت، شاكر عبدالجبار،١١٥.

[2] الاربعين النووية.

## ٨ ـ حەوزی کەوسەر( الكوثر )

(ابن كثير) لەتەفسیرەکەیدا دەفەرموێ: ئیمامی ئەحمەد بۆمان دەگێڕێتەوە لەئەنەسی کوڕی مالیکەوە، کەڕۆژێکیان پێغەمبەر(ﷺ) سەرخەوێکی شکان، پاشان سەری بەرزکردەوە زەردەخەنە گرتبووی، ئەمجا خۆی فەرمووی، یا لێیان پرسی: بۆ چ پێ دەکەنیت؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئێستە سورەتێك نازڵ بوویە سەرم، خوێندیەوە: ﴿ انا اعطيناك الكوثر ... السورة ﴾هەتا کۆتایی.

ئەمجا فەرموی: دەزانن کەوثەر چیە؟ وتیان: خواو پێغەمبەری خوا دەزانن، فەرمووی کەوثەر روبارێکە خوای بەرزو بڵند بەخشیویەتی بەمن، خێرو، بەرەکەتێکی زۆری تێدایە، ئوممەتی من هەموو دێنە سەری لەرۆژی قیامەتدا قاپو قاچاخو پەرداخی ئەو سەرحەوزە، زیاترە لەژمارەی ئەستێرەکان، هەندێك لەئوممەتم لائەدەنو رێ وێڵ ئەکەن ئەڵێم: (یارب) ئەوە لە ئوممەتی منە پێم دەوترێ تۆنازانی دوای تۆ چییان داهێناوەو چۆن دینیان گۆڕاوە؟

ئەو فەرموودانەی دەربارەی حەوزی کەوثەر هاتون گەیشتوونەتە ئەندازەی تەواتورو زیاتر لەسی صەحابە ریوایەتیان کردووەو[1] بخاریو موسلیمو تیرمذیو زانایانی حەدیث هاودەنگن لەسەر دروستی ئەو فەرموودانەو هەر فەرموودەیەك بەشێوەیەك زانیاری پێداوین دەربارەی ئەو بەهرە گەورەیەی پێغەمبەرو ئومەتەکەی(ﷺ).

بۆ نموونە دەفەرموێ: ( لەکاتێکدا من دەڕۆیشتم بەناو بەهەشتدا تووشی روبارێك هاتم هەردوکەناری گومەزێکی ناو بۆشی مرواری بوو، وتم: ئەمە چیە ئەی جبریل؟ وتی: ئەوە ئەو کەوثەرەیە خوا بەخشیویەتی بەتۆ، فریشتەکەی یاوەرم دەستی کرد بەناویدا کەچی قوڕەکەیش میسکێکی بۆن خۆش بوو).

هەروەها ئیمامی موسلیم بۆمان ریوایەت دەکات: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: (نێوان هەردوو کەناری حەوزەکەی من نێوان شاری مەدینەو سەنعایە، یان نێوان مەدینەو عومانە).

فەرموودەیەکیتر( ترمذي)دەیگێڕێتەوە کەپێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: پانایی حەوزەکەی من نێوان شاری عەدەنوعومانە، ئاوەکەی سپی تره لەشیر، شیرنترە لەهەنگوین، پەرداخو سوراحی یەکانی زیاترە لەژمارەی ئەستێرەکانی ئاسمان، هەر کەس لێی بخواتەوە قەت تینوی نابێت، یەکەم کۆمەڵ کەدەچنە سەری هەژارو دەست کورتەکانی موسڵمانانی کۆچ کەرن(المهاجرون).

---

[1] العقائد الاسلامية تاليف : د. رشدي عليان، فرج توفيق الوليد : ٥٥.

عومەری کوڕی خەططاب فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەوانە کێن؟ فەرمووی: ئەوانەن قژیان گرژو لوولە، جلەکانیان چڵکنە، ئەوانەن کە ئافرەتانی جوانو خۆش گوزەران ناخوازن، ئەوانەن کە دەرگای پیاوی گەورەو جێگای بەرزیان بۆ ناکرێتەوە).

بۆیە عومەری کوڕی عەبدولعەزیز خەفەتبار دەبوو دەیفەرموو: (سوێند بەخوا) من ئافرەتی خۆش گوزەرانم مارە کرد کە(فاطمەی کچی عبدالملك)ە دەرگای شوێنی بەرزم لێکرایەوە، سامەگەر خوا خۆی بەزەیی پیامدا بێتەوە، بەلاّم قەینا سەرم ڕۆن ناکەم تاگرژو لوول دەبێت، جلەکانیشم ناشۆم تاچڵکن دەبێت.

ئەم فەرموودەیە کە(ترمذي و ابن ماجە)ریوایەتیان کردووە باشترین پاڵنەرە لەم ڕۆژەدا بۆلاوە موسڵمانەکان بەتایبەت ئەوانەی ژنیان نەهێناوە تالایەك بکەنەوە بەلای ئافرەتە هەژارەکانەوە ئەو ئافرەتانەی یان لەبەر هەژاریو شەڕو شێواوی یان لەبەر ڕوومەت ناجوانی کەس لێیان ناپرسێتەوەو لەکاروانی شوکردن دواکەوتوون، دەبا لەبەر خاتری خواو، بەهیوای حەوزی کەوسەر گەنجەکانمان گیانی لێ بوردنیان تیا دروست ببێتو ئەم پاداشتە گەورە بکەنە بەشی خۆیان.

لەفەرموودەیەکی تردا پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێ: هەموو پێغەمبەرێك حەوزێکی هەیەو پێغەمبەران شانازی بەوەوە دەکەن کامیان زیاتر خەڵك بێتە سەر حەوزەکەی ، من ڕجام وەهایە لەهەمویان زیاتر خەڵك بێتە سەر حەوزەکەم)[1].

جا وەك پێغەمبەر(ﷺ) ڕجا دەکات بائێمەیش ڕجا بکەین یەکێ بین لەو کەسانەی کەدەچنە سەر حەوزەکەی.

وەپێویستە بزانین ـ وەك غەزالی دەفەرموێ: ڕەحمەتی خوای لێبێت) ڕجا تەنها خۆزگەی دڵ نیە، بەڵکو کەسێ بەتەمای دروێنەیە کە تۆوی وەشاندبێو ئەرزەکەی خاوێن کردبێتو ئاودێری کردبێت، یان باران ئاوی دابێت، بەتەمابێت خوای گەورە مەزراکەی بپارێزێ، لەبەلای ئەرزو ئاسمان.

بەلاّم ئەو کەسەی نەزەوی کێڵاوەو نەتۆوی چاندووە بەتەمایشە دانەوێڵەو میوەی بۆ بەرهەم بێت ئەوە مەغرورەو خۆزگەی وشکی دەخوازێو گەوجو نادانە خوا پەنامان بدەیت لەسەر لێشێوانو غورور ﴿ فلا تغرنكم الحياة الدنيا ولا يغرنكم بالله الغرور﴾(لقمان: ٣٣) واتە: بازیانی دونیا نەتانخەڵەتێنێ شەیتانی خەڵەتێنەرو تەڵەکە بازیش لەخشتەتان نەبات شافعیش(ڕەحمەتی خوای لێبێت) لەم بارەیەوە دەفەرموێ:

---

[1] المغني عن حمل الاسفار : ١/ ٢٨١.

ترجو النجاة ولم تسلك مسالكها ان السفينة لا تجري على اليبس

واتە: بەهیوای سەرفرازیت و ڕێگەکانی سەرفرازیشت نەگرتۆتەبەر، کەشتی بەسەر وشکانیدا ناڕوات.

خوایە توناوە جوانەکانت بمانکەیتە میوانی پێغەمبەر(ﷺ) لەسەر حەوزی کەوسەر (ئامین).

## ٩ ـ سزای دۆزەخ

ئەوەی دەربارەی سزای دۆزەخ هاتووە لەقورئان و فەرموودەکاندا مـرۆڤ نـاتوانێ بەتـەواوی بیخاتە دڵی خۆی و لێی تێبگات، مەگەر تەنها بەشێوەیەکی نزیک کردنەوە لەفام و هۆشی مرۆڤ.

ئەوەی دەربارەی ئاگری دۆزەخ و جۆرەکانی سزا سابت بووە لەقورئان و فەرموودەکاندا ئەگەر بەتەواوی بچەسپێ لەدڵماندا و بیری لێبکەینەوە بێگومان خۆراکمان تاڵ دەبێت و خەولەچاومان دەزڕێت.

گەر کەسێ هەواڵی پێ بدەن سبەینێ ئەتبەن بۆ بەندیخانە و سێ ساڵ بەندت دەکەن خەو و خۆارکی لێ تاڵ دەبێ و دڵی دەبەسرێ ئەی بۆچی ئێمە لەو دۆزەخە ناترسین کەخوا هەواڵمان پێدەدات ﴿وان منكم الا واردها كان على ربك حتما مقضياً * ثم ننجي الذين اتقوا ونذر الظالمين فيها جثياً ﴾ (مريم: ٧١، ٧٢).

خۆ چوونە ناو ئاگری دۆزەخ، یان ڕۆیشتن بەسەر(صراط)کە بەهەردوو شێوەکە ئایەتەکە تەفسیر کراوە، هەرکامیان بێ هەواڵێکی ڕاست و گومان لێنەکراوە و خوا هەواڵی پێداوین، بەڵکو هەواڵێکی حەتمی یە، تەنها لەخوا ترس ڕزگاری دەبێت و ستەمکاران لەسەر چۆک تیادەمێننەوە.

بەدڵ و گیان یادی ئەو ڕۆژە بکەرەوە تا بتوانیت خۆتی بۆ ئامادەبکەیت، سەختی ئەو ڕۆژە بهێنە بەرچاوی دڵت( چرە دوکەڵی دۆزەخ بەرزبووەتەوە لەچەند لایەکەوە گەمارۆی تاوانکارانی داوە سێبەرێکی تاریکی بۆ کردوون، بەڵام نەک سێبەرێک سوودی بۆیان هەبێت یان بڵێسەی ئاگریان لێدوور خاتەوە، بەڵکو ئەو ئاگرە پریشکی وادەهاوێ ئەوەندەی کۆشکێک بارسایی هەیە هەر دەڵێی وشتری زەردە لەگەورەیی دا[1] ئالەو ڕۆژەدا دۆزەخ تاوئەسێنێ و دەنگی لێبەرزدەبێتەوە و هەر لە دوورەوە پەلاماریان دەدات کاتێک فڕێ دەدرێنە ناوجێگایەکی زۆر تەسک و سەختەوە بەدەست و پێ کۆتکراوی هاواردەکەن بەنەگبەتی و لەناوچوونی خۆیان [2] وە لەوکاتەدا

[1] سورة المرسلات: ٣٠ ـ ٣٤.

[2] الفرقان: ١٢ ـ ١٣.

پێیان دەوترێ:﴿ ذق انك انت العزيز الكريم ﴾[1] . بچەژە سزای سەخت چونکە تۆلات وابوو زۆر بەرزو پایە بڵندی لەدنیادا[2] .

محمدی کوڕی کەعب دەفەرموێ: ئەهلی دۆزەخ پێنج داوایان هەیە لەچواریاندا وەڵام ئەدرێنەوە دوای ئەوە قسەیشیان لێحەرام دەکرێو قەت قسە ناکەن[3].

جاری یەکەم دەڵێن: ﴿ربنا امتنا اثنتين واحييتنا اثنتين فاعترفنا بذنوبنا فهل الى خروج من سبيل ﴾ (غافر:١١).

واتە: ئەی خوایە دووجار ئێمەت مراندووە دووجاریش زیندووت کردوینەتەوە ئێستە دان بەتاوانی خۆماندا دەنێین‌و بڕوامان بەزیندوو بوونەوە هێناوە ئایا ڕێگامان هەیە ئەمجارەیش دەرچین لەئاگرو بگەڕێینەوە بۆژیان تاخوا پەرستی بکەین؟

لەوەڵامدا پێیان دەوترێ: ﴿ ذلكم بانه اذا دُعيَ الله وحده كفرتم وان يشرك به تؤمنوا فالحكم لله العلي الكبير ﴾(غافر: ١٢).

ئەم سزایەتان بۆ ئەوەیە چونکە لەدنیا هەرکات بانگ بکرایە بۆ خوا بەیەك زانین‌و یەکتاپەرستی ئێوە کافر دەبوون، بەلأم ئەگەر هاوەڵ بۆ خوا دابنرایە باوەڕتان دەهێنا، ئەمڕۆ بزانن حوکم‌و دادگەری وابەدەست خوای بەرزو بڵندو گەورەوە.

جاری دووەم دەڵێن: ﴿ربنا اخرنا الى اجل قريب نجب دعوتك ونتبع الرسل ﴾ (ابراهيم : ٤٤).

خوای گەورە وەڵامیان دەداتەوە: ﴿... اولم تكونوا اقسمتم من قبل مالكم من زوال﴾ (ابراهيم:٤٤) ئەی ئەوە ئێوە نەبوون لەمەوبەر سوێندتان دەخوارد کەتیاچوونتان بەسەردا نایەت‌و هەمیشە لەخۆشیدا دەبن.

جاری سێیەم: ﴿ربنا اخرجنا نعملْ صالحاً غير الذي كنا نعمل ﴾ئەی خوایە ئەمجارەیش دەرمانکە کردەوەی چاکە دەکەین بەوشێوە نابین لەمەوبەر دەمانکرد خوا وەڵامیان دەداتەوە:
﴿اولم نُعمركم مايتذكّر فيه من تذكّر وجاءكم النذير فذوقوا فما للظالمين من نصير ﴾.فاطر: ٣٧.

ئایا تەمەنمان پێنەدان ئەوەندەی کەبیربکاتەوە مرۆڤێك بیەوێ بیر بکاتەوە؟ ئایا پێغەمبەرتان بۆ نەهات‌و ئاگاداری نەکردنەوەو نەیترساندن لەم ڕۆژە؟ کەوابوو بچەژن سزای سەخت ئەمڕۆ ستەمکاران هیچ پشتگیرێکیان نیە.

---

[1] الدخان: ٤٩.

[2] احياء: ٤/ ٤٨٢.

[3] لە(احياء)دا بەم شێوەیە هاتووە بەلأم ڕاست وایە دوای چوارەم قسەیان لێحەرام دەکرێ نەك پێنجەم وەك لەناوەڕۆکی باسەکەدا دەردەکەوێت ب٤/ ٤٨٦.

جاری چوارەم دەڵێن: ﴿ ربنا غلبت علينا شقوتنا وكنا قوماً ضالّين * ربنا اخرجنا منها فان عدنا فانا ظالمون﴾المؤمنون:١٠٦، ١٠٧ .ئەی خوایە خراپەی دەروونو بەدکاریمان زاڵ بوو بەسەرماندا و ئێمە گومڕاو سەرلێشێواو بووین، ئەی خوایە ئەمجارە دەرمانکە لەم ئاگرە ئەگەر گەڕاینەوە بۆ خراپە ئەوە ئێمە ستەمکارین.

خوا وەڵامیان دەداتەوە: ﴿ اخسئوا فيها ولا تكلمون ﴾المؤمنون:١٠٨ واتە: تیا بکەون بەڕیسوایی و قسەتان لەدەم دەرنەچێت ئیتر دوای ئەوە قسە ناکەن وە ئەمەیش سەختترین سزایە.

دەی برای باوەڕدار ئەم پرسیارو وەڵامانە هەموو ئایەتی قورئانە بێ دوو دڵیو گومانە، ئەبێ هۆی چی بێت والیی بێئاگاین؟

سزای دۆزەخ بەدەم وەسف ناکرێ، قوڵایی دۆزەخ بێبنو بێپەیە؟ ابوهورەیرە دەفەرموێ: ڕۆژێك لەخزمەتی پێغەمبەردابووین(ﷺ) گوێمان لە ناڵەیەك بوو فەرمووی دەزانن ئەو دەنگە چی بوو؟ وتمان: خواو پێغەمبەری خوا دەزانن، فەرمووی: ئەوە بەردێکە حەفتا ساڵە خراوەتە ناو دۆزەخ ئێستە گەییە بنەکەی)(موسلیم ریوایەتی کردووە)[1].

یان دەفەرموێ: ( سووك ترین سزای خەڵکی دۆزەخ لەقیامەتدا پیاوێکە جوتێ نەعلی ئاگرینی لەپێدایە مێشکی سەری پێوە دەکوڵێ) فەرموودەکە (متفق عليه)یە[2].

جابا یادبکەینەوە ئەو زەقوومە چییەو چۆنە؟ ئەو زەقوومە قورئان دەربارەی دەفەرموێ: ﴿ ان شجرت الزقوم طعام الاثيم...﴾ الدخان: ٤٣ ـ ٤٤.

ئەمجا یادبکەینەوە لەدۆزەخدا لاشەی خەڵکی دۆزەخ گەورە دەبێت بۆ ئەوەی زیاتر سزا بچەژن وەك موسلیم ریوایەتی کردووە کەپێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی:(ضرس الكافر في النار مثل احد ، وغلظ جلده مسيرة ثلاث )(رواه مسلم)[3]. واتە: خرێی کافر لەئاگردا بەئەندازەی کێوی (احد)ە قەبارەی پێستەکەیشی سێ ڕۆژ ڕێگایە، وقال(ﷺ) : ( شفته السفلى ساقطة على صدره والعليا قالصة قد غطتا وجهه )[4]. واتە: لێوی لاخوارووی شۆڕبووەتەوە بەسەر سینگیدا ، لێوی لاسەرووی هەڵچووەو ڕومەتی داگرتووە). ئەو گەرما کەپێی دەڵێن چلەی هاوین پێغەمبەر(ﷺ) دەربارەی دەفەرموێ: (اشتكت النار الى ربها فقالت يارب اكل بعضي بعضاً ، فأذن لها في نفسين نفس في الشتاء ونفس في الصيف، فاشد ماتجدونه في الصيف من حرها واشدُّ ماتجدونه في الشتاء من زمهريرها)(متفق عليه).

---

(1) احياء علوم الدين : ٥٣١/٤.

(2) سەرچاوەی پێشوو.

(3) المغني على الاحياء، ٥٣٣/٤٥.

(4) المغني على الاحياء / ٤، ٥٣٣.

واتە: ئاگری دۆزەخ هاواری بردەلای خوا وتی: ئەی خوایە هەندێك لەخۆم هەندێکی ترمی خواردوە، خوا رێگای پیّدا سالّی دووهەناسە بدات، هەناسەیەك لەزستانداو هەناسەیەك لەهاویندا، سەختترین گەرما کەتوشتان دێت لەهاویندا هەناسە گەرمەکەی ئەوە، سەخترین سەرمای زستان هەناسەی زەمهەریرەکەی دۆزەخە.

ئەمجا بایادبکەینەوە لەبۆگەنی کێم و زیچکاوی لاشەی سوتاویان کەهەندیّ لەزانایان لەمانای ئایەتی ﴿تلفح وجوههم النار﴾دەفەرموون: ئاگر لاشەیان دەسوتێنێ هەرچی گۆشتی گیانیان هەیە دێتە پاژنە پێیان[1]. کاتیّ گەرما شالاّوی بۆ مرۆڤ هێنا پەنا دەباتە بەرفێنکی و سێبەرو ئاوی سارد ئەی نازانن ئەهلی دۆزەخ کاتیّ هاوار دەکەن لەتاو گەرماو داوای فێنکی و ئاو دەکەن چۆن وەلاّمیان دەدرێتەوە؟ خوا دەفەرمویّ: ﴿ وان یستغیثوا یغاثوا بماء کالمهل یشوي الوجوه بئس الشراب وساءت مرتفقاً ﴾(الکهف: ٢٩).

ئەگەر هاواربکەن و داوای ئاو بکەن دێن بەهاواریانەوە بەئاوێکی گەرم و برکولّ هەر دەلّێی خەلّتەی زەیتی کولاّوە روومەت دەبرژێنیّ و هەلّی دەقرچێنیّ بەراستی خواردنەوەیەکی خراپ و جێگاو رێگایەکی سەغلّەت و پڕ ناسۆریان هەیە.

ئەمجا یاد لەخۆراك و رۆزیان بکەینەوە کە خۆراکیان درەختی زەقوومە ئەو زەقوومەی خوا دەبارەی دەفەرمویّ:﴿ انها شجرة تخرج في أصل الجحیم * طلعها کانه رؤوس الشیاطین * فانهم لاکلون منها فمالئون منها البطون ثم ان لهم علیها لشوبامن حمیم ...﴾(الصافات: ٦٤ ـ ٦٧).

واتە: زەقووم درەختێکە لەناو جەرگەی دۆزەخدا سەوز دەبیّ و وا لەسروشتی ئاگرداو ئاگر نایسوتێنیّ بەروبوومەکەی هەر دەلّیّی سەرو کەللەی شەیتانە، یان ئەلّیّی سەری ماری بەد فەسالّ و دیمەن ناشیرینە، جا دەبیّ سەری مار چەند ژاراوی و چەندەتالّ بیّ، کەچی کافران ئەوەندە بەدبەخت و چارە رەشن ئەوەنەی لیّدەخۆن تاورگیان فوول دەبیّ: ئەمجا ئاوی گەرم و سوتێنەری دەکەن بەسەریاو تێکەلاّوی دەبیّ بۆئەوەی جەرگ و دلّ و ریخۆلّەیان زیاتر بسوتێت)[2].

ئیبن و عەباس بۆمان دەگێڕێتەوە لەپێغەمبەرەوە(ﷺ) کەفەرموویەتی: (لو أن قطرة من الزقوم قطرت في بحار الدنیا لفسدت علی أهل الدنیا معایشهم) رواه ابن ماجه والترمذي وقال حسن صحیح.

ئەگەر تنۆکێك لەزەقووم بتکێنرێتە هەموو دەریاکانی دنیاوە ژیانی خەلّکی دنیا تێك دەداو ئاوی خواردنیان هەموو پیس دەبیّ و کەلّکی خواردنەوەی نامێنیّ.

---

[1] الاحیاء: ب٤/٤٨٤.

[2] المغني عن حمل الاسفار لهسەر احیاء، ٥٣٦/٤.

جا ئەوە نەبێ ئەهلی دۆزەخ بمرنو رزگاریان ببێت بەڵكو ئەگەر مردن ببوایە بەخەلات وەریان ئەگرت بۆیە خۆیان هاوار دەكەن ﴿ یامالك لیقض علینا ربك ﴾ئەی مالك ئەی بەرپرسیاری دۆزەخ دەی داوا بكە لەخوات بابمان كوژێو رزگاربین لەوەلامدا پێیان دەڵێ: ﴿ ... انكم ماكثون﴾تەنانەت لەتەفسیری جەلالەینو (احیاء)ی غەزالیدا هاتووە كەنێوان داوای ئەوانو وەلامی(مالك) هەزار ساڵە.

هەندێ كەس دەڵێن: ئەهلی دۆزەخ ساوازیان لەسزا دەبێتەوەو گاڵتەو گەپ پێكەوە دەكەن، بەلام قورئان بەرپەرچی ئەم قسانە دەداتەوەو دەفەرموێ: ﴿ ان الذین كفروا بایاتنا سوف نصلیهم نارا كلما نضجت جلودهم بدلناهم جلوداً غیرها لیذوقوا العذاب ان الله كان عزیزاً حكیماً ﴾( النساء: ٥٦.

ئەوانەی بێباوەرن لەمەودوا ئەیانخەینە ئاگرێكەوە هەركات پێستیان سووتا بۆیان دەگۆڕین بەپێستێكیتر بۆ ئەوەی زیاتر سزا بچێژن بەڕاستی خوا خاوەنی عیززتەو لەهیچ بێتوانا نیە خاوەنی حیكمەتەو كارەكانی بەجێیە.

ئەمجا یاد بكەینەوە لەمارو دوپشكی دۆزەخو گەورەیی لاشەو ئەندامیانو نابوتی دیمەنیان، بوخاری بۆمان دەگێڕێتەوە كەپێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (من اتاه الله مالاً ولم یؤد زكاته مُثل له یوم القیامة شجاعاً اقرع له زبیبتان یُطوّقه یوم القیامة ثم یاخذ بلهازمه، فیقول: انا مالك انا كنزك )

واتە: هەركەسێ خوا ماڵی بداتێو زەكاتەكەی دەرنەكات ئەو ماڵە بۆی دەبێتە مارێكی كەچەڵ دووخاڵی رەش وان بەسەرچاوانیەوە لەرۆژی قیامەتدا خۆی پیادەئالێنێو هەردوو لێوی دەگرێ دەڵێ: من ماڵەكەتم من گەنجینەكەتم، ئەمە بۆكەسێ زەكات دەرنەكات ئەبێ حاڵی ئەو كەسە چۆن بێ كەهەر بڕوای بەزەكات نیە!

خۆئەگەر بمانەوێ ئەم باسە تەواو بنووسین كۆتایی نایەت بەئاسانی بەلام گفتوگۆیەكی ئەهلی دۆزەخ كەقورئان بۆمان دەگێڕێتەوە دەیكەینە كۆتایی ئەم باسە كەدەفەرموێ: ﴿ واذ یتحاجون في النار فیقول الضعفاء للذین استكبروا انا كنّا لكم تبعاً فهل انتم مغنون عنا نصیباً من النار* قال الذین استكبروا انا كل فیها ان الله قد حكم بین العباد ﴾(غافر: ٤٧ . ٤٨).

واتە: لەكاتێكدا مشتو مڕدەكەن لەناو ئاگردا لاوازو كەم دەسەلاتەكانی دنیا دەڵێن بەگەورەكانیان ئێمە لەدنیا دوای ئێوەكەوتینو لەپێناوی ئێوەدا كۆشاینو، خوامان لەخۆمان رەنجان ، ئایا ئێوە دەتوانن هەندێ لەم سزایەمان لەسەر لابەن؟ گەورەكانیان وەلامیان دەدەنەوە: ئێمە هەردوولامان واین لەئاگرداو تازە خوا حوكمی نێوان بەندەكانی خۆی كردووە).

﴿ وقال الذین في النار لخزنة جهنم ادعوا ربكم یخفف عنا یوماً من العذاب* قالوا اولم تك تاتیكم رسلكم بالبینات قالوا بلی قالوا فادعوا وما دعاؤا الكافرین الا في ضلال﴾(غافر:٤٩.٥٠)واتە:

ئەهلی دۆزەخ بە(خزنة)ی دۆزەخ دەڵێن: بۆمان بپاڕێنەوە لەخواتان بەڵکو ڕۆژێ سزامان لەسەر سووك كات! پێیان دەڵێن: ئایا پێغەمبەران نەهاتن بۆلاتان بەبەڵگەی جوان و ڕوونەوە؟ دەڵێن : بەڵێ/ دەڵێن: دەی هەر هاوارکەن، هاوارو داوای کافران هەر گومڕایی و سەرلێ شێواوییە.

ئابەم شێوەیە ئەهلی دۆزەخ دڵنیا دەبن لەوەی کەدەرناچن لەسزا بەهەتا هەتایی، وەك پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێ: مردن دێنن لەڕۆژی قیامەتدا هەروەك بەرانێکی بازگ لەنێوان بەهەشت و دۆزەخدا سەردەبڕیێ و ئەمجا هاوار دەکرێ ئەی ئەهلی بەهەشت مانەوەی بێ‌مردن، ئەی ئەهلی دۆزەخ مانەوەی بێ‌مردن)[1].

ئەگێڕنەوە حەسەنی بەصری ڕۆژێکیان لەسوچێکدا دانیشتبوو دەگریا! وتیان: قوربان بۆ دەگریت؟ فەرمووی: ئەترسم خوابمخاتە دۆزەخ ئیتر گوێم پێ‌نەدات! ئەمجا دەیفەرموو: دوای هەزار ساڵ یەکێك دەر دەکەن لەدۆزەخ خۆزگە ئەو کەسە من بوایەم!

خوایە ئاگات لێمان بێت و لەگەرماو ڕەشەبای ئەم ژیانەو سزای نەبڕاوەی دۆزەخ ڕزگارمان بکەی(ئامین).

## ١٠ - بەهەشتی بەرین

بەرانبەر بەو هەموو سزاو ئازارە نەبڕاوەی ماڵی دۆزەخ کەلەلاپەرەکانی ڕابوردودا، کورتەیەکمان خستە ڕوو ماڵێکیتر هەیە پێی دەوترێ بەهەشت، کەوا پڕە لەخۆشی و شادی و دڵنیایی نەبڕاوەی هەتا هەتایی یاخوا لێی بێ‌بەش نەبین(ئامین).

یادی دۆزەخ بخەرە دڵت و ترس و بیمی لەدڵت دەرنەچێ، بەتەمای خۆشی و شادی بەهەشت بەو هەمیشە یادی لەدڵتا ببزوێنە، بەڵکو ترس و تەما (الخوف والرجاء)باڵت پێوەنێن و کۆمەکیت بکەن بۆ دامەزراویت و بەڕێوە چوونت لەسەر شاڕێگەی ڕاست.

یادبکەرەوە لەخەڵکی بەهەشت و ڕووی دەروشاوەیان کەشەرابێك دەخۆنەوە سەر نەکراوەیە و بۆی میسك و عەنبەر لەئاخر قومی دێ.

دانیشتوون لەسەر یاقووتی سوور لەناو خێمەی گەوهەرینی سپیدا پاڵیان داوەتەوە لەسەر کورسی لەکەناری ڕووباری شەراب و هەنگویندا، چواردەوریان تەنراوە بەمناڵی جوان جوان و خزمەتگوزار، بۆیان ڕازێنراوەتەوە بەچەندین حۆری خان ومان و چاوگەش و جوان ﴿لم يطمثهن انس قبلهم ولاجانّ ...كانهن الياقوت والمرجان﴾کەس دەستی لێنەداون پێش ئەوان، نە ئادەمی و نەدێوان، خۆیان ئارایش داوە بەجۆرەها گەوهەری جوان، وان لەناو باخداو سەرچاوەی ئاوان، ڕازاوە بەجۆرەها پەرداخ و قاپ و مەسینەی جوان، ئەمەیە جێگای ڕاستی ئەوان، لەلای پادشای

[1] المغني عن حمل الاسفار في الاسفار : ٤/٤٨٦.

ئەم جیهانو ئەو جیهان، دەژین بەخۆشیو بەرێزەوە ترسو بیم دایان ناگرێ، بێتاقەتیو نیگەرانی نابینن، دوورن لەنەخۆشیو مردن، لەچڵکنیو پیسی دەرکردن، ئارەقی لەشیان میسکی بۆن خۆشە[1] .

بەکورتی پێناسەی بەهەشتی خوا بەپێنوسی کۆڵی من نانوسرێ، بەزمانی لاڵی من ناوترێ بەگوێی کەڕی ئێمە نابیسرێ، چونکە بەهەشت میوانخانەی خوایە ئامادەی کردووە بۆ میوانە بەڕێزە خۆشەویستەکانی، وەك چۆن دۆزەخی ئامادەکردووە بۆ دوژمنەکانی.

خوایە بێبەشمان نەکەیت لەوبەهەشتەو بمانکەیتە میوانی بەڕێزی خۆت (ئامین).

خۆ ئەگەر بمانەوێ بەباشی باسی بەهەشت بزانین پێویستە بەوردی قورئان بخوێنین باسو بەیانی روون تەنها لەوێ دەبینین، بخوێنە فەرموودەی خوا ﴿ولمن خاف مقام ربه جنتان ﴾هەتا کۆتایی سوورەی رەحمان، بخوێنە سوورەی(واقعة)و کۆتایی( زمر) ﴿ وسيق الذين اتقوا ربهم الى الجنة زمراً حتى اذا جاؤها وفُتحت أبوابها وقال لهم خزنتها سلام عليكم طبتم فادخلوها خالدين * وقالوا الحمد لله الذي صدقنا وعده واورثنا الارض نتبوء من الجنة حيث نشاء فنعم اجر العاملين * وترى الملائكة حافين من حول العرش يُسبحون بحمد ربهم ، وقضي بينهم بالحق، وقيل الحمد لله رب العاملين ﴾الزمر: ٧٣ ـ ٧٥

لەرۆژی قیامەتدا لەخواترسان بەرێ دەکرێن بەرەو بەهەشت پۆل پۆل هەتا دەگەنە بەر دەرگاکانی دەبینن رێگە ئاچووخەو دەرگاکان لەسەر پشتن، ئا لەو کاتەدا دەرگا وانەکانی بەهەشت دێن بەپیریانەوە مژدەیان پێدەدەن: بەختەوەریو خۆشبەختی بۆ ئێوە، دەی بچنە بەهەشت بەهەتا هەتایی، ئەوانیش سوپاسو ستایشی پەروەردگار دەکەن کەبەڵێنی خۆی بردە سەر لەگەڵیانو نیشتەجێی بەهەشتی کردن کەبەئارەزووی خۆیان تیا بگەڕێن کوێیان بوێ تیابسرەون بەراستی پاداشتی چاکەکاران زۆر گەورەو جوانە.

ابوهریرە دەفەرموێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( بانگدەرێ بانگ دەکات ئەی خەڵکی بەهەشت لەش ساغ بن قەت نەخۆش ناکەون، بژین قەت نامرن، گەنج بن قەت پیرنابن، خۆشبەخت بن قەت زویرو نائومێد نابن)[2] (مسلم).

هەروەها لەفەرمودەیەکیتردا دەفەرموێ: ( ...وللجنة ثمانية أبواب فمن كان من أهل الصلاة دُعي من باب الصلاة، ومن كان من أهل الصيام دعي من باب الصيام ومن كان من أهل الصدقة دعي من باب الصدقة، ومن كان من أهل الجهاد دعي من باب الجهاد)(متفق عليه)[3]

---

[1] احياء علوم الدين :٤/٤٨٧ ، ٤٨٨.

[2] المغني: ٤/٥٣٧.

[3] المغني : ٤/ ٥٣٦.

واتە: بەهەشت هەشت دەرگای هەیە هەرکەس ئەهلی نوێژ بێت لەدەرگای نوێژەوە بانگ دەکرێتە ژوورەوە وە هەرکەس ئەهلی رۆژو و بێت لەدەرگای رۆژوەوە بانگ دەکرێ، وە هەرکەس ئەهلی چاکەو خێربێت لەدەرگای چاکەوە بانگ دەکرێ، وە هەرکەس ئەهلی جیهاد بێت لەدرگای جیهادەوە بانگ دەکرێ.

ئەمجا لەیادمان بێت جێگاو رێگاو ژوورو پلەکانی بەهەشت جیاوازن بەگوێرەی جیاوازی پەرستش و کردەوە بەڵکو دوارۆژ پلەکانی بەرزترەو جیاوازی نێوان خەڵکەکەی زیاترە، بۆیە خوای گەورە فەرمانمان پێدەدات لەم مەودایەدا پێش برکێ بکەین: ﴿ سابقوا الى مغفرة من ربكم وجنة عرضها كعرض السماء والارض ....﴾ (الحديد: ٢١) پێشبرکێ بکەن بۆ لێخۆشبونێك لەلایەنی پەروەردگارتانەوە بۆ بەهەشتێك کەپانایی‌یەکەی بەئەندازەی گەورەیی ئەرزو ئاسمانە.

یان دەفەرموێ: ﴿ وفي ذلك فليتنافس المتنافسون ﴾با ئالەمەدا پێشبرکێ بکەن ئەوانەی کەحەز دەکەن بەپێشکەوتن و لەخەڵك رەت بوون.

ئەبو سەعیدی خودری دەفەرموێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( خەڵکی بەهەشت دانیشتوانی ژوورەکانی سەرو خۆیان دەبینن وەك چۆن ئێوە ئەستێرەی کەنار دەبینن لەرۆژهەڵاتەوە تا رۆژئاوا چونکە دانیشتوانی بەهەشت جیاوازی هەیە لەنێوان جێگاکانیاندا وتیان: ئەی پێغەمبەر ئەو جێگا بەرزانە هی پێغەمبەرانە جگە لەوان کەس نایگاتێ؟ فەرمووی: بەڵێ سوێندم بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە پیاوانێك دەیگەنێ کەباوەڕیان بەخوا هێناوەو پێغەمبەران بەراست دەزانن) (متفق عليه)[1].﴿ومن يطع الله والرسول فاولئك مع الذين انعم الله عليهم من النبيين...﴾النساء:٦٩.

بەکورتی لەحەدیسی قودسی‌دا هاتووە کەخوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ اعددت لعبادي الصالحين مالا عين رات ولا اذن سمعت ولا خطر على قلب بشر ﴾ (رواه الشيخان)[2] . واتە: من ئامادەم کردووە بۆ بەندە چاکەکانی خۆم ئەوەی کەچاو نەیدیوە، هیچ گوێیەك نەیبیستووە بەدڵی هیچ کەسیشدا نەهاتووە.

هەروەها جابر دەفەرموێ: پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێ: ( لەبەهەشتدا چەند ژورێك هەن جۆرەها گەوهەریان تیایە دیوی دەرەوەیان لەناوەوە دەبینرێ، وە ناوەوە لەدەرەوە دەبینرێ لەنازو رابواردن و دڵخۆشی ئەوەندەی تیایە کەهیچ چاوێك نەیدیوە، هیچ گوێیەك نەیبیستووە، بەدڵی هیچ مرۆڤێکدا نەهاتووە).

---

[1] المغني: ٤/٤٨٩.

[2] سەرچاوەی پێشوو.

جابر دەڵێ: وتم ئەی پێغەمبەری خوا ئەمە بۆ کێ دەبێ؟ فەرمووی: بۆ کەسێك سڵاو بڵاوبکاتەوەو خۆراك ببەخشێ، هەمیشە بەرۆژو و بێتو نوێژبکات لەکاتی خەڵك خەوتندا جابر دەڵێ: وتمان ئەی پێغەمبەری خوا کێ ئەوە دەتوانێ؟ فەرمووی: ئوممەتی من دەتوانن پێشتان دەڵێم چۆن؟ هەرکەس بکات بەبراکەی سڵاوی لێ بکات یان وەڵامی سڵاوەکەی بداتەوە ئەوە سڵاو بەخشە، وە هەرکەس ماڵو منداڵی خۆی تێر خۆراك بکات ئەوە خۆراکی بەخشیوە، وە هەرکەس مانگی رەمەزان بەرۆژو و بێت لەهەرمانگێکیش سێ رۆژ ئەوە هەمیشە بەرۆژوو بووە، وەهەرکەس نوێژی عیشاو بەیانی بەجەماعەت بکات ئەوە لەکاتی خەڵك خەوتندا نوێژی کردووە)[1]. غەزالی لە(احیاء)دا دەفەرموێ: مەبەستی لەو خەوتوانە گاورو جولەکەو ئاگر پەرستە بەڵام بەداخەوە ئێستە زۆربەی بەناو موسڵمانەکانیش لەکاتی، بەیانیدا، خەوتوون.

ئەم فەرموودانەی پێغەمبەر(ﷺ) کەباسمان کردنو چەندین فەرموودەی تر لەم بارەوە هەمووی تەفسیرن بۆ ئایەتەکانی قورئان کەلەبارەی بەهەشتەوە باس دەکەن وەك لەسوورەتی (زخرف) دا دەفەرموێ: ﴿ الاخلاء يومئذ بعضهم لبعض عدو الا المتقين ﴾دۆستو خۆشەویستان لەرۆژی قیامەتدا هەموو دەبنە دوشمنی یەکتر، مەگەر ئەوانەی خۆشەویستییەکەیان لەسەر بناغەی تەقواو لەبەرخوا بووبێت، ئەوانە لەو رۆژەدا خوا پێیان دەفەرموێ: ﴿ يا عباد لاخوف عليكم اليوم ولا انتم تحزنون﴾ئەی بەندەکانی من ئەمڕۆ ترسو بیمتان لەسەر نیەو پەژارەداتان ناگرێ ﴿ الذين امنوا باياتنا وكانوا مسلمين ﴾ئەوانەی باوەڕیان هێناوە بەبەڵگەو نیشانەکانی خواو بەقورئانەکەی خواو موسڵمان بوون ، ئەوانە پێیان دەوترێ ﴿ادخلوا الجنة انتم وازواجكم تُحبرون ﴾ بچنە ناو بەهەشت خۆتانو خێزانەکانتان هەمیشە دڵخۆشو رووکراوەبن ﴿يُطاف عليهم بصحاف من ذهب واكواب وفيها ما تشتهيه الانفس وتلذ الاعين وانتم فيها خالدون ﴾ ( زخرف ٦٧ . ٧١) لەو بەهەشتەدا منداڵانی جوانکیلە دەگەڕێن بەسەریاندا قاپو پەدراخی ئاڵتون وا بەدەستیانەوە، لەو بەهەشتەدا ئەوەی نەفس حەزی پێ بکات چاو بەلایەوە جوانو شیرین بێت واله بەردەستداو، ئێوە بەهەمیشەیی تیادەمێننەوە.

لەفەرموودەکانی پێغەمبەردا بەدرێژی باسی شێوەی بەهەشتو جلوبەرگو خۆراکی خەڵکی بەهەشت کراوە ئێمە ناتوانین هەموو فەرموودەیەك لەم بارەوە بنووسین، بۆ نموونە پرسیاریان کرد لەپێغەمبەر(ﷺ) دەربارەی گڵی بەهەشت فەرمووی: (درمكة بيضاء مسك خالص) (اخرجه مسلم)[2].

مانای گڵێکی وردی سپییەو میسکێکی تەواوە.

---

[1] المغني ، ٤/٤٨٩.

[2] المغني عن حمل الاسفار: ٤/ ٤٩٠.

یان دەفەرموێ: ( من یدخل الجنة ینعم لاییأس لاتبلی ثیابه ولا یفنی شبابه) (رواه مسلم)[1] .

هەرکەس بچێتە بەهەشت هەمیشە والەژیانی خۆشدا بێزار نابێت جلەکانی شڕنابن و گەنجێتی بەسەر ناچێت.

یان دەفەرموێ یەکەم کۆمەڵ دەچنە بەهەشت شێوەیان وەك مانگی چواردەوەهایە تف و چڵمی تێناکەن وپیسی ناکەن، شانەکانیان ئاڵتون و زیوە، ئارەقیان میسکە، هەریەکەیان دوو ژنی هەیە ئەوە نەجوانن مۆخی لاقیان لەپشتی گۆشتەوە دەبینرێ ناکۆکی و کینەبەری نیە لەنێوانیاندا، دڵیان یەك دڵەو بەیانی و ئێوارە(سبحان الله) دەکەن(متفق علیه)[2].

جوولەکەیەك هاتە خزمەتی پێغەمبەر(ﷺ) پرسیاریکرد ئەی (ابو القاسم) تۆگومان وادەبەیت خەڵکی بەهەشت ئەخۆن و ئەخۆنەوە؟ جولەکەکە بەهاوڕێکانی وت ئەگەر محمد بڵێ: بەڵێ دەیبەزێنم، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: بەڵێ، سوێندم بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە هەریەکێ لەخەڵکی بەهەشت توانای صەد پیاوی پێ دەدرێ لەخواردن و خواردنەوەو تێکەڵاوی خێزاندا، جوولەکەکە وتی: ئەوەی بخواو بخواتەوە پێویستی ئاو دەستی دەبێ؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: پێویستی ئەوان ئارەقێکە لە پێستیان هەڵ دەنیشێ و وەك میسك وایە هەتا سکیان چۆڵ دەبێ و دادەنەوێ[3] .

(ابن مسعود) دەفەرموێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ( تۆ لەبەهەشتدا تەماشای باڵندەیەك دەکەیت و ئارەزووی دەکەیت یەکسەر دەکەوێتە خوارەوە بەردەستت بەبرژاوی)[4].

(انس) دەفەرموێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: بەیانی ڕۆشتنێك یان ئێوارە ڕۆشتنێك بۆ غەزا لەپێناوی خوا چاکترە لەدنیاو ئەوەی تیایدایە، وە ئەندازەی کەوانی یەکێکتان یان بەئەندازەی جێگا پێی لەبەهەشتدا باشترە لەدنیاو ئەوەی لەدنیادایە، ئەگەر ئافرەتێك لەئافرەتانی بەهەشت سەر دەربێنێتە سەر ڕووی زەوی ڕۆشنی دەکاتەوەو نێوان ئەرزو ئاسمان پڕدەکات لەبۆنی خۆش، وە سەر پۆشەکەی سەری چاکترە لەدنیاو لەوەی وا لەدنیادا.

ئابەم فەرموودەیە کۆتایی دێنین بەم باسە بەڵکو خوشکانی موسڵمانیش پەند وەرگرن لەم فەرموودەو سەرپۆشەکانیان توند بکەن لەگەردن و لاملیان و پەردەی شەرمی ئیسلامی بپۆشن بەڵکو ببنە یەکێ لەو ئافرەتانەی خوای گەورە دایان دەنێ لەناو نازونیعمەتەکانی بەهەشتداو خۆیشیان تێربن لەو نازو نیعمەتە پیرۆزە.

---

[1] سەرچاوەی پێشوو.

[2] سەرچاوەی پێشوو : ٤٩١.

[3] سەرچاوەی پێشوو.

[4] سەرچاوەی پێشوو.

خوازیارم خوای گەورە بمانگێڕێ لەئەهلی ئەو بەهەشتەو لەگوناهو تاوانەکانمان ببورێو دایكو باوكو مردوانمان عەفوو بكاتو شیفای نەخۆشمان بدات(ئامین).

## ١١ـ فراوانی بەزەیی خوا

﴿قل یاعبادیَ الذین اسرفوا علی انفسهم لاتقنطوا من رحمة الله ان الله یغفر الذنوب جمیعاً انه هو الغفور الرحیم ﴾الزمر/٥٣

واتە: تۆ پێیان بڵێ: ئەی محمد لەزمانی پەروەردگارەوە ئەی ئەو بەندانەی من کەوا لەسنور دەرچوونو زیادە ڕەویتان کردووە مەئویس مەبن لەبەزەیی‌خوا، چونکە خوا لەهەمووتاوانەکان دەبورێ بەراستی خوا زۆر لێبووردەو خاوەن بەزەییە.

﴿ ومن یعمل سوءاً او یظلم نفسه ثم یستغفر الله یجد الله غفوراً رحیماً﴾(النساء: ١١٠).

واتە: هەرکەس کردەوەیەکی خراپە بکات یان زوڵمو ستەم لەنەفسی خۆی بکات ئەمجا پەشیمان ببێتەوە و داوای لێ بوردن بکات دەبینێ خوا زۆر لێبووردەیەو خاوەنی سۆزو بەزەییە.

لەژێر ڕۆشنایی ئەم ئایەتە پیرۆزانەدا ئێمەیش داوای لێبوردن لەخوای گەورە دەکەین لەهەموو هەڵەو تاوانێکمانو تەیەکمان کەجیاواز بووبێت لەگەڵ کردەوەکانماندا دڵنیاش بین لەوەی خوا سۆزو بەزەیی زۆرەو (انشاء الله) لێی بێ‌بەش نابین هەر لەم بارەوە پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێ: ( ان لله مأة رحمة انزل منها رحمة واحدة بین الجن والانس والطیر والبهائم والهوام فبها یتعاطفون، وبها یتراحمون واخر تسعاً وتسعین رحمة یرحم بها عباده یوم القیامة )(اخرجه مسلم)[1].

واتە: خوای گەورە صەد ڕەحمەتی هەیە تەنها یەك ڕەحمەتی ناردۆتە سەر زەویو دابەش کراوە بەسەر جنۆکەو ئادەمیزادو باڵندەو ئاژەڵەکانو جانەوەرەکاندا بەهۆی ئەو تاکە ڕەحمەتەوە سۆزو بەزەییان دەجۆشێ بۆیەکتر، خوای گەورە(٩٩) ڕەحمەتی هەڵگرتووە بۆئەوەی دابەشی بکات لەنێوان بەندە موسوڵمانەکاندا لەڕۆژی قیامەتدا.

هەروەها دەفەرموێ: ( اذا کان یوم القیامة اخرج الله کتاباً من تحت العرش فیه ان رحمتي سبقت غضبي وانا ارحم الراحمین فیخرج من النار مثلا اهل الجنة )( متفق علیه)[2] . واتە: هەرکات ڕۆژی قیامەت هات خوا نامەیەك دەردێنێ لەژێر عەرشەوە تیایدا هاتووە: سۆزو بەزەیی من پێش کەوتووە لەخەشمو قینمو من(ارحم الراحمین)م ، واتە: بەسۆزترین خاوەن سۆزانم لەو ڕۆژەدا دوو ئەوەندەی خەڵکی بەهەشت خەڵکی‌تر دەردەچێت لەدۆزەخ هەروەها دەفەرموێ: ( ان الله یستخلص رجلاً من امتي علی رؤوس الخلائق یوم القیامة فینشر علیه تسعة وتسعین سجلاً

[1] المغني عن حمل الاسفار: ٤/٤٩٩.

[2] سەرچاوەی پێشوو.

كل سجل منها مثل مد البصر، ثم يقول اتنكر من هذا شيئاً ؟ أظلمتك كتبتي الحافظون ؟ فيقول: لا يارب فيقول: افلك عذر؟ فيقول : لا يارب ، فيقول: بلى انّ لك عندنا حسنة وانه لاظلم عليك اليوم فيخرج بطاقة فيها( اشهد ان لا اله الا الله واشهد ان محمداً رسول الله)فيقول يارب ماهذه البطاقة مع هذه السجلات؟ فيقول: انك لاتظلم، فتوضع السجلات في كفة والبطاقة في كفة فطاشت السجلات وثقلت البطاقة فلا يثقل مع اسم الله شيء)[1].

واته: خوای گەورە پیاوێك هەڵدەبژێریٚ لەئوممەتی من لەبەرچاوی هەموو مەخلوقات لەرۆژی قیامەتدا(٩٩) (سجل)ی بۆدەکاتەوەو هەریەکەی بەئەندازەی ئەوەنەی چاو بڕ بکات پانو پۆڕە( واتا گشتی پڕ لەتاوانە) ئەمجا پێی دەڵێ: ئایا لاریت هەیە لەشتێکدا لەمانە؟ ئایا فریشتەکان ستەمیان لێکردویت؟ دەڵێت: نەخێر ئەی پەروەردگارم، پێی دەڵێت: ئایا بیانوویەکت هەیە؟ دەڵێت: نەخێر ئەی پەروەردگارم، ئەمجا خوا دەفەرمویٚ: بەڵێ تۆلای ئێمە چاکەیەکت هەیەو ئەمڕۆ ستەمت لێناکریٚ، کارتێکی بۆ دەرئەهێنیٚ تیا نوسراوە: (اشهد ان لا اله الا الله واشهد ان محمداً رسول الله).

کابرا دەڵیٚ: ئەی خوایە جا ئەم کارتە بچکۆلە چیيە بەرانبەر بەم هەموو (سجل)انە؟

خوا دەفەرمویٚ: تۆ ستەمت لێناکریٚ هەموو(سجل)ەکان دەخرێنە تایەکی ترازووەکەوە تەنها کارتەکەیشی دەخرێتە ئەو تاکەیان(سجل)ە کان هەڵدەکشێنو کارتەکە قورس دەبیٚ بەسەر هەموو(سجل)ەکاندا چونکە هیچ شتێك قورس ترنیە لەناوی خوا.

هەروەها لەفەرموودەیەکی(قودسی)دا هاتووە خوای گەورە دەفەرمویٚ: ( يا ابن ادم انك مادعوتني ورجوتني غفرت لك على ماكان منك ولا ابالي، يا ابن ادم لو بلغت ذنوبك عنان السماء ثم استغفرتني غفرت لك، يا ابن ادم انك لو اتيتني بقراب الارض خطايا ثم لقيتني لاتشرك بي شيئاً لاتيتك بقرابها مغفرة ) (رواه الترمذي وقال حديث حسن)[2].

واته: خوای گەورە دەفەرمویٚ: ئەی ئادەمیزاد تۆ هەرچەندە لێم بپارێیتەوەو تەماداری من بیت من لێت دەبوورم لەوەی کردوتەو باکیشم نیە، ئەی ئادەمیزاد ئەگەر تاوانەکانت بگەنە بەرزایی ئاسمان لەپاشا داوای لێبوردن لەمن بکەی من لێت دەبوورم، ئەی ئادەمیزاد ئەگەر بێیتە بارەگای من نزیك بەئەندازەی زەوی تاوانت هەبیٚ بەلاَم کاتیٚ دەگەیتە من هاوەڵت بۆم بریار نەدابیٚ من بەو ئەندازەیە لێبوردنت پیٚ دەبەخشم.

بەم شێوە پێویستە موسڵمان لەبەزەیی خوا نائومێد نەبیٚ، هەمیشە لەنێوان ترسو تەمادا بژی چونکە نەترسان لەسزای خوا بەدبەختیيە.

---

[1] الترمذي وقال حسن غريب ، المغني عن حمل الاسفار ،٤/٤٩٧.

[2] رياض الصالحين / باب فضل الرجاء.

وەك خوا دەفەرمویٚ: ﴿ فلا يأمن مكر الله الا القوم الخاسرون ﴾ ( الاعراف: ٩٩).

هەروەها بەتەمانەبوونی بەزەیی خوایش کوفرە ﴿انه لاييأس من روح الله الا القوم الكافرون﴾(يوسف: ٨٧). ئەبیٚ لەحاڵەتی ئاسایی‌دا موسوڵمان بەشیٚوەیەکی یەکسان بژی لەنیٚوان ترس‌و تەما(خوف و رجاء)دا بەڵام لەکاتی نەخۆشی‌دا تەنها تەمای هەبیٚت‌و ترس لەدڵی دەرکات[1]. وەك شافیعی ـ رحمه الله ـ دەفەرمویٚ:

**ولما قسا قلبي وضاقت مذاهبي**

**جعلت الرجا منك لعفوك سُلّما**

**تعاظمني ذنبي فلما قرنته**

**بعفوك ربي كان عفوك اعظما[2]**

واتە: لەکاتیٚکدا دڵم ڕەش بوو لەتاواندا‌و ئاوات‌و بۆچوونەکانم تەسك بوونەوە، رجاو تەمام بەتۆکرد بەپەیژە بۆ لیٚبوردنت گوناهەکانم گەورە بوون لەبەرچاوم، بەڵام کاتیٚ بەراوردم کرد لەگەڵ لیٚبوردنی تۆدا لیٚبوردنی تۆ گەورەتربوو.

بوصیریش دەفەرمویٚ:

**يانفس لاتقنطي من زلّة عظمت**

**ان الكبائر في الغفران كاللمم**

**لعل رحمة ربي حين يقسمها**

**تأتي على حسب العصيان في القسم**

واتە: ئەی نەفس مەئیوس مەبە لەگوناهیٚك گەورەبووە، چونکە گەورە گوناهەکانیش لەلیٚبوردنی خوادا وەك وردە گوناهەکان وەهایە بەڵکو بەزەیی خوا لەکاتیٚکدا دابەشی دەکات، بەگویٚرەی تاوانەکان دابەشیان بکات !

بەم وتارە کۆتایی دیٚنین بەباسەکانمان دەربارەی یاد نامەکانی ڕۆژی قیامەت داواکارم لەخوای گەورە دڵ‌و دەروونمان خاویٚن کات‌و بەسۆزو بەزەیی خۆی لەئاگری دۆزەخ قوتارمان بکات‌و بەبەهەشتی بەرین شادمان کات!(ئامین).

---

[1] رياض الصالحين ، باب الجمع بين الخوف والرجاء.

[2] ديوان الامام الشافعي .

# فەسڵی دووەم / بۆنە ئاینیو کۆمەڵایەتییەکان

## ١ ـ ساڵی نوێی کۆچی ١٤٢٣ك/٢/ محرم

ئەمڕۆ هەینی ٢/ محرم ساڵی ١٤٢٣ کۆچی‌یە واتە: ئەمساڵ هەزارو چوار صەدو بیستو سێساڵە پێغەمبەر(ﷺ) کۆچی فەرمووە لەمەککەوە بۆ مەدینە لەگەڵ یاری غاردا (ئەبوبەکری صدیق)(ﷺ) بۆیە لەسەرمانە بەدڵو بەگیان یادی ئەو ڕۆژە پیرۆزە بکەینەوە هەزاران صەڵاوات لەدیاری پێغەمبەر(ﷺ) بدەین. ئەهلی ئیمان ئەوەی خۆی بەموسوڵمان بزانێتو بەتەمابێت لەژێر چەتری پێغەمبەردا حەشر بکرێتو بەئوممەتی ئەو حسابی بۆ بکرێت دەبێ ئەم یادانە زیندوو ڕابگرێت بەڵام... بەداخەوە دەگونجێ هەندێکتان نەتانبیستبێ ئەمڕۆ ساڵی نوێیە یان کەبۆیشتان باس دەکەمو ڕەنگە هێشتا نەزانن بۆچ ساڵی نوێیە چونکە لەعالەمی ئیسلامیدا ساڵی کۆچی پشت گوێ خراوەو بێنازکراوەو هەتیوو بێباوکە هەرکەسیش دەست بەسەری هەتیودا بهێنێو لەبەرخاتری خوا بیلاوێنێ چەند تاڵموو بکەوێتە ژێردەستی خوا ئەوەندە چاکەی بۆ دەنوسێو ، ئەوەندە پلەی بەرزدەکاتەوە، بۆیە من حەزدەکەم لەیادی ئەمساڵە نوێیەدا چەند خاڵێکتان ئاڕاستە بکەم.

**خاڵی یەکەم/** وتارەکە دەست پێدەکەم بەم ئایەتەی قورئان: ﴿إن عدة الشهور عند الله اثنا عشر شهراً في كتاب الله يوم خلق السموات والارضَ منها اربعة حُرم، ذلك الدّين القيّم فلا تظلموا فيهن انفسكم وقاتلوا المشركين كافّة كما يقاتلونكم كافة واعلموا ان الله مع المتقين﴾ التوبة: ٣٦.

واتە: ژمارەی مانگەکان لای خوا دوازدە مانگە بەگوێرەی هەوارگەکانی مانگاشەو کەهەرشەوێ لەهەوارێکدا دەبیو دەردەکەوێ، لەکیتابی خوادا کە(لوح المحفوظ)ە بەم شێوە دانراوەو تۆمارکراوە، لەو ڕۆژەوە ئەرزو ئاسمانی دروست کردووە هەر وەهابووە، چوار مانگیان پێیان دەوترێ مانگە قەدەغەکراوەکان( الاشهر الحرم) ئەمەیە ئاینی ڕاستو ڕەوان. زوڵم لەخۆتان مەکەن بەتێکدانی نامەو پەیامو حسابی خوایی، بجەنگن لەگەڵ موشریکو بێباوەڕاندا بەگشتی وەك چۆن ئەوان بەگشتی لەگەڵ ئێوە دەجەنگن، بیش زانن خوا لەگەڵ تەقوا کارانداییەو پشتیان دەگرێت، ئایەتەکە ئاماژە دەکات بەوەی ساڵ دوازدە مانگە، ساڵی هەتاویو مانگیش هەر دوازدە مانگە ساڵی هەتاوی زانراوەو پێویست بەژماردنیان ناکات، مانگەکانی ساڵی مانگیش بەم شێوەیە:

(محرم، صفر، ربيع الاول، ربيع الثاني، جمادي الاول، جمادي الثاني، رجب، شعبان، رمضان، شوال ، ذي القعدة، ذي الحجة)، (الاشهر الحرام) چوارن: (ذي القعدة، ذي الحجة، محرم، رجب).

هەر لەم بارەیەشەوە پێغەمبەر(ﷺ) لە(حجة الوداع)دا فەرمووی: ( ان الزمان قد استدار كهيئته يوم خلق السموات والارض السنة اثنا عشر شهراً منها اربعة حرم: ذو القعدة، وذوالحجة، والمحرم ورجب مضر الذي بين جمادي وشعبان).

واتە: ئەمڕۆ زەمان وەك خۆی لێهاتۆتەوە لەو ڕۆژەدا كەخوا ئاسمانەكانو زەوی دروست كردووە چۆن بووە ئەمرۆیش وایە . ئیتر نابێ یاری پێبكرێو هەركەس بەئارەزووی خۆی مانگەكان پاشو پێش بكات، ساڵ دوازدە مانگە، چواریان مانگە یاساغ كراوەكانن.

**خاڵی دووەم/** ئەم مێژووە مانای چی؟

مێژووی كۆچی یادمان دەخاتەوە بەكۆچی پێغەمبەرو(ﷺ) یارانی، بەتایبەت یاری غاری ئەبوبەكری صدیق(ﷺ)، مێژووی كۆچی یادمان دەخاتەوە بەباوەڕی پتەوو دەس هەڵگرتن لەماڵو سامانو خزمو خوێنو خاكو نیشتمان لەپێناو پاراستنی عەقیدەدا، مێژووی كۆچی یادمان دەخاتەوە بەوشەوە مێژوویی‌یەی پێغەمبەرو(ﷺ) ئەبوبەكر بەتەمابوون كۆچ بكەن بەڵام هێشتا كاتی كۆچەكەیان دیاری‌نەكردبوو ئەبوبەكر چاوەڕێی فەرمانی پێغەمبەرو پێغەمبەریش(ﷺ) چاوەڕێی فەرمانی خوابوو، قورەیشیش كەهەستی‌كرد بەم نیازەیان بڕیاریاندا بەبڕیاری هەموو گەورە پیاوەكانی قورەیش (ابو جهلو حكمی كوڕی عاصو عقبەی كوری ابي معيط وامية كوری خلف)و چەند كەسێ تریان كەدەبێ محمد بكوژنو نەیەڵن دەرچێت،شەوێكیان بۆ ئەم پیلانە دیاری كردو چوار دەوری ماڵی پێغەمبەریانداو دڵنیابوون لەوەی پیلانەكەیان سەری گرتووە و خوێنی محمدیش ون دەبێت.

هەر لەوشەوەدا خوای گەورە پێغەمبەرەكەی ئاگادار كردو فەرمانی پێدا لەجێگەكەی خۆیدا نەخەوێ كۆچ بكات، بۆیە ئەویش فەرمانی دا بە حەزرەتی عەلی ( نم على فراشي وتسبح ببردي الخضرمي الاخضر، فنم فيه فانه لن يخلص اليك شيء تكرهه منهم)[1].

واتە: بخەوە لەجێگەكەی منداو، خۆت بپێچەرەوە بە سەرچەفە خەضرەمی‌یە سەوزەكەی من هیچ شتێك كەتۆ پێت ناخۆش بێت لەدەستی ئەوكافرانە توشت نابێت.

دوای ئەوە پێغەمبەر(ﷺ) دەرچوو بەناو ریزەكانیانداو مشتێ خۆڵی كرد بەسەریانداو ئەم ئایەتەی خوێند ﴿ وجعلنا من بين ايديهم سداً ومن خلفهم سداً فاغشيناهم فهم لايبصرون ﴾ (یس:٩ ) هیچ پیاوێكیان نەبوو سەری لەوخۆڵەی بەر نەكەوتبێت.

بۆیە دەبێ موسوڵمان لەیادی ئەم مێژووەدا ئازایەتیو سەروەریو لەخۆبوردەییو بەخت كردنی ماڵو سامان لەناخیدا زیندوببێتەوە، هەر ئەوەیشە مانای پیرۆزبایی سەری ساڵی نوێو نوێ بوونەوەی ڕووداوەكان ، نەك ڕەش بەڵەكو، تێكەڵاویو شكاندنی سنووری خواو

---

[1] الرحيق المختوم ، مباركفوري : ١٤٧.

یغەمبەر(ﷺ) بەناوی ئاهەنگو شاییو پشوودانو ...هتد (والحمد لله) کەمێژووی کۆچی ئێستایش دووره لەومنالٚ بازارییە ئەوەیش فەزلی خوایە.

**خالی سێیەم/** مێژووی کۆچی تاقانە مێژووی ئەدیبو زانایانی کورد بووە لەمەوبەر.

ئەمەیش بەرونی دەردەکەوێ لەنووسینو دانانی بەروار بۆ ڕووداوەکان لەشیعرو نوسراوەکانیاندا، بۆ نموونە بەسەردەرگای مزگەوتی گەورەی خورمالٚ لەبەردێکی مەڕ مەڕ پارچە شیعرێ نوسرابوو کۆتایییەکەی بەم شیعرە هاتبوو:

(ابن اشارت زغیب شد تاریخ، بوده مسجد بذکر حق اباد)کەنیوە شیعری کۆتایی بەشێوە نوسینی ئیملای فارسی دەکاتە ١١٦٢ ك. ئەم شاعیرەیش کوردبووە بەلاّم ئەوکاتە ئەدەبی فارسی باوبووە.

هەروەها دەیان نمونەیشمان هەیە لەئەدەبی کوردیدا، ئەمەیش ئەوە دەگەیەنێ مێژووی رەسەنی گەلی کورد مێژووی کۆچییە، بەلاّم لەهەمان کاتیشدا پێویستە ئاگاداریش بین لەژیانی حەزرەتی عیسی و مێژووی ئەو ئاینە چونکە ئێمە لە(مسیحی)یەکان زیاتر ڕێز لەعیسی دەگرینو باشتریش دەیناسینو هەقی تەواوی خۆی دەدەینێ، وەك قورئان لەسەر زاری عیسی(سەلامی خوای لێبێت) بۆمان دەگێڕێتەوە و پێناسەی خۆیمان بۆ دەکات:

﴿ قال اني عبدالله اتيني الكتاب وجعلني نبياً* وجعلني مباركاً اينما كنت واوصاني بالصلاة والزكاة مادمت حياً* وبراً بوالدتي ولم يجعلني جباراً شقياً ﴾ مريم: ٣٠ - ٣٢.

واتە: من بەندەی خوام پەیامی بۆ ناردوومو کردوومی بەپێغەمبەر(ﷺ) ، پیرۆزی کردووم لەهەر لایەك بم، وە ئامۆژگاری کردووم بەنوێژکردنو ڕۆژوگرتنو زەکات دەرکردن هەتا لەژیاندابم، کردومی بەکەسێکی چاکەکارو دڵسۆز بەرانبەر دایکمو نەیکردوم بەکەسێکی ستەمکارو بەدبەخت.

**خالی چوارەم/** ئەوەیە نوێبوونەوەی سالی کۆچی ئەمسالٚ دەست لەملانە لەگەلٚ ئازارەکانی مانگی ئازاردا وەك: تواندنەوەی شۆڕشی کوردی سالی ١٩٧٥و ، کیمیابارانی هەڵەبجەو قەرەداغ سالی ١٩٨٨، کۆڕەوی سالی ١٩٩١وچەندین روداوی تر. بۆیە پێویستی سەرشانمانە ئەم یادانەیش لەدڵماندا زیندوو ڕابگرینو بزانین هەرچی بەسەر ئێمەدا هات هۆکارەکەی بەپلەی سەرەکی دووریمان لەخواو جیاوازیو لەتبوونی خۆمان بووکە کورد دەکرا بەگژی کوردا هەرجارەی بەناوێکەوە هەتا بووینە تیکەی چەوری هەموو ئەو لایەنانەی چاویان بڕیوەتە خاكو نیشتمان دینو ڕەوشتمان. بۆیە پێویستە بەدوای چارەسەرێکی بنە ڕەتیدا بگەڕێین هەتا جارێکیتر ئەو ڕۆژە ڕەشانە بەسەرماندا نەگەڕێنەوە ئەوچارەسەرەیش تەنها برایەتیو دڵسۆزیو خۆشەویستیو یەککەوتنمانە لەژێر سایەی قورئانو بەرنامەی خوادا وەك قورئان دەفەرموێ:

﴿واعتصموا بحبل الله جميعاً ولا تفرقوا واذكروا نعمة الله عليكم اذ كنتم اعداءً فالف بين قلوبكم فاصبحتم بنعمته اخواناً وكنتم على شفاحفرة من النار فانقذكم منها كذلك يبين الله لكم اياته لعلكم تهتدون﴾ ال عمران: ١٠٣ .

واتە: دەست بگرن بەئاینی خواوە بەگشتیو جیاواز مەبنو، یادی نیعمەتی خوابکەنەوەو لەسەرتان، کەپێش هاتنی ئەم ئاینە ئێوە دوژمنی یەکتربوون خوا دڵی جووت کردن بەهۆی ئەوبەشو نیعمەتە خواییەوە بوون بەبرای یەکتر، ئێوە لەسەر لێواری دۆزەخ وەستابوون خوا رزگاری کردن، بەم شێوە خوا بەڵگەونیشانە جوانەکانی دەخاتە روو بەڵکو راستی بدۆزنەوەو بکەونە سەری.

خوایە جارێکیتر بمانکەیتەوە بەبرای یەکتریو خۆشەویستیو تەبایی لەنێوماندا زیندوکەیتەوە ...ئامین

## ٢ ـ یادی مەولوود ١٤١٩/٣/٩ ـ مزگەوتی خەبات

لەم موناسەبەی مانگی مەولوودەدا زۆر لەخەتیبەکان باسی ئەم یادە پیرۆزە دەکەنو موسوڵمانانی لێ بەئاگا دێنن هەرکەس بەجۆرێك.

منیش بەدەوری خۆم حەزم کرد ئەمڕۆ هەندێ لەرەوشتە بەرزەکانی پێغەمبەر(ﷺ) باس بکەم بۆ جەنابتان لەژێر رۆشنایی ئەو ئایەتو فەرموودانەی گەورەیی رەوشتی ئەو زاتە پیرۆزەمان بۆ باس دەکەن ، بەونیازەی شارەزا بوونمان لەو رەوشتە بەرزانە ببێتە پاڵنەر بۆ ئێمەش تاچاوی لێبکەین و دوای سوننەتو رەوشتی بکەوین چونکە بەراستی هەر ئەو زاتە(قدوە)یە وشایستەی ئەوەیە دوای بکەوینو چاو لەرەوشتی بکەین ﴿لقد كان لكم في رسول الله اسوة حسنة ...الاية﴾ الاحزاب:٢١

لەراستیدا جوانترین سەرمەشقو چاولێکراوتان دەست دەکەوێت لەپێغەمبەری خوا(ﷺ) هەروەها عائیشەی خێزانی لەپێناسەی رەوشتیدا دەفەرموێ: (كان خلقه القران ) رواه مسلم. ئەو پێغەمبەرەی هەمیشە دەپاڕایەوە: (اللهم جنبني منكرات الاخلاق )[1]. ئەی خوایە بمپارێزە لەرەوشتی ناپەسەند. هەروەها دەیفەرموو: (اللهم احسنت خلقي فأحسن خلقي )[2] واتە: ئەی خوایە شەکڵو شێوازت جوانکردووم رەوشتیشم جوان کە).

---

[1] رواه الترمذي وحسنه ، المغني عن حمل الاسفار : ٢/٣٢٧.

[2] اخرجه احمد واسناده جيد . سەرچاوەی پێشوو.

ئەو پێغەمبەرەی ئاوێنەیەك بوو بۆ ڕەنگدانەوەی فەرمایشتو (توجیهات)ی خوایی کەپێی دەفەرموو: (خذ العفو ،وامر بالمعروف ، واعرض عن الجاهلين) الاعراف:١٩٩.

واتە: لێبوردنت هەبێ وەفەرمان بکە بەچاکەو ، پشت هەڵکە لەنەزانو نەفامەکان.

ئەو پێغەمبەرەی قورئان شایەتی بۆ تۆمار دەکات:﴿وانك لعلى خلق عظيم ﴾ القلم :٤.

بەراستی تۆ لەسەر ڕێبازێکی بەرزو بوڵندی ئەو پێغەمبەرەی دەیفەرموو: (بعثت لأتمم مكارم الاخلاق)[1] .واتە: نێردراوم بۆ تەواو کردنی ڕەوشتە بەرزەکان.

بەڵێ پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەسەرخۆ ترین کەس بوو ، ئازاترین کەس بوو ، دادوەر ترین کەس بوو ، دەستی لەهیچ ئافرەتێك نەکەوتووە مەگەر کەنیزەك یان خێزانی خۆی بووبێت یان مەحرەمەکانی.

دڵفراوانترین کەس بوو ، دینارو درهەم شەولای نەدەمایەوە، لەو هەمووماڵو سامانەی دەهاتە بەردەستی تەنها قووتی یەك ساڵی گل دەدایەوە، ئیتر لەخورما بوایە یان جۆ ، ئەوەلای دابەش دەکرد لەپێناوی خوادا ، زۆرجاریش پێش تەواو بوونی ساڵ قووتی لێدەبڕا ، بەدەستی خۆی نەعلو جلەکانی پینەدەکردو ، خزمەتی ناوماڵی دەکردو ، گۆشتی لەگەڵ خێزانەکانی دەبڕی ، زۆر بەشەرم بوو چاوی نەدەبڕیە ڕوومەتی کەس. هەرکەس بانگی بکردایە بەندە یان (حر) وەڵامی دەدایەوە دیاری وەردەگرت باقومێ شیر یان ڕانەکەروێشکێك بوایە ، پاداشتی خاوەن دیاریشی ئەدایەوە، بەڵام خێرو صدقەی وەرنەدەگرت.

رقو قین دەیگرت لەبەرخوا نەك لەبەرخۆی هەقی دەرئەبڕیو جێبەجێی دەکرد بازیانی خۆی یان یارەکانیشی تێدا بووایە.

هەرگیز قسەی بەخواردنو خۆراك نەدەوت ، هەرچی حازر بوایە دەیخوارد، گەر بەدڵی نەبوایە بێدەنگ دەبوو ، جاری وابوو نانی گەنم یان جۆی بەوشکی دەخوارد، لەکاتی خواردندا شانی دا نەئەداو لەسەر سفرە نانی نەدەخوارد، هەرگیز سێ ڕۆژ لەسەر یەك لەنانی وشك تێری نەخواردووە هەندێ جار لەبرسا بەردی لەسەر سکی دەبەست.

وەڵامی دەعوەتی شایی ئەدایەوە، سەردانی نەخۆشی دەکردو ئامادەی جەنازە دەبوو ، زۆر ملکەچو بێ فیز بوو ، قسەڕەوان بوو رووکراوەبوو، خۆشییەکانی دنیا تەفرەی نەئەدا . هەرجلێکی حەڵاڵی دەستە کەوتایە لەبەری دەکرد هەندێجار عەباو هەندێ جار جبەی خوری، مستیلەیەکی زیوی هەبوو ، دەیکردە توتەی ڕاستی ، جارجار چەپیشی، کڵاوو مێزەری لەسەر دەکرد، سواری ئەسپو وشترو هێسترو گوێ درێژ دەبوو ، هەندێجار بەندەکەی یان کەسێکیتری لەپاشکۆی خۆیەوە سواردەکرد.

---

[1] اخرجه احمد والحاكم والبهقي ، المغني عن حمل الاسفار:٢/٣٢٨.

زۆر حەزی بەبۆنی خۆش بوو ناحەزبوو بەبۆنی ناخۆش، هامشۆی خزمانی دەکرد، بەلاّم پێشی نەئەخستن لەکەسێك باشتر بێ لەوان ، ڕێزی لەهەموو کەس دەگرت عوزرو خواهی وەردەگرت. گاڵتەی دەکرد بەلاّم هەر راستی دەفەرموو، پێدەکەنی بەلاّم قاقای نەبوو ، یاریکردنی حەلاّلی دەبینی رێگای لێنەدەگرت ، بەچاوی سووك تەماشای هەژاری نەدەکرد لەبەر هەژاریەکەی‌و، لەپاشان نەدەترسا لەبەر موڵکەکەی و هەردووکیانی وەك یەك بانگ دەکرد بۆ خواپەرستی.

خوای گەورە رەوشتی بەرزو رامیاری تەواوی پێدابوو بەنەخوێندەواری لەبیابانێکی نەفامی‌و دوور لەزانستی‌دا شوانی مەڕبوو بێ‌دایك‌و باب بوو ، کەچی خوای گەورە کردیە شای کەسان‌و هەواڵی پێشینان‌و پاشینانی پێداو ڕێبازێکی پێ‌بەخشی سەرفرازی هەردوو دونیای تیابوو بۆخۆی‌و هەموو ئەوانەیشی کەدوای دەکەون .

پێغەمبەری خوا جنێوو قسەی ناشیرینی بەهەر موسوڵمانێ فەرمووبێت بۆی بووە بەکەفارەتی گوناهو رەحمەت ،چونکە خۆی دوعای کردووە وەهابێت نەفرینی لەهیچ ئافرەتێك و هیچ خزمەتکارێك نەکردووە پێی وترا بۆ نەفرین ناکەیت؟ فەرمووی: (انما بعثت رحمة ولم أبعث لعانا) واتە: من بەرەحمەت نێردراوم نەك بەنەفرینکار.

ئەگەر پێی بووترایە دوعای خراپ بکات لەکەسێك دوعای چاکی بۆ دەکرد ، هەرکات سەرپشك بکرایە لەنێوان دووکاردا ئاسانەکەیانی هەڵدەبژارد بەمەرجێ تاوان نەبوایە.

هەرکەس بهاتبایەتە لای سەربەست یان بەندە ، یان کەنیزەك بۆ پێویستی یەك لەگەڵی دەچوو بۆ کارەکەی . هەرکەس لەیارەکانی بهاتایەتە خزمەتی ئەم لەپێشدا دەستی دەبرد بۆ تەوقەو پاشان دەستی توند دەگووشی.

دانەدەنیشت‌و هەڵنەدەستا بەدەم یادی خواوە نەبێت ، زۆر کاتیش رووبەقیبلە دائەنیشت ، هەرکەس بهاتایەتە دیدەنی ژێرەخەرەکەی خۆی پێدەبەخشی ، گەر وەرینەگرتایە سووردەبوو لەسەری تاوەریدەگرت.

یارەکانی خۆی بانگ دەکرد بەناز ناوەکانیان بۆ ڕێز لێنانیان ، ئەگەر کەسێك نازناوی نەبوایە نازناوی بۆدادەنا ، ئەو ئافرەتانەیش منداڵیان هەبوو بەنازناوی منداڵەکانیان بانگی دەکردن . وەك دایکی فلاّن ـ ئەگەر منداڵیان نەبوایە نازناوێکی پێدەبەخشین ، هەروەها نازناوی بۆ منداڵیش دادەنا بۆ دڵنەواییان.

زۆر درەنگ رقی هەڵدەساو زۆر زوویش ئاشت دەبوویەوە، بەبەزەییترین کەسبوو ، سوود بەخشترین کەسبوو ، هەرکات لەکۆڕو دانیشتن هەڵبسایە دەیفەرموو: (سبحانك اللهم وبحمدك أشهد ان لا اله الا أنت استغفرك وأتوب اليك)

دەیشی فەرموو: (جبریل ئەم وشانەی فێرکردووم[1] .

کۆتایی ئەم وتارە دێنم بەچەند شیعرێکی مامۆستا عبدالکریم کەلەنورو نەجاتەکەیدا وەسفی پێغەمبەری (ﷺ) پێدەکات:

برێژە رەحمەت خوا هەتا قیامـــــەت لـەســـــەر
سەردەفتەری انبیاو رەهبەری جینـــــن و بەشـــــەر
ئەو کانی حیلم و وەفا کاتێ بەنـــورو صـــــەفا
دەرچوو لە پەردەی خەفا رووناکی کـــرد دەشت و دەر
بیستەمی نەیسانی‌زوو بەهاری خـــۆش رەنـــگ روو
غونچە بەلێو خەندەبوو لەبەر نەسیمی ســەحـــەر
مانگی رەبیعی یەك بوو لەرۆژی دوانـــــزەهـــەمـی
دووشەممە بوو صوبح دەم هەتا و لەگەل هاتـەدەر
بەصورەتی دلبەری نـــــازاری بێ‌سێبـــــەری
بەشەوقی رووی ئەنوەری (كالشمس لاكالقـــمـــر)
روونبوو زەوی تاسەما تۆزو تەمی تیا نـــــەما
خەم جێی نەمالەو دەما لەم عالەمە کەوتـــەدەر
کەوتە تەبەسسوم هەموو لێوی جیهان زوویـــەزوو
لەعەرزەوە موژدەچوو لەبۆ فریشتە لەســـــــەر
بەمەقدەمی( مصطفى )ئەما نموونەی جـــــــەفا
حیجازوو مەککەو صەفا پڕبوو لەخێرو لەفـــــەڕ
حەق کەوتە جیلوەو سەنا ،باطل بەرەو لای فـــەنا
نوور دای لە پێچ و پەنا ، تاریکی رۆیشتـــــــەدەر

خوایە بەونوورەی پێغەمبەر(ﷺ) دڵمان نوورانی کەیت ، خوایە گەردوو تۆزی گوناهو تاوان لەدڵمان دەرکەیت ، خوایە شیفای نەخۆشانمان بدەیت و رەحم بەمردوانمان بکەیت و ...هتد

[1] بۆ درێژەی ئەم باسە بڕوانە: احیاء علوم الدین: ٢/٣٤٦ - ٣٥٥ هەروەها (المغني عن حمل الاسفار).

## ٣ ـ شەورەویی و بەرزبوونەوە

﴿ سبحان الذي اسرى بعبده ليلاً من المسجد الحرام الى المسجدالاقصى الذي باركنا حوله لنريه من اياتنا انه هو السميع البصير﴾ (الاسراء: ١).

واتە: پاكو خاوێنی بۆ ئەو خوایەی شەوڕەوی كرد بەبەندەكەی خۆی. كە محمدە ـ لەشەودا لەمزگەوتی حەرامی مەككەوە بۆ مزگەوتی ئەقصای شام (بيت المقدس) بۆئەوەی بەڵگەو نیشانەكانی خۆمانی پیشان بدەین، بەڕاستی خوابیسەرو بینایە.

ئەهلی تەفسیرو سیرە دەفەرموون: شەوڕەوی‌و بەرزبوونەوە بەگیان‌و لاشە بووە، واتە: تەنها كارێكی رۆحی‌یان خەوێك نەبووە، چونكە ئەگەر وابوایە هیچ جێگای سەر سوڕمان نەدەبوو چونكە هەموو كەس دەگونجێ خەوی لەم شێوەیە ببینێ، دیسانەوە ئەگەر شەوڕەوی بەلاشە نەبووبێ پێی ناوترێ(معجزة) خۆشەوڕەویش یەكێكە لە(معجزة)كانی پێغەمبەری ئیسلام(ﷺ).

واتە: هەروەك چۆن خوا ڕێزی لەنوح پێغەمبەر گرت( بەوەی تەنها كەشتی‌یەكەی ئەو رزگاری بوو، هەموو بەشەر جگە لەدانیشتوانی ئەوكەشتی‌یە خنكان، هەروەها چۆن ڕێزی لەئیبراهیم گرت(سەلامی خوای لێبێت)و لەئاگر سەرفرازی كرد بە ﴿یا نار كوني برداً وسلاماً على ابراهيم﴾یان وەك ڕێزی لەموسا گرت(سەلامی خوای لێبێت) بەوەی دەریای بۆلەت كردو خۆی‌و قەومەكەی بەئاسانی تێپەڕین، هەروەها چۆن ڕێزی لەعیسا گرت(سەلامی خوای لەدیاربێت) و كەڕو كوێرو لاڵی چاك دەكردەوە بەئیزنی خوا، ئاوایش ڕێزی لە محمد(ﷺ) گرت‌و شەورەوی پێكردو ئاسمانەكانی بۆتەیكردو گەیاندییە ئاستێك هیچ مەخلوقێكی خوا جگە لە(محمد) پێی نەگەیشتووەو چەندین بەڵگەو نیشانەی‌زۆر گەورەی بینی. ﴿ لقد راى من ايات ربه الكبرى﴾(النجم: ١٨) لەوشەوەدا محمد(ﷺ) (سدرة المنتهى)ی بینی، ( البيت المعمور)ی بینی، بەهەشت‌و دۆزەخی بینی، حەزرەتی جبریلی بینی لەسەر شێوەی فریشتەیی خۆی كەشەش سەد باڵی هەبوو چونكە جگە لەم جارەو جارێكی‌تر لەسەرەتای وەحی‌دا هەموو جار حەزرەتی جبریل لەسەر شێوەی بەشەر دەهاتە خزمەتی پێغەمبەر(ﷺ) [1].

چیرۆكی شەورەوی پێغەمبەر(ﷺ) چەندین دەرسی لێ وەردەگیرێ لەساڵەكانی رابوردودا هەندێكمان باس كردووە ئەمرۆش پشت بەخوا. ئاماژە دەكەین بەچەند خاڵێكی تر لەو چیرۆكە گەورەو بەو دەرسانەیش لێی وەردەگیرێ.

یەكەم: لەم كۆچە پیرۆزەدا پێغەمبەر(ﷺ) شادبوو بەدیداری پێغەمبەران(عليهم الصلاة والسلام)لەئاسمانی یەكەمدا حەزرەتی ئادەمی بینی‌و سەلامی لێكرد ئەویش سەلامەكەی

---

[1] صفوة التفاسير ، سورة النجم.

سەندەوەو ئیقراری کرد بەپێغەمبەرایەتی محمد، لەئاسمانی دووەمدا یەحیاو زەکەریای بینی سەلامی لێکردن‌و وەلاَمیان دایەوەو بروایان هێنا بەبوونی بەپێغەمبەر، لەئاسمانی سێیەمدا (یوسف)ی بینی سەلامی لێکردو وەلاَمی دایەوەو شایەتی‌دا بەپێغەمبەرایەتی محمد لەئاسمانی چوارەمدا ئیدریسی بینی سەلامی لێکردو ئەویش وەلاَمی دایەوەو ئیقراری بۆ کرد لەئاسمانی پێنجەمدا هارونی دی بەهەمان شێوەبوو لەئاسمانی شەشەمدا حەزرەتی موسای دی سەلامی لێکردو وەلاَمی سەندەوەو بریاری پێغەمبەرایەتی بۆدا، لەئاسمانی حەوتەم دا باوکی پێغەمبەر ئیبراهیم ی بینی دوای ئەمانە بەرزکرایەوە بۆ (سدرة المنتهى) و ئەوشوێنانەی بەس خوا دەیزانی)[1].

گەورەترین دەرس لەم خاڵە وەربیگرین ئەو پەیوەندییە پتەوەیە لەنێوان هەموو پێغەمبەراندا(علیهم الصلاة والسلام) کەسەرچاوەی هەموویان یەکێکەو بەیەك مەبەست هاتوون: ﴿ ولقد بعثنا في كل امة رسولا ان اعبدوا الله واجتنبوا الطاغوت فمنهم من هدى الله ومنهم من حقت عليه الضلالة فسيروا في الارض فانظروا كيف كان عاقبة المكذبين ﴾ (النحل: ٣٦) .

واتە: ئێمە لەهەموو ئومەتێکدا پێغەمبەرێکمان بۆ ناردون و فەرمان مان پێداون لەسەر زاری ئەو پێغەمبەرانە کە تەنها خواپەرستن‌و، (طاغوت) واتە: بت‌و بەشەرمەپەرستن، هەندێکیان خوا هیدایەتی داون‌و هەندێکیشیان گومڕایی چەقیوە لەملیانداو رێگای کوفریان گرتووە، دەی ئێوەیش بڕۆن بەسەر زەویداو بەچاوی پەندەوە وردبنەوە لەپاشە ڕۆژی بێباوەڕان.

ئابەم شێوەیە پەیامی پێغەمبەران(علیهم الصلاة والسلام) یادی ئادەمیزاد دەخەنەوە تەنها رێگای(توحید) راستی‌یە جگەلەو هەموو بت پەرستی‌یە باناوەکانیشی بەگوێرەی زەمان بگۆڕێن‌و بەرگی ئازادی‌و پێشکەوتن خوازی لەبەربکەن.

خاڵی دووەم: پێغەمبەر(ﷺ) لەم کۆچەیدا چەند تاقمێکی دی لەئوممەتی خۆی کەهەندێکیان لەخۆشی بەهەشتا بوون، وەهەندێ تریان لەسزادا دەتلانەوە:

کۆمەڵێکی دی زەرعیان دەچاند لەرۆژێکداو رۆژی‌تر دەیاندوریەوە هەرکات دەیاندوریەوە وەك خۆی لێ دەهاتەوە پرسی لەجبریل ئەمانە کێن؟ فەرموی: ئەمانە ئەوانەن لەپێناوی خوا غەزایان کردووە خوا چاکەکانیان بۆ حەوت سەد قات دەکاتەوە . خوایە بمانگێرە لەوانە(ئامین) .

کۆمەڵێکی تری بینی سەریان بەبەرد پان دەکرایەوە، دیسان وەك خۆی لێدەهاتەوەو پان دەکرایەوەبێ ئەوەی مۆڵەتیان بدرێ، پرسی ئەمانە کێن؟ جبریل فەرموی: ئەمانە ئەوانەن کەسەریان لەئاستی نوێژە فەرزەکاندا قورس‌و گران بوو.

[1] الرحيق المختوم : ١٢٤ ، ١٢٥ .

کۆمەڵێکی تری دی گۆشتێکی کولاوی خاوێن لەمەنجەڵێکدا لەبەردەستیاندابوو، لەگەڵ گۆشتێکی نەکولاوی پیسی بۆگەن، کەچی ئەوان لەنەکولاوە پیسەکەیان دەخواردو، وازیان لەکولاوە خاوێنەکە دەهێنا، پرسی ئەمانە کێن؟ فەرموی: ئەمە پیاوێکە لەئوممەتی تۆ ژنێکی حەلاڵی خاوێنی هەبوو نەدەچوو بەلایدا، کەچی لەدامێنی ئافرەتێکی دامێن پیسی چەپەڵدا شەو دەمایەوە تابەیانی، هەروەها ئەو ئافرەتەیە کەوازی لەمێردی حەلاڵی خۆی دەهێنا، لەلای پیاوێکی چەپەڵ شەوی رۆژ دەکردەوە.

پیاوێ تری بینی کۆڵێ داری خڕکردبوو نەیدەتوانی هەڵی بگرێت کەچی هی تریشی دەخستە سەری پرسی ئەمە کێیە؟ جبریل فەرموی: ئەمەپیاوێکی ئوممەتی تۆیە سپاردەی زۆری خەڵکی لایە بۆی ناپارێزرێ کەچی دەیەوێ هی تریش بخاتەسەری.

کۆمەڵێکی تری بینی لێوو زمانیان بەمەقەستی ئاسن دەقرتێنران، هەرکات دەقرتێنرا وەك خۆی چاك دەبوویەوە بەبێ مۆڵەت، پرسی ئەمانە کێن؟ جبریل فەرموی: ئەمانە خەتیبەکانی فیتنەن.

پاشان هاتە لای کونێکی زۆر بچووك گایەکی زەبەلاحی لێدەهاتەدەرەوە، دواتر هەوڵی دەدا بگەڕێتەوە کونەکەی خۆی، نەیئەتوانی وتی: ئەمە چی‌یە ئەی جبریل؟ فەرموی: ئەمە پیاوێکە قسەیەکی خراپ‌و شەڕ ئامێز دەکات دواتر لێی پەشیمان دەبێتەوەو نایشتوانێ قسەکەی بگێرێتەوە. وە هەندێ شتی تریش کەدەرفەتمان نیە باسی بکەین.

## گەورەترین دەرس لەم وێنانە وەربیگرین ئەمەیە :

پێغەمبەری خوا لەم کۆچەدا خۆی حاڵی چەند گروهێکی ئوممەتی خۆی بینیوە وەترساندونی لەرپاشەرۆژە سزادارەی چاوەرێ هەندێك دەکات بەتایبەتی:

١ ـ ئەوانەی لاشەگرانن لەکاتی نوێژەکانیاندا چونکە نوێژ نیشانەی ئیمانە، نوێژ زۆر گەورەیە بۆیە لەم کۆچە گەورەدا فەرزکرا، هەرکەس نوێژی نەبوو دینی نیە.

٢ ـ داوێن پیسی رەوشتی ئوممەتی محمد نیە چونکە خێزان دەروخێنێ، ئابرو دەتکێنێ، سنووری خوا دەشکێنێ : دین‌و ئاین لەبن دێنێ، وەك پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێ: ( لا يزني الزاني حين يزني وهو مؤمن )واتە: زیناکەر لەوکاتەدا زینادەکات باوەری نامێنێ.

٣ ـ ئەمانەت زۆر گرانە کاربەدەستی‌و رابەری گەورەترین سپاردەیە لەملی خاوەنەکانیاندا، کەچی میللەتی ئەمڕۆ بەپلەی بچووك قەناعەتی نەماوە هالەهەوڵی پلەی بەرزتردا بێ‌ئەوەی بیری لای ئەوەبێت تا پلەی بەرزتر بێت کۆڵی گرانتر دەبێ‌و، تا ئێستایش هیچ خزمەتێکی بەو خەڵکە رەش‌و رووتە نەکردووە.

٤ ـ (خطباء الفتنة) ئەو وتاربێژانەن کەوتاری ناهەق دەدەن لەفەتواو وتارەکانیاندا مەبەستیان ـزامەندی خوانەبووە، بەڵکو هەمیشە لەهەولی رازیکردنی ئەمو ئەودا بوون، بیریان لای حوانەبووە، بەگوێرەی رۆژگار فتوایان تاشیوە، ئەوانەن سزایان لێوو زمان قرتاندنی هەمیشەیی‌یە خوا پەنامان بدات.

٥ ـ کەسانێك کەبێ ترس‌و لەرز زمانیان سوڕ داوەو قسەی فاحیشەیان کردووە ئاگری شەڕو ـژاوەیان خۆش کردووە ئەوانەیش سزایەکی زۆر سەخت چاوەڕوانیان دەکات . خوایە دڵ‌و ـمان‌و کردەوەمان پاك بکەیتەوە بەراستی رومان بکەرە بارەگای خۆت!.

## ٤ ـ پێشوازی رەمەزان

پیرۆزبایی ڕەمەزانی ئەمساڵ دەکەم لەخۆم‌و جەنابتان‌و سەرجەم جیهانی ئیسلامی، یاخوا ڕەمەزانێکی پڕ خێرو خۆشی‌و تەقواو عیبادەت بێت.

مرحبا مرحبا یاشهر رمضان مرحباً مرحباً یاشهر الخیر والبرکة والتقوی والاحسان مرحبا مرحبا یاشهر التهلیل والتسبیح وتلاوة القران مرحباً.

بەسە بۆ وەسف‌و سەنای تۆ کەخوای گەورە لەقورئاندا باسی فەرمووی: ﴿ شهر رمضان الذي انزل فيه القران هدى للناس وبينات من الهدى والفرقان فمن شهد منكم الشهر فليصمه ...﴾ (البقرة: ١٨٣) واتە:ڕەمەزانێکی ئەوتۆ کەقورئانی تیا هاتۆتە خوار بۆ هیدایەت دانی ئادەمیزادەکان وەچەندین بەڵگەی روونە بۆ رێنمایی‌و جیاکردنەوەی راست‌و ناڕاست، هەرکەس لەئێوە مانگی‌نوێی ڕەمەزانی بینی بابەرۆژووبێت ...هتد).

جامانگێك خوای گەورە وەسفی کردبێت بەئێمە وەسف ناکرێ.

برا بەڕێزەکان خوشکە ئازیزەکان ! لەمانگی ڕەمەزاندا زۆر شت بەیادی موسڵماندا دێت، ڕەمەزان مانگی تیلاوەتی قورئانە، ڕەمەزان مانگی خێرو چاکەخوازی‌یە، ڕەمەزان مانگی تەوبەو پەشیمانی‌یە، بۆیە ئێمەش وتاری ئەمرۆمان بۆ ئەم باسەی ئەخیرمان تەرخان دەکەین خوای گەورە لەقورئاندا دەفەرموێ: ﴿ قل ياعبادي الذين اسرفوا على انفسهم لا تقنطوا من رحمة الله ان الله يغفر الذنوب جميعاً انه هو الغفور الرحيم ﴾ واتە: تۆ پێیان بڵێ: ئەی بەندەکانی من کەستەمتان لەخۆتان کردووە بەهۆی لەسنوور لادانتانەوە نائومێد مەبن لەبەزەیی خوا، خوالەهەموو تاوانەکانتان دەبورێ خوا زۆر لێبوردەو بەبەزەیی‌یە).

(ابن مسعود) دەفەرموێ: (ئەم ئایەتە ڕجا بەخشترین ئایەتە لەقورئاندا بۆیە جێگای دڵخۆشی‌یە بۆ ئێمەیش‌و دەرگایەکی هەمیشە وازە بۆ ئەوانەی بیانەوێ چرای تەوبە هەڵکەن‌و لەو دەرگاوە بچنە ژوورەوە بۆ بارەگای بەزەیی خوا).

ئەوەیش کەزیاتر دڵخۆشمان دەکات ئەوەیە تەوبەی هەموو کەس وەردەگیرێ گەنج بێت یان پیر، دەوڵەمەند بێت یان فەقیر، بەبێ جیاوازی هەتا کاتی سەرەمەرگ، وەك پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێ: ( ان الله عزوجل يقبل توبة العبد مالم يُغر غر) (رواه الترمذي وقال: حديث حسن)[1].
واتە: خوا تەوبەی بەندە وەردەگرێ بەمەرجێ نەکەوتبێتە حاڵی غەرغەرەوە).

بەڵام لەبیرمان نەچێ ئەو فراوانی سۆزو بەزەیی خوا ئەوە ناگەیەنێت ئیتر ئێمە پشتوێنی گوناهی لێبکەینەوەو دڵمان پاڵ بداتەوە بڵێین بەئارەزووی دڵی خۆمان دنیا ویستی بکەین تاکاتی پیریمان ئەو کاتە تەوبە دەکەین، چونکە وەك وتراوە: ( دیار غەیبو ئەجەل غەیب) کاروانی ئەجەل ئەوەندە کوتوپڕە خۆمان نازانین لەکوێو کەیدا یەخەمان دەگرێ، بۆیە واجبە تەوبە دوانەخەین، هەموو رۆژێ بەیانی وابزانین تەنها ئەو رۆژە تەمەنمان هەیە بەڵکو ڕەنگە رۆژەکەش تەواو نەکەینو هەموو لەحزەیەك دەگونجێ ئاخری ژیانمان بێت بۆیە تەوبەکردن یەکێکە لەوپێنج شتەی کەدەبێ پەلەی تێدا بکەین: (کچ بەشودان، نانی میوان، بردنی جەنازە بۆ قەبران، کردنی نوێژە فەرزەکان، تەوبە لەهەموو گوناهەکان).

تەوبەی کاتی دەسەڵاتو گەنجێتیو لەش ساغی زۆر گەورەترە لەتەوبەی کاتی نەخۆشیو داماویو ناچاری وەك پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێ: ( ان الله يحب الشاب التائب) ( اخرجه ابن ابي الدنيا)[2] واتە: (خوا گەنجی تەوبەکاری خۆش دەوێ).

دەگێڕنەوە کۆمەڵێك چوونە عەیادەی (بشر الحافی) کەنەخۆش بوو، وتیان: بڕیاری چیت داوە؟ فەرمووی: بڕیارم داوە ئەگەر چاك بوومەوە تەوبە بکەم، وتیان ئەی ئێستا بۆچی تەوبەناکەیت؟ فەرموی: ئەی نەتان زانیوە پادشاکان داوای لێبوردن وەرناگرن لەکەسێ کوتو زنجیرکرابێ، ئەمەیش نموونەی کەسێکە لەنەخۆشیدا تەوبە بکات)[3].

هەروەها دەگێڕنەوە پیاوێك هەمیشە سەرخۆش بووە ، شەوێك بەوحاڵەوە خەوی لێکەوت لەخەودا پێیان وت:

جدَّ بك الامر ابا عمرو
وانت معكوف على الخمـر
تشرب صهباء صراحية
سال بك السيل وانتَ لاتدري

[1] رياض الصالحين/ باب التوبة.
[2] لطائف المعارف ابن رجب الحنبلي: ٥٨٨.
[3] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

واتە: وا کۆسپی گەورە یەخەی گرتی ئەی(ابوعمرو) هێشتا تۆگیرۆدەی شەرابیو پاڵفتە ەخۆیتەوە، لافاو بردیتی کەچی تۆ بەخۆت نازانی ! بەدەم ئەم خەوەوە راپەڕی خەوەکەی گێڕایەوە بۆ هەندێ لەوانەی لەدەوری بوون، بەلاّم شەراب سەری قورس کردبوو، خەوی پیاکەوتەوە تا بەرەبەیان بەکوتو پڕی گیانی دەرچوو فریای تەوبەنەکەوت[1] .

پەشیمانی قیامەتو پاش مردن زۆر سەختە چونکە کاتی پەشیمانی نییە، پەشیمانی لەوێ ئاهو ئازار زیاتر دەکات، بۆیە پێویستە تازووە، تاکات بەسەر نەچووە ، لێرە پەشیمان ببینەوە، بەڵکو فریای شتێ بکەوین، فریای قەرەبووی رابردوو بکەوین، ئەوەیش بزانین هەتا لەم دنیا زووتر پەشیمان بینەوەو کردەوەی خێرمان زۆرتر بێت پەشیمانییەکەی ئەوێ سوکتر دەبێ، وەك پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێ: ( ما من أحد يموت الا ندم قالوا وما ندامته، قال ان كان مُحسناً ندم ان لايكون ازداد، وان كان مسيئاً ندم أن لا يكون استعتب )اخرجه الترمذي مرفوعاً واتە: هیچ کەس نییە کەبمرێ ئیللا پەشیمان دەبێتەوە، وتیان: پەشیمانییەکەی چییە؟ فەرمووی: ئەگەر چاکە کاربوو لەوەپەشیمانە بۆ چ زیاتر چاکەی نەکرد، وە ئەگەر خراپە کاربوو لەوە پەشیمانە بۆ چ تەوبەی نەکردو لەژیندا لۆمەی خۆی نەکرد).

بەڵێ ئەوپەڕی ئاواتی مردوان لەگۆڕدا ئەوەیە: یەك سەعات ژیانیان بدرێتەوە بۆئەوەی تەوبەو کردەوەی چاکی تیا بکەن کەچی بەداخەوە خەڵکی دنیا تەمەنیان بەزایە دەڕوات لەشتی پڕوپووچو بێسوودو بەڵکو زیانبەخشیشدا بێئاگان لەمردن، وەك شاعیرێك دەفەرموێ:

| | |
|---|---|
| لوقيل للقوم ماٌمناكم طلبوا | حيـــــــاة يوم ليتوبوا فاعلم |
| ويحك يـانفـــس الاتيقّظ | ينفع قبـــل ان تـــزل قدمي |
| مضى الزمان في توانٍ وهوى | فاستدركي ماقد بقى واغتنمي[2] |

واتە: ئەگەر بوترێ بەوکەسانەی لەگۆڕدان ئاواتتان چییە؟ داوا دەکەن یەك رۆژ ژیان بۆئەوەی تەوبەی تیا بکەن، دەی کەوابوو تۆش بزانەو پەند وەربگرە. لەناوچوون، بۆ تۆ ئەی نەفس بۆچ وریا نابیتەوە وریا بوونەوەیەك سوودی هەبێ پێش ئەوەی پێم بخلیسکێ بەرەو مردن، کاتو زەمان هەمووی چوو لەتەمبەڵی ئارەزوودا، خۆکەوە فریای ئەم چەند رۆژە بکەوە کەماوە بەهەل بزانە تا ئەمیش نەچووە.

بەم شێوەیە تەوبەو ئاخر خێری گەورەترین بەشە خوا بەهەرکەسێکی بدات وەکەس بەکردەوەی چاکەی خۆی بوغرا نەبێت بەڵکو هەمیشە دوعا بکات خوا ئاخری بەتەوبەو چاکە بهێنێ، بۆیە لەفەرموودەیەکدا کەئیمامی ئەحمەد ریوایەتی کردووە هاتووە: ( اذا أراد الله بعبد

---

[1] لطائف المعارف : ٥٧٦.

[2] سەرچاوەی پێشوو/ ٥٧٧.

خيراً عسله قالوا: وما عسله؟ قال: يوفقه لعمل صالح ثم يقبضه عليه )واته: ئەگەر خوا ويستى چاكەی بەبەندەيەكی هەبوو شيرينی دەكات‌و، دەيكات بەهەنگوين، وتيان: چۆن دەبیٚ بەهەنگوين؟ فەرمووی: رێسازی بۆ دەكات بۆ كردەوەيەكی چاك‌و لەپاشان لەسەر ئەوكردەوە گيانی دەكێشیٚ).

خوايە ئاخرمان بەخێر بگێرە، بمان پارێزە لەشەڕی شەيتان، بەڵای ناگەهان، فيتنەی ئاخر زەمان !

## ٥ـ ئازادكردنی مەككە(١) رەمەزانی /١٤٢٢ك

وتاربێژەكان واراهاتووين هەمووساڵێك لەناوەڕاستی رەمەزاندا باسێكی غەزای بەدر دەكەين. بەڵام رووداوی ئازادكردنی مەككە(فتح مكە) كەكەمتر نيە لەهەندیٚ رويەوە لە(بدر) پشت گویٚ خراوەو باسی لێوە ناكرێت، كە ئەويش هەر لەمانگی رەمەزانی پيرۆزداو لەبەشی دووەم‌و سێيەمی ئەم مانگەدا بووە، بۆيە دەمەویٚ وتاری ئەمجارەو جاری داهاتوويشمان لەسەر ئەو رووداوە مێژوويی‌يە بێت پشت بەخوا.

هەروەك عادەتی جارانمان سەرەتای باسەكە بەم ئايەتە پيرۆزە دەكەينەوە: ﴿ انا فتحنا لك فتحاً مبينا ليغفر لك الله ماتقدم من ذنبك وما تاخر ويُتم نعمته عليك ويهديك صراطاً مستقيما ، ويَنصُرَكَ اللهُ نصراً عزيزا ﴾ الفتح/ ١ ،٢.

واتە: ئەی محمد ئێمە سەركەوتن‌و ئازادكردنێكی گەورەمان بەخشيوە بەتۆ كەروون‌و ئاشكرايە ئەويش ئازادكردنی مەككەی پيرۆزە، بۆئەوەی خوا لەرابووردوو داهاتووی گوناهەكانت ببورێ‌و نازو نيعمەتی خۆيت بۆ تەواو بكات‌و، رێگای راست‌و دروستت پيشان بدات‌و سەركەوتنێكی بەرزو بڵندت پیٚ ببەخشێت .

ئەم ئايەتە پيرۆزە لەدوای گەڕانەوەی پێغەمبەر(ﷺ) لەپەيمانی(حديبيە) نازلٚ بوو واتا نزيكی دووساڵ پێش ئازادكردنی مەككە بەڵام بەصيغەی رابوردوو دەفەرمویٚ: ( انا فتحنا) واتە: ئێمە ئازادكردن‌و رێكردنەوەمان بۆ مەككە بەخشيوە بەتۆ، ئەمەيش لەبەرئەوەيە فەرموودەی خوا ئەوەندە راست‌و بەجیٚيە ئەو بەڵێنەيشی كەهێشتاا نەبووە، وەك ئەوە وايە بووبێت، وەك لەزۆر شوێنی تری قورئاندا ئەم راستی‌يە دەردەكەویٚ.

بەڵیٚ رەمەزان وەنەبیٚ تەنها مانگی ئازادكردن‌و رێكردنەوەی مەككەبێت و بەس، بەڵكو مانگی چەندين قارەمانێتی‌و سەركەوتنی موسڵمانانە بەدرێژايی مێژووی ئەم دينە پيرۆزە، ( رەمەزان مانگی غەزای بەدرە كەموسوڵمانان گەورەترين سەركەوتنيان بەدەست هێناتيايدا، لەساڵی دووی كۆچيدا)

رەمەزان مانگی گەڕانەوەی پێغەمبەرە(ﷺ) لەغەزای تەبوك کەنیوە دوورگەی عەرەبی بەگشتی ملکەچی ئیسلام بوون لەساڵی نۆیەمی کۆچیدا .

رەمەزان مانگی ئازادکردنی وڵاتی ئەندەلووسە لەسەردەستی تاریقی کوری زیاد لەساڵی(٣٦١)ی کۆچیدا.

رەمەزان مانگی سەرکەوتنی موسڵمانانە بەسەر داگیرکەرانی تەتاردا لە(عين جالوت) لەساڵی ٦٥٨ك)[1].

رەمەزان مانگی خۆگری‌و زاڵ بوونە بەسەر هەواو ئارەزوو سەربازەکانی شەیتاندا ئیتر ئایا لەناوەوەی دەروونی موسڵماندا خۆیان حەشاردابێت وەك چاوچنۆکی‌و حەسوودی‌و کینەبەری‌و ...هتد ؛ یان لەدەرەوە خۆیان لەکەمین گرتبێ وەك دوشمنە دەرەکییەکان.

رەمەزان مانگێکە سەرەتاکەی رەحمەتە، ناوەراسەکەی لێبوردنە، کۆتاکەیشی ئازادکردنە لەئاگری دۆزەخ.

## هۆکاری ئازادکردنی مەککەیش بەم شێوەبوو:

خاڵێك لەخاڵەکانی پەیمانی حودەیبییە ئەوەبوو هەرکەس دەیەوێ بچێتە پەیمانی محمەد بۆی هەیە، هەرکەسێش دەیەوێ بچێتە پەیمانی قورەیشەوە بۆی هەیە، لەسەر ئەم بناغەیە (بنوبکر) چوونە پەیمانی قورەیشیەکانەوە، هۆزی خوزاعەیش چوونە پەیمانی پێغەمبەری خواوە(ﷺ) ، ئەم دووهۆزەیش پێشتر کوشت‌و برلەنێوانیاندا هەبوو، بۆیە لەماوەی ئاشتیدا(بنوبکر) ویستیان هەل بقۆزنەوەو تۆڵەی کۆنیان لەخوزاعە بکەنەوە، لەکاتێکدا ئەو هۆزە هەواریان هەڵدابوو لەسەر ئاوێك (بنوبکر) غافڵ گیریان کردن‌و لەتاریکایی شەودا(٢٠) پیاویان لێکوشتن قورەیشیەکانیش بەچەك‌و بەپیاویش یارمەتیان دان بەنهێنی، بۆیە دەس بەدەس(عمرو)ی کوری سالمی خوزاعی خۆی گەیاندە پێغەمبەر(ﷺ) لەمەدینەو هەواڵەکەی پێگەیاند کەوا قورەیشو (بنوبکر) پەیمانیان شکاندووەو داوای یارمەتی لێکرد، پێغەمبەریش(ﷺ) فەرمووی: ( لانُصِرت ان لم انصر بني كعب) واتە: سەرنەکەوم گەر بەهاواری (بنی کعب)ەوە نەچم و کۆمەکیان نەکەم[2] .

لەوێشەوە قورەیش زانیان هەڵەیان کردووە بۆیە زوو بەزوو (ابوسفیان)یان نارد بۆ مەدینە تا پەیمان نوێ بکاتەوە، ترسان لەوەی خوزاعە هەواڵەکەیان گەیاندبێ، کاتێ گەیشتنە مەدینە چووە ماڵی پێغەمبەر(ﷺ) ویستی لەسەر جێگاکەی دابنیشێ (ام حبيبە)ی کچی کەخێزانی پێغەمبەربوو

---

[1] منهل المؤمنين ومورد الخطباء/ ١٦٧.

[2] الرحيق المختوم/ ٣٦٢ ، ٣٦٣.

جێگاکەی پێچایەوە، وتی: رۆڵە منت لا خراپ بوو بۆ ئەو جێگایە یان جێگاکەت بەخراپ زانی بۆمن؟

وتی: ئەوە جێگای پێغەمبەری خوایە( تۆیش پیاوێکی بت پەرستی پیسی نابێ دانیشی لەسەری! وتی: رۆڵە دوای من تووشی خراپە هاتویت پاش ئەوە چوو بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) لەوبارەوە قسەی لەگەڵ کرد، وەلأمێکی نەدایەوە دڵی پێی خۆش بێت، ئەمجا چوو بۆ لای (ابوبکر) ویستی تکای بۆ بکات، وتی: نایکەم، ئەمجا چوو بۆ لای (عمر) تکای بۆ بکات، وتی: من تکاتان بۆ بکەم لای پێغەمبەر(ﷺ) سوێند بەخوا گەر هیچم دەست نەکەوێ مێرووولەوردە نەبێت دەیکەم بەگژتاندا، دوای ئەوان چوو بۆ لای (علی وفاطمة) هیچی لەوانیش نەبەستەوە، بۆیە دنیا لەبەرچاوی تاریك بوو بەدەستی بەتاڵ و هەتاڵ گەڕایەوە بۆ مەککە[1].

لەم لایشەوە پێغەمبەر(ﷺ) هەواڵی نارد بۆ ئەو لادێ نشینانەی دەورو بەری مەدینە: ( هەرکەس باوەری بەخواو رۆژی دوایی هەیە بارەمەزان بگاتە مەدینە) پێغەمبەر(ﷺ) ئەم هەواڵەی لەقورەیش شاردەوەو دوعای کرد ( اللهم خذ العیون والاخبار عن قریش حتی نبغتها في بلادها) واتە: ئەی خوایە چاوو راو لەقورەیش بگرە هەواڵی ئەم کارە نەزانن هەتا غەفڵەت گیریان دەکەین لەولأتی خۆیاندا)[2].

لەمیانەی ئەم نهێنی کاریەدا (حاطب)ی کوری (ابی بلتعة) نامەیەك دەنوسێ بۆ قورەیش و ئاگاداریان دەکات، پێغەمبەریش (ﷺ) (علی و مقدادو زبیر) دەنێرێ و دەفەرموێ: برۆن تا دەگەنە (روضة خاخ) ئافرەتێکتان توش دێت نامەیەکی پێیە لێی وەرگرن، علی دەفەرموێ: رۆیشتین لەشوێنی دیاریکراودا ئافرەتەکەمان دی وتمان: نامەکە دەربهێنە، وتی: نامەم لانیە وتمان: نامەکە دەردەهێنی یان جلەکانت دەگەڕێین، نامەکەی دەرهێنا لەناو پەلکیدابوو، هێنامانەوە بۆ پێغەمبەر(ﷺ) (حاطب)ی بانگ کردو فەرموی: (حاطب)ئەمە چییە؟ حاطب وتی: یارسول الله پەلەم لێمەکە من کەسێکم خۆم هەڵواسیوە بەقورەیشەوە لەوان نیم، ئەوانەی لەگەڵ تۆن لەکۆچکەران هەموو کەسیان هەیە لەمەککە ماڵ و منداڵیان دەپارێزن، بەلأم من ئەوەم نیە، من ئەم کارەم نەکردووە لەبەر پاشگەز بوونەوەم لەم دینە، یان رازی بوونم بەکوفر دوای موسڵمان بوون، پێغەمبەر(ﷺ) فەرموی راست دەکات، (عمر) وتی: یارسول الله لێم گەرێ بابدەم لەگەردنی ئەم دووڕووە، فەرمووی: (حاطب) ئامادەی بەدربووە، تۆ چووزانی رەنگە خوا بەچاوی بەزەیی تەماشای بەدرییەکانی کردبێ و پێی فەرموون، چی دەکەن بیکەن من لەئێوە بوردوم دوای ئەمە خوای گەورە ئەم ئایەتانەی نازڵ کرد.

---

[1] الرحیق المختوم /٣٦٤.

[2] نور الیقین / ٢٠٧.

﴿ يا ايها الذين امنوا لا تتخذوا عدوي وعدوكم أولياء تلقون اليهم بالمودة، وقدكفروا بما جاءكم من الحق يخرجون الرسول واياكم ... ﴾ هەتا دەگاتە ﴿ فقد ضل سواء لسبيل﴾[1]. الممتحنة:١

واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە دوشمنەکانی منو خۆتان مەگرن بەدۆستو باوەڕو خۆشەویستیان بۆ دەربڕن، لەحاڵێکدا ئەوان بێ باوەڕن بەو حەقەی خوا بۆ ئێوەی ناردووە، پێغەمبەر دەردەکەن لەمەدینە لەگەڵ ئێوەیشدا ، تەنها لەبەرئەوەی بڕواتان بەخوای پەروەردگارتان هێناوە...هتد

پێغەمبەر(ﷺ) لەرۆژی (١٠)ی ڕەمەزانی ساڵی هەشتی کۆچی لەمەدینە دەرچوو(کلثوم)ی کوری (حسین) ی کردە جێ نشین لەسەر مەدینە، هەواڵی نارد بۆ لادێ نشینەکان هەموویێکەوە لە(مر الظهران) کۆببنەوە سوپای ئیسلام ژمارەیان گەیشتە دەهەزار کەس، هێشتا قورەیش هەواڵیان دەس نەکەوتبوو بەڵام دەترسان لەبەرئەوەی هەوڵەکانی (ابوسفیان) بۆ نوێکردنەوەی پەیمانی ئاشتی سەری نەگرتبوو، بۆیە(ابوسفیان)و (حکیم)ی کوری (حزام)و (بدیل)ی کوری (ورقاء) یان ناردبوو بۆ هەواڵی ئەو ڕێگاو بانە، کاتێ گەیشتنە نزیکی (مر الظهران) ئاگرێکی زۆریان بینی . چونکە پێغەمبەر( ﷺ) فەرمانی دابوو بەسوپاکەی هەریەك ئاگرێك بکەنەوە . لەکاتێکدا باسو خواستیان لەم ئاگرە بوو ئایا ئەمانەکێنو چین؟ کاتێ بەخۆیان زانی کەوتنە ئابڵوقەی کەمینی پاسەوانەکانی پێغەمبەر(ﷺ) دەسگیریان کردنو هێنانیان بۆ بەردەم پێغەمبەر(ﷺ) اوبوسفیان موسڵمان بوو [2].

پەڕاوەکانی (سیرة) ئەوەیان لێوەردەگیرێ (ابوسفیان) هەڵوێستەیەکی هەبوو لەموسڵمان بونیدا تەنانەت خاوەنی پەراوی (الرحیق المختوم) لەباسی موسڵمان بونیدا باس لەوەدەکات دوای بەدیل گرتنیشی شەوێك لای( عباس)ی مامی پێغەمبەر(ﷺ) دەمێنێ ئەو داڵدەی دەدات وە یەکسەر موسڵمان نابێت[3]., گومان لەوەشدا نیە ئەو شەوە عەباس کۆمەڵێ قسەی خێری بۆ دەکات ئیتر دوای ئەوە موسڵمان دەبێ ئەمجا عەباس دەڵێ: یارسول الله (ابو سفیان) پیاوێکە حەز بە سەرداریو شانازی دەکات کارێکی پێ بسپێرە، ئەویش دەفەرموێ: بەڵێ هەرکەس بچێتە ماڵی (ابوسفیان) خوێنی پارێزراوە هەرکەس بچێتە مزگەوت خوێنی پارێزراوە، هەرکەس لەماڵی خۆیدا دەرگا لەسەر خۆی دابخات خوێنی پارێزراوە، ئەمجا بەعەباسی فەرموو:(ابوسفیان) رابگرە لەتەنگەبەری دەربەندو شیوەکەدا باسوپای خوا ببینێ کاتێ تێدەپەڕن، عەباس دەڵێ: لەوشوێنەی

---

[1] البوطي، فقه السيرة/ ٣٩٠ ، ٣٩١.

[2] سەرچاوەی پێشوو .

[3] الرحيق المختوم/ ٣٦٨.

پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی پێدام رام گرت، هەتا هەموو تیرەکان یەك لەدوای یەك تێپەڕین هەریەك ئاڵای تایبەتی خۆی بەرزکردبووەوە، وە هەر تیرەیەك تێدەپەڕی (ابوسفیان) دەیپرسی، ئەمانە کێن؟ منیش وەڵامم دەدایەوە: ئەمانە تیرەی سەلیمن، یان کێن، ئەویش دەیوت: من چیمە بەسەر سەلیمەوە ...بەم شێوەیە هەتا پێغەمبەر(ﷺ) لەناو سوپای یاریدەدەران و کۆچکەراندا تێپەڕی تەنها چاویان بەدەرەوەبوو چونکە هەموگیانیان زریە پۆش بوو پرسی ئەمانە کێن؟ وتم: ئەمە پێغەمبەری خوا بوو (ﷺ) لەناو یاریدەدەران و کۆچکەراندا ابوسفیان وتی: هیچ کەس ناتوانێ بەرەنگاریی ئەمانە بکات، ئەمجا وتی: بەراستی موڵك و دەسەڵاتی برازاکەت ئەمڕۆ زۆر فراوان بووە! عەباس فەرمووی: ئەی (ابو سفیان) ئەوە پێغەمبەرایەتی‌یە ئەویش وتی کەوابوو شتێکی چاکە [1].

لەم وەستاندنەی (ابوسفیان) لەبەردەم ئەو سوپایەدا دوودەرسی گەورە هەیە بەکورتی ئاماژەی پێدەکەین:

یەکەم/ پێغەمبەر(ﷺ) دەیزانی باوەڕ بەتەواوی نەچەسپاوە لەدڵی (ابوسفیان) دا بۆیە حەزی کرد ئەو وەستانە بوەستێ بەڵکو دیتنی ئەو سوپاگەورەیە باوەڕی پتەوبکات و ، گەردو تۆزی نەفامی لەدەرونی بتەکێنێ و، زیاتر دڵنیابێت لەوەی کەمەککە ناتوانێ بچێت بەگژی ئەو سوپایەدا بۆئەوەی بەبێ جەنگ و خوێن رشتن ملکەچ بێن.

دووەم/ ئەو وەڵامە کورتەی عەباس فەرموی بەرانبەر ئەبوسفیان (انها النبوة) واتە: ئەمە پێغەمبەرایەتی‌یە دیسانەوە بۆ لابردنی هەندێ لەو گەردو تۆزی نەفامی‌یە بوو، چونکە ئەو تا ئەو کاتەیش بیری بەلای موڵك و سامان و دەسەڵاتی دنیاوەبوو، هەروەها ئەو وەڵامە کورتە گەورە ترین بەرپەرچە بەدرێژایی مێژوو بۆ ئەوانەی گومان وادەبەن هەوڵی پێغەمبەر(ﷺ) بۆ موڵك و پادشایەتی و پلەوپایەو ...هتد بووە[2].

هەر لەمیانەی ئەو وەستانەدا (سعدی)کوری (عبادة)بە ئەبوسوفیانی وتبوو: ( الیوم یوم الملحمة، الیوم تستحَلّ الکعبة) واتە: ئەمڕۆ رۆژی تێرژانە، ئەمڕۆ جەنگ لەکەعبەدا حەڵاڵ دەکرێت، هەواڵی ئەم قسەیە گەیشتەوە بەپێغەمبەر(ﷺ) زۆر پێی ناخۆش بوو بۆیە بەرپەرچی دایەوەو فەرموی: ( بل الیوم یوم الرحمة، الیوم یُعظم الله الکعبة) واتە: ئەمڕۆ رۆژی بەزەیی‌یە ئەمڕۆ خوا کەعبە بەرزو بڵند دەکات.

دوای ئەوە( ابوسفیان) زوو خۆی گەیاندەوە مەککە هاواری کرد: ( مَنْ دخل دار ابي سفیان فهو امن ، من دخل المسجد فهو امن ، من اغلق بابه فهو امن ) بەقورەیشیەکانی وت: محمد سوپایەکی

---

[1] فقه السیرة/ ۳۹۲.

[2] سەرچاوەی پێشوو/ ٤٠٤ ـ ٤٠٨.

ۆ هێناون تواناتان نیە بچن بەگژیدا پێغەمبەریش بەسوپاکەی ڕاگەیاندبوو، نابیٚ بجەنگن نابیٚ کەس بکوژن مەگەر ڕێگاتان پێبگرن، بەڵام چەند کەسێکی جیاکردەوە کەزۆر ئازاری پێغەمبەرو موسڵمانانیان دابوو فەرمووی: ئەمانە بکوژن لەهەرلایەکدا بوون بادەستیش بگرن بەپەردەکانی کەعبەوە، ئەوانەیش: ( عکرمە) ی کوری (ابو جهل) ، (هبار) ی کوری( اسود) (عبدالله) ی کوری سعد) ی کوری (ابی سرح) (مقیس)ی کوری (صبابە) و (هند) ی کچی (عتبە) دوکەنیزەك کەگۆرانییان دەوت بەجنێودان بەپێغەمبەر(ﷺ) ، وەچەند کەسی تریش.

پێغەمبەر (ﷺ) لەلای سەری مەککەوە چووە ناوشار، خالدو سوپاکەی لەلای خوارەوە، خالد تووشی بەرەنگاری هات، بۆیە ناچار جەنگا لەگەڵ کۆمەڵێك لەبیٚباوەڕان کە(عکرمە)ی کوری( ابوجهل) یان تیابوو (عکرمە) رایکردو ئەوانی تریش شکانو (٢٨) کەسیشیان کوژران، پێغەمبەر(ﷺ) چاوی لەبریسکەی شمشێرەکان بوو لەدوور پێی ناخۆش بوو، وتیان (خالد)ە ڕێیان لێگرت ئەویش جەنگا فەرموی: ( قضاء الله خیر) واتە: چی خوا بیکات چاکە.

(ابن اسحاق) و( حاکم) بۆمان دەگێڕنەوە: پێغەمبەر(ﷺ) کاتیٚ گەیشتە (ذي طوی) بەسەر ولاخەکەیەوە وەستاو ئەوەندە سەری دانەواند لەوانەبوو ریشی بدات لەلێوی زینەکە، ئەمەیش بۆ دەربڕینی ملکەچی بۆ خوا بەرانبەر بەو ڕێزە گەورەی کەلٚی گرت بە ئازادکردنی مەککە.

هەروەها بوخاری دەگێرێتەوە کەپێغەمبەر(ﷺ) لەڕۆژی ئازادکردنی مەککەدا سوورەی(فتح)ی دەخوێندەوە چەند جار دەیوتەوە، (راوی) فەرموودەکە (عبدالله)ی کوری ( معقل) دەڵیٚ: گەر خەڵك لێم کۆنەبونایەتەوە وەك ئەو دەموتەوە)[1].

پێغەمبەر(ﷺ) چووە ناو مەککەو ڕۆیی بەرەو کەعبە لەدەوروبەری کەعبەدا(٣٦٠) بت هەبوو بەدارەکەی دەستی یەك لەدوای یەك لیٚی دەدانو وردو خاشی دەکردنو دەیفەرموو: ( جاء الحق وزهق الباطل، جاء الحق ومايبدئ الباطل ومايعيد )واتە: راستیهاتو بەتاڵ نەما، راستی هاتو جارێکیتر بیری پووچو بەتاڵ ناگەڕێتەوە.

لەناو ماڵی کەعبەیشدا چەندین وێنەو پەیکەری بتەکانی تێدابوو فەرمانیدا دەریان بهێنن، چەند وێنەیەکی (ابراهیمو اسماعیل) یان دەرهێنا قوماریان بەدەستەوەبوو، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ( قاتلهم الله لقد علموا ماستقسما به قط) واتە: لەعنەتی خوا لە بیٚباوەڕان خۆیان دەزانن کە ئەم دوانە قەت قومار باز نەبوون). دوای ئەوەی کەعبە پاك کرایەوە چووە ناویو (الله اکبر) ی تیاکرد بەڵام نوێژی نەکرد دەرچوو.

ئەمجا فەرمانی دا بە(بلال) چووەسەر بانی کەعبەو بانگی فەرموو بۆنوێژو دەنگی(الله اکبر) لەدەمی بیلالەوە ئەو ناوەی پڕکرد ! ئەو بیلالەی کەچەندین جار قورەیشیەکان ئازاریان دەداو

---

[1] فقه السیرة/ ٣٩٣ ، ٣٩٤.

سەنگو بەردیان دەناو داوایـان لێدەکـرد پاشـگەزبێتەوە لەئیسـلامو بتـەکان بپەرسـتێ ئـەویش هـاواری دەکرد ( احد ، احد ...) ئەو بیلالـەی ملـهوڕەکانی قورەیـش پێیـان ڕەوا نـەدەبینی هـەر نزیکی کەعبە بکەوێ چونکە قولەرەش بوو وا ئەمڕۆ ئیسلام بەرزی دەکاتـەوەو دەچێتە سـەربانی کەعبە.

جا بالێرەدا بیلال جێ بهێڵین بانگی خۆی بفەرموێو پاش مـاوەی باسـەکە هـەڵدەگرین بـۆ هەفتەی داهاتوو (انشاء الله) .

خوایە تو ناوە جوانەکانی خۆت رۆژوو نوێژو تەراویح مان قوبولّ بفەرموویت، خوایە لەگوناهی خۆمانو دایکانو باوکانمان ببوری!

خوایە شیفای نەخۆشەکانمان بدەیت تایبەت ئەوانەی داوای دوعـای خێریـان کـردووە، خوایە هیدایەتی زاناو کاربەدەستەکان بدەیت بۆ خزمەتی کوردستانو موسوڵمانان...

## ئازادکردنی مەککە( ٢ )

الحمـد للـه ... بەئـەندازەی ئەوبارانـەی لـەم هەفتـەداباری، بەئـەندازەی هـەموو ئـەو بارانـەی بـەدرێژایی مێـژوو بـاریوە سـوپاس و سـتایش بـۆ خـوا، ئـەوەندەیش صـلاوات لـەدیاری پـاکی پێغەمبەرو یارو یاوەرانی بێت.

لەخوتبەی رابووردودا حەزرەتی(بیـلال)مـان بەجێهێشـت لەسـەربانی کەعبە بـانگی دەفـەرموو، دوای ئـەوەی پێغەمبـەر(ﷺ) بتـەکانی دەوری کـەعبەی شـکاند بەدارەکـەی دەسـتیو بتـەکانی ناوکەعبەشیان دەرهێناو فرێدران بەفەرمانی ئەو پێغەمبەرە(ﷺ).

بەڵێ وەك خۆی فـەرمووی لـەوەڵامی سـەعدی کوری عوبـادەدا: ( بل اليـوم يـوم الرحمـة، اليـوم يعظم الله الكعبة ) واتـە: ئـەمڕۆ رۆژی بەزەییـە ئـەمڕۆ خـوا کەعبـە بڵنـد دەکـات، خـوا کەعبـەی بەرزکردەوە چونکە بتی تیا نەما ئەمجا شایستەی ئەوەبوو دەنگی(الله اکبر) ی تیا بەرزبێتەوە.

پێغەمبـەری خـوا دەسـتی گـرت بەهـەردوو داری ئـەم بـەرو ئەوبـەری دەرگـای کەعبـەو خـەڵك لەدەوری گردبوون نەیاندەزانی چی‌یان بەرانبەر دەکات، ئەویش وتارێکی بۆدانو فەرمووی:

( لا اله الا الله وحده لاشريك له، صدق وعده، ونصر عبده، وهزم الاحزاب وحده، الا كل مـأثرة اودم أو مال يُدعى فهو تحت قدميّ هاتين، الا سدانة البيـت وسـقاية الحـاج ... يـا معشـر قريـش ان الله قد أذهب عنكم نخوة الجاهلية وتعظمها بالاباء، الناس من ادم وادم من تراب، وتلا قولـه تعـالى: (يا ايها الناس انا خلقناكم من ذكر وانثـى وجعلنـاكم شـعوباً وقبـائل لتعـارفوا ان اكرمكـم عنـد الله اتقاكم ، ثم قال يامعشر قريش ماترون اني فاعل بكم؟ قالوا: خيراً، اخ كريـم وابـن اخ كريـم، فقـال: اذهبوا فانتم الطلقاء).

واتە: هیچ خوایەك نیە جگە لەزاتی (الله) تاكو تەنهایە هاوەڵی نیە، بەڵێنەكەی خۆی بردەسەرو، بەندەی خۆی سەرخستو ، هەموو حیزبەكانی بەتەنها خۆی تێكشكاند، ئاگاداربن هەموو كەلەپووررو شانازی‌یەكی باووباپیران، یان ماڵ، یان خوێنێك، ئەمڕۆ داوا بكرێت هەمووی لەژێر ئەم دوو پێی من دایە، جگە لەزەیوانی كەعبەو ئاودێری حاجی‌یەكان ... ئەی كۆمەڵی قورەیش بەراستی خوائێوەی پاك كردەوە لەفیزی سەردەمی نەفامی‌و شانازی كردنیان بەباوو باپیرانیان، خەڵك هەموو لەئادەمن ئادەمیش لەگڵە، ئەمجا ئەم فەرموودەی خوای خوێندەوە ﴿ یا ایها الناس انا خلقناكم من ذكر وانثى ....الخ ﴾ .

واتە: ئەی ئادەمیزادەكان ئێمە ئێوەمان خوڵقاندووە لەنێرو لەمێ، ئێوەمان گێڕاوە بەچەند گەل‌و تیرەیەكی جیاواز بۆئەوەی یەكترناسی‌و خۆشەویستی دروست ببێت لەنێوانتاندا بەهۆی پەیوەندی‌كردنی هەركەس بەبنەماڵەی خۆیەوە، بەراستی بەرێزترین كەسیشتان لای خوا ئەو كەسەیە زۆرتر لەخواترس بێت).

ئەمجا فەرمووی: ئەی كۆمەڵی قورەیش بەرای ئێوە من چی دەكەم بەرانبەرتان؟ وتیان: برایەكی بەرێزو برازایەكی بەرێزی فەرمووی: بڕۆن ئێوە ئازادن.

ئێمە لەم وتارەی پێغەمبەردا(ﷺ) كەهەندێكیمان نووسی چەند دەرسێك وەردەگرین زۆر بەكورتی ئاماژەیان پێدەكەین:

١ ـ موسوڵمانان ئەگەر راست بكەن لەگەڵ خواو خۆگربن لەسەر ئەشكەنجەو ئازارێك كەلەپێناو دینی خوا تووشیان بێت، دڵنیابن رۆژێك دێت خواسەریان دەخات بەسەر هەموو ئەوانەی دژایەتیان كردوون وەك قورئانیش ئەم راستی‌یە روون دەكاتەوە: ﴿وجعلنا منهم ائمة یهدون بامرنا لما صبروا وكانوا بایاتنا یوقنون ﴾ السجدة: ٢٤.

واتە: ئێمە گێڕامان لەوان چەندین پێشەواو سەركردە رێنمایی خەڵكیان دەكرد بۆ فەرمان‌و رێبازی خوا لەكاتێكدا ئەوان خۆگربوون‌و بروای پتەویان بەبەڵگەو ئایەتەكانی ئێمە هەبوو.

٢ ـ كەس بۆی نیە فەخرو شانازی بكات بەباوباپیرانی‌یەوە، یان بەهۆزو عەشرەت‌و پلەوپایەوە، وتارەكەی پێغەمبەر(ﷺ) لەم بارەوە گەلێ روونەو ئاماژەی بەئایەتەكەیش كرد، مانای وایە ئەم وتارەی پێغەمبەر(ﷺ) باشترین تەفسیرە بۆ ئەو ئایەتەی قورئان‌و هەر تەئویلێكی‌تر بۆ ئەو ئایەتە بكرێت جێگای خۆی نیە.

٣ ـ لێبوردن لەكاتی دەسەڵاتدایە، كەسێ دەسەڵاتی نەبێ هەقی خۆی بسێنێ نایشتوانێ بەتەواوی عەفوو بنوێنێ، چونكە پێی دەڵێن: گەر بتتوانیایە تۆڵەت دەسەندەوە، ئازا ئەوكەسەیە لەكاتی دەسەڵاتدا لێبوردن بنوێنی بەرانبەر بەوكەسەی دەست درێژی كردوەتە سەری، وەك خوا دەفەرمووێ: ﴿ ولمن صبر وغفر ان ذلك لمن عزم الامور ﴾ الشورى: ٤٣ .

واتە: هەرکەس خۆبگرێت و لێبوردنی هەبێت لەبەرخوا بەرانبەر بەدەست درێژیکار بەراستی ئەوە کارێکی زۆر پەسەندو وەرگیراوە لای خوا. پێغەمبەریش(ﷺ) دەفەرموێ: (مازاد الله عبداً بعفو الا عزاً). واتە: هەر بەندەیەك لێبوردنی هەبێ خوا زیاتر بڵندو سەربەرزی دەکات.

دوای ئەمە پۆل پۆل خەڵك دەهاتن و دەچوونە ژێرسایەی ئاینی خواوەو شایەتمانیان دەهێناو پەیمانیان بەپێغەمبەر(ﷺ) دەدا وەك قورئان ئەم رووداوەگەورەمان بۆ دەگێرێتەوە: ﴿ اذا جاء نصر الله والفتح ورأیت الناس یدخلون في دین الله افواجاً فسبح بحمد ربك واستغفره انه كان تواباً ﴾.

واتە: هەرکات سەرکەوتنی خوایی و کردنەوەی مەککەت بۆهات و خەڵك پۆل پۆل دەچوونە ژێر سایەی دینی خواوە تۆیش زۆر تەسبیحاتی خوابکەو داوای لێبوردنی لێ بکە بەراستی خوا زۆر لێبوردەیە.

دوای تەواوبوونی پیاوان ئینجا ئافرەتان هاتن بەڵێن ببەستن و موسوڵمان بىن لەناو ئەو ئافرەتانەدا هیندی کچی عوتبەی تیابوو کەخێزانی ئەبوسوفیان بوو خۆی داپۆشیبوو تا پێغەمبەر(ﷺ) نەیناسێ لەبەرئەو کارە خراپەی کردی بەرانبەر(حەمزە) لەغەزای ئوحوددا، وەیەکێ بوو لەوانە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانیدابوو بەکوشتنیان.

کاتێ ئافرەتەکان کۆبوونەوە پێغەمبەر(ﷺ) لەسەر صەفا بوو (عمر) نەختێ لەخواری ئەوەوە وەستابوو، پێغەمبەری خودا(ﷺ) بەئافرەتەکانی فەرموو: (ابایعكن على ان لاتشركن بالله شيئاً ) واتە: بەڵێنتان لێوەردەگرم کەهاوەڵ بۆ خوا بڕیار نەدەن، (عمر)یش پەیمانەکەی لەئافرەتان وەردەگرت، ئەمجا فەرموی: (ولاتسرقن) واتە: دزی مەکەن هیند وتی: ئەبوسفیان پیاوێکی رژدە ئەگەر من هەندێ شتم لەماڵەکەی بردبێ، ئەبوسفیان خۆی ئامادەبوو وتی: ئەوەی بردوتە حەڵاڵت بێت، پێغەمبەر پێکەنی و هیندی ناسییەوە فەرمووی: تۆ هیندی؟ وتی: بەڵێ، لێم ببورە لەڕابردوو خوالێت ببورێ ئەی پێغەمبەری خوا.

ئەمجا فەرموی: ( زینامەکەن) هند وتی: ئایا ئافرەتی سەر بەست زینادەکات؟ ئەمجا فەرموی: ( منالەکانتان مەکوژن) هیند وتی: بەبچووکی بەخێومان کردن لەرۆژی (بەدردا) بەگەورەیی کوشتنتان (عمر) ئەوەندە پێکەنی تاکەوت بەپشتا پێغەمبەر(ﷺ) زەردەخەنەی کرد.

ئەمجا فەرموی: ( بوختان مەکەن) هیند وتی: بوختان شتێکی ناشیرینە، تۆیش فەرمانی چاکەو رەوشتی بەرزمان پێدەکەیت.

ئەمجا فەرموی: (لەفەرمانی چاکەی من دەرمەچن و یاخی مەبن).

لەکاتێکدا هیند گەڕایەوە بتەکەی خۆی شکاندو وتی: ئێمە بەتۆ خەڵەتابووین)[1].

---

[1] الرحیق المختوم: ل ٢٧٥ ، ٢٧٦.، فقه السیرة ل ٢٩٦.

دوای ئەوە پێغەمبەر(ﷺ) نۆزدە رۆژ لەمەککەدا مایەوە نوێژەکانی کورت دەکردەوە، لەو ماوەیەدا خەریکی رێنماییکردنی موسوڵمانان بوو، وە هەر لەو ماوەیەدا چەند سوپایەکی بچووکی نارد بۆ تێکدانی بتەکانی دەورو بەری مەککە:

١ ـ خالدو (٣٠) ئەسپ سواری نارد بۆ تێکدانی بتی(العزی) لە(نخلة)، ئەم بتە تایبەت بوو بەقورەیشو کینانەوە، گەورەترین بتیان بوو (بني شيبان) زەیوانی بوون خالد شکاندنی کاتێ گەڕایەوە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموی: هیچت دی؟ وتی: نەء، فەرمووی: کەوابوو نەترووخاندووە بگەڕێرەوە بیروخێنە) خالد گەڕایەوە شمشێرەکەی رووت کردبوو رقی هەستابوو، ئافرەتێکی رووتی رەشی قژبژ بۆی هاتە دەر زەیوانی بتەکە هاواری کرد لەئافرەتەکە خالد شمشێرەکەی لێدا کردی بەدوو پارچەوە، لەپاشان گەڕایەوەو هەواڵەکەی هێنا بۆ پێغەمبەر(ﷺ) ئەویش فەرمووی: بەڵێ ئەوە(عزی)بوو، ئیتر دانکەنی ئەوەبوو بپەرسترێ لەولاتی ئێوەدا بەهەتا هەتایی.

٢ ـ (عمرو)ی کوری(عاص)ی نارد بۆ تێکدانی بتی (سواع) کەتایبەت بوو بەهۆزی ( هذیل) ەوە لەناوچەی (رهـا) بوو کە (٣) میل لەمەککەوە دوورە شکاندنیو گەنجینەکەیشیان تێکدا هیچی تیانەبوو.

٣ ـ (سعد)ی کوری (زید الاشهلی) لەگەڵ (٢٠) سواردا نارد بۆ تێکدانی بتی( المناة) کەتایبەت بوو بە ئەوسو خەزرەجو غەسسانو چەند هۆزێکیتر کاتێ (سعد) رۆیشت بەرەو بتەکە ئافرەتێکی رەشی رووت بەرەو رووی هات دەیدا لەسنگی خۆی هاوار هاواری بوو، (سعد) لێیداو کوشتی ئەمجا بتەکەی روخاند هیچ لەگەنجینەکەیشیدا نەبوو[1].

بەم شێوەیە بت پەرستی لەمەککەو دەوروبەردا کۆتایی پێهات.

بەکۆتایی هاتنی دەوڵەتی بت پەرستی دوایین قەڵای قورەیشیەکان رووخاو موسوڵمانان دەسەلاتی سیاسیو ئاینی کەوتە دەستیان لەنیوە دوورگەی عەرەبیدا ئەوان بوون بەپێشەوای ئاینیو دنیایی جیهانی سەردەمی خۆیان، لەبەرئەوە دەتوانین بڵێین ئازادکردنی مەککە گەورەترین جەنگی ئیسلامەو فراوانترین ئازادکردنە چونکە عەرەبەکان بیروبڕوایان وەهابوو هەرکەس لەسەر راستی نەبێت ماڵی خواناکەوێتە دەستیان، وەماڵی خوا لەدەستی هەرکەسدابوو راستی لای ئەوە، وە عەرەبەکان ئەم بیروباوەڕەیان لا تۆکمە بوو بەتایبەتی دوای تێکشانی سوپای ئەبرەهە کەخوا تەفروتونای کردن بە ﴿ طیرا ابابیل ﴾[2].

---

[1] الرحيق المختوم : ل ٣٧٦ ، ٣٧٧.

[2] الرحيق المختوم/ ٣٧/٨.

ئێمەیش لەکۆتایی ئەم وتارەدا دەست هەڵبڕینو دوعا بکەین خوایە لەبەرخاتری ناوە جوانەکانت دەسەڵاتی سیاسیو ئاینی بگێڕیتەوە بۆ موسوڵمانان، خوایە سەریان خەیت بەسەر دوژمنانیاندا !

خوایە شیفای نەخۆشەکانمان بدەیت ...هتد .

## ٦ ـ ماڵئاوایی ڕەمەزان

الوداع الوداع يا شهر رمضان الوداع ... الخ

خوا حافیز ئەی مانگی سۆزو بەزەییو لێبوردن لەتاوانباران ... خوا حافیز ئەی مانگی خێرخواهانو و قورئان خوێنانو دڵ نەرمان!... خوا حافیز ئەی مانگی تەراویحو شەونوێژو نازڵ بوونی قورئان! خواحافیز ئەی مانگی تەوبەو گریانو ئەسرینی چاوان! خوا حافیز ئەی مانگی کردنەوەی دەرگاکانی بەهەشتو داخستنی دەرگاکانی دۆزەخو کۆت کردنی شەیتان! خوا حافیز ئەی مانگی پڕ فەڕی پارشێوو بەربانگو کڵپەی دەروونی دوعا گۆیان ! خواحافیز ئەی مانگی بێدەنگیو خۆگری عیبادەتی پڕ لەئازادیو پتەوکردنی ئیرادەی مرۆڤەکان! خۆزگەم بەوکەسەی ئەم مانگەی زویر نەکردو بەجوانی بەڕێیکردو دەس لەملانی بوو.

سوپاس بۆ خوا ئەمساڵو چەند ساڵی رابردووی دوای راپەڕینو ئاوەدان کردنەوەی کوردستان کورد سەلماندی(الحمد لله) کەگەلێکی موسڵمانەو هەر ئیسلامی دەوێ، چونکە بەسەر باری ئەم هەموو شەڕو ئاژاوەو گرانی ساڵانی رابردوو شەڕەکانی براکوژی کەزۆرکات لەرەمەزاندا سەریان هەڵداوە، کەچی ئەم میللەتە هەرپابەندی دینداریو رۆژوو بووە، شەوەکانی قەدر مزگەوتەکان پڕبووە لەتەقواو تاعەت، ئافرەتان لەماڵاندا شەوانیان بەعیبادەت بەسەر بردووە، ئەمەش جێگای دڵخۆشییە، هەرچەندە لەزۆر شوێندا بێڕێزی کراوە بەرامبەر بەمانگی رۆژوو بەڵام (چەم بێچەقەڵ نابێ) ئەوانە زەرەریان لەخۆیان داوەو خوایان لەخۆیان رەنجاندووەو دوعاشیان بۆ دەکەین خوای گەورە هیدایەتیان بدات. ئامین..

ئەم دڵخۆش کردنەش مانای ئەوە نییە ئیتر ئێمە پشتێنی لێ بکەینەوە و بێخەم لێی بخەوینو وابزانین شەیتان تۆپیوە، نەخێر شەیتان نەتۆپیووەو هەزاران بەچکەیشی بووە، چەند رۆژیتر لەکۆتو زنجیر بەردەبن گەر بۆیان بکرێت داخی(٣٠) رۆژەی رەمەزانیشمان پێ دەرێژن، بۆیە پێویستە زۆر وریابینو پەنا بۆ خوا بەرین چونکە شەیتان دوژمنێکی ئاشکرایە﴿ ألم اعهد اليكم يابني ادم أن لا تعبدوا الشيطان انه لكم عدو مبين ﴾ ( يس: ٦٠) واتە: ئایا ئامۆژگاریم نەکردنو فەرمانم پێنەکردن ئەی بنیادەم کەشەیتان مەپەرستن بەراستی شەیتان دوژمنێکی ئاشکرایە بۆئێوە)

لەوانەیە هەندێ کەس بڵێ: خۆ من شەیتان ناپەرستم و کڕنۆشی بۆ نابەم ؟ بەڵام نازانێ ـەگوێکردنی مانای پەرستنێتی وەك ئەم ئایەتە دەری دەخات، بۆیە منیش دوایین جومعەی ـەمەزان بەهەل دەزانم و چەند ئامۆژگاریەك ئاراستەی خوشك و برایانم دەکەم:

یەکەم/ ئەو خوشك و برا بەڕێزانەی لەرەمەزاندا روویان کردۆتە مزگەوت و نوێژو عیبادەت ـادوای رەمەزانیش هەر بەدەوام بن لەسەر نوێژە فەرزەکانیان و نەگەڕێنەوە بۆ تاوان، هەوڵ بدەن ـەو فەرزانەی لەسەریانە قەزای بکەنەوە، چونکە بەراستی وازهێنان لەفەرزو گەرانەوە بۆ خراپە مانای ئاگر تێبەردانی کۆی خەرمانە، وە ئەمەش کاری مرۆڤی ژیر نی یە، هەروەها ئەو خوشکە بەڕێزانەی لەرەمەزاندا سەرپۆش و حیجابی پڕ شەرم و سەربەرزییان لەسەرکردووە، نەکەن دوای رەمەزان لاشەو جوانی خۆیان دەربخەن بۆ گورگە برسیەکان... چونکە پۆشینی (حجاب) بۆ ئافرەت واجبە بەدەقی قورئان لەهەموو کاتێکداو تایبەت نی یە تەنیا بەرەمەزانەوە ﴿ یاایها النبي قل لأزواجك وبناتك ونساء المؤمنين يدنين عليهن من جلابيبهن ذلك ادنى ان يُعرفن فلا يُؤذين وكان الله غفوراً رحيما ﴾ ( الاحزاب: ٥٩) واتە: ئەی پێغەمبەر بفەرموو بەخێزانەکانت و کچەکانت و ئافرەتانی موسڵمانان باهەندێ لەعەباکانی سەریان بدەن بەسەر رووماتیاندا (واتە پەچە) تەنها چاویان بەدەرەوە بێت، ئەمە باشترە بۆئەوەی بناسرێن و ئازار نەدرێن لەلایەن هەرزەو نەفامەکانەوە، خواش زۆر لێبوردەیە بۆئەوانەی لەمەوبەر داپۆشراو نەبوون و ئێستا تەوبەیان کردووە، وەزۆر بەبەزەیی یە لەگەڵ ئافرەتاندا کەفەرمانی پێداون داپۆشراوبن.

دووەم/ بۆتە عادەت لەناوماندا نۆجەژنە بۆ مردوو دەکرێ و پرسە نوێ دەکرێتەوە، ئەمەش کارێکی ناشەرعی یە بەراستی ئەو موسڵمانەی لەم رەمەزانەدا مرد خوای گەورە خۆشی ویستووەو رێزی لێ گرتووەو بۆ سەر سفرەو خوانی رەحمەتی خۆی دەعوەتی کردووە لەسزای گۆڕ بەدوور دەبێت (انشاء الله ).

کەوابوو ئێوەی کەس وکاریشیان گوناهباریان مەکەن نۆ جەژنیان بۆ ساز مەکەن وامن لەلای خۆمەوە بریار دەدەم ماڵی هیچ کەس نەچم بەناوی نۆجەژنەوە، هیوادارم ئێوەش بەقسەم بکەن، بۆ سەرقەبرانیش بەم شێوە لێشاوە، بێشەرعیەو دەبێت بەرەش بەڵەك و دروست نی یە بچن.

سێیەم/ بەردەوام بوون و خۆڕاگری لەسەر رێگای راست گەورەترین موژدەی دەربارە هاتووە لەقورئاندا، وەرن باپێکەوە گوێ بگرین لەم ئایەتە پیرۆزە : ﴿ ان الذين قالوا ربنا الله ثم استقاموا تتنزل عليهم الملائكة أن لاتخافوا ولاتحزنوا وابشروا بالجنة التي كنتم توعدون نحن أولياءكم في الحياة الدنيا وفي الاخرة ولكم فيها ماتشتهي انفسكم ولكم فيها ماتدعون نزلاً من غفور رحيم ﴾ (فصلت: ٣٠ـ ٣٢) واتە: ئەوانەی دەڵێن( الله) خوامانەو بەردەوامن لەسەر ئەو کاروانە پیرۆزە فریشتەکان دادەبەزنە سەریان و دەفەرموون: مەترسن لەوەی توشتان دێ لەدوای مردن،

خەفەتباریش مەبن لەسەر ئەو ماڵو منداڵەی بەجێی دەهێڵن مژدە وەرگرن بەو بەهەشتە بەرینەی بەڵێنتان پێدراوە.

(شێخ زادە) دەفەرموێ: ( فریشتەکان لەکاتی گیانکێشاندا دادەبەزنە سەر موسڵمانانو ئەم موژدەی بۆ دێنن: مەترسە لەسامناکی مردنو سزای گۆڕو تەنگو چەڵەمەکانی قیامەت، لەو رۆژەدا موسڵمان فریشتەکان دەبینێ بەسەرسەریەوە وەستاونو دڵخۆشی دەکەن ترسی دەڕەوێننو موژدەی خۆشی پێ دەدەنو پێی دەڵێن: ئەمرۆ چەند کارەساتێکی سەخت دەبینی قەت نەتدیوە، بەڵام مەترسە مەبەست پێی تۆ نییەو بۆ کەسێکیترە، ئەمجا فریشتەکان دەفەرموون: ئێمە یارمەتی دەرتانین لەژیانی دنیاو دوارۆژدا رێنمایتان دەکەین بۆ ئەو شتەی سوودی هەیە بۆتان، وەلەو بەهەشتەدا ئامادەیە بۆتان ئەوەی نەفستان حەزی پێدەکاتو خۆتان بیخوازن، ئەمە رێزێکە لەلایەن خوایەکی لێبوردەو خاوەن بەزەییەوە)[1].

ئەوەش بزانن(استقامة) بەمانا خۆماندووکردنو خۆ پروکاندن نییە بەڵکو بەمانا وازنەهێنانو کۆڵنەدانە باکەمیش بێت وەك پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێ: ( خیر الاعمال ادومها وان قل )واتە: باشترین کار ئەوەیە بەردەوام بێت باکەمیش بێت ، هەروەها فەرموویەتی: ( لن یشاد الدین أحد الا غلبه) (البخاري) واتە: هیچ کەسێك ململانێی لەگەڵ ئەم دینە نەکردووە ئیللا دین بەسەریدا سەرکەوتووە.

زۆرما ن دی لەسەرەتاوە زۆر بەگەرمی گرتبووی خەڵکی کافر دەکردو بەبیدعەچی باسی دەکردن، بەڵام زۆری نەخایاند وازی لەهەموو شت هێنا.

چوارەم/ دوای ڕەمەزان رۆژووی(شەشەڵان) بگرن چونکی زۆر گەورەیە پێغەمبەر(ﷺ) دەربارەی دەفەرموێ: ( من صام رمضان ثم اتبعه ستاً من شوال كان كصيام الدهر) (رواه مسلم )[2]. واتە: ( هەرکەس رەمەزان بەرۆژو بێتو شەش رۆژیش لەشەوال بەدوایدا بەرۆژو بێت وەك ئەوە وایە هەموو ساڵەکەی بەرۆژوبێ)، چونکە لەسەر یاسای خێر یەك بەدەیە: ٣٦ + ١٠ = ٣٦٠ کەساڵێکی تەواو دەکات.

پێنجەم/ لەبیرتان بێت خوا دەفەرموێ: ﴿ انما المؤمنون اخوة فاصلحوا بين اخويكم واتقوا الله لعلكم ترحمون ﴾ (الحجرات:١٠) واتە: موسوڵمانان و باوەڕداران برای یەکترن، کەوابوو ئاشتی بخەنە نێوان دووبرای بەشەڕهاتووتانو لەخوابترسنو تەقوای بکەن بەڵکو رەحمتان پێ بکرێت.

بەراستی جەژن باشترین فرسەتە بۆ ئاشت بوونەوە لەنێوان دووکەس یان دوو تاقم یان دوو بنەماڵە کەبەشەڕهاتوون، بۆیە داوا دەکەین بیکەن بەرەمزی ئاشت بوونەوەو گەردن ئازادیو

---

[1] صفوة التفاسير.

[2] رياض الصالحين .

مامشـۆو سـەردانی دایـكو بـاوكو خوشـكو بـراو خـزمو دراوسـێ وەنیازتـان تەنـها ڕەزامـەندی خوابێت، بۆئەوەی هەموو كۆسپێكتان ئاسان بێت لەبیرتان بێت كەپێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێ: ( من حب ان يُبسط له في رزقه ويُنسأله في اثره فليصل رحمه ) (متفق عليه)[1].

واتە: هەركەس حەز دەكات رزقی فراوان بێت خوا بەرەكەت بخاتە شوێنەواری پاش مردنی، باسیلەی رەحم بگەیەنیێو سەردانی خزمان بكات، بەتایبەت دایكو باوكو ئەمجا خوشكو برا دووره ولاَتەكان...

# ٧ ـ وتاری جەژنی رەمەزان

الحمد لله رب العالمين والصلاة والسلام على خاتم الانبياء والمرسلين ، محمد واله وصحبه اجمعين .

هەزاران سوپاس و ستایش بۆ خوای پەروەردگار كەهیدایەتی داین بۆ رۆژوی مانگی رەمەزانی پیرۆز داواكارم لەو خوایە رەمەزان و قورئان ـ كە دووبرای دەس لەملانی یەكترین ـ بكاتە تكاكارمان و ئازادمان بكات لەسزای سەختی دۆزەخ .

قورئان دیاری خوایە بۆ مرۆڤ ئەو دیاریەش لەمانگی رەمەزاندا هاتووەتە خوار، بۆیە مانگی رەمەزان زۆر پیرۆزەو جەژنەكەیشی هەر پیرۆزە، چونكە جەژنی دەرچونە لەدەورەیەكی یەك مانگی كەشەوو رۆژی ئاوەدان بێت بەیادو زیكری خوا، جەژنی ئاشنابوونە لەگەلْ قورئان و خەتمی قورئان و ئایەت و سوورەتەكانی و تێگەیشتنی ماناو لێكۆڵینەوە لەسودو ئەحكامەكانی.

جەژنی رەمەزان جەژنی سەخاوەت و بەخشندەیی و دابەش كردنی سەرفیترەو یارمەتی یە بۆ دراوسیێو هەژارو نەدارەكان،

جەژنی رەمەزان جەژنی گەردن ئازادی و هات و چۆو ئاشت بوونەوەو دڵدانەوەی هەژارو هەتیو بارو خزمو خوێشانە.

دەك یاخوا لێمان پیرۆزبێت ئەم جەژنە شیرینە، ببێتە مایەی خێرو خۆشی و هەرزانی و شادی بۆ هەلْگرانی ئەم پەیام و دینە، بۆیە منیش بەهۆی ئەو رۆژە پیرۆزەوە چەند ئامۆژگاریەكی كورت ئاراستەی ئەم برا موسوڵمانانە دەكەم:

یەكەم: ئەو موسوڵمانانەی لەرەمەزاندا توانایان نەبووە بەرۆژوبن لەبەر عوزرێكی شەرعی وەك سەفەرو نەخۆشی، ئەوانە بەشدارن لەئەجرو پاداشتی رەمەزاندا بەلاَم باخەمسارد نەبن لەقەزا كردنەوەی رۆژوەكانیاندا هەركات خوا شیفای بۆ ناردن بەزووترین كات قەزای بكەنەوە، خۆ ئەگەر

---

[1] رياض الصالحين / بر الوالدين وصلة الارحام.

بتوانن لەم مانگی(شوال)ەدا لەگەڵ شەشەلاّن گرەکاندا دەست پیّ بکەن زۆر پیرۆزو بەجیّیە، چونکە قەرزی خوایە ( ودين الله أحق بالوفاء) قەرزی خوایش لەهەموو قەرزیّ لەبەرترە بەدانەوە.

دووەم: ئەو موسوڵمانانەیش کەخوا تەوفیقی داون و رەمەزان بەرۆژوبوون پێویستە بزانن کاروانی رۆژو بەرەمەزان کۆتایی نایەت بەڵکو بەدرێژایی ساڵەکە رۆژو هەیە وەهەندیّ رۆژیان بەفەرموودەی (صحيح) پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی پێداوە ئەمانەش وەك:

ا - رۆژووی شەش رۆژ لە(شوال) چونکە پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرمویّ: ( من صام رمضان ثم اتبعه ستاً من شوال كان كصيام الدهر) (رواه مسلم)[1] .

واتە: هەرکەس رەمەزان بەرۆژوبێت و شەش رۆژیش لەشەوال بەدوایدا بەرۆژو بێت ئەوە وەك رۆژوی هەموو ساڵەکە وەهایە (موسلیم ریوایەتی کردووە).

ب ــ رۆژوی(نۆمینەی حاجیان) بەتایبەتی رۆژوی نۆیەم کەرۆژوی عەرەفەیە، چونکە پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرمویّ: ( هیچ رۆژانێك نیە کردەوەی چاك تیایدا بەئەندازەی ئەم رۆژانە خێربێت، مەبەستی دەرۆژی یەکەمی مانگی حاجیانە، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا تەنانەت غەزایش لەپێناوی خوادا ئەوەندە خێر نیە؟ فەرمووی: نەخێر غەزایش ئەوەندە خێر نیە مەگەر کەسیّ بەسەرو ماڵیەوە دەربچێت لەو پیناوەداو نەسەرو نەماڵی هیچیان نەگەڕێنەوە) ( بوخاری ریوایەتی کردووە)[2].

هەر لەم بارەوە پێغەمبەر(ﷺ) پرسیاری لێکرا لەرۆژوی عەرەفە؟ فەرموی: ( دەبێتە لابەری تاوانی ساڵی رابوردو ساڵی داهاتوو) (موسلیم ریوایەتی کردووە)[3].

ج ــ رۆژوی نۆیەم و دەیەمی مانگی (محرم) کەمانگی یەکی قەمەری دەکات ، چونکە ( پێغەمبەر(ﷺ) رۆژوی دەیەم بەرۆژو بووەو فەرمانی داوە بەرۆژوەکەیشی )(متفق عليه)[4] .

( وەفەرموویەتی: ئەگەر ژیام تاساڵی داهاتوو نۆیەمیش بەرۆژو دەبم) (موسلیم ریوایەتی کردووە) [5].

د - رۆژوی دووشەممەو پێنج شەممەو هەروەها رۆژوی سیّ رۆژی (١٣، ١٤، ١٥) ەی هەموو مانگێکی قەمەری هەموو ئەمانە سوننەتن و فەرموودەی دروستیان لەسەر هاتووە[6].

---

[1] رياض الصالحين / باب استحباب صوم ستة من شوال/١٢٥٤.

[2] سەرچاوەی پێشوو/ باب فضل الصوم في العشر الاول من ذي الحجة/١٢٤٩.

[3] سەرچاوەی پێشوو/١٢٥.

[4] هەمان سەرچاوەی پێشوو/١٢٥١.

[5] سەرچاوەی پێشوو/١٢٥٣.

[6] سەرچاوەی پێشوو/١٢٥٦، ١٢٦٢.

بەڵام لێرەیشدا دووپاتی دەکەینەوە پێویستە ئەو موسوڵمانانەی قەزای رەمەزانیان لەسەرە ئەگەر لەم رۆژانەدا بەرۆژوبوون بانیەتی قەزا بهێنن ئەوکاتە قەزاکەشیان لەمل دەکەوێو ئەجری سونەتەکەیشیان دەس دەکەوێ.

سێیەم: ئامۆژگاریم بۆ ئەو خوشكو برایانە ئەوەیە کە لەرەمەزاندا روویان کردۆتە نوێژو خۆیان لەگەڵ خوادا ئاشت کردۆتەوە کەبەردەوام بن لەسەر نوێژو رۆژو تاعەتو وەبەفێڵی شەیتان فریونەخۆنو دەس لەکاری خێر هەڵنەگرن، نەکا پێش رەمەزانی داهاتوو مردن یەخەیان پێبگرێو ئەوکاتە بەنوێژنەکەریو دوور لەخوایی کۆچو باربکەن، خوای گەورەیش دەفەرموێ: ﴿ ان الذين قالوا ربنا الله ثم استقاموا تتنزل عليهم الملائكة الا تخافوا ولاتحزنوا وابشروا بالجنة التي كنتم توعدون ﴾ (فصلت: ٣٠).

واتە: ئەوانەی دەڵێن( الله) خوامانەو بەردەوامیشن لەسەر ئەو باوەڕو کردەوە چاکە، ئەوانە فریشتە نازڵ دەبێتە سەر دڵو دەروونیانو دڵنەواییان دەکات لەکاتی مردنیاندا پێیان دەڵێن: مەترسن لەگیانەڵەی مردنو سزای گۆڕ، خەفەتبار مەبن بۆ ئەو ماڵو منداڵەی جێتان یەلاوە ئێمە لەجێگای ئێوە چاودێریان دەکەینو مژدە وەرگرن بەو بەهەشتەی لەدنیا بەڵێنتان پێدرابوو.

پیاوێك هاتە خزمەتی پێغەمبەر(ﷺ) داوای لێکرد وتەیەکی فێربکات دوای ئەو پرسیار لەکەسی تر نەکات، ئەویش فەرمووی: بڵێ ( امنت بالله ثم استقم ) واتە: باوەڕم هێناوە بەخوا دوای ئەمەش بەردەوامبە لەسەر ئەو وتەیە.

کەوابوو زۆری گرنگ نیە لەکاردا، بەڵکو گرنگ ئەوەیە موسوڵمان بەردەوام بێتو لەکارنەکەوێت بێگومان کەمێك کەبەردەوام بیت لەسەری چاکترە لەزۆرێك زوو دەسی لێ هەڵگری.

چوارەم: ئامۆژگاریم ئەوەیە لەم جەژنەدا بەگوێرەی توانا هاتوچۆو سیلەی رەحمو بەسەرکردنەوەی هەژارو داماوەکان بکەینو، دڵنەوایی هەتیوو بێ باوکەکان بکەین، بەیارمەتی ماڵیو بەوتەی شیرینو، وەچەندێك ئەتوانین ناوبژی نێوان ئەو خزمو دراوسێیانە بکەین کەدڵیان لەیەك زویر بووەو لێك بچڕاون، چونکە هەر خزمو دراوسێیە لەیەك زویر دەبێت، خوایش دەفەرموێ: ﴿ ... فاتقوا الله واصلحوا ذات بينكم واطيعوا الله ورسوله ان كنتم مؤمنين ﴾الانفال:١.

واتە: لەخوابترسنو ناوبژیو چارەسەری ناکۆکی نێوان خۆتان بکەن، وەگوێڕایەڵی خواو پێغەمبەر بکەن ئەگەر ئێوە بەراستی باوەڕتان هەیە.

ئەوکەسانەی دەکەونە نێوان خەڵکەوەو ئاشتیان دەکەنەوە لەبەر رەزامەندی خوا گەورەترین پاداشتیان دەس دەکەوێ وەتەنانەت لەم ناوەندەدا دروستە ئینسان درۆ بکات بۆ ئەوەی دوو موسوڵمان ئاشت بکاتەوە.

پێنجەم: ئامۆژگاریم بۆ خوشك‌و براپانم ئەوەیە لەم جەژنەو لەهیچ كات‌و شوێنێكی تریشدا بابەناوی هات‌و چۆو سەیران‌و گەشتەوە رەش بەڵەك‌و تێكەڵاوی بەنامەحرەم دروست نەكەیز چونكە زۆر حەیفە موسوڵمانێك(٣٠) رۆژبەرۆژو بێت بەڵام لەرۆژی جەژندا رێسەكەی خاوبكاتەوەو رەنجی وەك رەنجەكەی فەرهاد لێبكات‌و خوا لەخۆی برەنجێنێ.

پێویستە باوك‌و دایكەكان لەم رۆژانەدا خاوەنی هەڵوێستی موسوڵمانانەو پڕ لەئیمان بن‌و رێگا نەدەن كچەكانیان سەرو گیان رووتكەن‌و خۆیان بكەنە نێچیری چاوبرسی‌و دەروون برسی‌یەكان.

پێویستە خوشكی ئافرەت باش بزانێ ئەوانەی داوای سەیران‌و رەشبەڵەك‌و دەرچوونی تێكەڵاوی لێدەكەن ئەوانە گورگی برسین‌و هیچ كات مەبەستیان بەرژەوەندی خۆشبەختی ئافرەت نیە، بەڵكو زۆر ئاساییە لەلایان بۆ ئارەزوویەكی كاتی خۆیان ناموسی ئافرەتێكی بێتاوان وەك شوشەیەك بشكێنن ئامادەمیان بكات بەوشەربەتەی ئاواتی پێدەخوازن دوای ئەوەیش زۆر سادەیە بەلایانەوە شووشەكە فڕێدەنە ناو تەنەكەیەكی خۆڵەوە.

جابرایان باوك بەرپرسیارە لەژن‌و منالی خۆی خوا وەك دەفەرموێ: ﴿ یا ایها الذین امنوا قوا انفسكم واهلیكم ناراً وقودها الناس والحجارة ﴾ ( التحریم : ٦).

واتە: ئەی باوەڕداران خۆتان‌و ماڵ‌و منداڵتان بپارێزن لەئاگرێك سووتەمەنییەكەی ئادەمیزادو بەردە.

هەروەها پێویستە لەسەرشانی كاربەدەست‌و ریش سپی‌و ئەنجومەن‌و سەركردەو دەسەلاتدارەكان نەهێڵن رەعیەت‌و ژێر دەستەكانیان لەسنووری شەرعی خوا لابدەن‌و نابێ رێگای خراپەیان بۆ ئاچوغ كەن ئەگینا ئەوانیش هەڵگری تاوانی ئەو خەڵكە دەبن وەك پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێ: ( الامام راعٍ ومسؤول عن رعیته ...) واتە: پێشەواو سەركردە شوانەو بەرپرسیارە لەوكەسانەی وان لەبەردەستیا ...)[1].

لەكۆتاییدا داواكارم لەخوای گەورە رۆژی رەمەزانمان لێوەرگرێ جەژنمان لێپیرۆز بكات لەگوناهی مردوانمان ببورێ‌و شیفای نەخۆشەكانمان بدات‌و كوردستانمان لەژێر سایەی قورئاندا ئاوەدان بكاتەوە ( ئامین).

## ( ٨ ) خواحافیزی حاجی‌یەكان

ئەمرۆیش دیسانەوە باسەكەی حەزرەتی عیساو مریەمی دایكی رادەگرین بەنیازی خواحافیزی حاجی‌یەكانمان كەلەم هەفتەیەدا هەردووكاروانی رێگای ئێران‌و عێراق بەرێ دەكەون انشاء الله

---

[1] ریاض الصالحین / امر ولاة الامور بالرفق برعایاهم/٦٥٣.

کاروانی ئەمساڵی حەج لەباوردۆخێکی زۆر تایبەتیدایە چونکە ـ خوادەزانێت ـ رەنگە تا ئێران ـێنەوە هەموو بارودۆخێك گۆڕابێتو لەجێگای خۆی نەمابێت ، بۆیە پێویستە حاجیانی ئەمساڵ ـیاتر لەساڵان خواحافیزیو گەردن ئازادیو وەسێت نامەیان بەروونی جێبهێڵن بۆ ماڵو منداڵو خزمو خوێشو کەسانی پەیوەندیداریان.

براشیرینەکانم ! خوشکە ئازیزەکانم ئەمڕۆ موژدەبێت لەئێوەو خۆزگەمان پێتان کەدەچن بەدەم بانگەوازەکەی حەزرەتی ئیبراهیمی خەلیلەوە کەبەفەرمانی خوایی بانگی لێکردین ﴿وأذن في الناس بالحج يأتوك رجالاً وعلى كل ضامر يأتين من كل فج عميق ﴾ الحج:٢٧. واتە: بانگ بکە لەنێو ئادەمیزادەکاندا بۆ حەجی ماڵی خوا دەبینی ئەو خەڵکە دێن بەدەم بانگەکەتەوە بەپیادەو بەسواری هەموو وشترێکی لەڕو لاواز لەهەموو رێگاو جێگایەکی دوورەوە.

(ابن عباس) دەڵێت: کاتێ ئیبراهیم لێبوویەوە لەدروستکردنی ماڵی خوا ، خوافەرمانی پێکرد فەرمووی: تۆ بانگ بکە ئێمە دەیگەیەنین ، ئیبراهیم چوویە سەرکێوی (ابوقبیس)و هاواریکرد: ئەی ئادەمیزادەکان خوا فەرمانی پێداون بەحەج بۆئەوەی پاداشتتان بداتەوە بەبەهەشتو بتانپارێزێت لەدۆزەخ ؛ بچن بۆ حەج ئەوانەی کەحەجیان بۆ نووسرابوو ، لەپشتی باوكو لەمناڵدانی دایکا هەموو وەڵامیان دایەوە (لبيك اللهم لبيك)[1] .

ئەی کاکە حاجی و ئەی دادە حاجی ئەمڕۆ موژدەبێت لەتۆ کەروکنی پێنجەمی ئیسلامەکەت تەواو دەکەیتو بەر موژدەی پێغەمبەرەکەت دەکەویت ـ انشاء الله ـ کەدەفەرموێت: (العمرة الى العُمرة كفارة لما بينهما والحج المبرور ليس له جزاء الا الجنة) متفق عليه. [2].

واتە: عەمرە تا عەمرەیەکیتر دەبێتە هۆی لابردنی گوناهەکان،حەجی وەرگیراویش پاداشتی نیە جگە لەبەهەشت. یان دەفەرموێ: (من حج فلم يرفث ولم يفسق رجع كيوم ولدته امه) متفق عليه[3].واتە: هەرکەس حەج بکاتو قسەی پڕوپووچ و تاوانی تیانەکات وەك ئەو رۆژەی لێ دێت کەلەدایك بووە.

جابراو خوشکی هێژام منیش لەم رۆژە پیرۆزەداو لەخواحافیزی جەنابتاندا چەند ئامۆژگارییەکم هەیە بۆتان تکام وایە گوێم بۆ شل کەن:

یەکەم/ هەر لەئەمڕۆوە بچۆرە خزمەت مامۆستایانی ئاینیو شارەزایان، واجبەکانی خۆت فێربە، چونکە حەجیش وەك نوێژ وەهایە شەرتو مەرجو روکنەکانی جێبەجێ نەکەیت دروست نابێتو هەر زەحمەتەکەت پێدەبڕێت.

---

[1] صفوة التفاسير / الصابوني

[2] رياض الصالحين ،رقم:١٢٧٤.

[3] رياض الصالحين .

دووەم/ بەدرێژایی رێگاکەت و ئەنجامدانی کارەکانت لەوێ پەیوەندی بکەن بەو مامۆستایەی والەگەڵتان ، پرسەکانت پێش وەخت بێت ، زۆرکات مامۆستا بەرێزەکان ماندوون ، یان ناوێرن خەڵك کۆکەنەوەو قسەیان بۆ بکەن ، ئێوە خۆتان پەخەیان بگرن و داوای روونکردنەوەیان لێبکەن ، چونکە خوا دەفەرموێت: ﴿فاسئلوا أهل الذكر ان كنتم لاتعلمون ﴾واتە: پرسیار بکەن لەوانەی زاناو شارەزان ئەگەر خۆتان نایزانن.

سێیەم/ بەدرێژایی رێگاکەت لەسەیارەو فرۆکەدا دەمو دڵت بەندی یادی خوابکە ، نەکەیت خەریکی غەیبەت و قسەی پڕوپووچ و باسی ئەمو ئەوبیت، ئەو جێگای تۆ بۆی دەچیت زۆر پیرۆزە ، ئاواتی ژیانی موسوڵمانە ، رەنگە جارێکیتر ئەو فرسەتەت دەست نەکەوێتەوە، زۆر وریابە کاتت زایە نەکەیت ، بەتایبەت لەحەرەمی مەککەو مەدینەدا تادەتوانی نوێژ بکە ، عیبادەت بکە ، تەوافی کەعبە بکە ، چونکە پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێ: (صلاة في مسجدي هذا افضل من الف صلاة فيما سواه الا المسجد الحرام)رواه مسلم.

واتە: یەك نوێژ لەم مزگەوتی منەدا خێرترە لەهەزار نوێژی مزگەوتەکانی تر جگە لەمزگەوتی حەرام(کەعبە).

دەربارەی کەعبەیش دەفەرموێ: (وصلاة في المسجد الحرام افضل من مأة صلاة في مسجدي ) حديث حسن رواه احمد والبيهقي .[1]

واتە: نوێژێك لەکەعبەدا لەصەد هەزار نوێژی مزگەوتەکانی تر خێرترە ئەمجانەوەوی دەفەرموێ: (واعلم ان مذهبنا هذا ان التفضيل لايختص بالفريضة بل يعم الفرض والنفل جميعاً)[2].

واتە: تۆبزانە ئەم گەورەییە تەنها تایبەت نیە بەنوێژی فەرزەوە بەڵکو فەرزو سوننەت دەگرێتەوە لای شافیعی یەکان.

چوارەم: دەبێ بزانیت حەج و عەمرە هەردووکیان واجبن چونکە خوا دەفەرموێت: ﴿واتموا الحج والعمرة لله ...﴾واتە: حەج و عەمرە ئەنجام بدەن بۆ خوا .

شێوەی کردنی ئەم دوو واجبەیش_٣) جۆری هەیە:

یەکەمیان: تمتع / واتە: لەرێگاوە رۆیشتی عەمرەبکە ئەمجا حەج.

دووەمیان: قران/ واتە: بەیەك نیەت و بەیەك جار حەج و عەمرەبکەیت.

لەم دووجۆرەدا دەبێ حەیوان سەربڕی واتە: (فدية)بدەیت.

---

[1] شرح النووي على صحيح مسلم ج:١٠٢/٦.

[2] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

جۆری سێیەم: افراد واتە یەکەم جار حەج بکەیت و دوای تەواوبوونی حەج و دوای جەژن عەمرەبکەیت، جا هەرچەندە ئیمامی نەوەوی(افراد) بەچاکتر دەزانێت، بەڵام بۆ ئەمڕۆی حاجیانی عێراق زۆر گرانەو دەبێ نزیکی(١٠) ڕۆژ بەپۆشاکی ئیحرامەوە بمێنن و ژیانی ناو ئیحرامیش زۆرگرانە چونکە حەرامە:

١- بۆنی خۆش بەکاربهێنی بۆ لاشەو پۆشاکی.

٢ - ڕۆنکردن و جوانکردنی سەری.

٣ - لابردنی مووونینۆك.

٤ - تێکلاوی خێزانی و دەسبازی و ئارەزووکاری.

٥ - ڕاوکردنی هەموو حەیوانێکی گۆشت خوراوی بەڕی.

٦ - بڕینی هەموو ڕووەکێکی حەرەمی مەککەو دەوروبەری.

٧ - داپۆشینی سەروپۆشینی جلی دووراوو چنراوو گرێدراوو بۆپیاو.

٨ - داپۆشینی ڕوومەت و هەردوو دەست بۆ ئافرەت.

٩ - مارەبڕین و مارەکردن لەخەڵکی‌تر.

١٠ - داهێنانی قژ ئەگەر زانی دەبێ بەهۆی هەڵوەرینی مووەکان.

دیارە ئەمەیش زۆر گرانە ماوەی(١٠ -١٢) ڕۆژ پێوەی بمێنی ، لەبەرئەوە من ئامۆژگاریتان دەکەم بە(تمتع) نیەت بهێنن ئەوچەند ڕۆژەیش لە(مەککە) دەمێنن خەریکی عەمرەی زیادەبن بۆ خۆتان و دایك و باوکتان و کەسەکانتان بەڵکو ئێمەیشتان یادبکەوێتەوە (انشاء الله).

ڕۆژی (٨)ی مانگیش ئیحرام ببەستن بەحەج و فیدیەیەکیش سەربڕن.

پێنجەم/ لەبیرت نەچێت لەهەموو کاتێکدا دەم بەدوعا بەنامیلکەیەکی دوعا پەیدابکەو لەهەموو شوێنێکدا دوعاکان بخوێنە، کاتێ ئیحرامت پۆشی بڵێ: (لبیك حجا او عمرة) ئەمجا بڵێ: (لبیك اللهم لبیك ...الخ) خۆگەر دوعایشت نەزانی بەکوردی دوعاکانت بکە ، ئەم چەند شیعرەیش کەلەڕێگای مەدینە نووسیم و لەڕەوضەداخوێندمەوە دەیکەم بەدیاری بۆسەر گۆڕەکەی پێغەمبەر(ﷺ )و بەئێوەدا دەینێرم:

| | |
|---|---|
| یارسول الله بەرەو ڕووت هاتم | کوردێکی زەبوون شکستەو ماتم |
| ساڵەهای ساڵە ئاواتم تۆیە | کڵپەی دەروونم دیداری تۆیە |
| وائەمڕۆ بوومە میوان مەزارت | ڕازو نیازم هێنایە دیارت: |
| سەلامی صەدان کەسی کوردستان | هەڵم گرتووە بەدڵ و بەگیان |
| سڵاو دیاریمە لەکوردانەوە | هەموو برایان بەخوشکانەوە |

کڵپەی دەروونیان هەموو بۆ ناردووی شەفاعەتخوازن بۆسبەی ئەدوی
یارسول الله شەیدای دیدارم ئەمانەتباری کوردی هەژارم
لێمان وەرگرە هاناو هاوارمان لەرۆژی سەختا تۆی تکاکارمان
یارسول الله من میوانی تۆم میوانی خانەو رەوضەی جوانی تۆم
یارسول الله ساڵەهای ساڵە چیرۆك خوانی تۆم بەئاهوو ناڵە
سیرەتی پاکت رادەگەیەنم کارو فەرمانت بەجێ دەهێنم
ئومێدەوارم نازم وەرگری شەفاعەتخوازم رازم وەرگری
بۆ خۆم بۆ دایکم بۆ باوكو کەسم رۆژی قیامەت تۆی فریاد رەسم
دەستەبارەی من هەزاران سەلام لەدیاری پاکت یاخیر الانام
داوام وەهایە لێمی وەرگری جوابیش بفەرموو(یاخیر البری)
دوعا بفەرموو بۆ کوردستانت نەوەی صلاحو رۆڵەی جاوانت
بەڵکو ئەمجارەش رزگارمان ببێ لەدەستی ستەم قوتارمان ببێ

یا الله یارحمن یارحیم ! حاجی‌یەکانمان بەخێر بڕۆنو بەخێر بگەڕێنەوە، یا حي یاقیوم یا ذالجلال والاکرام ئەمجارەیش شاری سلێمانیو کوردستان بەتایبەتیو جیهانی ئیسلامی بەگشتی بپارێزە لەوویشوومەو بەلاو ئاگربارانەی وابەڕێوەو هەرەشە لەتەڕو ووشكوو گەورەو ساواو گیاندارو بێگیان دەکات.

خوایە گیان جارێکی‌تر ئەنفالو کیمیاباران و بەڵای کۆکوژی نەهێنی بەسەر ئەم خاكو وڵاتەدا ئامین

## ( ٩ ) ـ وتاری جەژنی قوربان

جەژن بەگشتی رەمزی وەفاداریو لەخۆبووردنو خۆشەویستیو برایەتیو دۆستایەتی‌یە

جەژنی قوربانیش بەتایبەتیو بەشێوەیەکی زۆر زەقو روون ئەم مانایانەو مانای قوربانیو خۆنەویستی تیا دەدرەوشێتەوە.

جەژنی قوربان هەر لەناوو نیشانەکەیەوە دیارە کە پێویستە بڕوادار قوربانی تیابدات بەهەموو دڵخوازێکی خۆی لەپێناو رەزامەندی خوای پەروەردگاردا.

داستانەکەی حەزرەتی ئیبراهیمو ئیسماعیلی کوری جوانترین نموونەیە بۆ تازەکردنەوەو نوێکردنەوەی ئەم مانایانە لەدڵی موسوڵمانو باوەڕداردا.

پێویسته باوەڕدار بەخواو بەرۆژی قیامەت بەدڵێکی زیندو ئاگاوە گوێ هەڵخات بۆ ئەم چیرۆکە پیرۆزەو بەراوردی ئیمانی خۆی بکات بەرانبەر بەو لێبوردنە راستەو دروستەی لەسەر دەستی ئەم دوو پێغەمبەری خوایە . علیهما السلام - رووی‌دا.

حەزرەتی ئیبراهیم دەست لەجگەر گۆشەو تاقانەی خۆشەویستی خۆی هەڵگرێو ئەو تاقانەی کەجارەها جار رووی ئەکردە بارەگای خواو داوای کوڕێکی صالحی لێدەکرد وا ئەمڕۆ دوعاکەی قوبوڵ بوو و کوڕبوو، گەورە بوو، وای لێهات بکەوێتە دوای باوکیو هەندێ کاری لەگەڵ بکات، کەچی لەخەودا ئەم باوکە کوڕەکەی خۆی سەر دەبڕێ (یا سبحان الله).

خۆ خەوی پێغەمبەران راستەو دروستە هەڵەشەو پەڵەشەی شەیتان نیە، بۆیە حەزرەتی ئیبراهیم بەکوڕەکەی دەڵێ:

﴿یا بني اني اری في المنام أني اذبحك فانظر ماذا تری قال یا ابت افعل ما تؤمر ستجدني أن شاء الله من الصابرین﴾ واتە: ئەی کوری شیرینم من لەخەومدا دیم کە تۆم سەر ئەبڕی بیری لێبکەرەوە بزانە ڕات چۆنە؟ وتی: ئەی باوکی شیرینم کارەکەت ئەنجام بدە بەوشێوەی فەرمانت پێدراوە خوا یاربێت من دەبینی خۆگر دەبم ﴿فلما أسلما وتله للجبین * وناديناه أن یاابراهیم قد صدقت الرؤیا انا كذلك نجزي المحسنین * ان هذا لهو البلاء المبین * وفدیناه بذبح عظیم﴾الصافات:١٠٢-١٠٧.

لەکاتێکدا کوڕو باوك هەردووکیان تەسلیمی فەرمانی خوای گەورە بوون، کوڕ خۆی دایە دەس باوکی بۆ ئەوەی سەری بڕێ، باوکیش جگەر گۆشەی خۆی پاڵ خست بەسەر ڕومەتیا تاچاوی لەروومەتی نەبێو بەزەیی نەیگرێ بەرانبەری، ئالەم کاتەدا کەبەتەواوی هەردووکیان فەرمانی خوایان بەجێهێنا دەریای فراوانی بەزەیی خوا هاتە جۆش‌و فریای کوڕو باوك کەوت‌وفەرمووی ئەی ئیبراهیم بەراستی خەوی خۆتت بردەسەرەو چووی بەدەم فەرمانی خواوە بەچاکی ئێمەیش هەموو کات بەم شێوە پاداشتی چاکە کاران بەچاکە دەدەینەوە، بەراستی ئەمە تاقیکردنەوەیەکی زۆر گەورەبوو بەسەر ئێوەداهات، بۆیە لەم کاتەدا خوای گەورە هاتە فریای ئەم دوو پێغەمبەرەی خۆیو بەرانێکی ناردە بەردەم حەزرەتی ئیبراهیم بۆئەوەی سەری بڕێ لەبریتی کوڕەکەی، بەراستی ئەمەیە نموونەی لەخۆبردن‌و تاعەت کردن؛ بەراستی داستانی پێغەمبەرانی خوا باشترین نمونەی فەرمانبەری خوای تێدا دەدرەوشێتەوە، بۆیە پێویستە ئێمەی باوەڕدار چاویان لێبکەین‌و وەك ئەوان بکەین.

هەر لەورۆژەوە قوربانی بوەتە سوننەت بۆ ئێمەی موسڵمان، خۆگەر ئەمڕۆ ئێمە نەیشتوانین قوربانی بکەین بەبەران [1] پێویستە لەمانای قوربانی تێبگەین، چونکە قوربانی مانای لێ برانە بۆ

---

[1] کاتی گرانی بوو کەس نەیدەتوانی قوربانی بکات.

عەقیدە، مانای ئەوەیە موسڵمان عەقیدەی بەلاوە لەهەمووشت لەپێشترو گەورەتر بێت، لەماڵی ، لەسامانی، لەکوڕی، لەخاكو نیشتمانی، چونکە ئەگەر عەقیدەمان پارێزراوبێت هەموو شتێکی ترمان پارێزراو دەبێت لەسایەی عەقیدەدا، بەلاَم ئەگەر عەقیدەمان تێکچوو، لیَ بڕانمان نەما لەپێناوی عەقیدەدا، ئەوکاتە خاوەنی هیچ شتێکی خۆمان نابین و وەك هەڵمات پاریمان پیَدەکریَو خاكو نیشتمان و ناموسمان پێشێل دەکریَ.

هەر لەم بارەیەشەوە پێغەمبەری ئیسلام (ﷺ) دەفەرمویَ: ( هیچ کەس لەئێوە ئیمانی تەواو نابێت هەتا هەواو ئارەزوی دوای ئەوە نەکەویَت کەمن هێناومە لای خواوە).

پێویستە موسوڵمانان لەم جەژنە پیرۆزەدا دەسگرۆیی یەکتری بکەین چاومان لەهەژارو نەدارەکانەوە بێت بەتایبەتی وا وەرزی کۆکردنەوەی بەرهەمی زەرع و دانەوێڵەیە بادڵمان لەگەڵ خوای خۆمان جووت کەین کەیارمەتی فەقیرەکان بدەین ئەگینا زۆر نزیکە خوا ئافاتێکی بۆ بنێریَو وەك (بیستو پێنج) دینارەکان خوا بیانکاتە ماڵی خەسار، پیاوی وامان بو بەفەردە(بیستو پێنجی) دانابوو بەزەیی بەفەقیرو بیَئاردا نەدەهاتەوە هەرخڕی دەکردو کۆی دەکردەوە، وایدەزانی (بیستو پێنجی) نایەڵیَ بمریَ، هەر خەریکی سوو خواردن بوو(بیستو پێنجی) بە(سییو پێنج) دەگۆڕایەوە، تاوەختیَ بەخۆی زانی پووڵەکانی بیَ بایەخ بوون، تەنانەت بایەخی کاغەزی سپیشان نەما کەتیایدا بنوسریَ، بەراستی ئەم بەسەرهاتە کە هات بەسەر (بیستو پێنجی) عێراقیدا دووپاتی داستانی(اصحاب الجنة) مان بۆ دەکاتەوە کەلە سوورەتی نوندا قورئان بۆمان دەگێڕێتەوە: ﴿ انا بلوناهم كما بلونا اصحاب الجنة ...﴾ باجەژنی قوربان بەهەل بزانین بۆ تازەکردنەوەی برایەتیو خۆشەویستیو هاتوچۆی یەکتریو ئاوەدان کردنەوەی وڵاتەکەمان لەسەر بناغەی دڵسۆزیو لیَبوردن بەڵکو ئاوەدانی یەکەمان پیرۆزبێت، دەوام دارو بەرهەم داربێت، وەك خوا دەفەرمویَ: ﴿ انما المؤمنون اخوة فاصلحوا بين اخويكم واتقوا الله لعلكم ترحمون ﴾ ( الحجرات: ١٠) .

واتە: باوەڕداران برای یەکن هەوڵ بدەن ناوبژی بکەن لەنێوان براکانتاندا کاتیَ ناکۆك بوون وەلەخوا بترسن و لەفەرمانی خوا دەرمەچن بەڵکو خوا بەزەیی پێتاندا بێتەوە.

پێغەمبەرمان(ﷺ) دەفەرمویَ: ( تعرض الاعمال في كل اثنين وخميس فيغفر الله لكل امريء لايُشرك بالله شيئاً الا امرا كانت بينه وبين اخيه شحناء فيقول اتركوا هذين حتى يصطلحا )(رواه مسلم)[1].

واتە: کردەوەکانی ئادەمیزاد ئاراستە دەکرێت لەهەموو (دووشەممەو پێنج شەممەیەکدا) خوایگەورە لەهەموو کەس خۆش دەبێت کە هاوەڵی بۆ خوا بڕیار نەدابێت، تەنها کەسێك نەبێت

[1] رياض الصالحين : باب تحريم الهجران بين المسلمين.

کەلەنێوان ئەوو برایەکی‌دا ناکۆکی هەبێت، خوای گەورە دەفەرموێ: ( لەم دوانە بگەڕێن تاخۆیان ئاشت دەبنەوە).

هەروەها دەفەرموێ: ( هەرکەس ساڵێك قسە لەگەڵ براکەی نەکات وەك ئەوە وایە خوێنی رژاندبێت) ئەبوداود ریوایەتی کردووە[1].

## (١٠) خۆگری لەسەر بەلاو مسیبەت

الحمد لله الذي لايبقى الا وجهه ولا يدوم الا ملكه ، وكل شئ هالك الا وجهه له الحكم واليه ترجعون ، وصلى الله على سيدنا محمد امام الصابرين واله وصحبه الميامين اما بعد

فقد قال تعالى ، في كتابه العزيز : ﴿وبشر الصابرين الذين اذا اصابتهم مصيبة قالوا انا لله وانا اليه راجعون ، اولئك عليهم صلوات من ربهم ورحمة واولئك هم المهتدون ﴾ البقرة: ١٥٥ ـ ١٥٧.

واتە: مژدە بدە بەو خۆگرانەی کاتێ تووشی کارەساتێك بوون دەڵێن: (انا لله ...هتد) واتە: ئێمە موڵکی خواین‌و بۆلای ئەویش دەگەڕێینەوە ، ئەوانە سۆزو بەزەیی پەروەردگاریان دادەبارێتە سەریان‌و هەر ئەوانەیش رێگای راستیان گرتووە.

ژیانی دنیا خۆشی تیایەو ناخۆشیشی تیایە هەردوو جۆرەکەیش تاقیکردنەوەیە بۆ بەندەکانی خوا ، بەلأم ئەو تاقیکردنەوە زیاتر زەق دەبێتەوە لەکاتی بەلأکاندا وەك لەسەرەتای ئەم ئایەتەدا دەفەرموێ: ﴿ولنبلونكم بشئ من الخوف والجوع ونقص من الاموال والانفس والثمرات ...﴾ البقرة: ١٥٥.

واتە: ئێمە تاقیتان دەکەینەوە بەهەندێك ترس‌و برسێتی‌و کەمبوونەوەی ماڵ‌و نەفس‌و بەروبوومی زەوی‌وزارو باخ‌و بێستان ..هتد

کەوابوو خۆگری لەوکاتانەدا لەبەرخاتری خوا نیشانەی پتەوی باوەڕو دامەزراوی دڵ‌و دەروونە لەسەر ئاینی خواو رازی بوونە بەبەشی خوا ، بۆیە خوایش ئەو موژدە گەورەی بۆ داناوە.

پێغەمبەرمان(ﷺ) دەفەرموێ: (هەرکات منداڵی بەندەیەك مرد خوای گەورە بەفریشتەکان دەفەرموێ: (قبضتم ولد عبدي؟ فيقولون : حمدك واسترجع فيقول الله تعالى : ابنو له بيتاً في الجنة وسموه بيت الحمد) رواه الترمذي وابن حبان[2].

---

[1] سەرچاوەی پێشوو.

[2] الكبائر : ٢٢٠.

واتە: ئایا گیانی منداڵی ئەو بەندەی منتان كێشا ؟ دەڵێن: ئەی خوایە سوپاسی تۆی كردو وتی: (انا لله وانا الیه راجعون)خوای گەورە دەفەرموێ: دەی ماڵێكی بۆ دروست بكەن لەبەهەشتدا ناوی بنێن (بیت الحمد) ماڵی سوپاسگوزاری.

(ام سلمة)دەڵێ : بیستم لەپێغەمبەری خوا(ﷺ) دەیفەرموو: (ما من عبد تصیبه مصیبة فیقول: (انا لله وانا الیه راجعون ) اللهم اجرني من مصیبتي واخلف لي خیراً منها الا آجره الله في مصیبته واخلف له خیراً منها)رواه مسلم.

واتە: هیچ بەندەیەك نیە كەگرفتاری بەڵایەك ببێتو ئەویش بڵێ: (انا لله وانا الیه راجعون)ئەی خوایە پاداشتم بدەیتەوە لەم بەڵایەداو شوێنەكەیم بۆ پڕبكەیتەوە بەچاكتر لەو. ئیللا خوای گەورە پاداشتی دەداتەوەو شوێنەكەی بۆ پڕدەكاتەوە بەچاكتر لەو.

(ام سلمة)دەڵێ: كاتێ (ابو سلمه) مرد ئەوەی پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی پێكردبووم منیش وتم: خوای گەورە لەجێی (ابو سلمة) چاكتری كرد بەمێردم كەپێغەمبەر بوو(ﷺ) رواه مسلم[1].

(معاویة)ی كوڕی (ایاس) دەگێڕێتەوە لەباوكیەوە كەپێغەمبەر(ﷺ) پیاوێك لەیارانی نەدەكەوتە بەرچاوی ، پرسیاری كرد لەحاڵی ، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا كوڕەكەی كەجەنابت دیبووت مرد. دواتر پێغەمبەر (ﷺ) تووشی هاتو پرسیاری كورەكەی لێكرد، هەواڵی دایە كەمردووە سەرەخۆشی لێكردو پاشان فەرمووی: (یا فلان أیهما أحب الیك ، ان تمتع به عمرك . أولاتأتي غداً باباً من أبواب الجنة الا وجدته قد سبقك الیه یفتحه لك ؟ )).

واتە: ئەی فڵان كەس كامیان لای تۆ خۆشترە ئەوەیان كەهەموو تەمەنت بەخۆشگوزەرانی لەگەڵ كوڕەكەت بەریتەسەر ، یان ئەوەیان كەسبەینێ هەر دەرگایەك لەدەرگاكانی بەهەشت كەتۆ بچیتە لای ئەو لێت پێشكەوتبێ‌و بۆت بكاتەوە؟

وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەوەیانم پێخۆشترە لێم پێشبكەوێ بۆ بەهەشتو بۆم بكاتەوە. فەرمووی: (فذلك لك) دەی ئەوە بۆ تۆ ، وترا ئەی پێغەمبەری خوا ئەوبەشە تایبەتە بەو یان بۆ هەموو موسوڵمانان ؟ فەرمووی: (بل للمسلمین عامة) بەڵكو بۆ هەموو موسوڵمانانە.رواه احمد ورجاله رجال الصحیح ورواه النسائي وابن حبان[2].

هەروەها لەفەرموودەیەكدا بوخاری ریوایەتی كردووە هاتووە: (... ما أعطي احد عطاء خیراً وأوسع من الصبر)[3].

واتە: هیچ كەسێك بەخششێكی پێنەدراوە چاكترو فراوانتربێت لە صەبر.

---

(1) الكبائر:٢٢٢ ، ٢٢٣.

(2) الكبائر: ٢٢٢، ٢٢٣.

(3) الكبائر:٢٢٤.

هەواڵ گەیشت بەئیمامی شافیعی کە(عبدالرحمن)ی کوری (مهدی) کوڕێکی مردووەو زۆر بۆی بێتاقەتە ، ئەویش پرسە نامەیەکی بۆ ناردوو تیایدا نووسی:

(ئەی برام سەرەخۆشی لەخۆت بکە بەوەی سەرەخۆشی لەخەڵك پێدەکەیت، چیت لا ناشیرینە بۆ خەڵکیتر بۆ خۆیشت لات ناشیرین بێت ، بیشزانە گەورەترین بەلا ئەوەیە خۆشەویست لەدەست دەیت و لەپاداشتیش بێبەش بیت، جا گەر ئەم دوانە لەگەڵ گوناهباربوونیشدا کۆببوونەوە چۆن دەبێت ؟

ئەی برام بەشی خۆت لەپاداشت وەرگرە هەرکات لێت نزیك بوویەوە ، بەرلەوەی لێت دوورکەوێتەوەو تۆ بەدوایدا برۆیت .

خوای گەورە خۆگری کاتی بەلا‌بخاتە ناودڵت و لەسەرخۆگرتنیش پاداشتمان بداتەوە ئەمجا ئەم شیعرانەی بۆ نووسی:

**اني معزيك لا أني على ثقة     من الحياة ولكن سنة الدين**

**فما المعزى بباق بعــــدميته     ولا المعزي ولو عاشا الى حين[1]**

واتە: من پرسەت لێدەکەم بەڵام نەبەومانایەی من متمانەم بەژیان هەبێ بەڵام ئەمە سوننەتی دینە.

چونکە نەپرسە لێکراو دوای مردووەکەی دەمێنێ و نەپرسەکاریش هەرچەند ماوەیەکیش بژین.

(عروة)کوری (زبیر) خۆرە(سەرەتان) دای لەقاچیو لەلاقیدا بڕییان بێ‌ئەوەی کەس بیگرێت و لەوکاتەیشدا پیر بووبوو، ئەو شەوەیش شەونوێژەکەی واز لێ نەهێنا، تەنها ئەوەندەی وت: (لقد لقينا من سفرنا هذا نصبا ) الكهف :٦٢.

واتە: بەراستی لەم سەفەرەماندا ماندووبووین ، ئەمجا فەرمووی: (اللهم ان ابتليت فقد عافيت ، وان كنت أخذت فقد ابقيت، اخذت عضواً وابقيت اعضاء ، واخذت ابنا وابقيت ابناء).

واتە: ئەی خوایە ئەگەر تاقیت کردمەوە شیفایشت بۆ ناردم ، ئەگەر لێت سەندمەوە بۆیشت جێ‌یەلاّم ، ئەندامێکت بردەوەو چەند ئەندامێکت هێشتووەتەوە ، کوڕێکت بردومەتەوەو چەند کوڕێکت بۆ جێ‌یەلاّوم.

شەوێك پیاوێکی کوێر لەهۆزی (بنو عبس) هات بۆلای وەلیدی کوری (عبدالملك) وتی: چاوەکانت بۆ کوێر بوون ؟ وتی: هیچ کەس نەبوو لەهۆزی (بنو عبس) لەمن ماڵ و سامانی زیاتر بێت ، شەوێك لەناو شیوێکدا ماینەوە لەناکاو لافاوێك دای بەسەرماندا هەرچی ماڵ و سامانم

---

[1] الكبائر: ٢٢٤.

هەبوو رایمالّیو بردی ، تەنهایەك وشترو یەك منداڵم بۆ دەرچوو ، وشترەكەش سەركەش بوو هەڵهات ، منیش منداڵەكەم جیٚهێشت و كەوتمە دوای زۆری پێنەچوو دەنگی منداڵەكەم بیست كاتیٚ بۆی گەرامەوە دیم وشترەكە قەپی كردووە بەسەری منداڵەكەداو كوشتی ، ئەمجا كەوتمە دوای وشترەكە بیگرمەوە لەقەیەكی دا لەناوچاوم شكاندیو هەردووچاوی كوێركردم ، كاتیٚ بەیانیم كردەوە نەماڵم مابوو نەخێزانو نەمنداڵو نەوشتر !! وەلید وتی: بیبەن بۆ لای عورورە بابزانێت لەسەر زەمیندا كەسێك هەیە لەوبەلاٚكەی سەخت تر بێت[1] .

(ابن عباس)(ﷺ) دەفەرموێت: بیستوومە لەپێغەمبەر(ﷺ) دەیفەرموو: (من كان له فرطان من امتي دخل الجنة) واتە: هەركەس لەئوممەتی من دووپێشەنگی هەبێت دەچێتە بەهەشت. واتە: دو منداڵی نابالغی مردبێت ـ عائیشە(رەزای خوای لێبێت) وتی: دایكو باوكم فیدات بیٚ ئەی ئەگەر كەسێك یەك پێشەنگی هەبێت ؟ فەرمووی: (ومن كان له فرط یاموفقة)واتە: ئەگەر كەسێكیش هەر یەك پێشەنگی هەبێت هەروایە ، ئەی كاربەجیٚو سەركەوتوو.

وتی: ئەی ئەگەر كەسێك لەئوممەتی تۆ پێشەنگی نەبێت ؟ فەرمووی: (انا فرط أمتي لن يصابوا بمثلي)[2] واتە: من پێشەنگی ئوممەتەكەمم تووشی هیچ بەلاٚیەك نەهاتوون لەمردنی من گەورەتر بێت بۆیان.

(ثوبان) (ﷺ)دەڵیٚ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: (ما اصاب عبداً مصيبة الا باحدى خلتين : اما بذنب لم يكن الله ليغفرله الا بتلك المصيبة ، او بدرجة لم يكن الله يبلغه اياها الا بتلك المصيبة)[3].

واتە: هیچ بەندەیەكی خوا گرفتاری موسیبەتێك نەبووە ، مەگەر بەیەكێك لەم دوو هۆكارە: یان گوناهێكی هەبووەو ، خوا لیٚی خۆشنەدەبوو، بەهۆی ئەو بەلاٚ وە نەبێت ، یان گەیشتووە بەپلەو پایەیەك بەو موسیبەتە نەبوایە نەیدەگەیشتیٚ.

خوایە توو ناوەجوانەكانی خۆت بەلاٚو نارەحەتییەكانمان بكەیت بەهۆی كەفارەتی گوناهو بەرزی پلەوپایەمان، خوایە خۆشیو شادی دنیاو قیامەتمان پیٚ عەتاكەیت ! لەگوناهی خۆمان و دایكو باوكمان ببوریت ! خوایە شیفای نەخۆشەكانمان بدەیت ...

---

[1] الكبائر:٢٢٦.

[2] الكبائر: ٢٧.

[3] الكبائر:٢٢٩.

# ( ١١ ) ساڵی نوێی خوێندن ( ١ ) ئەیلولی /٢٠٠١

سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایەی پلەی زانست و زانایانی لای خۆی بەرزکردۆتەوەو یەکەم وشەی قورئانی بە(اقرأ) دەست پێکردووە، وەفێری کردوین داوای زیادبوونی زانستمان بکەین کەدەفەرموێ: ﴿ وقل رب زدني علمًا ﴾ (طه: ١١٤).

هەزاران سەلاّت و سەلامی خوایی لەدیاری هەڵگری ئاڵای زانست و هۆشیاریو مامۆستای دنیاو پاشەرۆژی مرۆڤایەتی حەزرەتی محمد(ﷺ) کەدەفەرموێ: ( من يرد الله به خيراً يُفقهه في الدين ) (متفق عليه) واتە: هەرکەس خوا ویستی چاکەی پێی هەبێت شارەزای دەکات لەئایندا).

هەموو ساڵێك لەسەرەتای ساڵی خوێندندا خوتبەیەکمان تەرخان کردووە بۆ پیرۆزبایی و ئامۆژگاری مامۆستایان و قوتابییە دڵسۆزەکانمان، وەشایستەی ئەوەیش و زیاتریشن، چونکە بەڕاستی رەورەوەی زانست وابەدەست ئەو دوو کۆمەڵەوە بۆیە پێویستە لەیادی هەمووماندا بن، مامۆستایانی مزگەوت و ریش سپییەکان بەدڵسۆزی ئامۆژگاریان بکەن و ئاگاداریان بکەن لەو کۆسپ و هەڵدێرانەی رێگا بەکاروانی زانست دەگرێ یان سەرچاوەی روونی لێڵ دەکات.

پیاوە دەوڵەمەندەکانیش پێویستە بەماڵ یارمەتی مامۆستایان و قوتابیان بدەن، چونکە کاروانی دوورو درێژی عیلم زۆر پێویستی بەماڵ هەیە، تەنانەت دروستە لەماڵی زەکات بەشیان بدرێ، بۆدابینکردنی بژێوی خۆیان و ماڵ و منداڵیان و کتێب و پێداویستی خوێندنیان، بەمەرجێ پەیوەستی دین بن.

کربەدەستانی دەوڵەتیش ئەرکی سەرشانیان گرنگی بەمامۆستایان و قوتابیان بدەن زیاتر لەهەموو کۆمەڵێکی تر ، لەبەرئەوەی ئاستی رۆشنبیریو گەشەکردن و پێشکەوتنی بەندە بەوانەوە.

باسی یەکەم: کەباسی ئەمرۆمانە ـ ان شاء الله ـ باسی (تربية) دەکەین.

باسی دووەم: لەهەفتەیەکی داهاتوودا ـ انشاء الله . باسی (تعليم) دەکەین.

زۆر جێگای خۆیەتی وشەی(تربية . پەروەردە) پێش وشەی (تعليم) فێرکردن خراوە، چونکە بەڕاستی پەروەردە زۆر گرنگترو گرانترە لە(فێرکردن) زۆر کەس توانای فێرکردن و فێربوونیان هەیە، بەڵام کەم لەوانە دەتوانن بەشێوەیەکی عەمەلی ئەوەی دەیزانن تەرجەمەی بکەن بۆ عەمەل لەرەوشتی خۆیانداو لەکردەوەی خەڵکی تریشدا بیروێنن.

پەروەردە پیاوی خۆی دەوێ، لێبوردن لەکات و سات و ماڵ و سامانی دەوێ، ماندوبوون و شەونخونی دەوێ، خەم خواردن و نەخشەدانانی دەوێ، نوێکاریو بژارو ئاودانی دەوێ، بەڵکو زۆر شتی تری دەوێ بەقەڵەم نانوسرێ کەپەروەردەکار لەو رێگە دوورو درێژەدا تووشی دەبێ و

پێویستە زۆر بەژیری و دڵسۆزیو بۆ خوا بوون مامەڵەی لەگەڵ بکات هەتا درەختەکەی بێتە بەرو وشك نەبێت.

پەروەردە مانای لەگەڵدا ژیان، مانای رۆچوون لەناخی پەروەردەکراودا هەتا بەتەواوی لەهەستو نەستەکانی دەگەیتو نەخۆشییەکانی دەست نیشان دەکەیتو دەرمانی شیفا بەخشی بۆ دیاری دەکەیت.

من وادەزانم زانست بۆیە ئەو پلە گەورەی پێدراوە بەئایەتی قورئان : ﴿ يرفع الله الذين امنوا منكم والذين اوتوا العلم درجات ﴾ هەر لەبەر خاتری ئەوەیە زانست رێنمایمان دەکات بۆ راستییەکانو کلیلی دەرگای پەروەردەیە، هەر بۆیە پێغەمبەریش(ﷺ) بەعەلی دەفەرموێ: ( لأن يهدي الله بك رجلاً واحداً خير لك من حمر النعم ) (متفق عليه) واتە: ئەی عەلی ئەگەر خوا بەهۆی تۆوە یەك کەس بخاتە سەر رێگەی راستی ئەوە بۆ تۆ چاکترە لەهەرچی وشتری سوور هەیە).

یان دەفەرموێ: ( من دعا الى هدى كان له من الاجر مثل اجور من تبعه لاينقص ذلك من اجورهم شيئاً ( رواه مسلم) واتە: هەرکەس خەڵکی بانگ بکاتو رێنماییان بکات بۆ راستی ئەوە وێنەی ئەجری هەموو ئەو کەسانەی دەست دەکەوێت کەدوای دەکەونو بەقسەی دەکەن، بێئەوەی پاداشتی ئەوان هیچ کەم بکات.

ئیتر لێرەوە بۆمان دەردەکەوێت ئەرکی سەرشانی مامۆستایانمان زۆر گرانەو پاداشتەکەیان زۆر گەورەیە ئەگەر بەدڵسۆزی ئەو ئەرکە ئەنجام بدەن.

هەرکەسێ لەئێمە رەنگە ئەگەر دووکاتژمێر منداڵێکمان دیار نەبێت وەقرەمان لێدەبڕێ! بەڵام بەیانی تا نیوەڕۆ، یان نیوەڕۆ تا ئێوارە، یان لەپلەی زانکۆدا بەیانی هەتا ئێوارە منداڵەکانمان لەچاومان ون دەبن، دڵمان هیچ ناکات چونکە دەڵێین هان لەبەردەست مامۆستاکانداو ئەوانیش وانەی رەوشتو زانستیان پێدەڵێن لەجێگای باوكو دایکیانن.

کەوابوو ئای چەند بەختەوەرە ئەو مامۆستایەی بەدڵسۆزیو باوكو دایك ئاسا تەماشای منداڵەکانی بەردەستی دەکاتو فێری خواپەرستیو مرۆڤ دۆستیو رەوشت بەرزییان دەکات، ئامادەیان دەکات بۆ ئەوەی سبەینێ هەربوارێکی ژیانیان گرت کەسێکی لەخواترسو ئەندامێکی بەکەڵکیان لێدەرچێ بۆ کۆمەڵگای کوردەواریو مرۆڤایەتی.

لەهەمان کاتیشدا ئای چەند بەدبەختو گزیکارە ئەو بەناو مامۆستایەی منداڵی خەڵکی فریو دەداتو ئەیانکات بەدوژمنی خواو بەرنامەکەی خواو بەدڕەوشتییان لاجوان دەکاتو بەرۆشنبیری ناوی دەبات!

بەم بۆنەیەشەوە یادی باوكو دایکی منداڵەکان دەخەینەوە کەبەراستی پەروەردەی منداڵ تەنها بەمامۆستا تەواو نابێت، درەختی پەروەردە تەنها بەقوتابخانەکان بەرناگرێت، چونکە منداڵ تەنها

چوار سەعات لەقوتابخانەیە بیست سەعات لەماڵەوەیە بۆیە پێویستە لەماڵیشەوە زۆر بەوردی خەمیان بخۆن لێیان بپرسین کێ مامۆستاتانە، پرسیاری یەکەیەکەی دەرسەکانیان بکەین، ئەگەر لەدەرسێکدا لاواز بوون یارمەتیان بدەین، ئەگەر زیرەك بوون هەڵیان بنێین و ئەگەر دینارێکیش بووە بەخششیان بدەینێ.

هەروەها پێویستە بپرسین لێیان کێ هاورێیانە؟ دوای قوتابخانە بۆ کوێ دەچن؟ سەردانی کێ‌دەکەن؟ بەتایبەت لەپلەی ناوەندەی و ئامادەیی‌دا زۆر ئاگامان لێیان بێت چونکە لەوماوەیەدا فام و هۆشی دەکرێتەوە و بۆچوون و بیروباوەری خۆی دیاری دەکات بۆیە پێویستە لەم ماوەیەدا رەوشتی بەرزو ئاینی ئیسلام بدەین بەگوێی منداڵەکانماندا، بەجوانی تێیان بگەیەنین، ئەگەر دایك و باوکێك خۆیان ناتوانن بیانبەن بۆ مزگەوت و مامۆستای دڵسۆزیان بۆ پەیداکەن، لەخەمیاندا بن چونکە گەر وانەکەن منداڵەکانیان گورگان خوارد دەبن لەدواییدا پەشیمانی سوودی نابێت،لەدنیا گیرۆدەی دەستی بەدکارییان دەبن و، لەپاشە رۆژیشدا خوا پێیان دەفەرموێ: ئەو منداڵانە سپاردەی من بوون لای ئێوە بۆچی زایەتان کردن؟ دەبێ تاوانی ئەوانیش و وەچەکانیشیان لەملی ئێوە بێت .

هەروەها زۆر بەوردی ئاگاتان لەکچەکانتان بێت هەر لەپۆلی یەکی سەرەتاییەوە وردە وردە فێری جلی درێژیان بکەن با رابێن لەسەری، فێری قۆڵ رووتی و قول رووتیان مەکەن چونکە کە گەورە بوون دەرەقەتیان نایەن و زەمانەیان لەگەڵە.

مەترسن لەهەرەشەی هەندێ مامۆستا کەدەڵێن گەر سەرو قۆڵ رووت نەکەن دەریان دەکەین، چونکە ئەوانە هیچ بەدەستن دەیانەوێ بۆچوونی خۆیان فەرز کەن، خۆ ئەگەر وایش بوو منداڵەکانتان لەقوتابخانە دەربکرێن پیرۆزترە لەوەی لەدین و رەوشت دەربکرێن، دەخیلە وریابن! دەخیلە ژیرو بەئاگابن!

خوایە هیدایەتی منداڵ و وەچەتازەکانمان بدەیت بۆ رێبازی ئیسلام و رەوشتی جوان و خزمەتی وڵات.

خوایە گیان دایك و باوك و مامۆستاکانمان وریابکەیتەوە بۆ خەمخۆری مناڵەکان و هێزو تینیان بدەیتێ بۆ خۆگری و نەفەس درێژی لەپەروەردەیاندا(ئامین).

# ساڵی نوێی خوێندن(٢)

بەشی دووەم لەباسەکەی هەفتەی رابوردومان تەرخان دەکەین بۆباسی (تعلیم) واتە فێرکردن، سەرەتای باسەکەمان بەم ئایەتەی قورئان دەست پێدەکەین کەدەفەرموێ: ﴿یرفع الله الذین امنوا منکم والذین اوتوا العلم درجات والله بما تعملون خبیر﴾ (المجادلة: ١١).

واتە: خوای گەورە چەند پلە باوەڕداران بەرزدەکاتەوە لەگەڵ ئەو کەسانەیش دا کە زانستیان پێ بەخشراوە.

(ابن مسعود) لەتەفسیری ئەم ئایەتەدا دەفەرموێ: ئەم ئایەتە وادەگەیەنێ باوەرداری زانا پلەی بەرزترە لەباوەڕداری نەزان لەفەرمودەیەکیشدا هاتووە : ( فضل العالم علی العابد کفضل القمر لیلة البدر علی سائر الکواکب) (حدیث حسن أخرجه أبوداود والدارمي ).

واتە: گەورەیی زانا بەسەر خواپەرستدا وەك گەورەیی مانگی شەوی چواردە وایە بەسەرباقی ئەستێرەکاندا.

هیچ گومانمان لەوەدانی‌یە ئەم هەموو گەورەیی‌و رێزە کەدراوە بەزانایان لەبەرئەوەیە کەزانست رێگای دۆزینەوەی راستی‌یەکانە، گەورەترین راستیش دۆزینەوەی خوای گەورەیە، بۆیە خوا دەفەرموێ: ﴿ انما یخشی الله من عباده العلماء ان الله عزیز غفور ﴾ (فاطر: ٢٨) واتە: ئەوەی بەجوانی بترسێ لەخوا لەناو بەندەکانیدا تەنها زانایە خوایش بڵندو لێبوردەیە).

دوای ئەم پێشەکی‌یە دەبێ ئەوەیش بزانین(تعلیم) فێرکردن لەدوو باڵ پێك دێت: مامۆستاو قوتابی، بۆیە پێویستە ئەو دوو تاقمە گرنگی‌یەکی تەواوی پێبدرێ لەهەموو لایەنەکانی دەسەڵات‌و کاریگەری‌یەك کەلەوڵاتدا هەبێ، پێویستە خەمی تەواویان بخورێ هەتا بەرهەمی تەواو بدەن بەدەستەوە.

جا ئێمەیش لەسەر ئەم دوانگەوە تەنها توانای ئامۆژگاریمان هەیە لەخوایش داوا خوازم ئامۆژگاری‌یەکانمان کاریگەر بێت.

پێشەکی روودەکەینە قوتابی‌یە دڵسۆزەکان‌و بەچەند خاڵێك ئامۆژگاریان دەکەین:

## یەکەم/ نیاز پاکی:

پێویستە قوتابی لەهەر پلەیەکی زانستی‌دا بێت نیازی پاك بکاتەوە لەهەموو چڵك‌و پڵك‌و دنیاویستی‌یەك دەبێ مەبەستی بەو خوێندنە رەزامەندی خوابێت‌و فەرمان بەچاکەو رێگری لەخراپە بێت، دەبێ مەبەستی ئەوەبێت بەو زانستە خزمەتی بەندەکانی خوابکات، سەر رووی زەمین بەچاکە ئاوەدان بکاتەوە وەك پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێ: ( انما الاعمال بالنیات وانما لکل

مريء مانوى ) واته: كردهوهكان بهگوێرهی نیازی دڵ پاداشتیان دهدرێتهوه، ههموو مرۆڤێكیش ئهوهی بۆ ههیه كهخۆی نیازی كردووه.

بۆیه من روودهكهمه ئهو قوتابیانهی لهپۆلی شهشه من خۆیان زۆرماندو دهكهنو شهوڕۆژ دهخوێننهوه ههتا كۆلیژی پزیشكی یان ئهندازیاری وهریان بگرێت ئهگهر مهبهستیان بهو پلهیه ژیانی دنیاو كۆكردنهوهی پاره بێت، یان ناوو شۆرهتی بهرزبێت ئهوه رهنجه رۆن، بۆیه تازووه بانیازی خۆیان پاك بكهنهوهو رهزامهندی خواو خزمهتی بهندهكانی ئهو بكهن بهمهبهست.

لێرهدا جێگهی خۆیهتی ئهم فهرموودهی غهزالیتان بۆ نهقڵ بكهم كهله ناميلكهی (ايها الولد)دا بۆ قوتابیيهكی خۆی نوسیوه كهدهفهرموێ: ( ايها الولد كم من ليال أحييتها بتكرار العلم ومطالعة الكتب، وحرمت على نفسك النوم، لا اعلم ماكان الباعث فيه؟ ان كان نيل عرض الدنيا وجذب حطامها وتحصيل مناصبها والمباهاة على الاقران والامثال فويل لك ثم ويل لك، وان كان قصدك فيه احياء شريعة النبي(ﷺ ) وتهذيب اخلاقك وكسر النفس الامارة بالسوء فطوبى لك ثم طوبى لك).

ئهی رۆڵه چهندین شهو تابهیانی شهو نخونیت كردووه خهریكی پێداچوونهوهو تهماشای كتێب بویت خهوت لهچاوی خۆت حهرام كردووه نازانم چی ههڵیناویت؟ ئهگهر بهتهمای ژیانی دنیاو ماڵو سامانو بهدهست هێنانی پلهوپایهكانی، یان فهخرو شانازی بهسهر هاورێو هاوژینهكانتا ئهمهت كردووه، ئهوه سزا بۆ تۆ، دیسانهوه سزا بۆ تۆ، بهڵام ئهگهر مهبهست زیندووكردنهوهی شهریعهتی پێغهمبهرو(ﷺ) خاوێن كردنهوهی رهوشتو زاڵ بوون بهسهر خراپهكانی دهروندا خۆتت ماندو كردووه ئهوه بهختهوهری بۆ تۆ دیسانهوه بهختهوهری بۆ تۆ.

راستی فهرمووه ئهوشاعیرهی كهدهڵێ:

**سهر العيون لغير وجهك ضائع وبكاؤهن لغير فقدك باطل**

واته: شهونخونی چاوان بۆ تۆ نهبێ بهزایه چووه، گریانی چاوانیش بۆتۆ نهبێ بێهوده رۆیشتووه).

## دووهم: رێزگرتن لهمامۆستا:

مامۆستا ههرچی بێتو ههرچۆن بێت پێویسته قوتابیيهكان رێزیان بگرن چونكه ئهوان هۆكاری گهیاندنی زانستن تهنانهت ئهگهر مامۆستایهك لهپۆلدا بهئاشكرا دژایهتی ئاینیش بكات دهبێ قوتابی زۆر بهئهدهبهوه وهڵامی بداتهوه چونكه ژووری وانه خوێندن شوێنی جیهادو شمشێربازیینیيه، دهبێ ﴿ وجادلهم بالتي هي احسن ﴾ لهوشوێنانهدا بخرێته كار، ئهمرۆش قوتابی بهخواستی خۆی مامۆستا ههڵنابژێرێ تابتوانێت لای مامۆستایهك بگوێزێتهوه بۆ شوێنێكی تر، لهبهرئهوه ناچارین بهجوانی مامهڵه بكهین بهزانست بهرگری لهئاینهكهمان بكهین.

## سێیەم: هەوڵدان و شەونخونی:

پێویستە قوتابی خۆشەویست بزانێت تەمەنی لاوی فرسەتە وە مرۆڤ هەرچی بچێنێ ئەوە دەدورێتەوە خوایش دەفەرموێ: ﴿ وان ليس للانسان الا ماسعى وان سعيه سوف يرى ﴾ واتە: مرۆڤ تەنها ئەوەی دەست دەکەوێ کەخۆی هەوڵی بۆداوە، وەبەرهەمی هەوڵ و کۆششەکەیشی لەمەودوا دەبینرێ.

ئەم یاسای هەوڵ و کۆششە لەزانستدا زیاتر لەهەموو لایەنێکی تردیارە، زاستیش وەك ماڵ و سامان نی یە ئەگەر لەتەمەنی منداڵیو لاویتیدا بەدەست نەهێنرێ ئیتر کات بەسەردەچێت وەك شافیعی دەفەرموێ:

**ومن فاته التعليم وقت شبابه　　　فكبر عليه اربعاً لوفاته**[1]

واتە: هەرکەس لەگەنجیدا فێربوونی لەدەست چوو ئەوە چوار(الله اكبر) ی لەسەر بکە (واتا مردووە).

کاتی منداڵی بۆ فێربوون ئاڵتونی یە تەمەنی لاویش وەك زیو وایە جابراو خوشکی لاوم ئەگەر ئاڵتونەکەت لەکیس چووە وریابەرەوە بازیوەکەیشت لەدەست نەچێ، چونکە دوای ئەوە هیچ دەرفەتت نامێنێت .

هەوڵ بدە ماندوو نەناس بە، کاتت بەزایە نەدەیت، خۆت بەشتی پڕوپووچ و بەرنامەی پوچەڵی کەناڵە جیاجیاکانەوە خەریك مەکە، چاووبیرو هەست و مێشکت بەشتێکەوە ماندو مەکە کەدژ بەرەوشت و دژ بەئاین و بەزانست بێت، وەبیش زانە وێنەی هەر ئافرەتێك کەتۆ تەماشای دەکەیت روو بەروویان لەسەر شاشەی کەناڵەکان شوێنەوارێکی خراپ لەمێشك و دڵتدا بەجێ دێڵێ، سەدان دێڕی خوێندنەوەت لەدەست دەدات و دواتریش زۆر بەگران رزگارت دەبیو دەروونت خاوێن دەبێتەوە.

من ئامۆژگاریت دەکەم بەم فەرموودەی شافیعی کەدەفەرموێ:

**أخي لن تنال العلم الا بستة　　　سانبيك عن تفصيلها ببيان**

**ذكاءٌ وحرصٌ واجتهاد وبلغة　　　وصحبة استاذ وطول زمان**[2]

واتە: ئەی برام ناگەیتە زانست بەشەش شت نەبێت من ئاگادارت دەکەم لێیان ، زیرەکی، گەرم و گوڕی، هەوڵدان، پارووی ژیان، هاوڕێیەتی مامۆستا، زۆرمانەوە لەسەر ئەوکارە.

---

[1] ديوان الامام الشافعي ، قافية التاء.

[2] سەرچاوەی پێشوو : قافية النون.

قوتابی تەمەڵو تەوەزەل کەخەمی وانەکانی ناخوات یان لەکولآن یاری دەکات، یان چاوی بریوەتە شاشەو کەناڵەکان، نابنە پیاوی دوارۆژ، ناگەنە مەنزڵ. گوێگرن لە(ابن الوردی) کەدەفەرموێ:

| | |
|---|---|
| اطلب العلم ولا تكسل | فما أبعد الخير على أهل الكسل |
| لاتقل قد ذهبت اربابه | كل من سار على الدرب وصل |
| لاتقل اصلي وفصلي ابداً | انما اصل الفتى ماقد حصل [1] |

بگەڕێ بەدوای زانستدا تەمەڵ مەبە، خێرو چاکە دوورە لەخەڵکی تەمەڵ، مەڵێ زانست کەسی بۆ نەماوە، هەرکەس ڕێگا بگرێت دەگاتە مەنزڵ، مەڵێ ئەسڵم و ڕەگەزم فلآن و فیسارە، ڕەگەزی هەموو کەسێ ئەو چاکەو مەردایەتی‌یەیە کەخۆی بەدەستی دێنێ.

دیسان لێتان دووپات دەکەمەوە ئاگاتان لەمنداڵەکانتان بێت پەروەردەی جوانیان بکەن دەستی دڵسۆزیان لێ‌مەبڕن، بەداخەوە قوتابخانەو ناوەندی‌و ئامادەیی‌و زانکۆکان بوون بەهەوارگەی زۆر بیرو باوەری دژ بەئیسلام گەر زۆر وریانەبین منداڵەکانمان زایە دەبن لەناو ئەوبیرو بۆچوونە پوچەڵانەدا، بەشێوەیەك دەتوانم بڵێم: زانست لەو شوێنانە ئەمڕۆ وەك کوپەیەك ئاڵتون وایە کەوتبێتە ناو کێڵگەیەکی لوغمەوە، مرۆڤی ژیرو وریاو بەئاگای دەوێ دەری بهێنێ‌و نەیەڵن لوغمەکانی پیا بتەقێتەوە.

لەکۆتایی‌دا دوعا بکەین‌و بڵێین: ( رب زدني علماً والحقني بالصالحين ) خوایە زانستمان پەرە پێ بدەیتو بمان خەیتە نێو کاروانی پیاوچاکانەوە، خوایە دەسگرۆیی منداڵەکانمان بکە بۆ ڕێبازی زانستو دینداری پێکەوە.

خوایە منداڵەکانمان بپارێزە لەفێڵ‌و تەڵەکەی شەیتانەکان‌و داوی دوژمنانی دین. ئامین .

## ( ١٢ ) پەیامێك بۆ دایکان‌و باوکان /ئەیلولی ٢٠٠٠

الحمد لله ... قال تعالى ﴿ اقرا باسم ربك الذي خلق ... ﴾

پێشەکی پیرۆزبایی لەمامۆستایان‌و قوتابیان دەکەم بەهۆی هاتنی سەری ساڵی نوێی خوێندنەوە، یاخوا ئەمساڵ ساڵی خۆشی‌و ئاشتی بێت‌و، ساڵی عیلم‌و زانست بێت، ساڵی بارانی بەڕەحمەت‌و تەوبەو پەشیمانی بێت! ( ئامین).

جا بەم بۆنەیەوە ڕوودەکەمە دایکان‌و باوکانی بەڕێزو پەیامی ئەمجارەم بۆئەوانەو دەڵێم:

ئەی دایکی دڵسۆز ئەی باوکی خەمخۆر! من ناڵێم: بامناڵەکانتان نەزان بن چونکە من دەمەوێ سەرچاوەی وتەکانم قورئان‌و فەرموودەبێت ئەوەتا قورئانیش یەکەم ئایەتی بەوشەی(اقرا)دەستی

---

[1] قواعد اللغة العربية، السادس العلمي : ( ٢٨).

پێکردووە ناوی قەڵەم لەقورئاندا چوارجار هاتووە دووانیان بەتاك دووانیـان بـەکۆ، وەدووجـ ناوی (قرطاس)هاتووە جارێ بەتاك و جارێ بەکۆە (اقرا)و (مشتقات)ی (٨٨) جـار لـەقورئاند هاتووە وەك لە (المعجم المفهرس)ی (محمد فؤاد عبدالباقي)داهاتووەو سـوورەتێك لـەقورئا بەناوی (القلم)ەوەیە.

بێگومان ئەمانە هەمووی بەڵگەی رونن لەسەرئەوەی ئاینی پاکی ئیسلام زۆر گرنگی بەخوێندن داوەو، وەناوی پەیامەکەیشی قورئانە کەبەمانا خوێندنەوە دێت.

وە ئـەم گرنگی‌یـەی ئیسـلامیش بـەخوێندنو قەڵـەم و بـەیان(اعجـاز)ی عیلمـی قورئانـە . وەك لەچەند خوتبەیەکدا باسمان کرد . گەورەترین (معجزة)ی پێغەمبەری خۆمانە(ﷺ) کەدینەکەی تـ رۆژی قیامەت باقی دەبێت وەلەهەموو سەردەمێکدا خوا تازەکەرەوەی بۆ دەنێرێ.

پێش چـەند سـاڵێ بیسـتان منـاڵێکی ئـێرانی چـۆن لەتەمـەنی(٥) سـاڵاندا هـەموو قورئـانی لەبەربوو بەهەموو (قراءة) ەتەکانی لەگەڵ تەفسیرەکەیدا وەتا ئێستا ئەو منداڵە چەندین بڕوانامەی ماجستێرو دکتۆرای هێناوە لەزانکۆکانی جیهاندا.

لەم رۆژانەیشدا دیتان کەناڵی یەککگرتوو منـاڵێکی خستە ڕوو بەناوی(شێخ شریف) منـاڵێکی هەتیو لەتەنزانیای ئەفەریقیا لەتەمەنی دوو مانگیدا دێتە گۆو یەکەم قسەیش بەم ئایەتەی قورئان زمان دەگرێ ﴿ یا ایها الذین امنوا توبوا الی الله ... ﴾ لەتەمەنی (٥) ساڵیدا لێهاتووترین خەتیبی لێدەردەچێ، زۆر لەقورئانو فەرموودەکانی پێغەمبـەری(ﷺ) لەبەرەو بەزمانی تـەنزانی تەرجەمـەی دەکاتو عالەمی سەرسام کردووە.

ئەمانە لـەم چەرخانـەدا نموونـەی راسـتیو پـاکی دینـی محمـدە(ﷺ) بۆیـە پێویسـتە ئێمـەیش مناڵەکانمان رابهێنین لەسەر ئەوپەیامە زانست دۆستە.

بەڵام جێگای داخە خوێندنو قوتابخانەو زانکۆ لای ئێمە خەریکە لەتـەوەرەی خـۆی لادەداتو تەنها ناوی بێ ناوەڕۆك بێت.

هـەر لەگـەڵ کردنـەوەی قوتابخانـەکان کـۆڵانو سـەرجادەکان رۆژی چوارجـار (بـەیانی، نیـوەڕۆ. نیوەڕۆ، ئێوارە) پڕدەبن لەکچۆڵـەی گـەورەو بچـووك دێنو دەچن بـەڕووتیو جوانـترین ئارایشـیان کردووە، گەورەترین فیتنە بەرپادەکەن بۆ خۆیانو لاوان، جا باوکانو دایکانی بەرێز ئامۆژگاریم بۆتان ئەوەیە هەر لەسەرەتای ساڵەوە ئاگاتان لەمناڵەکانتان بێت چونکە ئێستا بناغەیە بۆ هەموو سـاڵەکەو تەمـەنی لاویـش بناغەیـە بـۆ هـەموو تەمـەن وە ئـەم حـەوت خاڵـە ڕەچـاو بکـەن لەپەروەردەیاندا:

**خاڵی یەکەم/** رایان بێنن لەسەر نوێژو رۆژوو هەر لەحەوت ساڵیەوە زۆر بەوردیو نەرمونیانی فێری نوێژیان بکەن، ئەگەر خۆتان باش نازانن مامۆستایان بۆ پەیداکەن بافێریـان بکـات، لەگەڵ

خۆتان بیانبەن بۆ مزگەوت بەپاكو خاوێنی، ئەوەتا پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرمویّ: ﴿ مروا اولادكم بالصلاة وهم ابناء سبع سنين واضربوهم عليها لعشر ...) واتە: فەرمان بدەن بەمناڵەكانتان بانوێژ بكەن لەحەوتساڵیدا لەدەساڵیشدا لێیان بدەن ئەگەر نوێژیان نەكرد.

خاڵی دووەم/ چاودێریان بكەن لەرەوشتو سلوكیاندا بارەوشت بەرز بن دووربن لەدرۆو دزیو گزیو داوێن پیسیو بەدرەوشتیو كینەبەرییو دەم شڕیو جنێودانو ...هتد چونكە بەراستی منداڵ لەكۆڵانو سەرجادەدا جۆرە هەڵسو كەوتو جنێودانێك فێربوون زۆرجێگای مەترسییە گەر فریایان نەكەوین، پەیامی پێغەمبەری ئیسلامیش رەوشت بەرزییە ( انما بُعثت لأتمم مكارم الاخلاق ) زۆر سەیرە لەو كۆڵانانەدا دەبینم مناڵان جنێوی زۆر ناشیرین بەدایكو باوكو خوشكی یەكتری دەدەن، دایكە كانیشیان گوێیان لێیە بەدەمیانەوە پێدەكەنن.

خاڵی سێیەم/ مناڵەكەت كورە یاكچ بزانە هاورێی كێیە؟ چونكە بەراستی ئەمرۆ هاوریّ گەورەترین دەور دەبینیّ زیاتر لەمامۆستاو دایكو باب كاریگەرە، هاورێی چاك مناڵەكانمان فێری نوێژو تاعەتو راستگۆیی دەكات، هەر هاورێی خراپیشە چەندین مناڵی لەرێگای قوتابخانەدا فریودا و وازی پیّ لەخوێندن هێنا، رەوشتی ناشیرینی فێركرد، چەندین كچۆڵەی ناسكو جوانیان لەماڵی باوكو دامێنی دایك تاركرد، چەندین مناڵی مزگەوتیان فێری درۆو دزیو بەدكاری كردو لەمزگەوت تاریان كردن، هەر دەربارەی رەفیق پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرمویّ: ( انما مثل الجليس الصالح وجليس السوء كحامل المسك ونافخ الكير، فحامل المسك اما ان يحذيك واما ان تبتاع منه واما أن تجد منه ريحاً طيباً،ونافخ الكير اما أن يُحرق ثيابك ، واما ان تجد منه ريحاً منتنة ) ( متفق عليه)[1] .

واتە: نموونەی هاورێی چاكو هاورێی خراپ وەك ئەوكەسە وایە میسكی هەڵگرتووەو ئەوكەسەیش كەفوودەكات بەهەمانەی ئاسنگەردا ، ئەوكەسەی میسكی پێیە یان بە شت دەدات یان لێی دەكڕیت یان بۆنێكی خۆشی لێدەكەیت، ئەوەكەسەیش فوودەكات بەهەمانەدا یان جلەكانت دەسوتێنیّ یان بۆنێكی ناخۆشت لێدەس دەكەوێت ).

خاڵی چوارەم/ زۆر ئامۆژگاری مناڵەكانتان بكەن بارێز لەمامۆستاكانیان بگرن مامۆستا هەرچی بێت مادام دڵسۆزبێت بەعیلم پێویستە رێزی لێبگیرێت، قوتابی سەركەوتوو نابێت لەخوێندن هەتا رێز لەمامۆستا نەگرێت . بەڵام لەهەمان كاتیشدا پێویستە مامۆستاكانیش رێز لە زانست بگرن، وانەیەك( اختصاص)ی خۆیان نەبێت وەری نەگرن، بۆئەوەی بتوانن هەقی وانەكان بدەن، وانەی ئاین بۆ دەسپێرن بەنوێژ نەكەر زۆر جێگای داخە دوورە لەیاساو ویژدان.

---

[1] رياض الصالحين: باب زيارة اهل الخير ومجالستهم /١٩٤.

**خاڵی پێنجەم/** بڵێن بەمناڵەکانتان با زۆر هەوڵ بدەن، فەترەی منداڵیو گەنجی وەرزی خوێندنە، کە گەورەبوون ئیتر ئەو وەرزە بەسەر دەچێ ئەو هەلە لەدەستیان دەچێ، باتەمەنیان بەزایە نەدەن بەدوای یاریو تۆپو سەنتەرو گەرانی نێو جادەو کۆڵانەکان وەك وتراوە: ( الحفظ في الصغر كالنقش على الحجر) واتە: لەبەرکردن لەمنداڵیدا وەك هەڵکەندن وایە لەسەر بەرد.

**خاڵی شەشەم/** منداڵەکانتان وافێرمەکەن کەتەنها بۆ دنیا بخوێنن بەڵکو فێریان بکەن کەخوێندن بەختەوەری دنیاو قیامەتی تیایە، خوێندەواری راستەقینە بەراستی خوادەناسێ ﴿ انما يخشى الله من عباده العلماء ﴾ خوێندەواریی چاوساغی‌یە بۆ رێگای هەردوو دنیا هەر گوندێ هەر شارێ هەر ولاتێ چەندە خوێندەواریی تیا پێشکەوتووبێت ئەوەندە سەربەرزە، دەوڵەمەندی ماڵ هەر بۆخۆیو ماڵو منداڵی سوودی هەیە کەم کەسیان سوودیان بۆ خەڵکی تر دەبێ، بەلام زانا سوودی بۆ عام هەیە. بەکورتی منداڵەکانتان وەها پەروەردەکەن توێشووی پاشە رۆژتان بن ( صدقة جارية) بن ( اذا مات الانسان انقطع عمله الا من ثلاثٍ صدقةٍ جارية او علم يُنتفع به أو ولدٍ صالح يدعو له):مسلم ١٦٣١

واتە: کاتێ مرۆڤ دەمرێ ئیتر کردەوەی نامێنێ. خێری بۆ ناچێت مەگەر لەسێ رێگەوە نەبێت خێرێکی نەبڕاوەی جێ‌یەلابێ، یان زانستی‌یەکی واسوودی لێوەربگیرێ، یان منداڵێکی صالح بۆی بپارێتەوە.

بێگومان منداڵێك سوودی دەبێو دایكو باوکی خۆی لەیاد ناچێت کەخۆی دڵی بەئاگابێتو ترسی خوای تیابێت، چونکە منداڵێ بۆخۆی نەبێتو غەمی قیامەتی خۆی نەخوات چۆن خێرو چاکەو پارانەوە بۆ دایكو بابی دەنێرێ؟. وەك مامۆستا مەلا کەریمی مدرس دەفەرموێ:

رۆڵەی ئازیزم بەندی جەرگەکەم — یادگارەکەم لە پاش مەرگەکەم
هەرچی زانستە بۆ تۆ بەسوودە — عیلم رەهنومای رێگای مەقسوودە
هەر عیلمێ باسی پێویستی دینە — لەسەر تۆ فەرزی عەینی یەقینە
پاش ئەمە عیلمی ئیخلاصی دڵە — بێ ئیخلاصی دڵ نەجات موشکوڵە
بێ پاکی لەگشت رەزیلەی نەفسی — ئاگەی بەنەشەی ئەنواری قودسی
پاش ئەمە هەرچی بۆ ژین بەسوودە — بۆ ئادەمیزاد فەرزو مەقسوودە
یافەرزی عەینە لەسەر هەموو کەس — یا بەچەند کەسێ کیفایەتە و بەس
بەهار بانگ ئەکا ئەی رۆڵەی هۆشیار — هۆش بۆ زانستە و زانستیش بۆ کار
زانستی ئادەم وێنەی گەوهەرە — گەوهەر دەسمایەو بەشی بەشەرە
رەهبەری ئازدار فەرموویە پێمان — تێکۆشان بۆ عیلم فەرزە لەسەرمان
بێ‌عیلمو زانست ئاگەن بە پایە — کۆمەڵی نەزان سووك و ریسوایە [1]

---

[1] بەهارو گوڵزار : ل ٣٤.

**خاڵی حەوتەم/** ئەخیرو هەرە گرنگ صەد دەخیل کچەکانتان رووت مەکەنەوە مەیانکەن بەبووکی کووچەو کۆڵانو چاكو خراپ، من نازانم ئەو باوكو دایکەی کچەکانیان بەرووتی دەبینن چۆن روویان دێ سەیریان بکەن؟ کاتێ کچەکانیان بەرووتی دەردەچن چۆن روویان دێ سەر دەربێنن؟ چۆن روویان دێ چاو هەڵبێنن؟ چۆن روویان دێ بچنە کۆمەڵ؟ چۆن روویان دێ باسی کچو ژنی خەڵك بکەن ؟ چۆن ... چۆن ؟.

بەڕاستی زۆر جێگای سەر سوورمانە جێگای حیرەتو تیامانە پیاو پۆشتەو پەرداخ جامانەی لەسەردایە، کەشیدەی لەپشت دایە گەر تۆزێ شەرواڵەکەی کورت بێتو قولەپێی دەرکەوێ گاڵتەی پێدەکەن؟ یان لەوانەیە جەنگێ بەرپابکات لەگەڵ خەیاتی شەرواڵەکەیدا، کەچی کچەکەی ، ژنەکەی تاپشتی ئەژنۆی رووتە، فەتحەیەکیش والە تەنوورەکەیدا، جارجار ژوورتریش دەردەکەوێت، سینگو بەرۆکی هی هەموانە کەچی هەر بەخەیاڵیدا نایەتو شەویش تێر خەودەبێت گوێ بگرن پێغەمبەرمان(ﷺ) دەفەرمووێ: ( من جرَّ ثوبه خُيلاء لم ينظر الله اليه يوم القيامة ) واتە: هەرکەس جلەکانی درێژ بکاتو رایبکێشێ بەزەویدا بۆفیز، خوا تەماشای ناکات رۆژی قیامەت، (ام سلمة) پرسی: ئەی ئافرەتان چی بکەن بەدامێنی جلەکانیان؟ فەرموی: (بابستێك بەرەو خواری کەنەوە( ( ام سلمة) وتی: لەوکاتەیشدا قاچیان دەردەکەوێ فەرمووی: باگەزێك بەرەو خوارویکەنەوە زیاتری نەکەن) (ئەبوداودو تیرمزی ریوایەتیان کردووە)[1].

ئەم گەزە مەبەستی ئەوەیە لەخوار ئاستی جلی پیاوانەوە، چونکە جلی پیاوان هەق وایە لەنێوان ئەژنۆو قولەپێدابێت، وەك لەفەرمودەیەکیتردا ابوداود) ریوایەتی کردووە: ( ازرة المسلم الى نصف الساق ...) واتە: کراسی موسڵمان تا ناوەراستی لاقییەتی داواکارم خوای گەورە رێنمایی خۆمانو منداڵەکانیشمان بکات بۆ دەست گرتن بەپەیامە راستەکەی خۆی ...(ئامین).

## ( ١٣ ) ـ ئاو / ١٩٩٩/٥/١٤

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ ... وينزل عليكم من السماء ماء ليطهركم به ويذهب عنكم رجز الشيطان وليربط على قلوبكم ويثبت به الاقدام ﴾ (الانفال: ١١).

ئەم ئایەتە پیرۆزە هەرچەند دەربارەی غەزای بەدر نازڵ بووە بەڵام چەند سیفەتێکی ئاووبارانی باس کردووە هەتا هەتایە باران ئەو سیفەتانەی هەر تیادەمێنێ.

واتە: خوای گەورە بارانتان لەئاسمانەوە بۆ دائەبەزێنێ بۆ ئەوەی پاكو خاوێنتان بکاتەوەو پیسیو چەپەڵی شەیتان لەسەرتان لابەرێو دڵ پتەوو باوەڕدامە زراوتان بکاتو پێتان دابمەزرێو لەناو لمو خۆڵی بیابانی بەدردا نەچەقن.

---

[1] رياض الصالحين /كتاب اللباس /ژمارە: ٨٠١.

ئەگەر هەموو خەتیبەکان بۆ ماوەی مانگێ باسی گەورەیی ئاویان بکردایە کەچەند نیعمەتێکی پیرۆزو پێویستە، چەندین پەڕاوو گۆڤار لەم بارەوە بنوسرایەو بەناو خەڵکدا بلاوبکرایەتەوە. هەموو کەناڵەکانی تەلەفزیۆن و راگەیاندن دەیان زاناو وردبینی وەك( حاجی شەماڵیان، بخستایەتە سەرشاشەکانیان و باسی سوودو پێویستی ئاویان بکردایە بۆ جەماوەرو سەرنجیان بۆ ئەم لایەنە بەکێش بکردایەن، هەموو دەزگا حوکومی‌یەکانیش هەوڵیان بدایە بەلایەنی یاسایی خۆیان پیرۆزی‌ئاویان لەناو خەڵکدا بچەسپاندایە، هەر هەموو ئەمانەو هەزار ئەوەندەی تریش بەقەدەر بێبارانی ئەمساڵ سوودی نەبوو، بۆ ئەو کەسانەی دڵیان زیندووەو چاویان بینایەو گوێیان بیسایە، چونکە وەك وتراوە(لسان الحال افصح من لسان المقال).

پار ئەم کاتانە چەمەکان پاراوبوون، دەربەن و شیوەکانی هاژەیان دەهات؛ دیمەنی هەردوو بناری چیاکان دڵرفێن بوون، دەشتی شارەزوورو هەولێرو موسڵ و سنجار، وەك خڕو بەرد ترۆزی تیاکەوتبوو شووتی و کاڵەك لەوەدابوون ماوەیەکی‌تر بکەونە بازاڕ گەنم و مەزراکان بالاپیاوێك بەرزبوون و نەتئەتوانی بچیتە ناویان، بەلام ئەمساڵ سەیرانکەرەکان ئاو دەبەن لەگەڵ خۆیان بۆ چێشت و چاکەیان.

جاتوخوا ئەمە رونترین بەڵگەنیە؟ گەورەترین وانە نیە؟

جوانترین شاشەی راگەیاندن و، بەهێزترین شەپۆلی سەتەلایت نیە بۆ گەیاندنی ئەو حەقیقەتە کەئەم بوونەوەرە بێ(خالق) نیە، ئەو (خالق)ەیش تاك و تەنهایە، بێ‌هاوەڵ و هاوتایە، کەس بالادەستی نیەو لەقەرەی نایە، لەکەس نەبووەو ژن و فەرزەندی نیە ﴿قل هو الله احد ...﴾.

دەبا چی دەسەلات دارەکانی دنیا هەیە، چی ملهوڕو تاغوت و بێ باوەڕەکان هەیە ئەوانەی فەلسەفەی بێ‌عەقیدەیی و بێ ئەدەبی بەرامبەر بەخواو بەدینی خواو پێغەمبەری خوا لەناو خەڵکیدا بلاودەکەنەوەو رەواجی پێ دەدەن بابتوانن بارانێ بۆ ئەو خەڵکە ببارێنن و لەدەست نەبوونی بێ‌ئاوی رزگاریان کەن ئەگەر واناکەن بائیتر بەئەدەب بن و دەم کوت بن چیتر خۆیان لای خەڵك و خوا ناشیرین و، بێزراو نەکەن براکانم خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ وان من شيء الا عندنا خزائنه وما ننزله الا بقدر معلوم * وارسلنا الرياح لواقح فانزلنا من السماء ماء فاسقيناكموه*وما انتم له بخازنين ﴾ (الحجر: ٢١ . ٢٢).

واتە: هەرچی شت هەیە گەنجینەو سەرچاوەکەی لای ئێمەیە بەئەندازەیەکی دیاری‌کراو دایئەبەزێنینە سەرزەوی. ئێمە(با)مان ناردووە بۆ موتوربەکردن، موتوربەی هەورەکان نێرومێ بۆئەوەی پڕ ئاوبن، لەئاسمانەوە بارانمان بۆ باراندوون و ئێوەمان پێ‌پاراو کردۆتەوە گەنجینەو سەرچاوەی بارانەکان لای ئێوە نیەو بەدەست ئێوە نیە.

جا وەك باسمان كرد ئەمسالْ لەم ئايەتەو لەم جۆرە ئايەتانە باش تێگەیشتین ئەگەر هەستو شعورمان زیندوبێت.

ئەمساڵیش وادیارە بەشی ئێمە لەباران‌و ئاو زۆرکەمە.

- هەرچەند ئێستەیش خوادەتوانێ بەشمان زۆرکات، بەڵام بەئەقڵی ئێمە ئیتر وەرزی باران بڕان و گیاگەنانە، بۆیە پێویستە ئەمساڵ ڕێبازێكی دیاریکراو دوور لەزیادە ڕەوی بخەینەکار بۆ بەکارهێنانی ئاوو کارەبا.

زۆر بەداخیشەوە ئەیڵێم: گەلی ئێمە زۆربەمان بەزەبرو زۆر نەبێ یاسا پەروەرنین، هەر بۆنموونە پارو پێرار سەدان جار خەتیبەکان‌و کەناڵەکانی ڕاگەیاندن ئەو خەڵکەیان بێدارکردەوە ئاگاتان لەکارەبا بێت زیادەڕەوی مەکەن، پیاوی چاك بن کارەبا مەبەستن لەگاسن‌و بیخەنە ناو تەنکی ئاو، بێسوود بوو هەتا بەزۆرو بەناچاری(٦٠) ئەمپێرەکەیان کرد بە(٦)، ئەمە بەرهەمی ناشوکری‌و زیادەڕەویمان بوو ﴿ ...لئن شكرتم لأزيدنكم ولئن كفرتم ان عذابي لشديد ﴾ ( ابراهيم: ٧).

واتە: ئەگەر شوکرانەی نیعمەتی خواتان کرد ئێمە بۆتان زیاد دەکەین، وەئەگەر ناڕەزاییتان دەربڕی‌و کوفرانەتان کرد ئەوە سزای ئێمە سەختە.

من وادەزانم هۆی ئەم حاڵەتە لەوڵاتی ئێمە دەگەڕێتەوە بۆ چەند خاڵێك هەندێکیان باس دەکەین:

یەکەم/ زۆربەی ئەوکەسانەی ئاوا سەرپێچی یاساو شەرع دەکەن‌و بەزۆر نەبێ ملکەچ نابن، ئەهلی مزگەوت‌و جومعەو جەماعەت نین، یان ئەگەر ئەهلی مزگەوتیش بن گوێڕایەڵی فەرمایشتەکانی مامۆستاو مینبەر نین‌و تەنها خویەکی سادەیان بەمزگەوتەوە گرتووە، کاتێ لەمزگەوت دەردەچن گەر لێیان بپرسی ئەم نیو سەعاتە مامۆستا باسی چی کرد؟ یەك کەلیمە یان لەبیرنەماوە چونکە پێشەکی بڕیاریان داوە بەقسەی مامۆستا نەکەن، جا بێگومان ئەم دووجۆرە کەسە هیچ سودێ لەمزگەوت‌و ئامۆژگارییەکانی مزگەوت وەرناگرن.

دووەم/ ئێمە خۆیشمان وەك زاناو پێشەوایانی ئاین زۆر کات قسەکانی خۆمان پیادە ناکەین، قسەمان زۆرەو کردەوەمان کەمە، ئەوەی بەئێوەی ڕادەگەیەنین خۆمان لەماڵەوە نایکەین. هەندێ مامۆستا ئایەتی حیجاب بۆ خەڵکی تەفسیر دەکات کچەکەی خۆی بەقۆڵی رووت‌و (ستریێچ)ەوە دەگەڕێ، بەخەڵك دەڵێ زیادەڕەوی لەئاوو کارەبا مەکەن بەڵام نەیتوانیوە ماڵ‌و منداڵەکەی خۆی قەناعەت پێبکات.

باسی بیلال‌و زەیدو خوبەیب بۆ خەڵك دەکات، بەڵام ڕازینیە خۆی لەسەر ئیسلام لەگوڵێ کاڵتری پێ بوترێ!

سێیەم/ هەندێ لەکار بەدەستو یاساپەروەرەکانمان لەهەموو کەس زیاتر سەرپێچی یاسە دەکەن کاتێ باسی دەست گرتن بەئاووکارەباوە دەکەن ماڵەکانی خۆیان چراخانە هەر باخچەکەی بەقەدەر(٥) ماڵی هەژار ئاوی دەوێ، جا شەرعو یاسایەك ئەم دوو تاقمە بیانەوێ بیچەسپێنن چۆ دەچەسپێ؟ چۆن دەگرسێ ﴿ یا ایها الذین امنوا لم تقولون مالا تفعلون ؟ کبر مقتاً عند الله أن تقولوا مالا تفعلون ﴾ الصف:٢ . ٣.

**وراعي الشاة يحمي الذئب عنها فكيف اذا الرعاة لها ذئاب ؟!**

**شوان دەبێ مێگەل لەگورگ بپارێزی حاڵ چۆنە بێ ئەگەر شوان خۆی گورگ بێ؟!**

جابەراستی گەربمانەوێ لەدەست کۆسپی بێئاوی ئەمساڵ رزگاربین و مەردانە هاوکاری و برایەتی یەکتری بکەین لەم قۆناغە نوێی ژیاندا پێویستە جەماوەرو زانایانو یاسا پەروەران دڵسۆزانە شان بدەینە ژێر ئەم بارەو ئەوەی باوەڕدارە بەخواو پێغەمبەر دڵسۆزانە لەبەرخاتری خوابچێ بەدەم فەرمانەکانی خواو پێغەمبەرەوەو ئایەتی ﴿ وکلوا واشربوا ولاتسرفوا انه لایحب المسرفین ﴾ (الاعراف: ٣١) لەم قۆناغەی ژیانماندا بکەینە باشترین سەرمەشق و مامۆستا.

وەك چەندجار باسم کردووە زۆر گوناهە زۆر تاوانە دەبینین هەندێ ماڵ شەو تەنکیئاویان پڕدەبێو بەدرێژایی شەو ئاوی لێدەڕژێ بەڵام یەکێ لەو ماڵەدا دڵی دانا چڵەکێو لەخواناترسی رەنگە دراوسێکەی پەنای خۆیشی ئاوی بۆ نەچێ.

هەندێ کەسیتر ماتۆرێکی بەهێزی بەستووە لەبۆری گەرەكو ئاوی دەیان ماڵ هەڵئەمژێو گوڵو گوڵزاری پێئاو ئەداتو حەوشەی پێدەشوات رەنگە گەر دراوسێکەی بێتو داوای لێبکات(٥) دەقیقە ئاوەکەی بداتێ بەمنەتەوە بیداتێ ئیتر خۆی گێل کردووە لەوەی ئەمە دزیەو غەدرەو ستەمە پێغەمبەریش(ﷺ)فەرموویەتی: (اتقوا الظلم فان الظلم ظلمات یوم القیامة) خۆتان بپارێزن لەزوڵمو ستەم چونکە زوڵم تاریکستانی رۆژی قیامەتە.

ئاو یەکێکە لەوشتانەی واجبە بەخشینی بۆ ئادەمیزادو ئاژەڵ. واتە ئەگەر کەسێك کارێزێك یان سەرچاوەیەکی هەبوو ئاوەکەی زیادبوو لەپێویستی خواردنەوەی خۆی واجبە بیبەخشێ بۆ خواردنەوەی خەڵك ئەگەر زیادبوو لەپێویستی ئاژەڵی خۆی واجبە بیبەخشێ بەئاژەڵی خەڵك بەمەرجێ ئەو رانو ئاژەڵە زیان نەگەیەنن بەوسەرچاوەیە.

بۆساڵێکی وەك ئەمساڵ دروست نیە خاوەن ئاوەکان ئاو لەئاژەڵ بگرنەوە لەبەرخاتری زەرع چونکە پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێ: ( الناس شرکاء في ثلاثة في الماء والکلأ والنار) ( رواه ابن ماجة باسناد جید).

واتـه: ئادەمیزادەکـان یەکسـانن لـەئاوو لـەوەڕگاو ئـاگردا. تەنانـەت بیروکـاریز ئەگـەر بەشـی مەتیویشـی تیـابوو دروسـتە خواردنـەوەی چونکـە خـوا ئـیزنی داویـن بەمـەرجێ لەپێویسـتی خواردنەوەی خۆی زیادبێت.مغني المحتاج : ٢/٣٧٥.

## ( ١٤ ) ـ وتـاری نوێژە بارانە(١)

٢٠٠١/١١/١٩ ز ـ ٤/ رمضـان /١٤٢٢ هـ نوێـژە بـارانە کـرا لەمزگـەوتی بێخـود دوای نوێـژی نیوەڕۆ.

**وتاری یەکەم:**

نستغفر الله العظيم الذي لا اله الا هو الحي القيوم واتوب اليه (٩ جار)

الحمد لله نحمده ونستعينه ونستهديه ونعوذ بالله من شرور انفسنا ...الخ اما بعد

قال تعالى: ﴿ استغفروا ربكم انه كان غفاراً ، يرسل السماء عليكم مدراراً ، ويمددكم باموال وبنين ويجعل لكم جنـات ويجعـل لكـم انـهاراً ﴾ واتـه: داوای لێبـوردن بکـەن لـە پـەروەردگارتان بەراستی پەروەردگارتان زۆر لێبوردەیە باران بەچڕیو پڕی دەبارێنێتە سەرتان، وەماڵو کوڕتـان پیٚدەبەخشێ، باخ و مەزراتان بۆ دەڕوێنێ روباری ئاوتان پیٚدەبەخشێ).

پیاوێك هاتە خزمەت ئیمام حەسەنی بەصری وتی: قوربـان گرانـیو بیٚئاوییـە، فـەرمووی: داوای لێبوردن لەخوابکە.

پیاوێکی تر هات وتی: قوربان هەژارو نەدارم، فەرموی: داوای لێبوردن لەخوا بکە.

پیاوێکیتر هات وتی: قوربان باخ و مەزراکەم وشك بوو، فـەرمووی: داوای لێبـوردن لەخوابکە، پیاوێکیتر هات وتی: منداڵمان نابێت، فەرموی: داوای لیٚبوردن لەخوا بکە، دوایی ئەم ئایەتانەی بۆ خوێندنەوە ﴿ استغفروا ربكم انه كان غفاراً...الخ الايات ﴾(٢). ( سورة نوح : ١٠ ـ ١٢) .

داوای لێبـوردن بەراسـتیو دروسـتی کلیلـی لاچوونـی هـەموو بـەڵاو ناخۆشـییەکە بۆیـە پێغەمبەریشمان فەرمویەتی: ( من لـزم الاستغفار جعل الله عزوجل لـه من كل هـم فرجاً ومن كل ضيق مخرجاًورزقه من حيث لايحتسب )(رواه ابوداود) (٣).

---

(١) نوێژەبارانـەکان بـەدەر لـەم جـارەی سـەرەوە : ١٩٩٦/١١/٢٢ مزگـەوتی (بێخـود) ، ١٩٩٦/١١/٢٥ مزگـەوتی (زەرگەتە)، ١٩٩٧/٥/١٩ مزگەوتی (بێخود) ،١٩٩٨/١٢/٢٥ مزگەوتی (بێخود) ، ١٩٩٩/٤/٢٣ مزگەوتی (بێخود).

(٢) كتاب الاستغفار للامام حسن البصري:/ ط: ١٩٨٩ . ١٤٠٩ / ١٠ ،١١.

(٣) الصالحين باب الاستغفار.

واتە: هەرکەس زۆر داوای لێبوردن لەخوا بکات، خوا لەهەموو خەفەتێك دڵخۆشی دەکات، وە لەهەموو تەنگانەیەك دەروی لێدەکاتەوە، وەرۆزی بۆ دەنێرێ لەشوێنێکەوە خۆی بەتەمای نەبووبێ.

پێچەوانەکەیشی هەر دروستە: وازهێنان لەتەوبەو داوای لێبوردن دەبێتە هۆی بەڵاو نەهامەتیو وێران بوونی ولاتو نەمانی سەروەتو خۆشی.

عن ابي سعيد أن رسول الله ( ﷺ) ( ان الشيطان قال: وعزتك يارب لا ابرح اغوي عبادك مادامت أرواحهم في اجسادهم، فقال الرب: وعزتي وجلالي لا ازال اغفر لهم ما استغفروني )(احمد والحاكم)[1].

واتە: (ابو سعيد دەفەرموێ: شەیتان وتی سوێندم بەعیززەتی تۆ ئەی پەروەردگار هەمیشە من بەندەکانی تۆ گومڕا دەکەم هەتا رۆح لەلاشەیاندا بێت، خوایش فەرمووی: سوێند بەعیززەتو گەورەیی خۆم منیش هەمیشە لێیان خۆش دەبم هەتا داوای لێبوردنم لێبکەن).

ئەم ئایەتو فەرمودانە هەموو بەڵگەن لەسەر ئەوەی سەرفرازی ئێمە لەبێ بارانیو قاتی و قڕیو نەهامەتی هالە داوای لێبوردنو تەوبەی راستی بۆیە ئێمەیش لەمڕۆدا کۆبوینەتەوە بۆ نوێژە بارانە هەر بەنیازی توبەو داوای لێبوردن، دڵنیایشین لەوەی خوا زۆر بەرەحمەو بارانی بەرەحمەتی دەبارێنێ بەسەرماندا کاتێ کەئێمە نائومێد بووین وەك خۆی دەفەرموێ: ( وهو الذي ينزل الغيث من بعد ماقنطوا وينشر رحمته وهو الولي الحميد) (الشورى : ٢٨) واتە: خوایەکی ئەوەندە گەورەو بەتوانایە باران دەبارێنێ دوای ئەوەی خەڵکەکە نائومێد بوون وەرەحمەتی خۆی بلاو دەکاتەوە بەراستی خوا گەورەیەکی سوپاس کراوە).

لا الە الا الله العظيم الحليم، لا الە الا الله رب العرش العظيم ، لا الە الا الله رب السموات ورب العرش الكريم، ياحي ياقيوم برحمتك نستغيث، اللهم انا نستغفرك انك كنت غفاراً فارسل السماء علينا مدراراً اللهم اغثنا (٣ جار) .

لەعائیشەوە دەگێرنەوە دەفەرموێ: ( خەڵك هاواریان هێنا بۆ پێغەمبەر(ﷺ) بۆ باران نەبارین، فەرمانی دا دوانگەیان بۆ دانا لەشوێنی نوێژی جەژنەکاندا وادەی دانا بۆ خەڵکی بۆ ئەو رۆژەی پێکەوە دەرچن، پێغەمبەر(ﷺ) لەو رۆژەدا دەرچوو لەکاتێکدا هەتاو هەڵهات دانیشت لەسەر دوانگەکەی (الله اکبر) ی کردو حەمدو سوپاسی خوای کرد، لەپاشدا فەرموی: ئێوە هاوارتان کردبوو لەدەست وشکی و دواکەوتنی باران لەوادەی خۆی، خوای گەورە فەرمانی پێداون هاواری لێبکەنو وادەیشی پێداون لێتان وەرگرێت، لەپاشدا فەرموی: ( الحمد لله رب العالمين ، الرحمن الرحيم ، مالك يوم الدين ، لا الە الا الله يفعل مايريد اللهم انت الله لا الە الا انت الغني ونحن

---

[1] كتاب الاستغفار /١٠،١١.

لفقراء، انزل علينا الغيث واجعل ما انزلت لنا قوة وبلاغاً الى حين ) دواى ئەوە دەستى بەرز كردەوە، ئەوەندە بەرزى كردەوە هەتا سپيايى باڵەكانى دەركەوت، لەپاشدا پشتى كردە خەڵكەكە(واتە رووى كردە قيبلە) و ئەو بەرماڵەى لەسەرشانى بوو راستو چەپى كرد، ئەمجا رووى كردە خەڵكەكەو دابەزى دوو ركات نوێژى كرد، خواى گەورە پارچە هەورێكى ناردو هەورە بروسكە دەستى پێكرد بەفەرمانى خوا باران بارى، پێغەمبەر(ﷺ) نەگەيشتەوە مزگەوت لافاو هەستا، كاتێ پێغەمبەر(ﷺ) خەڵكەكەى بينى رادەكەن بۆ حەشارگەكان پێكەنى هەتا دانەكانى پێشووى دەركەوتو فەرمووى: ( اشهد ان الله على كل شيء قدير، واني عبدالله ورسوله) (ئيمامى ابوداود وابن حبان وحاكم ريوايەتيان كردووە) (اللهم انا نستغفرك انك كنت غفاراً، فارسل السماء علينا مدراراً، الله اسقنا الغيث ولاتجعلنا من القانطين، اللهم اسقنا غيثاً مغيثاً هنيئاً مريئاً مريعاً سحاً عاماً غدقاً طبقاً مجللاً دائماً الى يوم الدين) ئەگەر خەڵكى خۆيان ئامادەكرد بۆ نوێژە بارانە پێش نوێژەكە باران بارى سوننەتە كۆبنەوە بۆ شوكرانەو پارانەوە نوێژەكەيش بكەن بەلاى فەرموودەى(صحيح)ەوە بەنيەتى شوكرانە). [1].

بەلام ئەگەر ئەو بارانەى كەبارى بوو كيفايەتى نەدەكردن واتە: پەڵەى تەواوى نەدابوو كانياوو كارێزەكان پاراو نەبوو بوونەوە ئەوە نوێژە بارانەكە هەر لەجێگاى خۆى ماوە، چونكە نوێژە بارانە تەنها بۆ بێبارانى نىيە بەڵكو بۆ ئاو كەميش دەكرێ، بۆ سوێر بوونى ئاويش هەردەكرێ، تەنانەت بۆ داواى زياد كردنى ئاويش هەر سوننەتە[2].

ريوايەت كراوە حەزرەتى سولەيمان دەرچوو بۆ نوێژە بارانە بينى مێرولەيەك دەپارێتەوە بۆ باران فەرمووى: بگەرێنەوە خوا بارانى بۆ باراندن بەهۆى غەيرى خۆتانەوە[3].

دەڵێن ئەم مێرووولەيە لەسەر پشت كەوتبوو قاچەكانى هەڵبڕيبوو بۆ ئاسمان دەيوت: ئەى خوايە ئێمە دروست كراوێكين لەدروست كراوەكانى خۆت بەفەنامان نەبەيت بەتاوانى بنيادەم [4].

هەروەها لەفەرموودەيەكى لاوازدا هاتووە: ( لولا شباب خشع، وبهائم رتع، وشيوخ رُكع، واطفال رضّع لصُبّ عليكم العذاب صباً ) واتە: ئەگەر لەبەر خاترى چەند گەنجێكى ملكەچو چەند ئاژەڵێكى لەوەرگاو چەند پيرێكى ركوع بەرو چەند مناڵێكى شيرە خۆرە نەبوايە خوا سزاى دەباراند بەسەرتاندا).

---

[1] مغني المحتاج : ( ١/ ٣٢١).

[2] سەرچاوەى پێشوو هەروەها بڕوانە المفصل في احكام المراة د. عبدالكريم زيدان /١/ ٢٩٧.

[3] المجموع /٥/٦٦.

[4] مغني المحتاج : ( ١/ ٣٢٣).

خوایــە لەبــەر خــاتری نــاوە جوانــەکانی خــۆت، لەبــەر خــاتری مێرووڵــەو گیانلەبــەرەکان! لەبەرخاتری پیرو منداڵو ئاژەڵو گەنجە ملکەچەکان، بارانی بەرەحمەتمان بۆ ببارێنی! بەگوناهی خۆمان لەناومان نەبەیت.

یا الله بەفرمێسکی چاوی ئێمە ئاسمانەکەت بێنە فرمێسکی بارانو بەئاهی ساردی حەوت ساڵ گرانیو چوار ساڵ بێبارانی ئیتر ئەم ساڵ نۆرەی دەروی رەحمەتت بێت، نۆرەی خۆشیو شادی بێـت، نـۆرەی زینـدو بوونـەوەی کانیـاوو بـاخو مـەزراکانمان بێـت، نـۆرەی ئـاوەدانی لادێو گوندەکانمان بێت، نۆرەی قەرەباڵغی مزگەوتو قوتابخانە ئاینیەکانمان بێت.

خوا بەگوناهی خۆمان نەمانگری(٣جار) خوایە لێمان ببوری(٣جار)

## وتاری دووەم: استغفر الله العظیم (٧ جار)

الحمد لله حمدا یوافي نعمه ویکافيء مزیده ...الخ اما بعد قال تعالی ﴿ استغفروا ربكم انه كان غفاراً یرسل السماء علیكم مدراراً ...﴾

استقبال القبلة والدعاء سراً وجهراً ویحول رداءه ( رووکردنە قیبلەو دوعاکردن بەئاشکراو نهێنی). خەڵکیش دوعا دەکەنو ئیمام بەرماڵەکەی راستو چەپ دەکاتو سەرەوژێری دەکات، دیسانەوە روودەکاتەوە خەڵکەکەو دوعاو ( استغفر الله) زۆردەکات، ئەمجا دەڵێ: ( اللهم اسقنا الغیث ولا تجعلنا من القانطین ، اللهم انبت لنا الزرع وادرَّ لنا الضرع، وانزل علینا من بركات السماء، وانبت لنا من بركات الارض، اللهم اكشف عنا الجَهْد والجوع والعری، واكشف عنا من البلاء مالایكشفه احد غیرك).

اقول قولي هذا واستغفر الله لي ولكم ولسائر المسلمین .

**تێبینی:** هەزاران جار( الحمد لله) پێش ئەم نوێژە بارانەی مزگەوتی بێخود . کەلە ٤/ رەمەزانی ١٤٢٢ ی کۆچی کرا کەمێك باران باری ، دوای نوێژەکە بەدرێژایی رەمەزانو شەشەڵان باران بوو .

## ( ١٥ ) ـ خوتبەی خۆرگیران[١] ١٩٩٩/٨/١١

خۆرگیران دیاردەیەکە لەقەرنێکدا جارێ دووجار روودەدات، وەك پیرەکانمان بۆمان دەگێڕنەوە لەساڵی ١٩١٤ جارێکیتر خۆرگیراوە لەکوردستاندا، ئافرەتان هەندێکیان دەگێڕنەوە کەئەو رۆژە، چوبووین بۆقنگر کەتاریکی داهات دانیشتین تاخوا دنیای رووناك کردەوە ئەمجا کەوتینە رێ. کەوابوو دیاردەی رۆژگیران لەتەمەنی مرۆڤێکدا جارێك روودەدات یان هەر روونادات، کەوابوو

---

[١] دەقی ئەم وتارەم نووسی لەبەرئەوەی شتێکی مێژوویییە تەنها هەندێکم لابرد چونکە دووبارە بوو، لەگەڵ هەندێ وردە دەسکاریدا بۆ شێوازی نووسین.

زیندو کردنەوەی سوننەتی (خسوف وکسوف) مانگ گیران و خۆرگیران سوننەتێکی گەورەیە، بەتایبەتی سوننەتی خۆرگیران، چونکە دیاردەی ڕۆژگیران کەمتر ڕوودەدات لەمانگ گیران، مانگ گیران زیاترە، هەروەها ڕۆژگیران کاریگەریەکی زۆر زیاتری هەیە بۆسەر بوونەوەرو نیشانەیەکی روونترو ئاشکراترە، کەوابوو زۆر جێگای خۆیەتی ئەمڕۆ موسوڵمانان ئەوەی توانای هەیە رووبکەنە ئەو مزگەوتانەی نوێژی خۆرگیرانی تێدادەکرێت، خۆتان بەلای تەلەفزیون و کەناڵەکانەوە ماتڵ مەکەن و چونکە دیاردەی خۆرگیران یەك لەحزەیە ئایا لەکەناڵەکانەوە بیبینی یان بە ئاسمانەوە بیبینی ئیتر بەسە، باش وایە ئەو تاریکی‌یەی کەبەسەرماندا دێت ئێمە ڕوونی بکەینەوە بەنوێژو، تاریکی قەبرەکەمانی پێ‌ڕووناك بکەینەوە، واتا لەوتاریکی‌یەی پاش ماوەیەکی‌تر بەسەرماندا دێت، ئێمە ڕوونی‌بکەینەوە بەنوێژو تاریکی قەبرەکەمانی پێ‌ڕووناك بکەینەوە.

ڕۆژی جومعە تەئکیدم لەسەر دووخاڵ کردەوە ئێستا بەکورتی بەسەریدا دەڕۆمەوە نەکو هەندێکتان ئامادە نەبووبن:

**خاڵی یەکەم/** ئایا زاناکان چۆن هەواڵ دەدەن بەوەی خۆر دەگیرێت لەڕۆژێکی تایبەتی و کاتێکی تایبەتیدا؟

هەمووتان بەرنامەکانی تەلەفیزیۆنیتان بەرچاو کەوت، تەنانەت مامۆستا مەلا محمدی شارەزووری رەحمەتی خوای لێبێت لەکتێبێکیدا بیست ساڵ لەمەوبەر نووسیویەتی لە١٩٩٩/٨/١١ دا ڕۆژ دەگیرێ، ئەویش لەکتێبێکی ترەوە نەقڵی کردوو، کەدەساڵ پێش ئەو نوسیویەتی، کەوابوو وەك جاری پێشوو دەقەکەی ئیمامی غەزالیم بۆ خوێندنەوە کەلەپەڕاوی (تهافت الفلاسفة)دا نووسیویەتی : ( هەرکەس ئینکاری زانینی ئەم دیاردانە بکات و ئەو ئینکارییەیش پاڵبدات بەدینەوە ئەوکەسە(فقد جنی علی الدین) واتە: دەسدرێژی کردۆتە سەردین و دژایەتی دینی کردووە، دوژمنێکی عاقڵیش لەدۆستێکی نەزان باشترە.

کەوابوو بەراستی هەق وایە موسوڵمانان پێشکەون لەم بوارەدا، هەق وایە موسوڵمانان ئەمڕۆ عالەم ئاگادار بکەن نەك گوێ بۆ کەناڵەکانی عالەم بگرن و ئەوان شانازیمان بەسەردا بکەن و ئاگادارمان بکەن لەڕووداوەکانی جیهان، لەهەمان کاتیشدا دیاردەیەك کەبەئاسمانی خواوە ڕوودەدات و لەئەرزی خواوە بەدی دەکرێت کەچی ئەوان بیکەن بەداردەستی خۆیان و دژایەتی دینی پێبکەن. پاشان دین لەگەڵ زانستدا کۆکەو دژ بەزانست ناوەستێت.

دیاردەکەی‌تر ئەوەبوو هەندێ لەبەناو زاناکان لەم ڕۆژەدا باسیان لەڕۆژگیران دەکردو دەیاندایە پاڵ سروشت و تەبیعەت بێ‌ئەوەی وشەی خوا بەدەمیاندابێت، ئیتر لەبیریان چوبوو ئەوان لەگەڵ کۆمەڵگایەکی موسوڵماندا قسەدەکەن، کۆمەڵگایەك تەنها لەگەڕەکی خەباتدا ئەمەندەی ئامادەی

نوێژی خۆرگیران بووه کەسوننەتیشە، کەوابوو بەڕاستی ئەوان وێڵ بوون کەئەیانەوێ خۆیان لەم کۆمەڵگا موسوڵمانە گێل بکەن.

خوای گەورە لەقورئاندا دەفەرموێ: ﴿ ومن اياته الليل والنهار ، والشمس والقمر، لاتسجدوا للشمس ولا للقمر واسجدوا لله الذي خلقهن ان كنتم اياه تعبدون ﴾فصلت:٣٧.

واتە: لەبەڵگەکانی وجودو دەسەڵاتی خوایە: شەوو ڕۆژو خۆرومانگ، ئێوە کڕنووش مەبەن بۆ خۆرو مانگ، کڕنووش بەرن بۆ ئەو خوایەی دورستی کردوون ئەگەر بەڕاستی خوا دەپەرستن.

زانایانی(فقە)ی ئیسلامی ئەم ئایەتەیان کردووە بەبەڵگە لەسەر سوننەت بوونی نوێژی خۆرگیران، ئەمجا بەڵگەی فەرموودەکە پێغەمبەر(ﷺ) لەکاتی خۆرگیراندا نوێژی خۆرگیرانی کردووە. وەك دەگێڕنەوە کەپێغەمبەر(ﷺ) چوو بۆ نوێژی خۆرگیران عەباکەی بەکێش دەکرد، واتە پەلەی کرد لەڕۆیشتندا وەك چۆن یەکێ لەئێمە ئەگەر هەواڵێکی کوتو پڕ ببیستێ بەپەلە دەچێت بەدەمیەوەو فرسەتی نابێت پێڵاوەکانی هەڵکێشێت، یان پاڵتاوەکەی لەبەرکات، هەروەها پێغەمبەریش لەگەڵ بیستی خۆرگیراوە ڕۆیشت بەدەم ڕووداوەکەوەو نوێژیکردو پاشان فەرمووی: ( ان الشمس والقمر ايتان من ايات الله لاينكسفان لموت احد ولا لحياته فاذا رأيتم ذلك فصلوا )لەهەندێ ڕوایەتی تردا دەفەرموێ: (فكبروا ، وادعوا، وتصدقوا)واتە: (الله اكبر) بکەن بپاڕێنەوە، خێر بکەن ، هەتا خۆر دەردەکەوێتو ئاسایی دەبێتەوە.

هەڵبەتە کاتەکەمان کورتە چونکە هەواڵیان داینێ کەخۆر ٣٠٪ یان ٤٠ ٪ گیراوە، واتە: ئێستا کاتی نوێژەکەمانە بەڵام پێش نوێژەکە هەندێ شت هەیە پێویستە بیزانن بۆتانی باس دەکەین، دوای نوێژەکەیش سوننەتە وتارێ بخوێنین ، وەئەگەر نەمانەوە ئەوباڵتان بەملی خۆتان.

## چۆنیێتی نوێژی خۆرگیران:

نوێژی خۆرگیران بەپێنج شێوە دەکرێت :

**شێوەی یەکەم**/ئەوەیە وەك سوننەتی پێش بەیانی دووڕکات سوننەت بکەیت بەنیەتی نوێژی خۆرگیرانو تەنها دوو سوورەتی کورتی تێدا بخوێنیت دوای(فاتحە).

**شێوەی دووەم**/ کەفەرموودەی(صحيح)ی لەسەر هاتووە ڕارەوی شافیعیشە کەنوێژی خۆرگیران دووڕکاتە بەڵام هەر ڕکاتێك دوو وەستانو دوو ڕکوعو دوو سەجدەی تیایە، وەك لەبەشی یەکەم باسی وتاری خۆرگیراندا نوسیومانەو دووبارەی ناکەینەوە.شێوەکانی تر نانوسین لەبەر کەم دەرفەتی.

## چەندێ قورئان لەم نوێژەدا دەخوێنرێت؟

ریوایەتەکان دەفەرموون:

پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەم نوێژەدا ئەوەندەی قورئان خوێند هەتا هەندێ لەصەحابەکان بوورانەوەو کەوتن، لەدوا ئاویان کرد بەسەریاندا تا هۆشیان بێتەوە لەکاتی گەرمای زۆر گەرمایشدا بوو، وەك لەکتێبەکانی مەزهەبی شافیعیدا وەك(المنهاج) بەدرێژی ئەم ئەندازەی قورئان خوێندنە دیاریکراوە.

ئەمە لای تەواوی نوێژەکەیە ، بەڵام ئێمە توانای ئەوەمان نیە لەبەرئەوە مەترسن ئێمە ئەوشێوە نوێژە ناکەین، تەنها ئەندازەیەك قورئان دەخوێنین هیوادارم بێتاقەت نەبن، هەرکەسیش توانای نەما بێتاقەت بوو لەشوێنی خۆی دانیشێ چونکە نوێژەکە سوننەتە.

دەربارەی خوێندنی قورئانەکەیش بەلای مەزهەبی شافیعیەوە نوێژی رۆژگیران نوێژی رۆژەو دەنگی تێدا هەڵنابڕین لەبەرئەوە ئێوە گوێتان لەقورئان خوێندنی من نابێت نەفاتیحاو نەسوورەت، ئێوەیش دوای(الحمد) هەرکەس قورئانی زۆری لەبەرە با قورئان بخوێنێت، هەرکەسیش قورئانی لەبەر نیە سوورەتی ﴿قل هو الله﴾ دووبارە بکاتەوە تا ئیمام دەچێتە رکوع.

جارێکیتر لێتانی دووبارە دەکەمەوە بێتاقەت مەبن. سوننەتە دوای نوێژەکەیش دوو وتار بخوێنین کەباسی تەوبەو پەشیمانی تێدا بکەین، پێغەمبەری خوا لەوتاری نوێژی خۆرگیراندا باسی مەترسی زینای بۆ صەحابەکان دەکرد ئەو گوناهەی دەبەست بەم دیاردەوە بۆئەوەی ئوممەتەکەی بترسێنی لەپاشە رۆژی تاوان.

ئەمرۆیش دیاردەی زیناو تاوان زۆر بڵاوە لەسلێمانیدا. دوکاندارەکانو خەڵکی بازاڕ دێن بۆم دەگێڕنەوە کەئافرەت بەئاشکرا دێن بەسەر دووکانەکاندا دەگەڕێن و خەڵك دەیانبەنە ژوورەوە، کەهیچ کاتێك بەم شێوە نەبووە لەسلێمانیدا.

جابا ئێمەیش مەردی چاك بین با تەوبە بکەین، دەزانن لەم دەساڵەدا چەندە نەهامەتیو نارەحەتیمان بینی، هەردوای جەنگی ئێرانو عێراقیش حسابی بکە کوڕەومان دی، ئاوارەییمان دی، فەردەیەك ئارد چووە هەزار دینار، پەتاو وەباو بوومەلەرزەمان دی ... چیمان دیو چیمان دی...

هەرکەسیش توانای نەبووەو نەهاتووە بۆ مزگەوت لەپیرو ئافرەتان بالەشوێنی خۆیانەوە نوێژی رۆژگیران بکەن بەتەنها، باکەس ئەم هەلە لەدەست نەدات چونکە بەگوێرەی زانست ئەم جیلە جارێکیتر رۆژگیران نابینین مەگەر منداڵێکی کەم تەمەن جابا ئیتر دەست بکەین بەنوێژەکەمان:

خوایە ئەم نوێژەمان لێ وەرگریت، خوایە دوای هەموو رۆژگیرانێك بەڵاو نەهامەتی روویداوە، بەڵام دوای ئەم رۆژگیرانە تووشی بەڵاو نارەحەتیو گرانی نەبین. خوایە تووشی خۆشیو شادی ببینو دین لەناوماندا زیندوبکەیتەوە ئامین، نستغفر الله العظیم (٣ جار) کۆمەڵێ موسوڵمان داوای دوعـای خێریـان کـردووە خوایـە شـیفای نەخۆشـیان بدەیـت رەحـم بـەمردوانو سـەیوانمان بکەیت...هتد

الصلاة جامعة جامعة یا امة محمد المصطفی ٣ جار

ئەمجا نوێژەکە کراو دنیا تاریك بوو گریان بەرزبوویەوە بەکوڵ

## وتاری یەکەم دوای نوێژەکە:

الحمد لله الذي جعل في السماء بروجاً وجعل فيها سراجاً وقمراً منيراً، والصلاة والسلام على سيدنا محمد الذي بعثته للناس بشيراً ونذيراً، وعلى اله وصحبه الذين اتبعوه وكانوا له نصيراً وظهيراً.

اخوة الاسلام قال تعالى: ﴿ ومن اياته الليل والنهار والشمس والقمر لاتسجدوا للشمس ولا للقمر واسجدوا لله الذي خلقهن ان كنتم اياه تعبدون ﴾ فصلت: ٣٧

وروى البخاري عن ابي بكرة قال: كنا عند رسول الله (ﷺ) فانكسفت الشمس فقام النبي(ﷺ) يجرّ داءه حتى دخل المسجد، فدخلنا فصلى بنا ركعتين حتى انجلت الشمس ) التاج الجامع:٣٠٧/١.

برا موسوڵمانەکان ئەو دیاردەی دیتان لەونبوونی رۆژو تاریك بوون قیامەتی هێناینەوەیاد، هەندێ کەس هەن بەهۆی ئولفەتیان بەم بارودۆخەوە گومان وا دەبەن بوونەوەر گۆرانی بەسەردا نایەت و هەروەها بەردەوام دەبێت، دیارە لای هەمووکەسێکی ژیر ئەو خوایەی توانی بۆ چەند دەقیقەیەك رۆژ لەعالەم بگرێتەوە، دەتوانێت، بۆ هەتا هەتاییش لێمان بگرێتەوە، ﴿ فسبحان الله حين تمسون وحين تصبحون وله الحمد في السموات والارض وعشياً وحين تظهرون﴾.الروم:١٧،١٨.

ئامۆژگاریتان دەکەم ـ لەپێشدا نەفسی خۆم بەتەقوای خواو تەوبەو پاڕانەوە بادەرس لەو گۆڕانکارییە وەرگرین، لەو دیاردە وەرگرین لەو بەسەرهاتە وەرگرین (الحمد لله) کەخوا رێنمایی کردین سوننەتێکی گەورەی پێغەمبەرمان بۆجاری یەکەم لەژیانی خۆماندا زیندوکردەوە. لەخوادەخوازم لەوکەسانە بین کەپێغەمبەر(ﷺ) دەربارەیان دەفەرموێت: (بدأ الاسلام غريباً وسيعود غريباً كما بدا، فطوبى للغرباء ).

واتە: ئیسلام لەسەرەتاوە غەریب بووە، جارێکی تریش غەریب دەکەوێتەوە، بەختەوەری بۆ غەریبەکان لەهەردوو سەرەوە.

وتيان: (ومن الغرباء يا رسول الله ؟)

واته: غەریبەکان کێن ئەی پێغەمبەری خوا؟

فەرموی: (الذین یُحیون ما اماته الناس من سنتي )واته: ئەوانەی کەسوننەتەکانی من کەخەڵك مراندونی ـ ئەوان زیندووی دەکەنەوە.

یان لەریوایەتێکیتردا دەفەرموێت: (الذین یصلحون ما افسده الناس من سنتي ) واته: ئەوانەی سوننەتەکانی من ـ ئەوانەی خەڵك تێکیان داون . ئەوان راستی دەکەنەوە.

یاربی خوایە ئالەم کاتەدا کە لەرۆژی نیوەرۆدا بۆچەند دەقیقەیەك دنیات لێتاریك کردین ئالەم کاتەدا دوای گریانی بەکوڵی چەند کەسێکمان دەستی پەشیمانی هەڵدەبڕین، دەستی لالآنەوە هەڵدەبڕین، دەستی ئیستغفارو تەوبە هەڵدەبڕین، یاربی خوایە رەحمەمان پێ بکەیت! یاربی هیدایەتمان بدەیت! یاربی توفیقمان بدەیت یاربی گەردو تۆزی گوناهو تاوان لەسەر دڵو دەروونمان لابەریت.! خوا لەگوناهی مردووەکانمان خۆشبیت لەخێری ئەم نوێژەدا بەشداریان کەیت، لەگوناهی دایكو باوکمان ببوریت خوایە شیفای نەخۆشەکانمان بدەیت تایبەت ئەوانەی داوای دوعای خێریان لێکردووین... ئیتر نۆرەی خۆشیمان بێت نۆرەی بارانو پەڵەی بەرەحمەتمان بێت نۆرەی پاراوبوونەوەی چەمو کانیاوەکان بێت...

# فەسڵی سێیەم
# دووفەرمووده لەیازده وتاردا

## فەرموودەی :﴿ سبعَةٌ یُظلهم الله في ظله ..﴾[1]

### ( ١ ) پادشایەکی دادوەر

اللهم اجعلني مفتاحاً للخیر اینما کنت ، واجر الخیر علي یدي ، واجعلني مبارکا اینما کنت : ئەی خوایە بمگێڕە بەکلیلی چاکەکاری لەهەرلایەك بووم خێرو چاکە لەسەر دەستی من ئەنجام بدە وەپیرۆزم بکە لەهەر لایەك بووم.

خوای گەورە لەقورئاندا دەفەرموێ:﴿وما اتاکم الرسول فخذوه ، وما نهاکم عنه فانتهوا ...﴾ الحشر:٧. واته: ئەوەی پێغەمبەر بۆی هێناون ــ واته فەرمانتان پێدەکات . ئێوە وەری بگرن وەئەوەیشی نەهیتان لێ دەکات وازی لێبهێنن ، لەم هەفتەوە دەچینە خزمەت فەرموودەیەکی

[1] چوار ئەلقەی ئەم فەرموودەیەم خوێندەوە لەئازاری ٢٠٠٠ لەمزگەوتی (کۆڵەك). جارێکی دیش هەر حەوت ئەلقەکەم خوێندەوە لە شباط و ئازاری ٢٠٠٢ لەمزگەوتی (بێخود).

پێغەمبەر(ﷺ) کەدەفەرموێ: (سبعة يظلهم الله في ظله يوم لا ظل ، الا ظله امام عادل ، وشابٌ نشأ في عبادة الله ، ورجل قلبه معلق بالمساجد ، ورجلان تحابا في الله ، اجتمعا عليه وتفرقا عليه ، ورجل دعته امراة ذات منصب وجمال فقال اني أخاف الله ، ورجل تصدق بصدقة فأخفاها حتى لاتعلم شماله ماتنفق يمينه ، ورجل ذكر الله خالياً ففاضت عيناه)متفق عليه[1] .

جاپشت بەخوا ئەمڕۆ دێینە سەرباسی یەکەم (**امام عادل**) /

لەقامووس دا هاتووە: (الامام ما ائتم به من رئيس وغيره )واتە: پێشەوا کەسێکە خەڵك دوای بکەوێت و بەقسەی بکەن ئیتر سەرکردە بێت یان هەرکەسێکی‌تر (عادل) یش کەسێکە خۆی لە گوناهە گەورەکان بپارێزێت و لەسەر گوناهی وردیش بەردەوام نەبێت واتە تەوبەیان لێ‌بکات و هەمیشە لەخەمیاندا بێت.

پێشەوا دانان لەپێویستی‌یە سەرەکیەکانی ژیانی مرۆڤەو ، هیچ گەلێك بێ پێشەوا ناتوانێ بژی، بەڵکو دانانی پێشەوا لەعیلمی(عقائد)دا باسکراوە ، بەڵام دانانی قازیو دادوەر لەعیلمی(فقە)دا باسکراوە لەپەڕاوی(العقائد النفسية)داهاتووە: (والمسلمون لابد لهم من امام يقوم بتنفيذ احكامهم ، واقامة حدودهم ، وسد ثغورهم ، وتجهيز جيوشهم ، واخذ صدقاتهم ، وقهر المتغلبة والمتلصصة ، وقطاع الطريق ، واقامة الجمع والاعياد ، وقطع المنازعات بين العباد )[2] .

واتە: پێویستە موسوڵمانان پێشەوایەکیان هەبێت هەستێ بەجێ‌بەجێ‌کردنی حوکمی شەرعو بەدیهێنانی ئەو سزایانەی دیاریکراوە بۆ تاوانبارانو پاراستنی کەلێنی سنوورەکانو ئامادەکردنی سووپای ئیسلامو کۆکردنەوەی زەکاتو بەگژاچوونو قەڵاچۆکردنی دزوجەردەو رێگرەکانو ڕاگرتنی شیعاری جومعەو جەماعەتو جەژنەکانو کۆتاکردنی ئەو ناکۆکیانەی ڕوو ئەدات لەنێو خەڵکدا.

زانای پایەبەرز تەفتازانی لەڕاڤەی ئەم دەقەدا دەفەرموێ: (فان قيل لم لايجوز الاكتفاء بذي شوكة في كل ناحية ؟ ومن اين يجب نصب من له الرياسة العامة ؟ قلنا : لأنه يؤدي الى منازعات مُفضية الى اختلال أمر الدين والدنيا كما نشاهد في زماننا هذا ...)واتە: ئەگەر بوترێ: باشە بۆ چ لەهەموو ناوچەیەکدا خاوەن دەسەڵاتێك نەکەین بەپێشەوا ؟ وەبۆچ واجبە هەر ئەبێ پێشەوای گشتی دابنرێت ؟ لەوەڵامیدا دەڵێین: چونکە زۆربوونی پێشەوا دەبێتە هۆی دروست بوونی دووبەرەکیو تێکچوونی کاروباری دینو ژین ، وەك چۆن ئەمڕۆ بەرچاو دەکەوێ.

---

[1] رياض الصالحين / باب الوالي العادل.

[2] شرح العقائد النفسية : ٢٣٤.

دانانی پێشەوا بۆ ئوممەتی ئیسلام ئەوەندە گرنگە کاتێك پێغەمبەری خوا(ﷺ) وەفاتیکرد دوو ڕۆژو شەوێك جەنازە پیرۆزەکەی دانراو دفن نەکرا هەتا بەیعەت درا بە حەزرەتی ابوبکرو کرایە(خەلیفە)ی پێغەمبەر(ﷺ)[1] .

ئەوەی دەمانەوێ لەم خوتبەدا جەختی لەسەر بکەین ئەوەیە هەرکەس کارێکی پێ سپێررا ئیتر ئایا کاری خێزانێك بێت یان گەرەکێك بێت یان شارو ولاتێك بێت واجبە لەسەری دادوەربێت و خوای لەیادبێت لەمامەڵەو حوکمو کێشانەو پێوانەیدا، وەك خوا دەفەرموێت: ﴿ ان الله يأمر بالعدل والاحسان وايتاء ذي القربى وينهى عن الفحشاء والمنكر والبغي يعظكم لعلكم تذكرون﴾النحل: ٩٠. واتە: خوا فەرمانتان پێدەکات بەدادوەریو چاکەکاری و بەسەرکردنەوەی خزمو خوێش. وەنەهیتان لێدەکات لەکردەوەی چەپەڵو ناشیرین و ستەم ، ئامۆژگاریتان دەکات بەڵکو بەهۆش بێنەوە.

(شهاب الدين) ی قەستەلانی لەشەرحی بوخاریدا دەفەرموێ: (امام عادل) ئافرەتێکی خاوەن خێزانو منالیش دەگرێتەوە کەدادوەرو خواویست بێت لەگەڵ مێردو منالەکانیدا[2]. هەر لەم باسەدایە پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێ: (كلكم راع وكلكم مسؤول عن رعيته الامام راع ومسؤول عن رعيته ، والرجل راع في أهله ومسؤول عن رعيته ، والمرأة راعية في بيت زوجها ومسؤولة عن رعيتها والخادم راع في مال سيده ومسؤول عن رعيته وكلكم راع ومسؤول عن رعيته)متفق عليه[3].

هەر لەم بارەیشەوە پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێ: (شر الرعاء الحطمة)رواه مسلم[4] .

واتە: خراپترین شوان ئەوانەن کەتوندوتیژن لەگەڵ بەردەستەکانیانداو بەزەییان پیایاندا نایەتەوە . یان دەفەرمووێ:﴿من ولاه الله شيئاً من أمور المسلمين فاحتجب دون حاجاتهم وخلتهم وفقرهم احتجب الله دون حاجاته وخلته وفقره يوم القيامة)رواه أبو داود ووالترمذي[5].

واتە: هەرکەسێك خوابیکاتە سەرپەرشتیاری شتێك لەکاروباری موسوڵمانان ئەویش خۆی لێیان بشارێتەوە واتە: دەرگاوان دانێو نەیەڵێت هاواریان بگاتە لای بۆ پێویستیو نەبوونیو هەژارییان ، ئەوە خوای گەورە لەڕۆژی قیامەتدا خۆی دەگرێتەوە لەپێویستیو هەژاریو نەبوونی ئەو، مانای وایە ناچێت بەدەم هاوارییەوە ـ کاتێك (ابو مريم الازدي) بە(مەعاویە)ی وت: من ئەم

---

[1] الرحيق المختوم ؛ المباركفوري : ٤٣١ ـ ٤٣٢.

[2] شرح القسطلاني على البخاري : ج/٣ باب صدقة السر.

[3] رياض الصالحين ، باب أمر ولاة الامور بالرفق برعاياهم.

[4] رياض الصالحين / باب الوالي العادل.

[5] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

فەرموودەم لەپێغەمبەر بیستووە دوای ئەوە(معاویة) پیاوێکی دیاریکرد لەپێویستییەکانی خەڵك بکۆڵێتەوەو ئاگاداری بکات.

دادوەری ئەوەندە بەرزە بۆیە ئەبێتە مایەی خۆشەویستی خواش بۆ بەندەی خۆی وەك دەفەرموێ: ﴿واقسطوا ان الله یحب المقسطین ﴾ الحجرات :٩.واتە: دادوەربن خوا دادوەرانی خۆش دەوێ ، هەروەها دادوەری دەبێتە هۆی خۆشەویستی خەڵکیش بۆسەرکردەو پێشەوا وداکوتانی ڕەگو ریشەی لەناویاندا وەك پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: (خیار ائمتکم الذین تحبونهم ویحبونکم ویصلون علیکم وتصلون علیهم ، وشرار ائمتکم الذین تبغضونهم ویبغضونکم وتلعنونهم ویلعنونکم ).واتە: چاکترین پێشەواکانتان ئەوانەن کەخۆشتان دەوێن و خۆشیان دەوێن بۆیان دەپاڕێنەوە ، وەخراپترین پێشەواکانتان ئەوانەن کە ڕقتان لێیانەو ڕقیان لێتانەو نەفرینیان لێدەکەن و نەفرینتان لێدەکەن ) وتیان:

(افلا ننابذهم بالسیف ؟ )قال: لا ما اقاموا فیکم الصلاة )

رواه مسلم برقم ١٨٥٥.

واتە: ئایا نەجەنگین لەگەڵیان بەشمشێر ؟ فەرمووی: نەخێر هەتا وابن نوێژەکانیان بکەن ،نەخێر هەتا وابن نوێژەکانیان بکەن ( واتە هەتا نوێژ بکەن مەجەنگن لەگەڵیان).

بەکورتی و بەکوردی پێشەوای عادل کەسێکە بەراستی لەخوا بترسێ وخەمی ئەو ڕۆژە سەختەی بێت خوا دەربارەی دەفەرموێت:﴿ونضع الموازین القسط لیوم القیامة فلا تظلم نفس شیئاً وان کان مثقال حبة من خردل اتینا بها وکفی بنا حاسبین ﴾ الانبیاء:٤٧. واتە: تەرازووی داوەری دادەنێین بۆ ڕۆژی قیامەت هیچ کەسێك زوڵمی لێناکرێت ئەگەر کردەوەکەی بەئەندازەی یەك دەنکە خەرتەلەیش بێت ئێمە بۆی دەهێنین و بەسە ئێمە ژمێریاری کردەوەکانیان بین.

دیارە پێشەوا موسڵمانەکانیش وەکو عومەری کوڕی (خطاب)و (عومەری ) کوڕی (عبدالعزیز) و شاگردەکانی ئەوان بەدرێژایی مێژوو ئەم ئایەتەیان لەبەرچاو گرتووە بۆیە توانیویانە تەرازووی دادوەری بپارێزن و بەداوەرانە حوکمیان کردووەو وڵاتیان پاراستووەو بەرئەو مـوژدە شیرینەی پێغەمبەر کەوتوون: (سبعة یظلهم الله ...الخ ).

## ( ٢ ) لاوێکی خوا پەرست :

یـا الله یارحمـان یـارحیم ! ئیخـلاص و دڵسـۆزی بخەیتـە کـردارو گوفتارمـان لەهـەموو کاروبارێکمـاندا مەبەستمان تەنـها ڕەزامەندی تۆبێت و بـەس ! خوایـە بەرەکـەت بخەیتـە ئـەم جومعەیە!

یا حی یا قیوم یا ذالجلال والاکرام حەق و راستی بڕژێنە ناو دڵ و سەرزاری من و بتوانم بێ پێچ و پەنا بەو خەڵکەی رابگەیەنم کەبۆ تێگەیشتنی حەق هاتوونە بەردەمی من ، گۆشی سەرو گۆشی دڵی ئەوانیش بکەیتەوە حەق و راستی لەهەموو حەق خوازێك وەربگرن و سەرگەردان نەبن بەفریوی فریو دەران و فێڵی فێڵبازان و وەسوەسەی شەیتانەکان ...ئامین

دوای ئەم پاڕانەوەیە دەچینەوە سەرباسی جومعەی رابووردومان کەئەم فەرموودەی پێغەمبەرە(ﷺ) : (سبعة يظلهم الله في ظله يوم لاظل الا ظله ...الحديث) متفق عليه جاری پێشوو باسی خاڵی یەکەم و یەکەم کەسمانکرد کەدەچێتە ژێر سێبەری خوا ئەویش پێشەوای دادوەرە، ئەم جارەیش دەچینە سەرخاڵی دووەم و کەسی دووەم.

(شاب نشأ في عبادة الله)واتە: گەنجێك پەروەردە بووبێت و پێ گەیشتبێت لەناو عیبادەت و تاعەتی خواداو سەرەتای خێربووبێت، ئەمەش گەورەترین موژدەیە بۆ ئەو گەنجانەی خۆیان لەمزگەوت و لەسەر سفرەو خوانی نوێژو قورئان خوێندن و قورئان فێربوون و پەروەردەی ئیسلامی دەبیننەوە .

(اصحاب الكهف) کۆمەڵێك گەنج بوون لەناو گەلێکی بت پەرستدا دەژیان کەسجدەیان بۆ تاغوت دەبردو قوربانیان بۆ دەکردن، پاشایەکی ستەمکاریان هەبوو ناوی (دەقیانووس) بوو زۆری لەخەڵك دەکرد بت بپەرستن، ڕۆژێك ئەو گەلە دەرچوون لەجەژنێکدا بۆ دەرەوەی شار بۆئەوەی بەکۆمەڵ خواکانیان بەپیرۆز بگرن ، هەندێ گەنجیان تیابوو زۆر نابەدڵ بوون بەوەی قەوم و خزمانیان دەیکەن، یەکەیەکە خۆیان دزیەوەو لەبن دارێکدا یەکیان گرت، سەرەتا نەیان وێرا لای یەکتری رازی خۆیان دەربڕن بەڵام دواتر لەیەك ئاشکرابوون کەهەموو یەك مەبەستیان هەیە، کەئەویش یەکتاپەرستی و وازهێنانە لەبت و تاغوت ، بۆیە یەکبوونی دڵیان بوو بەهۆی یەکبوونی لاشەشیان ، چیرۆکەکەیان بەدرێژی لەسوورەتی(الكهف)دا باسکراوە کەبەم ئایەتە دەست پێدەکات: ﴿نحن نقص عليك نبأهم بالحق انهم فتية امنوا بربهم وزدناهم هدى ، وربطنا على قلوبهم اذ قاموا فقالوا : ربنا رب السموات والارض لن ندعو من دونه الهاً لقد قلنا اذا شططاً﴾١٣.١٤.

(ابن كثير)لەتەفسیری وشەی(فتية)دا دەفەرموێ: (وهم الشباب ، وهم اقبل للحق وأهدى للسبيل من الشيوخ الذين قدعتوا وانغمسوا في الباطل ، ولهذا كان أكثر المستجيبين لله ولرسوله ـ ﷺ ـ شباباً ، أما المشايخ من قريش فلم يسلم منهم الا قليلٌ) .

ئەمە ڕاستیەکەو هەمووومان دەیزانین کەکۆڵی هەرەگران وابەسەر شانی گەنجانەوە (ابوبکرو علی و زیدو مصعب..هتد) هەموو گەنج بوون کاتێك موسڵمان بوون، بەڵکو (مصعب) جوانترین جلی لەبەردەکرد لە(مەککە)داو دەوڵەمەندترین کەسیش بوو، وەیەکەم کەس بوو ، کۆچی کرد بۆ

(مەدینە) بۆئەوەی موسوڵمانانی (مەدینە) فێری ئیسلامو قورئان بکات ، کاتێ لەغەزای(ئوحود)دا شەهیدکرا ، پارچەیەك جلی کورتی لەبەردابوو کەسەریان پێ دائەپۆشی قاچی دەرئەکەوت ، کەقاچیان دائەپۆشی سەری دەرئەکەوت پێغەمبەر فەرمووی: (ضعوه مما يلي رأسه واجعلوا على رجليه شيئاً من الاذخر)[1]. واتە: لەسەریەوە تاکوێ بڕ دەکات دایپۆشن بەوجلەو هەندی پووش‌و پەلاشیش بخەنە سەرقاچەکانی.

سائێوەش ئەی گەنجە خوێن گەرمەکان مەصعەب ئاساو ئەسما ئاسا ، ئەوسێبەرەی خوا لەرۆژی قیامەتدا لەدەست خۆتان دەرمەکەن ، باوەڕتان بەتین‌و پتەوکەن ، بەراستی‌و دروستی رووی دڵتان لەخوابکەن‌و بەکڵپەو تاسەوە لێی بپاڕێنەوە فرمێسکی چاوانتان بڕێژن ، بەڵکو خوا زاڵتان بکات بەسەر هەواو ئارەزوو گێژەڵووکەی سەختی ئەم زەمانە کەخەریکە درەختی باوەڕ لەبن دێنێ.

خوشك‌و برا ئازیزەکانم نەکەن خۆتان خەریك بکەن بەشتێکی بچووك‌و فەرعی‌یەوە ، یان بەرابەرکێ بکەن لەگەڵ یەکتری لەسەر هەندێ مەسەلەی خیلافی کەپێشینانیشمان زۆر قاڵەیان لەسەر نەناوەتەوەو بەکاری بنەڕەتیان نەزانیوە ،وەك سەڵەواتی پاش بانگ ، یان فاتیحە خوێندنی دوای بانگ ، یان دەست هەڵبڕین لەدوعادا ، یان دەنگ هەڵبڕین لەویردەکانی دوای نوێژەکاندا ، وێنەی ئەمانە هەڵناگرن ئێمە یەکتری زویر بکەین و کینەبەری لەسەر بکەین.

ئەمڕۆ مەسەلە بنەڕەتیەکانمان لەخەتەردایە ، ئەمڕۆ جیهانی ئیسلامی بەگشتی لەخەتەردایە ، ئەمڕۆ دوژمنانی دین زۆریان پێ خۆشە خۆمان بەو مەسەلەبچووکانەوە خەریك بکەین‌و پێوە بەنج ببین هەتا ئەوان بەئارەزووی خۆیان یاری بەوڵات‌و مێژوو کەلەپورمان بکەن‌و دەستی تێوەر بدەن.

بەڕاستی هەندێك لەوگەنجانە ئەوەندە تەسك بینن مرۆڤ سەرسام دەبێت لەفام‌و بۆچوونیان ، بۆ نموونە: خەڵکی گوندێك لەم کوردستانە بۆیان گێڕامەوە مامۆستای قوتابخانەکەیان چوار ساڵە لەودێیەیە نوێژکەریشە بەلام نایەتە مزگەوت زۆر هەوڵیان لەگەڵداوە بێت بۆ مزگەوت دەڵێ ئەو مزگەوتە(رابطە)دروستی کردووە من ناچمە ناوی ، ئەم بۆچوونەی خۆیشی ناو زەد دەکات بە(تصوف)، حاشا(تصوف)ی راستی‌و رابەرانی مێژووی پاکی تەریقەت لەو هەڵوێستە بەدوورن ، لەلایەکی تریشەوە لەم رۆژانەدا موسڵمانێك بۆی گێڕامەوە: کەگەنجێك یەخەی گرتووە(وەرە تەوبەبکە) وتوومە: تاوانەکەم چی‌یە هەتا تەوبەی لێبکەم وتی: تۆ دوای نوێژی مەغریب لەمزگەوت نوێژی سوننەت دەکەیت ئەمەش(بيدعە)یە ئەمەشیان خۆی ناوزەد کردووە بە(سەلەفی)، حاشا سەلەفییەتی راستیش لەو هەستە تەنگە زۆر دوورە .

[1] فقه السيرة : البوطي :١٦٦.

براو خوشكه گەنجەكانم:

گەنجی‌و جوانی گەورەترین نیعمەتی خوایە بەسەر مرۆڤەوە ، بەلاّم بەداخەوە مرۆڤ هەستی پێناكات زۆربەمان بەغەفلەت‌و بی‌ئاگایی بەسەری دەبەین ئەمڕۆ ناسبەی تەوبەو گەڕانەوەمان دوادەخەین هەتا لەناكاو ئەجەل یەخە گیرمان دەبێت‌و و عومری ئەمانەتمان لێوەردەگرێتەوە.

گەنجی ئەو گەوهەرە سەنگینەیە خوای گەورە بەخشیوێتی بەمرۆڤ بەلاّم بەداخەوە هەتا پیر نەبین و صەد عەیب لێمان دیاری نەدات هەستی پێناكەین بۆیە پێغەمبەری خۆشەویستمان دەفەرموێ(ﷺ) : (لا تزال قدما عبد يوم القيامة حتى يُسأل عن اربع عن عمره فيم افناه ؟ وعن شبابه فيم ابلاه ؟ وعن ماله : من اين اكتسبه ؟ وفيم انفقه ؟ وعن علمه ماذا عمل فيه ؟ )رواه الطبراني[1].

واتە: دوو پێی هیچ بەندەیەك لەگۆڕەپانی رۆژی قیامەت ناترازێ تاچوار پرسیاری لێدەكرێ: یەكەم/ لەتەمەنی : لەچیدا بەسەری بردووە ؟ دووەم/ لەجوانی‌و گەنجی: لەچیدا كۆنی كردووەو پەرپووتی كردووە؟ سێیەم/ لەماڵی : لەكوێوە دەستی كەوتووەو لەچیدا سەرفی كردووە؟ چوارەم/ لەعیلم‌و زانستی‌یەكەی: كەچی پێكردووەو تاچ رادەیەك بەكاری هێناوە؟

دەی مژدەبێت لەوگەنجانەی ئەمڕۆ جادەو كۆلاّن‌و زانكۆو قوتابخانەو سەتەلایت‌و سەنتەرو یانەكان بەئاشكرا بانگیان ئەكەن بۆ تاوان‌و دوورە خوایی بەلاّم ئەوان بەڵێنی تەواویان داوە بەخوا كەگەنجییان بۆ خوا بەخت كەن‌و لەپێناوی خوادا بەسەری بەرن بۆئەوەی وەلاّمی رۆژی قیامەتیان ئامادەكەن.

بەڵێ ئەم فەرموودانەی پێغەمبەر(ﷺ) هەمووی مژدەیە بۆ ئەو خوشكە بەڕێزەی بەرەو رووتی‌و بی‌دینی بانگی دەكەن ، بەلاّم ئەو بڕیاری‌داوە هەر خوا لەخۆی رازی بكات‌و لەئایەتی﴿ولا تبرجن تبرج الجاهلية الاولى﴾لانەدات! دیسانەوە مژدەبێت لەودایك‌و باوكە هۆشیارانەی ئاگایان لەمنداڵەكانیانەو نایەڵن ببنە سوو تەمەنی دۆزەخ‌و ئەو ئەمانەتەی والەگەردنیاندا بەجوانی پی‌یان رادەگەیەنن بی‌ئەوەی سڵ بكەن لەتانەو تەشەرو فشاری جۆراو جۆری نەیارانی ئیسلام.

منیش لەم وتارەمدا بەكورتی چەند ئامۆژگاری‌یەك ئاراستەی خۆم‌و هەموو ئێوەی بەرێزدەكەم:

یەكەم: بەرامبەر بەبراگەنجەكان دەڵێم: براكانم سوپاسی خوابكەن كەرووتان كردووەتە مزگەوت بەدڵ‌و بەدەم بڵێن: (الحمد لله الذي هدانا لهذا وما كنا لنهتدي لولا ان هدانا الله)الاعراف:٤٣.

بەخۆتان مەنازن بەڵكو شوكرانە بژێری خوابكەن ، رێز لەپیرەكانی‌مزگەوت‌و مامۆستایانی ئاینی بگرن ، خۆتان لەوان بەخوێنەوارتر مەزانن ، چونكە ئەوان ساڵەهای ساڵ فەقێیەتی‌و

[1] في ظل الله ، محمد ابراهيم الهسنياني :٤١.

کوێـرەوەری چەشـتووە، ڕێــز لەســەلەفی ســاڵح و پێشــینانی ئــەم ئوممەتــە بگــرن ، ئــەوان سەردەمەکەیان لەسەردەمی ئێمە زۆر چاکتر بووەو ڕۆحیشیان پاکتربووە.

تکایە تکایە خۆ خەریك مەکەن بەشتی لاوەکی‌یەوە کەس لەئەهلی قیبلە بەکافر مەزانن هەتا کوفری لێدەردەکەویٚ بەزمان یان بەکردەوە.

تۆیش ئەی مامەی خۆشەویست و ئەی پووری بەڕێزم هەرگەنجێکت دی ڕوو لەمزگەوت بوو خۆشت بوێت و هەوڵ بدە باکوڕو کچەکانی خۆیشت ڕوو لەمزگەوت و حیجاب بن ، چونکە نوێژو مزگەوت و حیجاب و شەرم و خووڕەوشتی بەرز موڵکی هیچ تاقم و حیزبێك نیە بەڵکو بەرنامەی ئیسلام و قورئانە ، هەرکەسیش دژی بوەستێ ئەوە دژ بە قورئان دەوەستێ.

تۆیـش ئـەی مامۆسـتای بـەڕێزی مزگـەوت ئاگـات لەگەنجـەکان بێـت لەمزگـەوتدا ، نەکـەیت دژایەتیان بکەیت ، چونکە گەر تۆ لەمزگەوت دەرت کردن زۆر شوێنی‌تر باوەشی بۆ هەزارانی وەك ئەمانە گرتۆتەوە، ئەوکاتە گوناهەکەیشی لەملی من و تـۆ دەبێـت کەلەمزگـەوت دەرمـان کـردن . خۆگەر هەڵەیشیان هەبوو . بێگومـان گـەنج بیٚهەڵـە نـابێت ـ پێویسـتە ئێمـە بەتـەرازووی شـەرع بەنەرم و نیانی لەگەڵیان بدوێین هەتا حەقیان بۆ ڕوون دەکەینەوە.

تۆیش ئەی برای صۆفی و برای دەروێش باش سیرەتی شێخ و مورشیدەکانی خۆت ئاگاداربە کەچەند بەنەرم و نیانی لەخزمەتی (تەریقەت و حەقیقەت)دابوون، هەمیشە خـەریکی(محاسبة)ی دەروونی خۆیان بوون، خۆیان بەخراپ زانیوەو خەڵکیان بەچاك زانیوە ، هەمیشە پابەندی شەرعی خوابوون و حـەزیان بەبرایـەتی و تـەبایی کـردووە ، گـویٚ بگـرن لەمـەولانا خـالیدی نەقشـبەندی کەلەدوای ناکۆکیەك لەنێوان ئەوو (شێخ مەعروفی نۆدیٚ) ئامادەی ئاشت بوونەوەو گەردن ئازادی دەبێت نامەیەکی درێژی بۆ دەنووسیٚ ئەمە هەندێکێتی: ( ...واما حب الالتئام وترك الخلاف ، فأمر يشتاق اليه أهل الانصاف ، فكيف بمن يدعي له قدما في طريق التصوف ولو بالجذاف ،وأما الابراءُ فهو يصدر مني ليلاً ونهاراً، وافصحت به في المحافل جهاراً ...)[١].

واتە: (حەز بەئاشتبوونەوەو وازهێنان لەناکۆکی کارێکە هەموو خاوەن ویژدانێك بۆی پەرۆشە، چ جای کەسێك لافی ئەوە لێبدات کەجیٚ پیٚیەکی هەیە لەتەصەوفدا ، ئازادکردنیش شەوو ڕۆژ ها لەسەر زمانی من و لەزۆر کۆڕو کۆمەڵدا بەئاشکراوتوومە بەکورتی و بەکوردی باهەمووماں بەجارێك وەلامـی ئـەم فـەرموودەی پێغەمبـەر(ﷺ) بدەینـەوە کەدەفـەرمویٚ: (...ولاتحسسـوا ولاتجسسـوا ولاتنافسوا ولاتحاسدوا ولاتباغضوا ولاتدابروا وكونوا عباد الله اخوانا كما أمركم . المسلم أخو المسلم لايظلمه ولايخذله ولايحقره ، التقوى ها هنا ـ ويشير الى صدره ثلاث مرات . )رواه مسلم[٢].

---

[١] یادی مەردان / ملا عبدالكرمی مدرس : ١/ ٣٩٧.

[٢] رياض الصالحين / النهي عن التجسس.

واتە: بەدوای عەیبی یەکتریدا مەگەڕێن ، جاسوسیو دووزمانی یەکتری مەکەن، ململانێی یەکتری مەکەن ، حەسادەت بەیەکتری مەبەن ، ر قتان لەیەك نەبێتو پشت مەکەنە یەکتری ، هەمووتان بەندەی خواو برای یەکتری بن ، وەك چۆن فەرمانی پێداون ، موسڵمان برای موسڵمانە نابێ زوڵمی لێبکاتو ریسوای بکاتو بەسووك تەماشای بکات تەقوا والێرەدا ـ لەوکاتەدا سێجار ئامارەی بەسەر سنگی کرد ـ ...... ، خوایە سینگو دەروونمان پاك بکەیتەوە لەچڵكو تاوان...هتد

## ( ٣ ) پیاوێك دڵی بەندی مزگەوت بێت :

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿في بيوت أذن الله أن ترفع ويذكر فيها اسمه يسبح له فيها بالغدو والاصال ، رجال لاتلهيهم تجارة ولابيع عن ذكر الله واقام الصلاة وايتاء الزكاة ، يخافون يوما تتقلب فيه القلوب والابصار﴾النور:٣٦ ـ ٣٧.

واتە: لەچەند ماڵو خانەیەکدا کەخوا ڕێگای داوە بەرزوبڵند بکرێتەوە (کەمزگەوتەکانە) یادو تەسبیحاتی خوای تیادەکەن بەیانیانو ئێواران پیاوانێك واتە(کەسانێك) کەبازرگانی و مامەڵەکردن غافڵیان ناکات لەیادی خواچونکە دەترسن لەو ڕۆژەی دڵو چاوی تیا هەوڵەق دەبێت.

پەیوەند بوونی دڵو دەروون بەمزگەوتەوەو هاتو چۆی چڕوپڕی مزگەوت مانای ئیمانی تەواو مانای خۆشەویستی خواو پێغەمبەری خواو پەیامەکەیان، چونکە مزگەوت مەڵبەندو جێگای خواپەرستی‌یە ، یەکەم لانکەی ئیسلامە لەمەدینەدا وەیەکەم کارە پێغەمبەر پێی هەستا لەمەدینە لەدوای کۆچە پیرۆزەکەی ، بەڵکو پێش ئەوەی بگاتە مەدینەش لە(قوباء) مزگەوتێکی دروستکردو خۆی ئیشی تیاداکرد ئەویش ئەو مزگەوتەیە کەخوا دەربارەی دەفەرموێ:﴿لمسجد اسس على التقوى من أول يوم احق أن تقوم فيه فيه رجال يحبون أن يتطهروا والله يحب المطهرين﴾التوبة/١٠٨.

واتە: مزگەوتێك کەلەسەر بناغەی تەقوا بنیات نرابێ لەیەکەم ڕۆژەوە شیاوترو لەبەرترە نوێژی تیابکەیت، لەو مزگەوتەدا پیاوانێك هەن کەدەیانەوێ خۆیان خاوێن بکەنەوە خوایش ئەوانەی خۆش دەوێت کەخۆیان خاوێن دەکەنەوە لەچڵكو ژەنگی تاوان.

مزگەوت مەڵبەندی خاوێنکردنەوەی هەستو دەروونە بۆئەوانەی بەڕاستیو دڵسۆزی هامشۆی مزگەوت دەکەن ، وەلەمزگەوتیشدا نەبێت گونجاو نیە هیچ قوتابخانەو دەزگایەکی پەروەردەی تر بتوانێ ئەو دەورە بەرزە ببینێ، هەر بۆیەش پێغەمبەر(ﷺ) مژدە دەدا بەوکەسەی دڵی پەیوەستی

مزگەوتە کەیەکێکە لەو حەوت کەسەی کەڕۆژی قیامەت دەکەونە ژێر سێبەری خوا ﴿.. ورجل قلبه معلق بالمساجد ...).

مزگەوت جێگای فێربوونی دینو رەوشتی بەرزە ، مزگەوت قوتابخانەی فێربوونی زانستی و خواویستی‌یە مزگەوت مەڵبەندی کۆبوونەوەو هەواڵپرسینی موسڵمانانەو بەسەرکردنەوەیانە تا بزانن کامیان نەخۆشە یان هەژارە یان لێقەوماوە ، هەر لەمزگەوتدابوو تا دوێنێ چەندین کەڵە پیاوو زانای پایەبەرز پەروەردە بوون ، بۆیە گەر مزگەوت دەوری نەمێنێو گەنجەکان رووی تێنەکەن مانای وایە کوردستان جارێکی‌تر ئەو پیاوە بەرزانەی تیادا دروست نابێتەوەو فەقێو مەلاو خانەدانەکان سەرچاوەی پەروەردەیان وشك دەبێت. مزگەوت باڵوێزخانەی بەرزبوونەوەی ڕۆحو گیانە بەرەو بارەگای پەروەردگارو چەشتنی تامو چێژی(مناجات) بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێ: (اذا رأيتم الرجل يعتاد المساجد فاشهدوا له بالايمان ) قال الله عزوجل:﴿انما يعمر مساجد الله من امن بالله واليوم الاخر﴾ الاية / رواه الترمذي وقال حديث حسن[1].

واتە: هەرکات پیاوێکتان دی خووی بەهاتووچۆی مزگەوتەوە گرتبوو شایەتی باوەڕی بۆ بدەن، خوای گەورە دەفەرموێ: ( تەنها ئەو کەسانە مزگەوت ئاوەدان دەکەنەوە کەبڕوایان بەخواو بەڕۆژی دوایی هەیە). ئەمەش وادەگەیەنێ هەرکەس هامشۆی مزگەوتی نەکرد ئیمانی تەواو نیە.

دەبا هەوڵ بدەین هەرچەند دەتوانین جارێکی‌تر مزگەوتەکانمان ئاوەدان بکەینەوە لەڕووی ماددی‌و مەعنەوی‌یەوە، باجارێکی‌تر مزگەوت بکەینەوە جێگای پەروەردەو زانستی‌و فەقێی زانستە ئیسلامیەکان دروست بکەینەوە، باخۆمان رابهێنین لەسەر هاتوچۆی مزگەوت بەتایبەت بەیانیانو عیشایان بەڵکو بەر ئەو مژدەیەی پێغەمبەر(ﷺ) بکەوین کەدەفەرموێ: (بشروا المشائين في الظُّلَم الى المساجد بالنور التام يوم القيامة )رواه ابوداود والترمذي[2].

واتە: مژدە بدەن بەوکەسانەی کەزۆر هاتوچۆی مزگەوت دەکەن لەتاریکیدا، بەرۆشنایی و نووری تەواو لەرۆژی قیامەتدا.

ئوممەتی ئیسلام بەگشتی‌و کوردستان بەتایبەتی هەموو قەرزاری مزگەوتن ، هەق وایە هەموو کوردێك نوێژکەرو نوێژنەکەریشی مانگانە ئەندازەیەك لەمووچەکەی تەرخان بکات بۆ خزمەتی مزگەوت ، ئەو پیاوانەی کورد کەسەری ئەم میللەتەیان بەرزکردوەتەوە هەر لە(صلاح الدينی ئەیوبی)یەوە تادەگاتە (ابن خلكان و ابن الحاجب و ابن الصلاحی شهرزوری و مەلا علی الاشنوی‌و ابن الحاج جێشانەیی‌و مەلای جزیری‌و سەعیدی نوورسی‌و ...) شێخانی تەریقەتو

---

[1] رياض الصالحين / فضل المشي الى المساجد .

[2] رياض الصالحين / فضل المشي الى المساجد.

کەڵەپیاوانی شۆڕشگێڕی وەك: (قازی محمدو شێخ سەعیدی پیران و بارزانی و ...هتد) هەموو پەروەردەی مزگەوت بوون و دین و ڕەوشت لەمزگەوتدا فێربوون.

لەبەرئەوە واجبە لەسەر هەموو کوردێکی بەغیرەت ئەمڕۆ زۆر بەدڵسۆزی لەخزمەت مزگەوتدا بێت و هەر پیلانێك لەدژی مزگەوتەکان چنرابێت زۆر دڵسۆزانە خاوی بکەینەوە، چونکە بەڕاستی دژایەتی مزگەوت تەنها دژایەتی دین نیەو بەس، بەڵکو دژایەتی کوردو کوردستانیشە .

مزگەوتەکان جێگای پرسەو مردوو شۆردن و هەموو کارێکی کۆمەڵایەتییە، لەلادێکاندا تائێستایش میوانخانەیە ، کام دەزگای دنیاویستان ڕێگا دەدات ژوورێك لەژوورەکانی تەرخان بکرێت شەو تابەیانی مردوویەکی تیادابمێنێتەوەو زۆرپای بۆ دابخات هەتا بەیانی و ، جێگای شۆردن و کفن و تابووت و ئاوی گەرم و تەنانەت دەرزی و دەزوو ئامادە بکات بۆ کەس وکاری مردوو. دیارە ئەو مەردایەتییە تەنها شایستەی مزگەوت و پەروەردەکراوانی مزگەوتە ئەگینا کەسانی(عەلمانی) بەرنامەی قیامەتیان لانیەو تەنیا لەدنیا شارەزان.

وەك قورئان دەفەرموێ: ﴿یعلمون ظاهراً من الحیاة الدنیا وهم عن الاخرة هم غافلون ﴾الروم/٧.

واتە: تەنها ڕواڵەتێك لەژیانی دونیا دەزانن ئیتر لەدوارۆژ غافڵ و بێ ئاگان.

ئیمام(فەخری رازی) لەتەفسیری ئەم ئایەتەدا دەفەرموێ: (تەنانەت دنیاش وەك خۆی ناناسن واتە: بیر لەتیاچوون و کۆتایی دنیا ناکەنەوە، تەنها ڕواڵەتێکی دەرەوەی لێ دەزانن ئەویش بۆ خۆشگوزەرانی و رابواردنی خۆیان)[1].

جابراکانم لەم فرسەتەدا لەمانای فەرموودەی(رجل قلبه متعلق بالمساجد)دا چەند خاڵێکتان بەکورتی بۆ باس دەکەم بەڵکو بتوانین جێبەجێی بکەین بەوهیوایەی ئێمەش بەر ئەو مژدە گەورەیە بکەوین:

خاڵی یەکەم/ سوپاس بۆ خوا واچەند ساڵێکە گرانی رزق و رۆزیمان لەسەر نەماوەو ئەمساڵیش خوا دەرووی بەرەحمەتی لێکردینەوەو کانیاو کارێزەکان پاراوو تێر ئاو بوونەوە، ئەمجا سەرەی ئەوەمانە بەدڵ و بەگیان بەلاشەو بەماڵ و سامان پەلاماری مزگەوتەکانمان بدەین و ئاوەدانیان بکەینەوە لەهەموو شوێنێکی پێویستدا ، چونکە کوردستانی عێراق بەلایەنی کەمەوە (٢٤٠٠) مزگەوتی تێدا ڕووخاوەو وابەئاسانی ئاوەدان ناکرێتەوە، رێکخراوە خێرخوازەکان خوا جەزایان بداتەوە ـ هەرچەند زۆر مزگەوتیان ئاوەدان کردۆتەوە ، بەڵام ئەوانیش هەندێ قەیرانیان بۆ دروست بووەو، ڕەنگە ئەو توانایەی جارانیان نەمابێت ، کەوابوو پێویستە دەوڵەمەندەکانی خۆمان بەڵکو هەرکەس بەپێی توانای خۆی لەمەودوا لەم بەهارەوە لەخەمی ئەو گەڕەك و گوندانەدابین کەمزگەوتیان نیە ، چونکە بەڕاستی گەورەیی و بچووکی لەمزگەوتدا گرنگ نیە ،

---

[1] صفوة التفاسیر : ٤٧٢/٢.

گرنگ ئیخلاصه بۆ خوا وەك پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێ: (من بنى لله مسجداً يبتغي به وجه الله، بني الله له بيتا في الجنة) متفق عليه.[1].

واتە: هەركەس لەبەرخوا مزگەوتێك بنيات بنیێو دروستی بكات مەبەستی تەنها رەزامەندی خوابێت خوای گەورە لەبەهەشتدا ماڵێكی بۆ دروست دەكات.

لەفەرموودەیەكی تردا دەفەرموێ: (من بنى لله مسجداً ولو كمفحص قطاة لبيضها بنى الله له بيتاً في الجنة) رواه احمد وابن حبان والبزار بسند صحيح[2].

واتە: هەركەسێك مزگەوتێك بۆ خوا دروست بكات بابەئەندازەی هێلانەی كورِكورِەیەك بۆ هێلكەكەی بێت خوا ماڵێكی لەبەهەشتدا بۆ دروست دەكات.

خاڵی دووەم/ لەسەرمان واجبە ئەو مزگەوتانەی كەهەیە لەگوندو گەرەكەكاندا ئاوەدانیان بكەینەوە بە جومعەو جەماعەتی گەرمو گورِ ، ئەگەر مەلایان نیە لەرِێی ئەوقافەوە یان لەسەر مەصرەفی گوندو گەرِەك مامۆستایان بۆ دابین بكەین چونكە بەراستی پێشینان فەرموویانە(مەلاو مزگەوت) مزگەوت ئەگەر مەلاو جومعەو جەماعەتی نەبێت نەبوونی چاكترە.

هەروەها پێویستە خەڵكی گوندو گەرِەك لەخەمی ئەوەدابن( وەك پێشینانمان) هەموو مزگەوتێك كۆمەڵێك فەقێی تیادابێت چونكە ئەم تاقمە مامۆستایەی ئێستا پێویستیان بەكەسانێك هەیە كەجێگایان بگرنەوە، ئەگینا شوێنەكانیان چۆڵ دەبێت ، وەك صەدەها مزگەوت ئەمرِۆ لەقەرەداغو گەرمیانو شارباژێرو ناوچەكانی تردا چۆڵو بێمەلایەو تەنانەت دەرگایشی ناكرێتەوەو خەمخۆریشیان نیە ئەوە تاوانیان لەملی ئێمەیە. خەڵكی ئەو شوێنانە لەرِۆژی قیامەتدا خوا پرسیاریان لێدەكات ، دەبێ چ وەڵامێكیان پێ بێت ؟ خۆ ئەگەر یەك مانگ شەكرو چاكەیان پێنەگات بەجارێك هاواریان لێبەرزدەبێتەوەو كاربەدەستان هەراسان دەكەن بە(عەرزو حاڵ) ئەی بۆچی بۆ چۆڵیی مزگەوتەكانیان بێ خەمن ؟!!

دەگێرِنەوە حاجی ئەحان وەصێت دەكات بۆ كورِێكی كەپاش مردنی مزگەوتێكی بۆ دروست بكات ...كورِەكەیشی دەڵێت: بابە خۆت خەمی خۆت بخۆ من فریات ناكەوم . تاشەوێك پێكەوە دەچن بۆ ماڵێك حاجی دەڵێ رِۆڵە ئەو چرا لەپێشمەوە بگرەو برِۆ كورِە ژێر دەبێ دەكەوێتە دوای باوكیو بەردەمی تاریك دەكات ، تاحاجی دەكەوێتە چاڵاوێكو گیانی قورِاوی دەبێتو و توورِە دەبێت لە كورِەكەی ، كورِەكەیشی دەڵێت: بابەگیان ئەی پێم نەوتی: چرای من كەڵكی تۆ ناگرێت چراكەت بگرە بەدەست خۆتەوە ئەمجا برِۆ ،ئەوە مزگەوتی (حاجی حان) دروست دەكات . رەحمەتی خوا لەخۆیو كورِەكەی.

---

[1] فقه السنة :٢/٢٤٦.

[2] فقه السنة : ٢/٢٤٦.

خاڵی سێیەم/ مژدەبێت لەوانەیماڵیان لەمزگەوتــەوە دوورەو دێــن بــۆ جەماعــەت ، ئــەجریان گەورەیە لەلای خوا ، جابر دەفەرموێ: زەویــەکانی دەوروبــەری مزگــەوتی مــەدینــە چــۆڵ بــوو( بــني سلمة) ویستیان ماڵەکانیان بگوێزنەوە نزیکی مزگەوت ، ئەم هەواڵە گەیشت بەپێغەمبەر(ﷺ) پــێی فەرموون: بیستوومە دەتانــەوێ بگوێزنــەوە نزیکی مزگەوت ؟ وتیــان: بــەڵێ ئــەی پێغەمبــەری خــوا نیازمــان وەهــابوو ، فــەرمووی: ( بــني سلمة دیــارکم تکتــب اثــارکم ، دیــارکم تکتــب اثــارکم)واتــە: لەجێگای خۆتان بمێنــن ، شــوێن پێکانتــان دەنوسرێ ، لــەجێگای خۆتــان بمێنــن شــوێن پێکانتــان دەنوسرێ، وتیان: کەوابوو پێمان خۆش نەما بگوێزینەوە)رواه مسلم[1].

## ( ٤ ) دووکەس یەکیان خۆشبووێ لەبەرخوا :

چوارەم کــەس لــەو حــەوت کەســەی کەپێغەمبــەر(ﷺ) مــژدەی پێــداون کەلــەژێر ســایەی خۆیــدا حەشریان بکات (رجلان تحابا في الله اجتمعا علیه وتفرقا علیه)واتــە: دوو کــەس کەلەبــەرخاتری رەزامــەندی خــوا یــەکتریان خۆشویستبێ ، لەســەر بناغــەی ئــەو خۆشەویســتی‌یە بی‌گــەردە یــەکیان گرتبێ‌و بەو شێوە مابێتەوە هەتا مردن یان لێك دابڕان لەیەکیان جیادەکاتەوە.

بێگومــان دۆســتایەتی و خۆشەویســتی ڕاستەقینە بەرهـــەمی ڕەوشـــتی بـــەرزە ، کینەبـــەری‌و دژایەتی‌و حەسوودیش بەرهەمی بەد ڕەوشتی‌یە ، موسڵمانی ڕاستــەقینەو پــەیامداریش لەهــەموو کەس ڕەوشتی بەرزترە چونکە مامۆستاکەی پێغەمبەرێکە (ﷺ) کــەخوا پــێی دەفــەرموێ: ﴿وانــك لعلى خلق عظیم ﴾مانــای: بەڕاســتی تــۆ وای لەســەر ڕەوشــتێکی بــەرز. خۆشەویســتی‌و یــەکبوونی دڵ‌و دەروون نیعمەتێکی خوایە بۆ بەندەکانی بۆیە پێویستە بەندەکان شوکرانە بژێری خوا بکــەن لەسەری ﴿واذکروا نعمة الله علیکم اذ کنتم اعداء فألف بین قلوبکم فأصبحتم بنعمته اخوانا ...﴾ال عمران :١٠٣. واتــە: یــادی نیعمــەتی خوابکەنــەوە لەســەرتان کــەئێوە دوژمنـــی یــەکتری بــوون خــوا ئولفەتی خستە نێوانتان بەهۆی ئەو نیعمەتی خۆشەویستی‌یەوە بوون بەبرای یەکتری .

قال ابو ادریس الخولاني لمعاذ: اني احبك في الله فقال له: ابشرثم فأني سمعت رسـول الله (ﷺ) یقول : ( یُنصب لطائفة من الناس کراسي حــول العــرش یــوم القیامــة وجوهــم کــالقمر لیلــة البــدر یفزع الناس وهم لایفزعون ویخاف الناس وهم لایخافون وهــم أولیاء الله الذین لاخوف علیهم ولاهــم یحزنون ، فقیل من هؤلاء یارسول الله ؟ فقال: هم المتحابون في الله تعالی ) اخرجه احمد والحاکم [2].

واتە: (ئــەبو ئیدریس خولانی) فەرمووی: بە(مەعاز) من تۆم خۆش دەوێت ، ئــەویش فــەرمووی: مــژدە وەرگــرە، مــژدە وەرگــرە چونکــە مــن لــەپێغەمبــەرم بیســتووە دەیفــەرموو: کۆمــەڵێك خــەڵك هــەن

---

[1] ریاض الصالحین : باب فضل المشي الی المساجد.

[2] احیاء علوم الدین :٢/اداب الالفة والصحبة /١٤٤.

رۆژی قیامەت کورسی و قەنەفەیان بۆ دائەنرێ بەدەوری عەرشی خوادا، رووموەتیان وەك مانگی چواردە ئەدرەوشێتەوە، لەو رۆژەدا خەڵك ترس و لەرز دایان دەگرێ ئەوان ناترسن ، ئەوانە ئەولیاو دۆستەکانی خوان کەترس و غەم نایانگرێتەوە، وترا: ئەوانە کێن ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی: ئەوانەن کەلەبەر رەزامەندی خوا یەکتریان خۆشویستووە.

لەریوایەتێکی تری فەرموودەکەدا دەفەرموێ: (هم المتحابون في الله والمتجالسون في الله والمتزاورون في الله) (اخرجه النسائي في سننه الكبرى ورجاله ثقات). واتە: ئەوانەی کەلەبەرخوا یەکتریان خۆشویستووە ، لەبەرخوا پێکەوە دانیشتوون لەبەرخوا هامشۆی یەکتریان کردووە.

لەریوایەتێکی تریشدا لەوەسفیاندا دەفەرموێ: (وهم من أبناء الناس ونوازع القبائل لم تصل بينهم ارحام متقاربة تحابوا في الله وتصافوا ...)احمد وابويعلى باسناد حسن. واتە: ئەوانە کۆمەڵێ خەڵکن لەچەند تیرەیەکی جیاجیا خزمی یەکتری نین، لەبەرخوا بوونە خۆشەویست و یەکریز بوون.

خۆشەویستی لەبەرخوا گەورەترین نیشانەی باوەڕداریی مرۆڤە گوێ بگرن لەم فەرموودەیە: (أوثق عرى الايمان الموالاة في الله والمعاداة في الله والحب في الله والبغض في الله ) الطبراني والبغوي.

واتە: بەهێزترین قوڵفی باوەڕ ئەوەیە لەبەرخوا دۆستایەتی و دوژمنایەتی بکەیت ،وەلەبەرخوا کەسانێکت خۆش بووێت و رقیشت لەکەسانێکی تربێت.

هەرکەس بەڕاستی خوای خۆشویست و خوای پەرست ئەوە عەبدە راستەکانی خوایشی خۆش دەوێت، وەهەرکەس رقی لەئەولیاو پیاوچاکان بوو مانای رقی لەخواش دەبێتەوە ، بۆیە لەفەرموودەی قودسیدا هاتووە: (من عادى لي ولياً فقد آذنته بالحرب )واتە: خوا دەفەرموێ: هەرکەس دوژمنایەتی دۆستێك و خۆشەویستێکی من بکات ئەوە من جەنگم لەگەڵدا راگەیاندووەو ئاشکرام کردووە.

خۆشەویستەکانی سەرزەمین هەر هەموویان لەرۆژی قیامەتدا دەبنە دوژمن جگە لەوانەی کەلەبەرخاتری خوا یەکتریان خۆشویستووە، وەسەربازو ژێردەستەو دەستەو پێوەندی ستەمکاران لەو رۆژەدا ئەوپەڕی پەشیمانی دایان دەگرێ، گوێ بگرین لەم ئایەتانە بەجوانی ئەو مەبەستەمان بۆ روون دەکەنەوە: ﴿الاخلاء يومئذ بعضهم لبعض عدو الا المتقين ﴾ زخرف:٦٧. واتە: دۆست و خۆشەویستەکان لەو رۆژەدا دەبنە دوشمنی یەکتری ئیللا ئەوانە نەبێت لەسەر بناغەی تەقواو خواویستی یەکتریان خۆش ویستووە. هەروەها لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ:﴿ويوم يعض الظالم على يديه يقول ياليتني اتخذت مع الرسول سبيلا ، ياويلتى ليتني لم اتخذ فلاناً خليلاً لقد اضلني عن الذكر بعد اذ جاءني وكان الشيطان للانسان خذولاً ﴾ الفرقان: ٢٧ ـ ٢٩.

واتە: لەو ڕۆژەدا کەستەمکار قەپ دەگرێ لەهەردوو دەستی لەبەر پەشیمانیو هەناسەساردی ڕەنج بێوەری و دەڵێت: خۆزگایە من ڕێگای پێغەمبەرم بگرتایە ، ئای بەدبەختیو هەناسە ساردی بۆ من خۆزگایە فلآنەکەسم نەکردایەتە دۆستو خۆشەویستی خۆم ، بەڕاستی گومڕاو سەرگەردانی کردم لەقورئانەکەی خوا دوای ئەوەی کە من ئەو قورئانەم پێگەیشت و شارەزای بووم.

بێگومان زاناو خواویستەکان کەلەپوور بەری پێغەمبەرانن (ﷺ) بۆیە هەرکەس لەفەرمانیان دەرچێت مانای لەفەرمانی پێغەمبەر لایداوە ، بۆیە پێویستە ئەوکەسانەی دەیانکەین بەدۆستو خۆشەویستی خۆمان چەند مەرجێکیان تێدابێت چونکە پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێ: (المرء على دين خليله فلينظر احدكم من يُخالل) اخرجه ابوداود والترمذي وحسنه الحاكم وقال صحيح ان شاء الله.

## ئەو مەرجانەش:

یەکەم/ ژیری :واتە: بادۆستەکەت ژیر بێت چونکە گەوجو نادان زیانت پێدەگەیەنن وەك ئیمامی عەلی (ﷺ) دەفەرموێت: (فلا تصاحب أخا الجهل واياك واياه ، فكم من جاهل أردىٰ حليماً حين اخاه، يقاس المرء بالمرء اذا ما المرء ماشاه، وللشئ من الشئ مقايس واشباه، وللقلب على القلب دليل حين يلقاه).

| | |
|---|---|
| مەبەدۆستی گەوج و نادان | زۆر پێویستە خۆلەولادان |
| زۆرکەس هەبوو عاقڵو ژیر | کەوتە داوی دۆستی کەم بیر |
| مەردبناسە بەهاوڕێکەی | گەر دەتەوێ لیێ تێبگەی |

دووەم/ ڕەوشت بەرزی: چونکە زۆر کەس هەیە ژیرە چاكو خراپ ، ڕەشو سپی لێك جیادەکاتەوە، بەڵام کاتێك لافاوی ئارەزووبازی یان ڕقو قین یان تەماعی دنیا هێرشی بۆ هێنا هەموو چاکەیەکی لەبیردەچێتەوەو هاوڕێکەی دەفرۆشێت ، ئەوەتا قورئانیش ئاماژە دەکات بەم مەبەستە:﴿ولا تطع من اغفلنا قلبه عن ذكرنا واتبع هواه وكان امره فرطاً ﴾ الكهف: ٢٨ واتە: بەگوێی کەسێك مەکە کەئێمە بێئاگامان کردووە لەیادی خۆمانو دوای هەواو ئارەزوو کەوتووەو کاری لەسنوور دەرچووە.

سێیەم/ دینداریو لەخواترسی: چونکە هاوڕێ دەبێ دڵنیابێت لەهاوڕێکەی ، وەکەسێك لەخواترس نەبوو جێگای موتمانەو دڵنیایی نیە چونکە هەموو شتێك بەتەرازووی ئارەزووی خۆی دەکێشێو، زۆر ئاساییە لای کەدەستدرێژی بکاتە سەرماڵو سامانو ناموسی هاوڕێکەی هەرکات ئارەزوو زۆری بۆهێنا چونکە ترسی خوا لەدڵیدا نیە بۆیە خوای گەورە دەفەرموێ:

﴿فأعرض عمن تولى عن ذكرنا ولم يرد الا الحياة الدنيا ﴾ النجم : ٢٩ واتە: ڕوو وەرگێڕە لەوکەسەی پشتی کردۆتە خواو یادی ناکات وتەنیا ژیانی دنیای مەبەستە.

ئیمامی شافیعی لەم بارەیەوە دەفەرموێ:

اذا لم أجد خلاً تقياً فوحدتي    ألذ وأشهى من غوي أعاشره

وأجلس وحدي للعبادة امناً    أقر لعيني من جليس أحاذره [1]

واتە: ئەگەر دۆستێکی دین پاكو لەخواترسم دەست نەکەوت تەنیایم زۆر بەلاوە بەتامو چێژترە لەهاودەمی خراپەکار ، ئەگەر بەتەنها دانیشم و بەدڵنیایی خواپەرستی بکەم ، چاوودڵم زیاتر دەسرەوێ لەوەی هاودەمێکم هەبێو لێی بترسم، ...

ئەمانەو چەندین مەرجی تریش هەن پێویستن بۆ هاوڕێ بەلاّم ئەم سیانە سەرەکیەکانن .

## ( ٥ ) کەسێك لەترسی خوا خۆی لەخراپە بگرێتەوە:

پێنجەم کەس لەوحەوت کەسەی دەکەونە ژێر سێبەری خوا لەڕۆژی قیامەتدا: (رجل دعته امراة ذات منصب وجمال فقال اني أخاف الله) واتە: پیاوێکە ئافرەتێکی خاوەن پلەوپایەو جوانی بانگی لێبکات بۆکاری خراپە بەلاّم ئەو لەوەلاّمدا بڵێ من لەخوا دەترسم.

داستانی یوسف کەخوای گەورە لەقورئاندا بۆمان دەگێڕێتەوە گەورەترین وانەیە بۆ گەنجەکانی ئەمڕۆمان تایبەکنە سەرمەشقی خۆیانو خۆبگرن لەبەردەم فشاری ئارەزوو هەڵنانەکانی ئەمڕۆ کەئافرەتی تێدا بەجۆرەها شێوە ڕازێنراوەتەوەو بەزمانی حاڵ گەنجەکان بەرەو خراپەو داڕوخاندنی ڕەوشتی بانگ دەکەن.

گوێ بگرین چۆن قورئان ئەو هەڵوێستەی یوسفی تۆمارکردووە بەرامبەر خواستەکانی خێزانی پادشای میصر کەدەفەرموێ: ﴿وراودته التي هو في بيتها عن نفسه وغلّقت الابواب وقالت : هيت لك قال معاذ الله انه ربي أحسن مثواي انه لايفلح الظالمون ﴾يوسف:٢٣.

واتە: ئەو ئافرەتەی یوسف لەماڵیاندا بوو داوای لێکرد یوسف نزیکی بکەوێت، هەموو دەرگاکانی لەسەر داخست و پێی وت: ئامادەبە چونکە یوسف زۆر جوانو ئێسك شیرین بوو بەلاّم یوسف لەوەلاّمدا فەرمووی: پەنا بەخوا لەکاری وەها چونکە بەڕاستی گەورەکەم(خاوەنی ماڵ) زۆر چاکەی لەگەڵ کردوومو جێگای خۆشی پێداوم ، بەڕاستی ستەمکاران بەختەوەر نابن.

﴿ولقد همّت به وهم بها لولا ان رأى برهان ربه ، كذلك لنصرف عنه السوء والفحشاء انه من عبادنا المخلصين ﴾ يوسف: ٢٤. واتە: بەڕاستی ئافرەتەکە نیازی خراپەی کرد لەگەڵ یوسف ، یوسفیش نیازی خراپە دای لەدڵی ئەگەر بەڵگەی خوای نەبینایە ، بێگومان نیازی دەروون بەتەنیا بێئەوەی

---

[1] ديوان الامام الشافعي :٤٣.

بریاری لەسەر بدریٚ و جیٚبەجیٚ بکریٚ نابیٚتە گوناە ، مادام لەترسی خودا وازی لەونیازە هێناوە خوا بەچاکەیەك بۆی دەنووسیٚ، وەك لەفەرموودەی (صحیح)داهاتووە. ئەو بەڵگەش یوسف بینی هەندێك دەڵێن: یوسف شێوەی(یعقوب)ی باوکی بینی کە قەپی کردبوو بەسەر پەنجەیدا، واتە پیٚی وت: نەکەی . هەندێك دەڵێن: دای بەسەر سنگی یوسفدا . هەندێك دەڵێن: یوسف شێوەی پادشا . مێردی ئافرەتەکەی ـ ی هاتە پێش چاو [1].

هەرکام لەمانە یان غەیری ئەمانە بێت گومان لەوەدانیە خوا پاراستی چونکە وەك خۆی دەفەرموێت: ﴿انه من عبادنا المخلصين ﴾بەڕاستی یوسف لەبەندە پاڵفتەکراوەکانی ئێمەیە.

لەبارەی خۆگرتنەوە لەئارەزووی حەرام زۆر چیرۆکی کاریگەر هەیە لەفەرموودەو ژیاننامەی پیاوچاکاندا یەکێك لەوانە ئەو چیرۆکەیە کە(باوکی عبدالرحمن عبدالله ی کوری عمری کوری خطاب)دەیگێڕێتەوەو دەڵیٚ: بیستوومە لەپێغەمبەر(ﷺ) دەیفەرموو: ((سیٚکەس لەئوممەتەکانی پێش ئێوە ڕۆیشتن هەتا بۆ شەومانەوە ڕێگایان کەوتە ئەشکەوتێك چوونە ناوی ، بەردێکی گەورە لەشاخەکە هاتە خوارەوە دەرگای ئەشکەوتەکەی لێگرتن ، لەناوخۆیاندا وتیان: هیچ شتێك لەم گابەردە رزگارمان ناکات ئەوەنەبیٚ لەخوا بپاڕێینەوە بەکردەوە چاکەکانمان ، پیاوێکیان وتی: ئەی خوایە من دایكو باوکێکی پیرو زۆر بەتەمەنم هەبوو ، پێش ئەوەی شیری ئێوارە دەرخواردی ماڵو منداڵم بدەم ئەوانم تێردەکرد . تاڕۆژێکیان بەدوای داردا دوورکەوتمەوە نەگەڕامەوە بۆلایان هەتا خەویان لیٚکەوتبوو ، پێم ناخۆش بوو پێش ئەوان شیرەکە بدەم بەماڵو منالم ، شیرەکەی ئێوارەم بۆ دۆشین ، بەوشێوەیە مامەوە هەر پەرداخە شیرەکە بەسەر دەستمەوە بوو، چاوەڕیٚبووم بەخەبەربێن تاسپێدەی بەیان دەرکەوت، منالەکانم دەکڕوزانەوە لەبرسا لەپەنا قاچمدا ، هەتا دایكو باوکم خەبەریان بوویەوە، شیرەکەی شێویان خواردەوە. ئەی خوایە ئەگەر من ئەوەم لەبەر ڕەزامەندی تۆکردووە دەروویەکمان لێبکەیتەوە لەم بەڵاوین تیایدا!!...بەردەکە هەندێك جوولاٚ بەلاٚم نەیان ئەتوانی دەرچن ، یەکێکی تریان وتی: ئەی خوایە من کچێکی مامم هەبوو، خۆشەویسترین ئادەمیزاد بوو لەلای من ، لەڕیوایەتێکی تردا هاتووە : (بەوپەڕی ئەو خۆشەویستی‌یە پیاوان ژنانیان خۆش دەوێت ، داوام لێکرد خۆی بداتە دەستم ڕێگای نەدام ، هەتا گرانیەك لەگرانیەکان زەفەری پێهێنا پەنای هێنایە لام ، صەدوبیست دینارم پێدا بەومەرجەی ڕێگای نێوان منو خۆی نەگریٚو رازی بوو، تاتوانام شکا بەسەریدا) لەڕیوایەتێکی‌تردا (لەکاتێکدا دانیشتم لەنێو هەردوو قاچیدا ) وتی: لەخوا بترسەو ئەو مۆرە مەشکێنە مەگەر بەهەقی خۆی نەبیٚ، لیٚی گەڕامە دواوە کەئەو خۆشەویسترین کەس بوو لەلام ، ئەو ئاڵتونەشی پێمدابوو جێم هێلاٚ بۆی ، ئەی خوایە ئەگەر ئەوەم لەبەر ڕەزامەندی تۆ کردووە

---

[1] تفسير ابن كثير : يوسف : ٢٤.

دەروومان لێ بکەیتەوە لەم حاڵەی واین تیایدا ، بەردەکە هەندێ جووڵا بەلام نەیان دەتوانی دەرچن.

سێیەم وتی: ئەی خوایە من هەندێ کرێکارم گرت هەموویان کرێکەم دانێ جگە لەپیاوێکیان هەقەکەی خۆی جێیەلاو وەری نەگرت و رۆیشت ، منیش بۆم خستەکارەوە هەتا بوو بەماڵێکی زۆر ، دوای ماوەیەك هات بۆلام وتی: فلان کەس کرێکەم بدەرێ ، وتم ئەوەی تۆدەیبینی لەوشترو رەشەولاخ و مەرو بەندە گشتی کرێی تۆیە ، وتی: ئەی بەندەی خوا گاڵتەم پێ مەکە وتم: گاڵتەت پێناکەم هەمووی وەرگرت و دانی لەبەر هیچی بەجێ نەهێشت ، خوایە ئەگەر ئەمەم لەبەرخاتری تۆ کردووە دەروویەکمان لێبکەرەوە لەم حاڵەی تێی کەوتووین. بەردەکە جووڵاو دەرچوون و کەوتنە رێ ) فەرموودەکە (بخاری و مسلم) ریوایەتیان کردووە[1].

دەگێڕنەوە سلێمانی کوڕی یەسار لەمەدینەوە رۆیشت بەنیازی حەج لەگەڵ هاوڕێیەکیدا لە(ابواء)دابەزین بەنیازی پشوودان ، هاوڕێکەی هەستا توێشوودانەکەی هەڵگرت و چوو بۆ بازاڕ شت بکڕێ، سلێمان لەدەوارەکەدا دانیشت . کەجوانترین روومەتی هەبوو ـ ئافرەتێکی دەشتەکی چاوی پێی کەوت لەسەر لووتکەی تەپۆڵکەیەکەوە دابەزی بۆلای هەتا لەبەردەمیدا وەستا، پەچەو دەسکێشی پۆشیبوو ، پەچەی لادا لەروومەتێك هەر دەتوت: پارچەیەك لەمانگە وتی: بەشم بدە ، سلێمان وای زانی خواردەمەنی دەوێ، پاشماوەی خوانەکەی هەڵگرت بیداتێ ، وتی: ئەوەم ناوێ ، ئەوەم دەوێ کەپیاو لەگەڵ خێزانی خۆیدا دەیکات ، وتی: شەیتان بۆ منی رازاندویتەوە ؟ ئەمجا سەری خستە نێوان ئەژنۆکانی دەنگی بەرزکردەوە بەگریانێکی بەکوڵ ، هەرگریا هەرگریا هەتا چاوی سووربوو ، هەناسەی سواربوو، کەئافرەتەکە ئەم دیمەنەی دی پەچەکەی دادایەوەو گەڕایەوە بەدوا تاگەیشتەوە لای کەس و کاری کاتێك هاوڕێکەی هاتەوە بینی سلێمان هەردوو چاوی سووربووە و ئاوساوەو هەناسەی لێبڕاوە لەتاو گریان ، پێی وت: بۆچی دەگری؟ وتی: خێرە یادی منداڵەکانم کردەوە ، وتی: نەوەڵلا رووداوێك لێی رووداوی چونکە هەمووی سێ رۆژە منداڵەکانت جێهێڵاوە ، وازی لێنەهێنا تابەسەرهاتی ئافرەتە دەشتەکی یەکەی بۆ گێڕایەوە ، ئەمجا هاوڕێکەی توێشوودانەکەی داناو دەستی کرد بەگریانێکی بەکوڵ ، سلێمان پێی وت: ئەی تۆ بۆ دەگری ؟ وتی: من شیاوترم بەو گریانە لەتۆ ، چونکە گەرمن لەجێگای تۆبوومایە خۆم نەدەگرت لەبەرامبەر ئەو ئافرەتەدا ، ئەمجا پێکەوە گریان زۆر گریان ، لەکاتێکدا سلێمان گەیشتە مەککە هاتوچۆی نێوان صەفاو مەروەی کردو حەوتجار لەدەوری کەعبە گەڕا ، ئەمجا چووە ئەو شوێنەی پێی دەڵێن (حجر) خۆی گرمۆڵە کردو بەعەباکەی خۆی داپۆشی و خەوی لێکەوت ، پیاوێکی روومەت جوانی بۆنخۆشی بالا بەرز هاتە خەوی ، سلێمان پێی وت: تۆ کێی خوا رەحمەت پێ

---

[1] ریاض الصالحین / باب الاخلاص واحضار النیة .

بكات؟ وتی: من یوسفم وتی( یوسف الصدیق)ی ؟ وتی: بەڵێ وتی: بەڕاستی ڕووداوی تۆو خێزانەکەی پادشای میصر ، جێگای سەر سووڕمانە ! یوسف فەرمووی: ڕووداوی تۆو ئافرەتەکە (ابواء) زیاتر جێگای سەر سووڕمانە[1] .

کاتێك سەرباز بووم لەساڵی (١٩٨١) لە(بصرة) لەدەشتی (الرميلة الشمالية)پیاوێکم لەگەڵ بوو سەربازی (احتياط)بوو زایندەی (١٩٤٨) خەڵکی (سوق الشيوخ)و لەبرادەرانی شیعە بوو ناوی (محمد مهاويش) بوو ، چەندجار بۆی گێڕامەوە وتی: کاتێ سەربازی (مکلف) بووم لە بەغداد تازە ژنم هێنابوو چوار مانگ بوو ماڵم نەدیبوو ئێوارە وەختێك ئیجازەم وەرگرت و چوومە گەراجی (علاوی) بڕۆمەوە سەیارەی (ناصرية)نەمابوو تەنها یەك سەیارەی (نەجەف)مابوو ئەویش تەنهایەك جێگای مابوو لەپێشەوە، وتم: ئەمشەو دەچمە (نەجەف)و زیارەت دەکەمو لەوێوە دەڕۆم بۆ (ناصريه) بەڵام ئەوەی خەریك بوو ساردم بکاتەوە لەو نیازە ئەوەبوو ئافرەتێکی گەنجی جوانی سپی و ناسك و قەڵەو لەپێشەوە سواربووبوو قوڵ و قوڵی ڕووت بو هەندێ هەڵوێستەم کرد ، بەڵام دواتر وتم کورە من بەنیازی خێرو زیارەت دەچم ، چیمە لەسەر ئەو ، بەوشێوە بڕیارمداو سەرکەوتمو لەپەنا ئافرەتەکەدا دانیشتم زۆر بەشەرمەوە ، کاتێك نزیکی (نەجەف) بووینەوە کەوتە گفتوگۆ لەگەڵمداو وتی: (ابو خليل وين رايح) ؟ واتە : ئەی سەرباز بۆ کوێ دەچیت ؟ وتم: (انا زاير) واتە: بۆ زیارەت دەچم وتی: (انا هم زايرة) واتە : منیش هەم بۆ زیارەت دەچم ... بەکوردی و بەکورتی وتی: دەرگای گفتوگۆ لەنێوانماندا کرایەوەو لێم پاڕایەوەو گوتی: تۆ بۆ زیارەت و من بۆ زیارەت من لە(نەجەف و کەربەلا) کەس ناناسم ، بەڵکو ئەمشەو لەگەڵ خۆت بم بەیتە ئوتێل و بڵێی ئەمە خوشکمە چونکە من بەتەنها جێگام ناکەنەوە.

محمد وتی: زۆر ترسام لەم کارەساتە بەڵام ئەوەندە پاڕایەوەو خۆی بەپاکی خستەڕوو بەزەییم بۆی جووڵاو بڕیارمدا ...سەرەتای شەو گەیشتینە (نەجەف) چووینە ئوتێل ژوورێکی دووکەسیمان گرت و کردم بەخوشکی خۆم زیارەتمان کردو نانمان خواردو پێکەوە چووین بۆ (کەربەلا) و زیارەتی (حسين)مان کرد(رضي الله عنه وعن والديه)، کاتی خەو گەڕاینەوەو چووینە ژووری خۆمان و من بەنیازی پاکی خۆم بەتەمابووم بخەوم ، بەڵام ئەو بەنیازی پیسی خۆی کێچ کەوتە کەوڵیو تێم ئاڵا ، ئەو پارچە جلەش کەبەگیانیەوە بوو لای داو کەوتە حەلوەلا لەگەڵم ، کار لەوەدا نەمابوو ئامۆژگاریم لێوەربگرێ، شەیتان چووە کەللەیو پێی دەوتم: تۆ پیاو نیت نەگینا چۆن هەلی وەها لەدەست خۆت دەردەکەیت ، درێژەی پێنەدەین (محمد) وتی: کاتێك زانیم جلەوم لەدەست چووەو ئارەزووم سواربووە، لەوەدابوو تووشی هەڵەی گەورەبم ، بۆیە خێرا بەتانیەکانی خۆم پێچایەوەو کلیلەکانم هەڵگرت و لەژوورەکە دەرچوومو لەدیوی دەرەوە دەرگاکەم لەسەر

---

[1] احياء علوم الدين : ٣ فضيلة من يخالف شهوة الفرج والعين.

ئافرەتەکە داخستو چوومە سەربانی ئوتێلەکە خەوتم ، هەرچەند کاتەکەیش ساردبوو ، (ئێستا یادم نەماوە محمد وتی: پایز بوو یان بەهار) .

ئەم داستانەی (محمد مهاوش) چەندجار بۆی گێراومەتەوە پیاوێکی ئەوەندە ڕاستگۆش بوو ئەوەندە دڵساف و هەژاربوو بەزۆریش نەتئەتوانی درۆیەکی پێ بکەیت.

لەم بارەیەوە دەیان و صەدان ڕووداوی جوان و بەسەرهاتی دلێرانە تۆمارکراوە لەمێژوودا و تەنها باوەڕو ترسی خوایە بتوانێ لەکاتی لافاوی ئارەزوودا خۆی بگرێو سنووری شەرم نەشکێنێ وەئەوکەسانەی دەڵێن: دڵ حسابەو هەرکەس شیری پاك بێت ئەم کارانە ناکات دەیانەوێت بەو قسانە خەڵکی دەسخەرۆبکەن و خۆیشیان دەزانن قسەکانیان ڕاست نیە چونکە تەنها قەڵای ئیمان و ترسی خوایە لەم کاتەدا فریای ئینسان دەکەوێ ...

ئەمجا ئەوەش بزانین بەگوێرەی فەرموودەکانی پێغەمبەر(ﷺ) هەرکات ئافرەت لەشەرع و یاسای خوا لایدا و پەردەی شەرمی دانا گەورەترین فیتنەیە بۆ پیاوان و بۆ لەناچوونی گەل و وڵات ...وەك پێغەمبەر( لەم بارەوە دەفەرموێ: (ماترکت بعدي فتنة هي اضر علی الرجال من النساء).

واتە: دوای خۆم هیچ تاقیکردنەوەیەکم بەجێنەهێشتووە زیانبەخش تر بێت بۆ پیاوان لەفیتنەی ئافرەت.

یان دەفەرموێت: (اتقوا الدنیا واتقوا النساء فان أول فتنة بني اسرائیل کانت في النساء)واتە: خۆتان بپارێزن لەدونیاو خۆتان بپارێزن لەئافرەت ، چونکە یەکەم بەڵای (بنی اسرائیل) لەئافرەتەوە سەری هەڵدا.

دیارە جوولەکەو غەربیش باش ئەم ڕاستیییەیان زانیوە بۆیە ئەمڕۆ دەیانەوێ بەهەموو شێوەیەك لەولایەنەوە زەفەرمان پێ بهێنن و سەرکەوتووش بوون ، گوێ بگرن لەیەکێك لە(پرۆتۆکۆلات)ی جوولەکەکاندا دەڵێت: (علینا أن نکسب المرأة ففي أي یوم مدت الینا یدها ربحنا القضیة)واتە: لەسەرمانە کەئافرەت بکەین بەلایەنگرو داردەستی خۆمان ، هەر ڕۆژێك ئافرەت دەستی بۆ درێژکرد ین مانای ئێمە گرەومان بردوەتەوە.

یان یەکێکی تریان دەڵێت : (کأس وغانیة تفعلان في تحطیم الامة المحمدیة أکثر مما یفعله ألف مدفع فأغرقوها في جب المادة والشهوات).واتە: پەرداخێکی شەراب و ئافرەتێکی گۆرانی بێژ کارێك دەکەن بۆ تێکشکاندنی ئوممەتی (محمد) کەبەهەزار (مدفع) ناکرێت ، کەوابوو ئەو ئوممەتە غەرق بکەن لەخۆشەویستی ماددەو ئارەزووەکانی نەفسدا.

یا الله ئوممەتی محمد (ﷺ) بێدارکەیتەوە لەخەوی غەفڵەت و شارەزایان کەیت لەپیلانی دوژمنانیان و هیدایەتیان بدەیت بگەڕێنەوە بۆ ڕێگای پێغەمبەرەکەیان ...

ئامین ... ئامین ... والحمد لله رب العالمین

## ( ٦ ) پیاوێکی خێرۆمەند:

شەشەم کەس لەو حەوتەی دەچنە ژێر سێبەری خوا لەرۆژێکدا هیچ سێبەرێك نیە جگە لەسێبەری ئەو ( رجل تصدق بصدقة فاخفاها حتى لاتعلم شماله ماتنفق يمينه) .

واتە: پیاوێك خێرێك بکاتو بیشارێتەوە بەشێوەیەك دەستی چەپی بەدەستی راستی نەزانێ ، ئەم تەعبیرە ئاماژەیە بەزۆر شاردنەوەی بەخشینی مالْ بەهەژار بۆئەوەی دووربێ لەرووپایی و شانازی لەلایەن ئەو کەسەی دەیبەخشێ ، هەروەها دووربێت لەرووشکێنی و منەتبارکردنی ئەوکەسەی وەری دەگرێت.

ئەم فەرموودەیە دووپاتی ئەو بنەما شەرعیەمان بۆ دەکاتەوە کەلەئایەتی(٧١)ی سوورەتی(بقرة) دا هاتووە کەدەفەرموێ:﴿إن تبدوا الصدقات فنعما هي ، وان تخفوها وتؤتوها الفقراء فهو خير لكم ، ويكفر عنكم من سيئاتكم والله بما تعملون خبير ﴾.

واتە: ئەگەر خێرو بەخشینەکانتان ئاشکرابکەن ، ئەوە کارێکی چاکە ، بەلاّم ئەگەر بیشارنەوەو بیبەخشن بەهەژاران ئەوە چاکترە بۆتانو دەبێتە هۆی کەفارەتو لابردنی گوناهەکانتانو خوا ئاگادارە بەوەی کەدەیکەن.

(ابن كثير)لەتەفسیری ئەم ئایەتەدا دەفەرموێ: (ئەم ئایەتە بەلْگەیە لەسەر ئەوەی شاردنەوەی خێرو بەخشین چاکترە لەدەرخستنی چونکە دوورترە لەرووپامایی ، مەگەر دەرخستنی بەرژەوەندیەکی بەهێزی تێدابێت ، وەك ئەوەی بیەوێ خەلْکی‌تر چاوی لێبکەن ، لەوکاتەدا دەرخستنی باشترە ، وەلەم بارەیەوە فەرموودەیەك نەقلْ دەکات کەئیمامی ئەحمەد ریوایەتی کردووە کەپێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: (لەکاتێکدا خوای گەورە زەوی دروست کرد، زەویکەوتە جوولْە جوولْ، خوا چیاکانی دروستکردو ، داینا لەسەرزەوی ، ئیتر قەراری گرت ، فریشتەکان کڕنووشیان برد بۆ خوا کاتێ چیاکانی دروست کرد وتیان: ئەی خوایە شتێك هەیە لەدروستکراوەکانی تۆدا لەچیا بەهێزتربێت ؟ فەرمووی: بەلْێ ئاسن. وتیان: ئەی خوایە شتێك هەیە لەدروستکراوەکانی تۆدا لەئاسن بەهێزتربێت ؟ فەرمووی: بەلْێ:ئاگر ، وتیان: ئەی خوایە شتێك هەیە لەدروستکراوەکانی تۆدا لەئاگر بەهێزتر بێت ؟ فەرمووی: بەلْێ ؛ ئاو ، وتیان: ئەی خوایە شتێك هەیە لەدروستکراوەکانی تۆدالەئاو بەهێزتربێت ؟ فەرمووی: بەلْێ؛ با . وتیان : ئەی خوایە شتێك هەیە لەدروستکراوەکانی تۆدا لە(با) بەهێزتربێت ؟ فەرمووی: بەلْێ؛ ئادەمیزاد کەبەدەستی راستی خێردەکاتو دەیشارێتەوە لەدەستی چەپی.

لەم ئایەتە پیرۆزە ئەوەش وەردەگیرێ ئەوانەی خێرەکانیان دەشارنەوە دەبێ هەولْ بدەن هەژاری شیاو بەو خێرە بدۆزنەوە ئەوکاتە پلەی چاکترەکەیان دەست دەکەوێت و دەبێتە کەفارەتی

تاوانەکانیان ؛ هەروەك چۆن کۆتایی ئایەتەکە ﴿والله بما تعملون خبير﴾ئاماژە بەوە دەکات کەپێویست ناکات ئێمە بمانەوێ خەڵك بەچاکەکانمان بزانێت چونکە خوا هیچی لێ ون نابێت وەئاگایە بەهەموو شتێك.

غەزالی رەحمەتی خوای لێبێت لەپەڕاوی (احياء علوم الدين)دا دەفەرموێ: هەندێکەس هەوڵیانداوە وەرگر نەزانێت کێ ئەو خێرەی بۆ ناردووە بۆیە هەندێجار دەیانخستە دەستی کوێرێك ، یان لەڕێگای هەژارێکدا یان لەشوێنی دانیشتنەکەیدا دایان دەنا ، یان لەکاتی خەودا ئەیانبەست بەجلەکانیەوە ، یان بەکەسێکی‌تردا بۆیان دەناردو دەیان وت ناوی ئێمە مەبە ، هەموو ئەمانە بەهیوای کوژاندنەوەی خەشم و قینی خوا(سبحانه) یان لەبەر خۆپاریزی لەڕووپایی و ناودەرکردن.

وە ئەگەر هەر پێویست بوو یەکێك پێی بزانێت باشتر وایە بیداتە دەست وەکیل بیگەیەنێ بەهەژارەکان، چونکە ئەگەر هەژارەکە پێی زانی ئەوە مەترسی رووپاییو منەتبارکردنی لێدەکرێ ، بەڵام ئەگەر هەر وەکیلەکە بزانێت ، ئەوە تەنیا مەترسی روپایی تیایە.

وەهەرکەس مەبەستی شۆرەتو ناوبوو ئەوا کردەوەکانی پووچەڵەو پاداشتی نابێ ، چونکە بەخشینی زەکاتو خێر بۆ نەهێڵانی رەوشتی رژدیو چاوچنۆکی و لاوازکردنی خۆشەویستی ماڵی دنیایە ، وەخۆشەویستی ناوو شۆرەت زیاتر لەدەدەروندا چەقیوە ، تاخۆشەویستی ماڵ ، وەهەرەیەك لەم دووانە رەنج دەسوتێنن لەپاشە رۆژدا ...)[1].

لەشاردنەوەی خێروچاکەدا خێرخواز سەرفراز دەبێت لەپووچەڵ بوونەوەی خێرەکەی بەهۆی منەتبارکردنی هەژارەکە ، یان ئازاردانی لاشەیی یان دەروونی ، وەك قورئان دەفەرموێ: ﴿يا ايها الذين امنوا لاتبطلوا صدقاتكم بالمن والاذى كالذي ينفق ماله ر..آء الناس ولا يؤمن بالله واليوم الاخر ...﴾البقرة : ٢٦٣. واتە: ئەی باوەڕداران خێرو بەخشینەکانتان پووچەڵ مەکەنەوە بەمنەتبارکردنی هەژارەکە ، یان ئازاردانی ، وەك ئەوکەسەی ماڵەکەی دەبەخشێ لەبەر روپایی بۆ خەڵكو بڕوای بەخواو بەڕۆژی دوایی نیە.

وە لەم بارەیەوە پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێ: (ثلاثة لا يكلمهم الله يوم القيامة ولاينظر اليهم ولايزكيهم ولهم عذاب اليم قال فقرأها رسول الله (ﷺ) ثلاث مرات ، قال: ابو ذر خابوا وخسروا من هم يارسول الله ؟ قال: المسبل والمنان والمنفق سلعته بالحلف الكاذب)[2].

واتە: سێ‌کەس هەن خوای گەورە گفتوگۆیان لەگەڵ ناکات رۆژی قیامەت ، وەبەچاوی بەزەیی تەماشایان ناکات و لەگوناه خاوێنیان ناکات ـ واتە لێیان نابورێ ـ سزایەکی سەختیان هەیە راوی

---

[1] احياء علوم الدين : ١٩٢/١ باب الاداب الباطنة في الزكاة ، الوظيفة الثالثة.

[2] رياض الصالحين باب النهي عن المن بالعطية .

دەفەرموێ: سێجار پێغەمبەر(ﷺ) ئەمەی فەرموو (ئەبو ذر) وتی: بەدبەختو خەسارۆمەندن ، ئەوانە کێن ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی: ئەوکەسەی منەت دەکات بەهۆی بەخشینەکانیەوە ، وە ئەوکەسەی کراسو شەرواڵەکەی درێژ دەکات تا لە ئەرزبخشێ ، وە ئەو کەسەی رەواج ئەدات بەکوتاڵو مامەڵەکەی بەسوێندی درۆ).

لەلایەکی تریشەوە ئەوەمان لەیادبێت ئاشکراکردنی خێرو بەخشین هەندێ کات چاکترە لەشاردنەوەی وە ئەمەش لەشوێنێکەوە بۆ شوێنێکیتر ، لەکاتێکەوە بۆ کاتێکیتر ، لەکەسێکەوە بۆ کەسێکیتر دەگۆڕێت ، نیازی کەسی بەخشندەو ئەو سوودانەی کەدەیەوێ بەئاشکراکردنی خێرەکەی بەدەستی بهێنی، ئەم شتانەیە بتوانێت بڕیاربدات لەسەر چاکی یان خراپی هەریەك لەم دوو حاڵەتە ، بۆیە پێویستە بەوردی ئەم بەراوردە بکاتو بەچاوی ئارەزوو تەماشا نەکات ، وەهەرکات پێی باش بوو ئاشکرای بکات دەبێ نهێنییەکانی دەروونی بپارێزێ لەرووپایی. ئەو حاڵەتانەی کەباش وایە:، بەخشینی تیادەربخرێ وەك ئەوەی بیەوێ خەڵکیتر چاوی لێبکەن ، یان پرۆژەیەکی خێرەو دەیانەوێ بەهەرەوەز بکرێت ، مامۆستایەکی ئاینی یان سەرکردەیەکی دنیا پەلامار ئەدات پێش هەموویان کۆمەکی خۆی بەئاشکرا دائەنێ تا خەڵك بەگوێی بکەنو چاوی لێ بکەن ، یان هەژارێك لەناو کۆمەڵدا داوای یارمەتی دەکات ئەوە پێویست ناکات یەکێك بڵێ: من لەناو کۆمەڵدا کۆمەکی ناکەم چونکە تووشی رووپایی دەبم ، چونکە هۆیەك لەهۆیەکانی شاردنەوەی خێر ئەوەیە هەژارەکان ڕوشکێن نەبن ، وەلەم حاڵەتەدا هەژارەکە خۆی پەردەی شەرمی دڕاندووەو جێگای خۆیەتی ئێمەش بەئاشکرا بەشی بدەین[1].

هەروەها لەئادابی دڵسۆزیو قەبوڵ بوونی خێرە ، کەخێرخواز خێرەکەی خۆی بەبچووكو کەم بایەخ بێنە پێشچاوی ، تەنانەت ئەگەر مزگەوتێکی گەورەیشی دروست کردبێت ، یان سوپایەکی گەورەی بەماڵو سامانی خۆی بەرێ کردبێت لەپێناوی خوادا ، هێشتا هەردەبێت بەلایەوە کەم بایەخو بچووك بێت ، چونکی ماڵ ماڵی خوایە سپاردەیە لای ئەوکەسە ﴿وآتوهم من مال الله الذي آتاكم﴾واتە: بەشیان بدەن لەو ماڵەی کەخوا داویەتی بەئێوە . جا کەماڵ سپاردەبێت لەلای ئێمە دەبێت لەکاتی خێرکردندا حاڵی دەروونیمان وەك ئەو کەسە وەها بێت کەسپاردەیەکی لەلابووە ، کاتێ داوای لێدەکەن بیگێڕێتەوە بۆ خاوەنەکەی ، هەندێکی دەداتەوەو هەندێکی ناداتەوە، دیارە لەوکاتەدا زۆر شەرمەزار دەبێ چونکە سپاردەکەی بەناتەواوی داوەتەوە ، لەلایەکی تریشەوە خێرخواز لەپاشە ڕۆژدا هەزاران قاتی ئەو خێرەی خۆی وەردەگرێت کەوابوو هەرچەندبێت هەرکەمە خوایش دەیزانێ لێوەردەگیرێ یان نا ؟[2] .

---

[1] احياء علوم الدين : ١/١٩٠ ـ ١٩٦.

[2] تفسير ابن كثير :١/٣١٨.

هەر لەسەر ئەوبناغەیە: کەماڵ ماڵی خوایەو سپاردەیە لای ئێمە ، کۆمەڵێك لە(تابعین) دەفەرموون : ماڵ جگە لەفەرزی زەکات هەقی تریشی تیایە بۆ هەژارەکان بەبەڵگەی ئایەتی: ﴿وآتى المال على حبه ذوي القربى واليتامى والمساكين وابن السبيل والسائلين وفي الرقاب وأقام الصلاة وآتى الزكاة ...﴾البقرة : ١٧٧. ئەم زانایانەش وەك (نەخەعیو شەعبیو عەطاو موجاهید) ـ رەحمەتی خوایان لێبێت ـ کەبۆچوونیان وەهایە واجبە لەسەر دەوڵەمەند هەرکاتو لەهەر لایەکدا هەژارێکی بینی کەخۆی یان ماڵو منداڵی مەترسی فەوتانو لەناوچوونیان لێدەکرا واجبە لەسەری رزقو رۆزیو پۆشاکی پێویستی بۆ دابین بکات ، با ئەم دابین کردنەش زیاتری بۆ بێت لەماڵی زەکات ، چونکە زایە بوونی موسڵمان حەرامەو ئەگەر موسڵمانێك لەوڵاتێکدا لەبەر نەبوونی لەبرسان مرد، یان لەسەرما رەق بوویەوە ، یان نەخۆش بوو چارەسەری نەخۆشی یەکەی بەعیلاجو دەرمان دەکرا بەڵام ، لەبەر نەبوونی نەیکردو مرد ، لەم حاڵەتانەدا هەموو موسڵمانانی دەوڵەمەندی ئەو دەڤەرە گوناهبارنو بەشدارن لەو تاوانی مردنەدا [1].

هەر ئەو باوەڕە پتەوو ئەو دەروونە خێرخوازانەبوو لەچاخەکانی رابوردوودا هەزاران مزگەوتی لەکوردستاندا بنیات نا ، لەسەر ئەرکی موسڵمانان ، هەموو مزگەوتێك مەلایەكو کۆمەڵێ فەقێی تێدابوو هەر لەسەر ئەرکی خێرخوازان ، بەڵام ئەمڕۆ لەصەد دەوڵەمەند مەگەر تەنها(دە) کەسیان زەکاتە فەرزەکەش دەربکەن ، بۆیە خوای گەورە کردینی بەژێر باری باجو زەریبەو گومرگو بەهەموو شێوەیەك و ماڵو سامانمان بەزایە دەڕوات بێئەوەی ئەجریشمان بۆ بنووسرێ.

خوازیارم کەخوا دەسگرۆیمان بکات و ڕێنماییمان بکاتو دڵو دەروونمان لەئاستی خوشك و برایانی دیندا پڕسۆزو بەزەیی بکات ...امین

## ( ٧ ) پیاوێك یادی خوا بکات بەنهێنی :

حەوتەم کەس لەو حەوت کەسەی کەپێغەمبەر(ﷺ) موژدەی سێبەری خوای پێداون لەڕۆژی دواییدا (رجل ذكر الله خالياً ففاضت عيناه)واتە: پیاوێك بەتەنها یادی خوابکاتو لەترسی خوا فرمێسك لەهەردووچاوی هەڵنیشێت واهەیە بەندەیەك یادی گەورەییو دەسەڵاتی خوا دەکاتەوەو سەرسام دەوەستێو گریان دەیگرێ ، وەك قورئان ئەم حاڵەتەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە : ﴿إن في خلق السموات والارض واختلاف الليل والنهار لآيات لأولي الالباب ، الذين يذكرون الله قياما وقعودا وعلى جنوبهم ويتفكرون في خلق السموات والارض ربنا ماخلقت هذا باطلا سبحانك فقنا عذاب النار﴾ ال عمران :١٩٠ ـ ١٩١.

---

[1] احياء علوم الدين : ١/ ١٩٠ ـ ١٩١.

واتـه: بەڕاسـتی لەدروسـتکردنی ئاسمانـەکان و زەویـدا ، لـەجیاوازی شـەوو ڕۆژدا چـەندین بەڵگەی گەورە هەن لەسەر تواناو دەسەلاتی خوا بۆ ئەوانەی کەخاوەنی ژیری و هۆشن ، ئەوانەی یـادی خـوا دەکـەن بـەپێوەو بەدانیشتنەوەو لەسـەر لاتەنیشـتیان، بیردەکەنـەوە لەدروسـتکردنی ئاسمانەکان و زەوی و دەڵێن: ئەی خوایە ئـەم دروسـتکراوانەت بەهەوانتـەو بێمەبەسـت دروسـت نەکردووە، پاك و خاوێنی بۆ تۆ لەوەی شتی پڕوپووچ دروست بکەیت ، بمانپارێزە لەسزای ئاگر.

بەرامبەر بەم ئایەتەش خوا لۆمەو سەرزەنشتی ئەوانەی کردووە کەبیرناکەنـەوەو پـەند لەبەڵگـە گەورەکانی بوونەوەر وەرناگرن وەك دەفەرموێ: ﴿وكأين من اية في السموات والارض يمرون عليها وهم عنها معرضون﴾ يوسف : ١٠٥. واتە: چەندین بەڵگە هەیە لەئاسمانەکان و زەویدا تێدەپـەڕن بەلایدا بەلام پشتی لێ هەڵدەکەن و یادی لێناکەنەوە.

بیرکردنەوە لەدروستکراوەکانی خواو دەرهێنانی پەندو ئامۆژگاری لەوسەرچاوە پاراوە یەکێکە لەسیمای پیاوچاکان و خواویستان ، بۆیە دەگێڕنـەوە لـە(حسـنی بصـری)یـەوە کەفەرموویـەتی: بیرکردنەوەی یەك سات چاکترە لەشەو نوێژی شەوێك) یان دەیفەرموو: (بیرکردنەوە ئاوێنەیە کە چاکەو خراپەی خۆتت نیشان دەدات) لوقمانی حکیم فەرموویەتی: (زۆر تەنیا بوون دڵت ڕوون دەکاتەوە ، وە زۆر بیرکردنەوە بەڵگەیە لەسەر لێدانی دەرگای بەهەشت)[1] .

جۆرێکی‌تر لەجۆرەکانی بیرکردنەوە بیرکردنەوەیە لەگوناهەکانی خۆمان ، ئەویش بەو شێوەیە دەبێت هەموو بەیانیەك ئەندامەکان خۆی بپشکنێت دەست و قاچ و چاوو گوێ و زمان ...هتد

بۆ نموونە(تەماشا بکات زمان خەریکە بە غەیبەت و درۆو خۆبەچاك باس کردن و دەمـەقاڵێ و گاڵتـەو پڕوپـووچ ، ئـەمجا بیربکاتـەوە ئەمانـە هـەموویان حـەرامن و خـوا پێیـان ڕازی نیـە ، ئـەمجا بیربکاتـەوە لـەو ئایـەت و فەرموودانـەی باسـی سـزای ئـەم تاوانـە دەکـات لـەدوا ڕۆژدا ، ئـەمجا بیربکاتەوە لەحاڵی خۆی چۆن زمانی ڕاهێناوە لەسەر ئەم تاوانانەو خۆی بۆ شل دەکات، بێئەوەی هەست بەخۆی بکات ، ئەمجا بیر لەوەبکاتەوە چۆن دەتوانێ خۆی ڕزگار بکات و وازبهێنێ ، ئەویش بەوەی بڕیاربدات کەنارگیربێ لەوکەسانەی ڕێگای غەیبەت و گوناهی بۆ ئاسان دەکەن و بڕیاربدات لەگەڵ پیاوچاکاندا نەبێت دانەنیشێ بۆئەوەی ئەگەرقسەیەکی لەدەم دەرچوو خوا پـێی ناخۆش بوو یادی بخاتەوەو ڕێی لێبگرێ)[2].

هـەر بـەم شێوەیە دەتوانـێ ڕۆژانـە جارێك یان چـەند جـارێك دابنیشـێ و هـەموو ئەندامـەکانی بپشکنێ و بیانخاتە ژێر لێکۆڵینەوەی وردەوە ئەگەر ئێستا هاموڕازن لەگەڵ گوناهدا وازی لێبهێنـێ ، ئەگـەر دوێنێـش گونـاهێك ڕووی داوە لێیـان پەشـیمان ببێتـەوە ، لەمـەو دوایـش خۆبپـارێزێ

---

[1] تفسير ابن كثير:١/٤٣٨.

[2] احياء علوم الدين :٤/٣٩.

لەدووبارە بوونەوەی ، بەم شێوەیە بژی لەگەڵ بیرکردنەوەو لێکۆڵینەوەدا هەتا بەتەواوی دڵی نەرم دەبێ‌و جۆش‌و ترسی خوای تێدەکەوێ فرمێسك لەچاوانی هەڵدەنیشێ ئەو کاتە بەڕاستی بەرموژدەی فەرموودەکەی پێغەمبەر(ﷺ) دەکەوێ‌و شیاوی سێبەری خوادەبێت.

هەر لەم بارەیەوەیە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ: (لا يلج النار رجل بكى من خشية الله حتى يعود اللبن في الضرع ، ولايجتمع على عبد غبار في سبيل الله ودخان جهنم )رواه الترمذي وقال حديث حسن صحيح[1] واتە: (ناچێتە دۆزەخ پیاوێك گریابێت لەترسی خوا هەتا شیرنەگەڕێتەوە بۆ گواز ، وەکۆنابێتەوە لەسەر بەندە تۆزێك کەلەپێناوی خوادا هاتبێت بەسەریدا . واتە تۆزی جیهاد ـ لەگەڵ دوکەڵی دۆزەخدا) هەروەها دەفەرموێ: (عينان لاتمسهما النار عين بكت من خشية الله وعين باتت تحرس في سبيل الله) رواه الترمذي وقال حديث حسن[2]. واتە: دووچاو هەن ئاگر بەریان ناکەوێت ، چاوێك لەترسی خوا گریابێت ، وەچاوێك شەوی ڕۆژ کردبێتەوەو پاسەوان بووبێت لەڕێگەی خوادا.

جۆرێکی‌تر لەجۆرەکانی زیکر ئەو دوعایانەیە کەلە پێغەمبەرەوە(ﷺ) پێمان گەیشتوون ئەگەر ئێمەش بەردەوام بین لەسەری‌و بەدڵ‌و دەروون لەگەڵیدا بژین‌و هەمیشە زمانمان پێی پاراوبێت‌و بەدەم فرمێسکی چاوانەوە بیانخوێنین‌و بەکردەوە وتەکانیان ئەنجام بدەین ئەوە بەرئەو مژدە گەورەی پێغەمبەر(ﷺ) دەکەوین.

بۆ نموونە: لەفەرموودەیکیدا دەفەرموێ: (احب الكلام الى الله اربع ، سبحان الله والحمد لله ولا اله الا الله والله اكبر ، لايضرك بأيهن بدأت) مسلم وابوداود.[3] . واتە: (خۆشەویسترین وشە لای خوا چوارن: پاك‌و خاوێنی بۆ خوا ، سوپاس‌و ستایش بۆ خوا هیچ خوایەك نیە جگە لە(الله) . خوا لەهەموو کەس گەورەترە ، زیانت پێ‌ناگەیەنێ هەرکامیان پێش بخەیت).

یان لەفەرموودەیەکی تردا دەفەرموێ: (من قال لا اله الا الله وحده لاشريك له له الملك وله الحمد وهو على كل شئ قدير ، عشر مرات كان كمن اعتق اربعة انفس من ولد اسماعيل)[4].

واتە: هەرکەس ئەم زیکرە بخوێنێ: (لا اله الا الله وحده ...هتد)دەجار وەك ئەوکەسە وایە چوار بەندەی لەوەچەی ئیسماعیل ئازاد کردبێت.

دەیان فەرموودەی ترمان هەیە لەوبارەوە بۆ گەورەیی زیکر ، تەنانەت پێشەوا (نەوەوی) ـ ڕەحمەتی خوای لێبێت ـ پەڕاوێکی گەورەی داناوە دەربارەی(ذكر).

---

[1] رياض الصالحين.

[2] رياض الصالحين.

[3] الاذكار للنوي:٥٢،٥٣.

[4] الاذكار للنوي:٥٢،٥٣.

بەڵام دووپاتی ئەوە دەکەمەوە ئەو موژدەگەورانەی لەو فەرموودانەدا هاتووە بۆ کەسێکە بەدڵ لەگەڵ ئەو وتانەدا بژی‌و کردەوەیشی پێ بکات بۆ نموونە: کەوتی (لا اله الا الله) دەبێ هەر خوای لەدڵدابێت و هەردینەکەی ئەو بەیاسا بزانێت. کەوتی (وحده لا شریك لە)دەبێت ڕەفزی هەموو هاوەڵێك بکات بۆ خوا کەس نەکات بەشەریکی ، ملکەچی‌و کڕنووش بۆ کەس نەنوێنێ.

جۆرێکی‌تر لەجۆرەکانی یادکردنەوە یادی نیعمەتە ژمارە نەکراوەکانی خوایە وەك خۆی فەرمانمان پێدەدات: ﴿یا ایها الناس اذکروا نعمة الله علیکم هل من خالق غیر الله یرزقکم من السماء والارض لا الە الا هو فأنی تؤفکون ﴾فاطر:٣. واتە: ئەی ئادەمیزادەکان یادی نازونیعمەتەکانی خوابکەنەوە بەسەرتانەوە ئایا دروستکارێکی‌تر هەیە جگە لە(الله) رزق‌و رۆزی ئاسمان‌و زەویتان بداتێ ئایا دوای ئەم هەموو روونکردنەوەو دەرکەوتنی راستی‌یە ئیتر بۆ کوێ دەچن ؟ چۆن دەتوانن پشت لەخوا هەڵکەن وبتەکان بپەرستن .

باشە (سێ) ساڵ بێبارانی بوو خوا رزقی ئاسمانی لێگرتینەوە کەس توانی سەعاتێ بارانمان بۆ ببارێنێ ؟ باشە چەند ساڵێکیش باران هەبوو خوا سوون‌و کیسەڵەی زاڵکردبوو بەسەر خەڵەو دانماندا کەس توانی بەرگری لێبکات؟

ئەی ئێمە کەئێستا خوا لەش ساغی کردووین‌و چاوو دەست‌و قاچ‌و هێزو هۆش‌و عەقڵی پێداوین هەرکام لەمانەمان لێبگرێتەوە کەس دەتوانێ بالاَ دەستی خوابێت ؟

بۆ ڕۆژێك ساتێك لەتەمەنت تەرخان نەکرد بیر لەم هەموو نازو نیعمەتە گەورانەی خوابکەیتەوە ، هەر لەنەفسی خۆتەوە هەتا ماڵ منداڵت هەتا ئاسمان‌و زەوی ﴿... وان تعدوا نعمة الله لاتحصوها ان الانسان لظلوم کفار ﴾ ابراهیم:٣٤.

واتە: ئەگەر نیعمەتەکانی خوا ژمارە بکەن ناتوانن تەواویان بکەن‌و بەڕاستی مرۆڤ زۆر ستەمکارو کافرە کەچاو لەم هەموو ڕاستیە دەنوقێنێ‌و کافر دەبێ بەپەروەردگاری.

لەکۆتایی‌دا کورتەی ئەم وتارە: باچاوو دڵ‌و هەستمان بخەینەکارو هەمیشە لەیادی خوا غافڵ نەبین‌و بەهەموو زمانێك زیکرو یادو شوکرانە بژێری بکەین ، ئەگەر ئێمە بەدڵێکی زیندوو خوامان لەیادبێت ئەویش یادی ئێمە دەکاتەوە:﴿فاذکروني اذکرکم واشکروا لي ولا تکفرون ﴾ البقرة: ١٥٢. واتە: یادی من بکەنەوە منیش یادتان دەکەمەوە شوکرانە بژێری من بن‌و سپڵەو بێباوەڕ مەبن.

بەم وتارە هاتینە کۆتایی زنجیرە باسی(سبعة یظلهم الله في ظله)ئیتر تاجارێکی‌تر بەخواتان دەسپێرم خوایارو یاریدەدەری هەموو لایەکمان بێت‌و ڕۆژی قیامەت لەژێر سێبەری خۆیدا کۆمان بکاتەوە . ئامین واخر دعوانا ان الحمد لله رب العالمین .

## فەرموودەی دووەم: ﴿ایاكم والظن... ﴾

## (١) وازهێنان لەبەد گومانی

دڵو دەروون خواكردێكی زۆر نازدارو ناسكە، ئاوێنەیەكی ساف و بێگەردە، هەموو وێنە و دیمەنێكی بەجوانی تێدا دەردەكەوێ ئەگەر بەچڵكی تاوان چڵكن نەكرێت.

یەكێك لەوتاوانانەی پەڕەی ناسكی دڵ ئەژ اكێنێ و ئاوێنەكەی لێڵ دەكات بوغزو كینەیە بەرانبەر موسوڵمانان كەدەبێتە پەڵەیەكی رەش لەسەر دەروون و وادەكات خاوەنەكەی تامو چێژ لەپەرستش و نوێژەكانی وەرنەگرێت و خۆشی خواپەرستی نەچێژێت.

لەم بارەوە قورئان رێنمایمان دەكات كەهەمیشە دڵمان ساف بێت بەرانبەر برایانی موسوڵمانمان كەدەفەرموێ: ﴿والذین جاؤوا من بعدهم یقولون ربنا اغفر لنا ، ولأخواننا الذین سبقونا بالایمان ولاتجعل في قلوبنا غلا للذین امنوا ربنا انك رؤوف رحیم ﴾ الحشر:١٠.

واتە: ئەو موسوڵمانانەی دوای (مهاجرین و انصار) هاتوون رەوشتیان وەهایە دەپاڕێنەوەو دەڵێن: پەروەردگارمان لەتاوانەكانمان ببوورە ، لەتاوانی ئەو برایانەیشمان ببورە كەپێش ئێمە كەوتوون لەباوەڕهێناندا كەیارەكانی پێغەمبەرن، لەدڵماندا هیچ بوغزو كینەیەك دروست مەكە بەرانبەر باوەڕداران ، ئەی پەروەردگارمان تۆ خاوەنی سۆزو بەزەییت. لابردنی ئەو كینەو رقە بەریە بەرانبەر موسوڵمانان كارێكی هەروا ئاسان و كەم ئەرك نیە، بەڵكو بەڕاستی زۆر گرانەو پێویستی بەهەوڵ و تەقالای دەروون هەیە ، پێویستی بەوەیە بەدڵ بپاڕێینەوە خوای گەورە سەرمانخات بەسەر چەپەڵیەكانی(النفس الامارة)دا، تابتوانین خوا لەخۆمان رازی بكەین و دڵمان نەكەینە هێلانەی بوغزو كینە بەرانبەر برایانی موسوڵمانمان. ئەمەیش پێویستی بەچەند هەنگاوێكی مەردانەو لەخۆ بووردانە هەیە وابەكورتی هەندێكیان باس دەكەین لەژێر رۆشنایی فەرموودەیەكی پێغەمبەردا(ﷺ) كەئیمامی موسلیم ریوایەتی كردووە كەدەفەرموێ: (ایاكم والظن فأن الظن أكذب الحدیث ، ولاتحسسوا ،ولاتجسسوا ولاتنافسوا ، ولاتحاسدوا ، ولاتباغضوا ، ولاتدابروا ، ولایبع بعضكم على بیع بعض، وكونوا عبادالله اخواناً ، المسلم أخو المسلم لایظلمه ولایخذله ، ولایحقره : التقوى هاهنا- ویشیر الى صدره-بحسب امرئ من الشر ان یحقر أخاه المسلم ، كل المسلم على المسلم حرام: دمه وماله وعرضه ، ان الله لاینظر الى صوركم وأموالكم ولكن ینظر الى قلوبكم وأعمالكم) رواه مسلم[1].

---

[1] ریاض الصالحین ، النهي عن التجسس /٥٩٥.

واته: خۆتان بپارێزن لەگومانی خراپ بەیەکتر ، بەڕاستی بەدگومانی درۆترین وشەیە ، گوێ بۆچپەو وتەی یەکتری هەڵمەخەن ، دوای و نهێنی یەکتر مەکەون ، بەربەرەکانی و کێبەرکێ مەکەن ، حەسوودی بەیەکتر مەبەن ، ڕقتان لەیەکتر نەبێتەوەو پشت لەیەکتری هەڵمەکەن ، مامەڵە بەسەر مامەڵەی یەکتریدا مەکەن ، هەموو بەندایەتی خوابکەن و برای یەکتربن ، موسوڵمان برای موسوڵمانە ، نابێ ستەمی لێبکات ، نابێ پشتی بەردات ، نابێ بەچاوی سووك تەماشای بكات ، خواپەرستی ئالێرەدایە- ئاماژەی کرد بۆ سینگی [illegible] - بەسە بۆ خراپەکاری مرۆڤ کەبەچاوی سووك تەماشای براکەی بکات ، موسوڵمان هەمووی لەسەر موسوڵمان حەرامە: خوێنی ،ماڵی ، ناموسی ، خوا تەماشای ڕەنگ و ڕواڵەت و ماڵ و سامانتان ناکات ، بەڵکو تەماشای دڵ و کردەوەکانتان دەکات.

ئەو خاڵانەیش کەلەم فەرموودە وەردەگیرێن ئەمانەن:

یەکەم/ وازهێنان لەبەدگومانی ، ئەمەیش مانای وانیە هەرکەسمان دی شایەتمانی هێناو نوێژی کرد ئیتر بە(وەلی) بزانین ، چونکە موسوڵمان دەبێ وریاو ژیربێ بەفێڵی فێڵبازان نەخڵەتێ لەم بارەوە پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێ: (الحزم سوء الظن)[1] . واتە: بیری ساغ ئەوەیە بەدگومانبیت بەرانبەر ئەوانەی گومانی خراپیان پێدەبرێ، یان ئیمامی عومەر دەفەرموێ: (نحن لانخدع ولانُخْدَع). واتە: ئێمە فێڵ ناکەین ، فێڵیشمان لێناکرێت ، یان پەندێکی عەرەبی دەڵێ: (من لم یکن ذئباً تأکله الذئاب)واتە: هەرکەس گورگ نەبوو گرگ دەیخوات.

کەوابوو مانای ئەم فەرموودە ئەوەیە لەخۆتەوە بێبەڵگەو دەلیل خەڵك تۆمەتبار مەکە ، لەناو خەڵکدا بەخراپە ناوی مەزڕێنە، ئەگەر لەشتێکی کەوتیتە گومان خۆتی لێبپارێزە ، وریاو بەئاگابە لەمامەڵەیداوەك وتراوە: (اتقوا الغرباء ولو کانوا أولیاء)خۆتان لەنەناسراوەکان بپارێزن باوەلیش بن ، بۆیە باش نیە بەیەکەم بینین و یەکەم قسەکردن ئێمە حوکم بدەین بەسەر کەسێکدا بەباشە یان خراپە ، سەنگی مەحەك بۆ ناسینی مرۆڤ: یان سەفەر لەگەڵ کردنە ، یان دروواسێیەتی یە ، یان هاوبەشیکردنە لەمامەڵەو تەماعدا.

کورتەی ئەم خاڵە ئەوەیە: بەدگومان مەبە بەرانبەر موسوڵمان ، وەئەگەر کردەوەیەك یان قسەیەکیشی کرد جێگای گومان بوو لای تۆ بچۆرە بنج و بنەوانی نەکو بیانویەکی هەبێ تۆ گومانی خراپی پێ بەریت و گیرۆدەی قیامەت ببێت، لەم بارەیەشەوە فەرموودەی خوا خەتمی کەلامە کەدەفەرموێ: ﴿یا ایها الذین امنوا اجتنبوا کثیراً من الظن ان بعض الظن اثم﴾ .

واتە: ئەی باوەڕداران زۆر خۆدووربگرن لەگومانی خراپ چونکە هەندێ لەو گومانانە وانیەو دەبێتە تاوان.

---

[1] چل چرای ئیسلام ، مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس، فەرموودەی بیست و شەشەم.

ئیمامی عومەر لەم بارەوە دەفەرموێ: (لا تظنن بكلمة خرجت من أخيك المؤمن الا خيراً ، وانت تجد لها في الخير محملاً )[1].

واتە: گومان مەبە بەوشەیەك لەدەمی براکەت دەردەچێت مەگەر بەگومانی چاکە هەتا بگونجی مانای چاکەی لێبگریت.

بەتایبەت براکانم زۆر بەسوَز بن بەرانبەر زانایانی ئیسلام ئەگەر قسەیەکی هەڵەشیان کرد لەکۆمەڵێکدا لەناو خەڵکدا بلاَوی مەکەنەوە ، چونکە هەڵەی ئەوان زیانی زۆرەو گشتگیرە وەك ابراهیمی نەخەعی دەفەرموێ: (لاتحدثوا الناس بزلّة العالم فان العالم يزلّ الزلّة ثم يتركها )[2].

واتە: هەڵەو زەللەی زانایانی ئاین لەناو خەڵکدا باس مەکەن، چونکە زانا زەللە دەکات و دواتر وازی لێ دێنێ.

کۆتایی ئەم وتارە دێنین بەم فەرموودە کە (عبدالله)ی کوری (عمر)ی کوری(عاص) بۆمان دەگێڕێتەوە؛ دەفەرموێ: دانیشتبووین لەخزمەت پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (يطلع الا ن عليكم رجل من أهل الجنة )واتە: ئێستا پیاوێك دێتە ناوتان ئەهلی بەهەشتە ، (عبدالله) دەڵێ: پیاوێکی (انصار)ی هاتە ناومان ریشی ئاوی دەستنوێژی لێدەتکا هەردوو نەعلەکەی گرتبوو بەدەستی چەپیەوە ، رۆژی دوایی پێغەمبەر(ﷺ) هەمان فەرموودەی خوێندەوەو هەمان پیاو هاتە ژوورەوە . بەشێوەی جاری یەکەم ، رۆژی سێیەم پێغەمبەر(ﷺ) هەمان فەرموودەی خوێندەوەو هەمان پیاو هاتە ژوورەوە بەهەمان شێوەی جاری یەکەم ، کاتێ پێغەمبەر(ﷺ) هەستاو (کۆمەڵەکە بلاَوەیان لێکرد) (عبدالله) کەوتە دوای ئەو پیاوەو وتی: من لەگەڵ باوکمدا رِقم هەستاوە و سوێندم خواردووە سێ رۆژ نەچمە ماڵی ، ئەگەر رێگام بدەی بێمە ماڵت تا ئەم سێ رۆژە دەڕوات،دێم . کابرا وتی: بەڵێ: ئەنەس دەڵێ: (عبدالله) باسی کرد ئەوسێ شەوە لەگەڵی خەوتم نەم دەبینی شەو هەستێ بۆشەونوێژ، بەلاَم هەرکات دەچووە سەر جێگاکەی یادی خوای دەکردو (الله اكبر)ی دەکردو دەخەوت هەتا هەڵدەسا بۆ نوێژی بەیانی ، (عبدالله) دەڵێ: بەلاَم جگە لەچاکە نەمبیست هیچ بڵێ، کاتێ سێ رۆژەکە رۆیی ، کردەوەکانیم لاکەم بایەخ بوو ، وتم : ئەی بەندەی خوا لەنێوان منو باوکمدا هیچ رقو قینو زویر بوونێك نەبوو بەلاَم لەپێغەمبەرم(ﷺ) بیست سێ جار فەرمووی: (يطلع عليكم الان رجل من أهل الجنة)هەرسێ جارەکە تۆهاتی ، ویستم لێت نزیك بمەوە بزانم کردەوەت چی‌یە ؟ تامنیش چاو لەتۆ بکەم ،کەچی کردەوەیگەورەم لێنەدیت ، ئەی ئەوە چی‌یە تۆی گەیاندۆتە ئەم پلەی پێغەمبەر(ﷺ) ئەوەی دەرهەقت فەرموو ؟ وتی: والله هەر ئەوەیە کەدیوتە لێم. کاتێ رۆیشتم و جێم هێشت بانگی کردم وتی: والله هەرئەوەیە کەتۆ دیوتە ، بەلاَم

---

[1] صفوة التفاسير ، سورة الحجرات .

[2] احياء علوم الدين: ١٦٧/٢.

بەرانبەر بەهیچ موسوڵمانێك کینەو غەشم لەدڵدانیەو حەسوودیش بەکەس نابەم لەسەر خێرێك کەخواپێی بەخشیوە .

(عبدالله) فەرمووی: ئەمە ئەوەیە تۆیگەیاندۆتە ئەوپلەو ئەوەیش بەکەس ناکرێت !

خوایە گیان دڵو دەروونمان لەئاستی یەکدا خاوێن بکەیت ...هتد

## ( ۲ ) وازهێنان لەجاسووسیو هاوردو بردی قسە :

جاری پێشوو هەندێك لەسەر ئەم باسە دواین لەژێر ناونیشانی فەرموودەکەی پێغەمبەردا(ﷺ) (اياكم والظن فان الظن اكذب الحديث ).

ئەمجارەیش پشت بەخوا- دەچینە سەر برگەی دووەمی ئەم فەرموودەیە : (... ولا تحسسوا ولاتجسسوا ولاتنافسوا ولاتحاسدوا ).

دەروازەی باسەکەیشمان ئەم ئایەتە پیرۆزەی قورئان بێت: ﴿يا ايها الذين امنوا اجتنبواكثيراً من الظن ان بعض الظن اثم ولا تجسسوا ولايغتب بعضكم بعضاً ايحب احدكم ان ياكل لحم اخيه ميتا فكرهتموه واتقوا الله ان الله تواب رحيم ﴾ الحجرات :۱۲

واتە: ئەی باوەڕداران خۆتان بپارێزن لەزۆربەی بەدوگومانی چونکە هەندێ لەو گومانانە راست دەرناچن و تاوانە بۆتان جاسووسیو هاوردوو بردی قسەوباس مەکەنو غەیبەتو باسی پاش ملەی یەکتری مەکەن ، ئایە کەس لەئێوە حەز بەوەدەکات گۆشتی براکەی بەمردوویی بخوات ، لەخوابترسن خوا زۆر تەوبە قوبوڵکارو بەسۆزە.

(تحسس یان تجسس) دوو وشەن جار جار بەمانایەکتر بەکاردێن وەك لەم فەرموودەی پێغەمبەردا(ﷺ) هاتووە: جار جاریش ماناکانیان جیادەبێتەوە[1].

ئیمامی(اوزاعی) دەفەرموێ: (تحسس) بەمانای گوێ هەڵخستنە بۆ قسەی خەڵکی کەپێیان ناخۆش بێت ، (تجسس) یش بەمانای لێکۆڵینەوەو بەدوا گەڕانی کاروباریانە [2].بۆئەوەی تووشی زیان بکرێن ، ئەمەیش گوناهی (کبیرة)یەو پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێ: (لايدخل الجنة نمام)[3] .واتە:دوزمان ناچێتە بەهەشت.

---

[1] تفسير ابن كثير: ٢١٢/٤.

[2] هەمان سەرچاوە .

[3] رياض الصالحين /النهي عن النميمة.

لەفەرموودەیەكی‌تردا پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرمویٚ: یامعشر من آمن بلسانه ولم یفض الایمان الى قلبه لاتغتابوا المسلمین ولاتَتَّبِعوا عوراتِهم ، فانه من یَتَّبِعْ عورة اخیه یَتَّبِعِ الله عورته ، ومن یَتَّبِعِ الله عورته یَفْضَحْهُ ولو في جوف بیته)رواه الحافظ ابو یعلى[1].

واته: ئەی كۆمەڵێك كەبەزمان باوەڕتان هێناوه باوەڕ تێكڵاو نەبووه بەدەروونتان ؛ غەیبەتی موسوڵمانان مەكەن‌و دوای عەورەت‌و نهێنی‌یەكانیان مەكەون ،چونكه هەركەس بەدوای نهێنی‌و عەورەتی برای موسوڵمانیدا بگەڕێ، خوای گەوره دەكەوێته دوای نهێنی‌یەكانی ، هەركەسیش خوا بكەوێته دوای نهێنییەكانی ریسوای دەكات ئەگەر لەكونی ماڵەكەی خۆیشیدا بێت.

خاڵێكی‌تر لەم فەرمووده: (ولاتنافسواولاتحاسدوا)

غەزالی - خوای لێرازی بێت - دەفەرمویٚ: (حسد) ئەوەیه حەزبكەیت نازو نیعمەتی براكەت نەمێنیٚ‌و لەناوبچێت ، (منافسه)یش ئەوەیه حەز بكەیت خۆت بچیته ئاستی ئەو لەو نازو نیعمەتەداكەخوا داویه بەو. زۆرجاریش ئەم دوو وشه لەجێگای یەكتر دادەنرێن[2]

هەرچۆن بێت ناو گرنگ نیه ، ماناو ناوەڕۆك گرنگه حەسوودی بەمانای یەكەم حەرامەو پێغەمبەر(ﷺ) نەهی لێكردووه لەچەندین فەرموودەدا، تەنانەت بەسوتێنەری هەموو چاكەكانی دادەنیٚ‌كەدەفەرمویٚ: (ایاكم والحسد ، فان الحسد یأكل الحسنات كما تاكل النار الحطب ، أو قال العشب) رواه ابوداود[3].

واته: دەتانترسێنم لەحەسوودی‌و ئێرەیی، بەراستی حەسوودی چاكەكانی موسوڵمان دەسوتێنی، وەك چۆن ئاگر دار - یان پوش - دەسووتێنیٚ).

بەڵام (منافسه) یان(غبطة) لەدووشتدا دروسته وەك پێغەمبەر(ﷺ) بۆمان روون دەكاتەوه: (لاحسد الا في اثنتین : رجل آتاه الله مالاً فسلّطه على هلكته في الحق ، ورجل آتاه الله علما فهو یعمل به ویعلّمه للناس) متفق علیه[4]

واته: حەسوودی بردن دروست نیه مەگەر لەدووشتدا نەبێت : پیاوێك خوا ماڵ‌و سامانی پیٚ بەخشیووەو توانایشی پێداوه ئەو ماڵه بەخت دەكات لەرێگای حەقدا ، پیاوێكیش خوازانستی پێداوەو كار بەزانستەكەی دەكات‌و فێری خەڵكی دەكات.

---

[1] صفوة التفاسیر:٤/٢٣٥.

[2] احیاء علوم الدین:٣/١٧٩.

[3] ریاض الصالحین : تحریم الحسد /٥٩٥ .

[4] احیاء علوم الدین :٣/١٨٠.

(ابن سیرین) دەفەرموێ: قەت حەسوودیم بەکەس نەبردووە لەسەر خۆشی دنیا ، چونکە ئەگەر ئەوکەسە بەهەشتی بێت چۆن حەسوودی پێ بەرم لەسەر دنیا کەچاڵێکە لەچاو بەهەشتدا، وەئەگەر ئەهلی دۆزەخ بێت چۆن حەسوودی بەکەسێ بەرم بەرەو دۆزەخ دەڕوات[1].

بەکری کوڕی عبداللە دەڵێ: پیاوێك هامشۆی یەکێ لەپاشاکانی دەکردو هەموو کات دەچوو پێڵاوەکانی بۆ ڕێکدەخستو، بۆی ئامادە دەکردو پێی دەگوت: (احسن الی المحسن بأحسانه فأن المسئ سیکفیك اساءته)واتە: هەرکەس چاکەی لەگەڵ کردی تۆیش چاکەی لەگەڵ بکە. بەڵام خراپەکار خراپەکەی خۆی بەسیەتی واتە: لێی گەڕێ.

پیاوێکیتر حەسوودی پێبرد کەپادشا ڕێزی لێدەگرێو گوێ لەقسەی دەگرێ، ویستی لەناوی بەرێ، ڕۆژێك چووە لای پادشاو پێی وت: ئەوپیاوەی پێڵاوت بۆ دادەنێو قسەت بۆ دەکات گومان وادەبات تۆ بۆنی دەمت پیسە ، پادشا وتی: من چۆن ڕاستی ئەم قسە بزانم وتی: بانگی کە نزیك خۆتەوە دەسدەنی بەدەمیدا ، پادشاکە وتی: بڕۆ تابزانم چۆنە ؟ کابراکە دەرچوو پیاوەکەی لای پادشای بانگهێشت کرد بۆ ماڵ خۆیو خواردنێکی بۆ دروستکردو سیری تێکرد ، کاتێ پیاوەکە لەماڵ ئەو هەستا گەڕایەوە لای پادشاو دەستی دایەوە کاری خۆی ، وتەکەی وتەوە: (احسن الی المحسن بأحسانه ...هتد)پادشا وتی: لێم نزیك بەرەوە لێی نزیك بوویەوە دەستی نایە سەردەمی نەك بۆنی سیرەکە بچێت بەلووتی پادشادا. پادشا وتی: کابرا ڕاستی کرد ئەو پادشایش ڕەوشتی وەهابوو کاغەزی بۆ کەس نەدەنووسی بەخەتی خۆی ، مەگەر بۆ بەخششێکی گەورە ، کاغەزێکی بۆ ئەم پیاوە نووسی بەخەتی خۆی بۆلای یەکێ لەکارمەندەکانی تیایدا نووسی: هەرکات هەڵگری نامە هاتە لات سەری بڕەو کەوڵی بکەو پێستەکەی پڕبکە لەکاو بۆم بنێرەوە ، پیاوە بەدڵخۆشییەوە کاغەزی پادشای گرت بەدەستەوەو ڕۆیشت بەرەو مەبەست لەڕێگادا کابرای دەروونپیسی توشهات ، وتی: ئەم نامە چییە پێت ؟ وتی: پادشا نامەی بەخششی بۆ نوسیوم ، وتی: تۆیش بیبەخشە بەمن ، وتی: ها بۆ تۆ ، کابرا نامەکەی برد ، کارمەندەکە خوێندیەوەو پێی وت: نامەکەت فەرمان دەکات سەرت بڕم ، کابرا وتی: توخوا ، توخوا ، ئەو نامە هی من نیە خۆت بگرە تاهەواڵێك لەپادشا دەگێڕیتەوە ، کارمەندەکە وتی: نامەی پادشا هەواڵ گەڕاندنەوەی نیە، سەری بڕیو کەوڵەکەی پڕ لەکاو گێڕایەوە لای پاشا ، ئەمجا پیاوی یەکەم وەك جاران گەڕایەوە بۆ پێڵاو دانانی خۆی ، پادشا لێی پرسی: نامەکەت چی لێکرد ؟ وتی: فلانەکەس توشم هاتو داوای لێکردم منیش پێم بەخشی وتی: ئەوکەسە بۆی باسکردم تۆمن بەدەم بۆگەن دەزانی ، وتی: وام نەوتووە ، وتی: ئەو ڕۆژە بۆچ دەست نایەسەردەمت ؟ وتی: ئەو پیاوە خواردنێکی دابوومێ

[1] هەمان سەرچاوەی پێشوو : ١٧٨.

سیری تیابوو، وتی: راستدەکەیت بگەڕێرەوە جێگاو ڕێگای خۆت بەراستی خراپەکار خراپەکەی خۆی بەسبوو لەناوی‌دا[1].

خوایە تو ناوە جوانەکانی خۆت هەرکەس نیازی خراپی بەئێمەو بەئاین‌و بەوڵاتمان هەیە بەخراپەکەی خۆی لەناوی بەرە! خوایە ئەو چاڵەی بۆ ئێمەی هەڵدەکەنێت خۆی تێکەوێت ..هتد امین .

## (٣) وازهێنان لەڕق‌و کینە :

لەدوو وتاری رابوردودا لەخزمەت فەرموودەیەکی پێغەمبەردا بووین(ﷺ) (ایاکم والظن فأن الظن أكذب الحديث ، ولاتحسسوا ولاتجسسوا ، ولاتنافسوا ولاتحاسدوا ،...)

لەم وتارەیشدا ـ پشت بەخوا ـ دەچینە سەر بڕگەیەکی تر هەر لەو فەرموودە کەدەفەرموێ: (ولاتباغضوا ولاتدابروا )واتە: یەکتر مەبوغزێنن‌و پشت مەکەنە یەکتری .

بێگومان فەرموودەکانی پێغەمبەر(ﷺ) تەفسیرن بۆ ئایەتەکانی قورئان بۆیە سەرەتای ئەم وتارەیش بەم ئایەتەی قورئان دەکەینەوە کەلەوەسفی باوەڕداراندا دەفەرموێ: (والذين يجتنبون كبائر الاثم والفواحش واذا ما غضبوا هم يغفرون ﴾ الشورى:٣٧.

واتە: ئەوانەی کەخۆیان دەپارێزن لەگەورە تاوانەکان و کردەوەی خراپ‌و فاحیشە ، وەهەرکات قینیان جۆشا بەرانبەر کەسێك لێدەبوورن .

خۆگرتنەوە لەرق‌و کین لەبەرخاتری خوا کارێکە بەدەم رەنگە لامان ئاسان بێت ، بەڵام بەکردەوە ، زۆرگرانەو مەردی ئەوێ‌بتوانێت خۆی بگرێت ، بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) کاتێ پیاوێك داوای لێکرد: ئامۆژگاریم بکە فەرمووی: رقت هەڵنەسێ ، چەندجار ئەو داوایەی کرد هەرپێی فەرموو: (لاتغضب)واتە: رقت هەڵنەسێ.

رق هەڵسان پشکۆیەکە لەئاگرو ، لەئاگری دۆزەخ وەرگیراوە لەدڵدا شاراوەیەو وەك چۆن پشکۆ لەناو خۆڵەمێشدا شاراوەیە.

رق‌و قین دوژمنی عەقڵی مرۆڤە ، بەڵکو کەشتی لەناو گێجی دەریاداو لەکاتی رەشەبادا حاڵی باشترە لەو دەروونەی پڕبووە لەخەشم‌و قین [2].

مرۆڤ گەر بیزانیایەو چاوی لەخۆی بوایە لەکاتی رق‌و قیندا چەندە ناشیرین دەبێ لەوانەبوو ئیتر قەت خۆی تووشی ئەو حاڵەتە ناهەموارە نەکردایە.

---

[1] احياء علوم الدين :١٧٨/٣.

[2] احياء علوم الدين:١٥٧/٣ ـ ١٥٩.

نابینی مرۆڤ لەکاتی رقدا چۆن رەنگی تێکدەچێ ، گیانی دێتە لەرزە ، قسەکانی دەبزرکێن‌و جوولەی ئاسایی نابێ ، دەستە وەشێنی ، جوێن ئەدا شت دەشکێنێ ، بەرد فڕە ئەدا ، جل ئەدرێنێ»[1]... هتد بەکورتی کردەوەکانی زیاتر لەکردەوەی شێت دەچێ گەرچەکیشی پێبێ زۆر ئاسایی‌یە لای پیاو بکوژێ ، خۆزگە کامێرا شاراوەکان لەوکاتانەدا دیمەنی چەند کەسێکیان دەگرت‌و دلسۆزانە چەند مۆژیاری‌و لێکۆلینەوەیان لەسەر دەکردو پێشکەش بەجەماوەریان دەکرد، رق هەلساویش خۆی ببینیایەو ، شەرمی لەخۆی بکردایە.

(غضب)دەبێتە هۆکاری دروست بوونی(بغض) زۆرکاتیش (بغض) (غضب) دروست دەکات ، لەبەرئەوە ئەو دوو وشە پەیوەندییەکی زۆر لەنێوانیاندا هەیەو پیتەکانیش لەهەردوکیاندا وەك یەکە ، ... ، لەکوردیشدا زۆرچاکیان دارشتووە کەدەلێن: (رق‌و قین).

ئەوەیش بزانین خواردنەوەی (رق) یەکێکە لەرەوشتی باوەڕدارانی راستەقینە، وەك خوادەفەرموێ: ﴿والذين يجتنبون كبائر الاثم والفواحش واذا ماغضبوا هم يغفرون﴾ الشورى:٣٧.

واتە: ئەوانەی خۆیان دەپارێزن لەگوناهە گەورەکان‌و فاحیشەو بەدکارییەکان‌و ، هەرکات رقیان هەستا لێدەبورن.

پیاوێك هاتە خزمەتی پێغەمبەر(ﷺ) پێی وت: (اوصني) واتە: ئامۆژگاریم بکە ، فەرمووی: (لاتغضب) . چەندجار دووبارەی کردەوە (اوصني) هەر فەرمووی: (لاتغضب) واتە رقت هەلنەسێ رواه البخاري[2].

دەگێرنەوە : (ذي القرنين) گەیی بەفریشتەیەك وتی: زانستێکم فێرکە یەقینم پێی گەشە بکات ، وتی : رقت هەلنەسێ چونکە شەیتان لەکاتی رقدا زیاتر زالْ دەبێ بەسەر ئادەمیزادا.

خۆگرتنەوە لەکاتی رقدا بەلگەی ئازایەتی‌و نەبەردی‌یە وەك پێغەمبەرمان(ﷺ) دەفەرموێ: (ليس الشديد بالصُّرَعَةِ ولكن الشديد من يملك نفسه عند الغضب)[3]. واتە: ئازاو بەجەرگ ئەوکەسە نییە خەلك بدا بەزەویدا بەلکوئەوکەسەیە لەکاتی رقدا خۆی دەگرێت

ئافرەتێك بە(مالك)ی کوری (دیناری) وت: (يامرائي)واتە: ئەی ریاباز هیچ رقی هەلنەسا ، فەرمووی: بەس تۆ منت ناسیوە.

پیاوێك جنێوی‌دا بە(سلمان) فەرمووی: ئەگەر ترازووی خێرم سووك بێت ئەوە خراپترم لەوەی تۆ پێم دەلێی ، وەئەگەر قورس بوو ، ئەو وتەی تۆ زیانم لێنادات[3].

---

[1] احياء علوم الدين: ٣/١٥٧ . ١٥٩ .

[2] رياض الصالحين : باب الصبر.

[3] رياض الصالحين : باب الصبر.

ئەوەی جێگـای داخ و حەسـرەتە ئـەمڕۆ خـەڵك ڕقیـان هەڵدەسـێ‌و جـەنگ بەرپادەكـەن ئەگـەر جنێوێك بەخۆیان ،یان عەشرەتیان، یان حیزب‌و گرۆهیـان بدرێت ، بـەڵام كـەس نیە لەسـەر دینی خواو(حرمات)ی خوا ڕقی‌بێتە جۆش.

ئەمـەیش پێچەوانـەی قورئان‌و فەرموودەكانـە، كەپێغەمبـەر بـۆ شـكاندنی سـنووری دیـن ڕقـی جۆشـاوە ، وەك دەگێڕنـەوە لـە(عائیشـە) ڕەزای خـوای لەسـەر : (ان قريشاً اهمّهم شـأن المـرأة المخزومية التي سرقت فقالوا: من يُكلّم فيها رسول الله (ﷺ) ، قالوا مَن يجترئ عليه الا اسـامة بـن زيد ، حِب رسول الله ، فكلمه اسامة ، فقال: اتشفع في حد مـن حدود الله ، ثـم قـام فأختطب فقـال: انما اهلك من قبلكم انهم كانوا اذا سرق فيهم الشريف تركوه ، واذاسرق فيهم الضعيف اقاموا عليه الحد ، وايم الله لو أن فاطمة بنت محمد سرقت لقطعت يدها ) متفق عليه[1].

واتـە: عائشـە دەفـەرموێ: قورەیـش لایـانگرانبوو دەسـبڕینی ئـەو ئافرەتـە مەخزومیـەی دزی كردبوو ، وتیان: كێ لەوبارەوە قسە لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) دەكات ، وتیـان: كـێ هەیـە بتوانـێ جگـە لـە(اسامە)ی كوری(زەیـد) خۆشەویستی پێغەمبـەر(ﷺ) ، اسـامە لـەوبارەوە لەگـەڵ پێغەمبـەر (ﷺ) قسـەی كـرد پێغەمبـەر(ﷺ) ڕقـی هەسـتاو فـەرمووی: ئایـە لەحـەددێك لەحـەددەكانی خـوا تـۆ تكادەكـەیت ؟ ئـەمجا هەسـتاو وتـاری خوێنـدەوە فـەرمووی: ئـەوەی ئومەتـەكانی بـەر لـەئێوەی لەناوبرد، ئـەوەبوو هـەركات پیـاوی شـەریف‌و بەڕێز دزی بكردایە وازیـان لێدەهێنـا، بـەڵام ئەگـەر هەژارو لاواز دزی بكردایە حەددەكەیان بەسـەردا دەسـەپاند ، سوێند بەخوا ئەگەر فاتمـەی كچـی محمد دزی بكات دەستی دەبڕم.

بەڵێ غیرەتی ئاینی هەڵگیرا ، كەس خۆی بەخاوەنی دین نازانێ ، كەس لەسەر دین‌و ئەحكامی دین نایێتە جواب، پیاوی وامان هەیە خۆی زۆر بەپیاو دەزانێ، كەچی كچەكەی یـان خوشـكەكەی یان خێزانی سەروملو قاچ‌و قول ڕووت بەیانی تائێوارە ، بەڵكو لەزۆر شوێندا ئێوارەیش تابەیانی ئەم ئافرەتە والەگەڵ پیاوی بێگانـەدا ، لەگـەڵیان دادەنیشـێ و پێدەكـەنێ‌و تـەنیا دەكـەوێ‌و كـات بەسەر دەبا ، كەچی كەسەكانی دەڵێ‌ی مێشێك میوانیان نیە، غیرەت نایانگرێ ، ڕقیان هەڵناسـێ ، ڕەنگە وایش بەباش بزانێت سوێند بەشەرەف‌ناموس بخوات (انا لله وانا اليه راجعون).

خوایە بەهۆشی خۆماندا بێینەوە ! خوایە غیرەتی دینیمان زیندوكەیتەوە ...الخ

---

(٣) احياء علوم الدين: ١٦٢.

(١) رياض الصالحين /الغضب اذا انتهكت حرمات الشرع /٣٠٨.

## ( ٤ ) وازهێنان لەستەمو سووکایەتی بەیەکتر:

لەسێ وتاری رابوردوودا قسەمان کرد لەسەر فەرموودەی: (ایاکم والظن فان الظن أكذب الحديث ) وەلەم بارەوە چەند برگەیەکی ئەم فەرموودەمان راڤەکرد.

ئەمرۆش دەچینە خزمەت برگەی کۆتایی کەدەفەرمویٚ: (وكونوا عباد الله اخوانا كما امركم ، المسلم اخو المسلم لايظلمه ولايخذله ولايحقره ...)تاکۆتایی فەرموودەکە.

سەرەتای‌و تارەکەمان بەم ئایەتە دەس پێدەکەم :﴿والذين يؤذون المؤمنين والمؤنات بغير ماكتسبوا فقد احتملوا بهتاناً واثما مبينا ﴾الاحزاب:٥٨.

واتە: ئەوانەی ئازاری پیاوانی باوەڕدارو ، ئافرەتانی باوەڕدار دەدەن بێئەوەی هیچ تاوانێك یان کارێکی نەشیاویان کردبێت، ئەوانە کۆڵی بوختان‌و تاوانیان داوە بەسەر شانی خۆیاندا.

برگەی ﴿وكونوا عباد الله اخوانا ﴾واتە: هەموو بەندەی خوابن‌و برای یەکتربن لەبەندایەتی‌و خواپەرستیدا ، باسی برایەتیمان لەفەرموودەی: (سبعة يظلهم الله في ظله)دا بەجوانی باسکردو بۆی ناگەڕێینەوە. (المسلم اخو المسلم لايظلمه ولايخذله ولايحقره ، التقوى هاهنا، ويشير الى صدره ، بحسب امرئ من الشر ان يحقر اخاه المسلم كل المسلم على المسلم حرام دمه وعرضه وماله ، ان الله لاينظر الى صوركم ولكن ينظر الى قلوبكم واعمالكم ).

ئەم برگە درێژەی کۆتاییش هەموو بەدەوری یەك مانای زۆر گرنگ سووڕدەخوات ئەویش ئەوەیە: ( موسوڵمان برای موسوڵمانە نابێ ستەمی لێبکات نابێ ریسوای بکات‌و دوژمن بێنێتە سەری ، یان دیفاعی لێنەکات ، نابێ بەچاوی سووك تەماشای کات ! تەقواو ترسی خوائالێرەدایە . ئاماژەی دەکرد بۆ سینگی ـ بەسە بۆ خراپی مرۆڤ کەبەچاوی سووك تەماشای برای موسوڵمانی بکات ، موسوڵمان هەمووشتێکی بۆ موسوڵمان حەرامە: خوێنی ، ماڵی نامووسی ، خواتەماشای رەنگ‌و رووخسارتان ناکات ، بەڵام تەماشای دڵ‌و کردەوەتان دەکات).

یەکێ لەمافەکانی برای موسوڵمان (لايظلمه)زوڵمیش جۆری زۆرە : پاشا زوڵم لەژێر دەسەکانی بکات ، منداڵ زوڵم لەدایك‌و باوکی بکات ، یان پێچەوانەکەی ، مێردزوڵم لەژن‌و منداڵەکانی بکات یان پێچەوانەکەی هەموو ئەمانە بەر ئەو فەرموودەدەکەوێت کەپێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت: لتؤدن الحقوق يوم القيامة حتى يقاد للشاة الجلحاء من الشاة القرناء) رواه مسلم[1].

واتە: دەبێ هەمووتان ئەو مافانەی لەسەرتانە بیدەنەوە بەخاوەنی‌تەنانەت مەڕی بێ‌شاخ هەقەکەی بۆ وەردەگیرێ لەمەڕی شاخدار).

---

[1] رياض الصالحين : تحريم الظلم والامر برد المظالم :٢٠٤.

دیاره ئەگەر خراپە بەرانبەر باوك‌و دایك بوو ئەوە هەم ستەمەو هەم (عقوق)كەئەوەیش گەورەترینی گوناهە گەورەكانە.

(ولایخذله)واتە: نابێ بەدەستی تۆو دەمی تۆو نووسینی تۆو ئامارەی تۆموسولمانێ زەلیل‌و ریسوا بكرێت ، ئەگەر موسولمانێكیش ریسوا كراو ئاگات لێی بوو دەبێ بەگوێرەی توانات داكۆكی لێ بكەیت و ستەمی لەسەر لابەریت وەك پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێ: (من ردّ عن عرض اخیه رد الله عن عرضه النار یوم القیامة ) رواه الترمذي[1].

واتە: هەركەس داكۆكی لەناموسی براكەی بكات خوای گەورە ئاگری دۆزەخی لێدوور دەخاتەوە رۆژی قیامەت.

جێگای داخە ئەمڕۆ هەموو سەركردەكانی عەرەب برا فەلەستینییەكانی خۆیان بەزەلیلی دەبینن‌و لەبەرخاتری كورسی‌یەكانیان بێدەنگن لەئاست ئەو هەموو زولم‌و ستەم‌و جەنگی كۆ كوژیەی بەرانبەر ژن‌و منداڵ‌و پیرو گەورەو بچووكی ئەو گەلە داماوە دەكرێت، ئەویش لەترسی لەدەسدانی كورسی‌یەكانیان.

(٩٠)ساڵە عەرەب هاواردەكەن : (عروبە ، عروبە) بەلام ئەمرۆ فریایان نەكەوت چونكە (قومیة)گەردینی لەگەڵ نەبوو تەنهاكورسی پەرستی‌یە.

(ولایحقره) واتە: نابێ موسولمان بەچاوی سووك تەماشایموسولمان بكات وەك قورئان دەفەرموێ: ﴿یا ایها الذین امنوا لایسخر قوم من قوم عسی ان یكونوا خیراً منهم ولانساء من نساء عسی ان یكن خیراً منهن ولاتلمزوا انفسكم ولاتنابزوا بالالقاب بئس الاسم الفسوق بعد الایمان ومن لم یتب فاولئك هم الظالمون ﴾ الحجرات:١١.

واتە: ئەی باوەرداران با هیچ كۆمەڵێك گاڵتە نەكات بەكۆمەڵێكی‌تر ، چونكە لەوانەیە گاڵتە پێكراوەكان چاكترو پاكتر بن لای خوا لەگاڵتەچی‌یەكان، باهیچ تاقمێكی ئافرەتانیش گاڵتە نەكەن بەتاقمێكی‌تر لەئافرەتان چونكە نزیكە گاڵتە پێكراوەكان باشتر بن لەوان، عەیب‌و عارو لەیەكتر مەدۆزنەوە ، ناوو ناتۆرە بەیەكتر مەڵێن ، چونكە زۆر ناشیرینە ناوی فیسق‌و خراپە دوای ئەوەی باوەرتان هێنا بەخوا ، هەركەسیش تەوبە نەكات لەم كردەوە خراپانە ئەوانە لەكۆڕی ستەمكارانن.

لەم بارەیشەوە پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێ: رب اشعث اغبر ذو طمرین لو اقسم علی الله لَأبَرَّهَ)[2]

واتە: زۆر كەس هەیە قژ ژاكاو تۆزاوی دووپارچە جلی شڕی لەبەردایە گەر سوێند بخوات لەسەر خوا (واتە: بڵێ ئەی خوایە سوێندم بەزاتی پاكت دەبێ ئەو كارەم بۆ ئەنجام بدەیت) خوا سوێندەكەی ناخات).

---

[1] ریاض الصالحین: تحریم سماع الغیبة :١٥٢٨.

[2] صفوة التفاسیر / الحجرات.

ئامارژەی پێغەمبەریش بۆ سینگی لەکاتێکدا فەرمووی: (التقوی ھاھنا) ئەوە دەگەیەنێت سەرچاوەی خواپەرستی دڵو دەروونە،سینەیە،سینەسافی و دەروون پاکیو باوەڕپێتەوی سەرچاوەی هەموو کارێكو گوفتارێکی چاكو پاکن ، چەپەڵی دەروونیش سەرچاوەیە بۆ هەموو کردەوەیەکی چەپەڵو ناڕەوا ، کوێری دەرونیش زۆر سەختترە ، لەکوێری چاو وەك قورئان ئامارژەی پێدەکات : ﴿فأنها لا تعمى الابصار ولكن تعمى القلوب التي في الصدرو ﴾.

واتە: بەراستی چاوان کوێر نابن ، بەڵام ئەو دڵانە کوێر دەبن لەسینگدایە مانای کوێری چاو بەتەنیا پێی ناوترێ کوێری.

ساخوایە سینەساف و دەروون پاکمان کەیت! سینەمان بەنوری خۆت نوورانی کەیت لەتاریکیو گەردو تۆزی گوناە پاکمان کەیتەوە ئامین والحمد لله رب العالمين.

# فەسڵی چوارەم
# چەند وتارێکی جیا جیا

## (١) پەشیمانی (التوبة):

لە(منجد) داھاتووە: تاب یتوب توباً وتوبةً وتابه ومتاباً وتتوبة الى الله: رجع عن معصيته: واتا گەڕایەوە لەگوناھەکانیو پەشیمان بوویەوە.

تەوبەو پەشیمان بوونەوە واجبە لەگوناە لەسەر هەموو موسوڵمانێك بەدەقی فەرموودەی خوا:﴿وتوبوا الى الله جميعا ايها المؤمنون لعلكم تفلحون﴾ النور:٣١ .

واتە: بگەڕێنەوە بۆلای خواو دەسبەرداری گوناە بن ئەی باوەڕداران بەڵکو بەختەوەربن.

((تەوبە مەنزڵگای کاروانی خواناسانە هەوارگەی دڵە بەتاوان برینداربووەکانە، سەرمایەی دەستی خۆشبەختانە، یەکەم هەنگاوی خواویستانە، قەڵغانی خۆپاراستن لەتاوانە، سەرەتای هەڵبژاردنی لەخوانزیکانە، گۆماوی خۆپاکردنەوەی ئادەمیزادەکانە)).

لەقوڕی ئادەمیزاددا دوو ڕەگەز تێکەڵاو بووە چاکەو خراپە، چاکەی بێ خراپە سروشتی فریشتەکانە خراپەی دور لەچاکەیش سروشتی شەیتانەکانە، بۆیە پێویستە ئادەمیزادەکان چاو لەباوکە ئادەمیان بکەن هەرکات گوناھیان کرد زوو تەوبەبکەن ، هەرکەس لەگوناھدا بەگوێی باوکی کرد بەڵام لەتەوبەدا بەگوێی نەکرد ئەوە ستەمی کردووە، تەوبەکار بەڵگەی خستووەتە ڕوو کەبەڕاستی وەچەی ئادەمە (عليه السلام). بەڵام هەرکەس سوورە لەسەر مانەوەی لەگوناھدا ئەوە خۆی پاڵداوە بەڕشتەی شەیتانەوە.

جا کەتاوان شێلرابێت لەگەڵ قوڕی ئادەمیزاددا دەبێ ئەو قوڕە زاخاو بدرێ‌و پاك بکرێتەوە بەیەکێ لەم دوو ئاگرە: یان ئاگری پەشیمانی‌و گریان لەترسی خوا ، یان ئاگری دۆزەخ ، کەوابوو سوتاندنی ئەو گڵە بەئاگر پێویستە بۆ دەرکەوتنی گەوهەری پاکی مرۆڤ. ئێستایش کەوای لەژیاندا خۆت سەربەستی کام ئاگریان هەڵدەبژێری ، بێگومان ژێر ئەوکەسەیە ئاسان ترین ئاگریان ئیختیار بکات پێش ئەوەی مردن فرسەتی ئیختیاری لەدەس وەرگرێ‌و بەرێی بکات بەناچاری بەرەو ئاگری دۆزەخ.

ئاگری پەشیمانیش بەوە گڕ دەگرێ بەندەی تاوانکار بزانێت گوناە دەبێتە پەردە لەنێوان ئەوو خوادا، بەو هۆیەوە پەشیمانی دایبگرێ‌و ئازار بگات بەدڵی‌و لەرابوردوو پەشیمان بێتەوەو بڕیار بدات لەئێستاو داهاتوودا دەست لەوتاوانە هەڵگرێت ئەم مانایانەیش هەموو کۆدەبنەوە لەفەرموودەی پێغەمبەردا(ﷺ) (الندم توبة )اخرجه ابن ماجه وابن حبان والحاكم وصحح اسناده[1].

دیارە تەوبە زۆرگرانە هەوڵ‌و کۆششی زۆری دەوێ بۆیە تەوبەکار خۆشەویستی خوایە ﴿إن الله يحب التوابين ويحب المتطهرين﴾ البقره: ٢٢٢.

واتە: خوا ئەوانەی خۆش دەوێ کە زۆر تەوبەدەکەن و خۆیان خاوێن دەکەنەوە لەتاوان.

مرۆڤ لەکاتی تاواندا نەفام‌و نەزانە واتارێزی خواو یاسای خوای لا کەم بووەتەوە سزای پاشە ڕۆژی لەبەرچاو ون بووە بۆیە خۆی گوناهبار دەکات، ئیتر ئایا ئەو گوناهە گەورە بێت یان بچووك ، بەڵام بێگومان بەئەندازەی گەورەیی تاوانەکە نەزانینە کەیش خەست‌و خۆڵ دەبێتەوە، جا ئەگەر ئەو کەسە بەخۆیدا هاتەوەو زووبەزوو تەوبەی کرد ئەوە لێی قوبوڵ دەکرێت وەك خوا دەفەرموێ:﴿انما التوبة على الله للذين يعملون السوء بجهالة ثم يتوبون من قريب فاولئك يتوب الله عليهم وكان الله عليما حكيما﴾ النساء:١٧.

واتە: ئەو تەوبەی کەخوای گەورە وەریدەگرێت بۆ کەسانێکە لەکاتی نەفامی‌و نەزانیندا تاوان دەکەن ئەمجا زووبەزوو پەشیمان دەبنەوە. ئەوانە خوا تەوبەیان وەردەگرێت خوا زۆر زانایەو خاوەنی حیکمەتە.

مەبەست لەنزیکی تەوبە ئەوەیە کەئەو کەسە نەگەیشتبێتە حاڵی غەرغەرەی گیان دان وەك لەئایەتی دواتردا روونی دەکاتەوە :﴿وليست التوبة للذين يعملون السيئات حتى اذا حضر احدهم الموت قال اني تُبت الان ولا الذين يموتون وهم كفار اولئك اعتدنا لهم عذاباً اليما ﴾ النساء: ١٨.

واتە: تەوبە بۆ ئەوانە نیە بەدکاری دەکەن هەتا کاتی مردن‌و گیانەڵە لەوکاتەدا دەڵێ: من تەوبە کارم، یان لەکاتی دیتنی سزای قیامەتدا پەشیمان دەبێتەوە لەکردەوەکانی ئەوانە ــ خوا دەفەرموێ . سزایەکی سەختمان بۆ ئامادەکردوون.

---

[1] احياء علوم الدين والمغني على الاحياء :ب:٣، ل :٤٠٣ ، لەگەڵ دەستکاریدا.

لەم بارەیەشەوە پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێ: (ان الله عزوجل يقبل توبة العبد مالم يُغرغر) رواه الترمذي وقال حديث حسن[٢] .

واتە: خوا تەوبەی بەندەوەردەگرێت مادام گیان نەگیشتبێتە گەرووی (حاڵەتی غەرغەرە).

(بۆیە وەها ناودەبرێ چونکە گیان وەك ئاوی غەرغەرە پێكراو لەگەروودا دێت و دەچێ تابەیەکجاری دەردەچێ !

لەم بارەوە شاعیرێك دەفەرموێ:

عش مابدا لك سالماً　　فاذا النفوس تقعقعت　　فهناك تعلم موقناً

في ظل شاهقة القصور　　في ضيق حشرجة الصدور　　ماكنت الا في غرور[٣]

ماناکەی بەشیعر:

بژی چۆن دەتەوێ بەخۆشحاڵی　　لەژێر سایەی کۆشکە بەرزەکاندا

هەرکات گیان کەوتە هات و چۆ ..　　لەتەسکایی گەروو سینگەکاندا..

ئەوکاتە بۆت دەردەکەوێت بەجوانی　　چەندە مەغرور بوویت لەرۆژانی ژیاندا

تەوبە واتا بەرپابوونی جەنگ لەنێوان سەربازەکانی شەیتان و سەربازەکانی مەلائیکە، سەربازی مەلائیکە لەدەروونی مرۆڤدا ژیرییە ، سەربازی شەیتانیش هەواو ئارەزوو پەرستییە، جالەبەرئەوەی هەواو ئارەزوو هەر لەمنداڵی و گەنجیدا جێگای خۆیان دەکەنەوەو ژیری لەسەرەتای بلوغ دا پێدەگات و لەچل ساڵیدا کامڵ دەبێ بۆیە سەربازەکانی شەیتان زوتر نیشتەجێ دەبن و سەنگەردەگرن و پێویستیان بەدەرکردن و راونان هەیە بەوەرزشی دەروونی کەتەوبەو پەشیمانی بەردەوامە ، جا ئەگەر عەقڵ و تەقوا بەهێز نەبوو بەهێز نەکرا بێگومان گۆرەپانی دەروون ئاچوغ دەبێ بۆ سەربازەکانی شەیتانی لەعین و وادەی خۆی بەجێدێنێ ﴿لَأَحتَنِكَنَّ ذريته الا قليلاً﴾الاسراء: ٦٢.

واتە دەبێ وەچەی بنیادەم لەبن بێنم بەسەر گەردان کردنیان کەوابوو تاوانکردن و پەردەی تاوان کارێکە بنیادەم ناتوانێ لێی رزگار ببێ مەگەر بەتەوبەو داوای لێبوردن وەك پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێ: ( كل بني ادم خطّاؤون وخير الخطائين التوّابون).

واتە: بنیادەم هەموو تاوانکارن بەڵام چاکترین ئەو تاوانکارانە ئەوانەن زۆر تەوبەدەکەن و پەشیمان دەبنەوە.

---

(٢) رياض الصالحين ، باب التوبة .

(٣) رسالة الحث على التوبة قبل الموت / دار ابن خزيمة ، الرياض ، ص٥.

كەوابوو هەموو كەس موحتاجە بەتەوبە ئەگەر بیّ باوەڕە واجبە لەسەری تازووە باوەڕبهیّنیّو موسوڵمان ببیّو لەپیّڕی كافران دووركەویّتەوە ، ئەگەر باوەڕدارە بەچاولیّكەری باوكو دایكی. واجبە لەدین بگاو خۆی لەتەوقی چاولیّكەری رزگار بكات، ئەگەر ئەم پلەیەیشی بڕی واجبە بگەڕیّتەوە لەدواكەوتنی هەواو ئارەزوو هەتا بەتەواوی دەچیّتە قاڵبی شەرعی خواوە ئەویش گرانترین جۆری تەوبەیە .

بەم شیّوە هیچ كەس تەنانەت پیّغەمبەرانیش(علیهم الصلاه والسلام) نابیّ بیّ تەوبە بن بەلاّم جیاوازی هەیە لەنیّوان ئەندازەو جۆرەكانیدا[1] .

## ( ٢ ) داوای لیّبوردن : ١٢/رەمەزان /١٤٢١ هـ ٨/١٢/٢٠٠٠

قال تعالى :﴿وسارعوا الى مغفرة من ربكم وجنة عرضها السموات والارض اعدت للمتقين ﴾
ال عمران : ١٣٣

واتە: پەلەو پیّشبڕكیّ بكەن بۆ لیّبوردنی خوایی‌و بەهەشتیّك كەپانتاییەكەی بەقەدەر ئاسمانەكان‌و زەمینە ئامادەكراوە بۆ تەقواكاران .

لەژیّر رۆشنایی ئەم ئایەتەدا بۆ تەواوكردنی خوتبەی رابوردویشمان هەندیّك باسی لیّبوردنی گوناه دەكەین چونكە باسیّكی گرنگەو زۆریش پەیوەستە بەباسی تەوبەوە.

پیّشەكی پیّویستە بزانین لیّبوردن بەخششیّكی خوایەو بەخواستی خۆی دەیبەخشیّ بەبەندە تاوانكارەكان بەمەرجیّ تاوانەكە هاوەڵ بۆ خوا دانان (الشرك) نەبی، چونكە ئەم تاوانە گەورەترین تاوانەو لیّبوردنی بۆ نیە وەك خوا دەفەرمویّ: ﴿ان الله لایغفر أن یشرك به ویغفر مادون ذلك لمن یشاء ﴾ النساء: ١١٦

واتە: خوا لەوەخۆشنابیّ هاوەڵی بۆ دابنریّ بەلاّم گوناهی لەمەكەمتر لیّ‌ی خۆش دەبیّ بۆ كەسیّ خۆی بیەویّت.

داوای لیّبوردن لەهەمووكاتدا گەورەترین هۆكارە بۆ لیّبوردنی گوناهەكانمان، قورئان زۆر دووپاتی ئەم خاڵە دەكاتەوە وەك دەفەرمویّ:﴿فاعلم انه لااله الا الله واستغفر لذنبك وللمؤمنين والمؤمنات ﴾ محمد :١٩.

واتە: تۆ بزانە هیچ پەرستراویّكی بەهەق نیە جگە لە(الله) وە داوای لیّبوردن بكە بۆ تاوانەكانی خۆت‌و بۆ یارا ـنی باوەڕدارو خوشكانی باوەڕداریشت.

---

[1] احیاء علوم الدین :٤:١٠ لەگەڵ دەستكاریدا.

داوای لێبوردن و پاڕانەوە لەکاتی سەحەردا زۆر خێرترەو هیوای قوبوڵ بوونیشی زیاتر لێدەکرێ ، وەك قورئان خۆی دەفەرموێ لەپێناسەی تەقواکاراندا:﴿كانوا قليلاً من الليل مايهجعون وبالاسحار هم يستغفرون ﴾الذاريات :١٨

واتە: ئەوانە بەشەو کەم دەخەوتن هەر خەریکی شەونوێژ بوون، وەلەکاتی پارشێودا داوای لێبوردنیان دەکرد.

هەروەها لەسوورەتی (ال عمران)دا خوای گەورە پێناسەی تەقواکارانمان بۆ دەکاو دەفەرموێ:﴿الذين يقولون : ربنا اننا امنا فاغفر لنا ذنوبنا وقنا عذاب النار ، الصابرين والصادقين والقانتين والمنفقين والمستغفرين بالاسحار ﴾ ال عمران : ١٦،١٧

ئەوانەی کەدەڵێن: پەروەرگارمان ئێمە باوەڕمان هێناوە، لەتاوانەکانمان ببورەو بمانپارێزە لەسزای ئاگر ، ئەوانەی کەخۆگرن لەسەر بەڵاو مسیبەتی خوایی، ڕاست دەکەن لەوادەو بەڵێنەکانیاندا لەگەڵ خواو خەڵکی خوادا، ئەوانەی ملکەچ و فەرمانبەرن بۆ خوا، ماڵ دەبەخشن لەپێناوی خوادا لەکاتی پارشێواندا داوای لێبوردن لەخوا دەکەن.

له(صحيح) ی بوخاریو مسلم دا هاتووە کەپێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: (ينزل الله تبارك وتعالى في كل ليلة الى سماء الدنيا حين يبقى ثلث الليل الاخير فيقول: هل من سائل فأعطيه ؟ هل من داع فاستجيب له ؟ هل من مستغفر فاغفر له ؟... الحديث) ابن كثير :ج١، ص ٣٥٣.

واتە: خوای گەورە هەموو شەوێك دادەبەزێت بۆ ئاسمانی دنیا، کاتێ سێیەکی کۆتایی شەودێت، دەفەرموێ: ئایا کەسێ هەیە داوام لێبکات تاپێی ببەخشم ؟ ئایا کەسێ هەیە بپاڕێتەوە لێی قەبوڵ بکەم؟ ئایا کەسێ هەیە داوای لێبوردنم لێبکات تالێی ببوورم؟

پێغەمبەری خوا(ﷺ) سەرمەشقی کاروانی تەقواکاران و عەفووخوازان بووە زۆر بەکوڵ داوای لێبوردنی لەخوا دەکرد لەکاتێکدا خوا لەگوناهی ڕابوردوو داهاتووی خۆش بووبوو بۆئەوەی ئوممەتەکەیشی فێری ئەم حاڵەتە بکات لەفەرموودەی(صحيح)دا هاتووە پێغەمبەر(ﷺ) دەیفەرموو: (اللهم اغفر لي خطيئتي وجهلي واسرافي في أمري وما أنت أعلم به مني، اللهم اغفر لي هزلي وجدي ، وخطئي وعمدي ، وكل ذلك عندي )ابن كثير ، ج:٤ ص١٧٧.

واتە: ئەی خوایە لێم خۆش بە لەهەڵەم ، لەنەزانینم، لەسنوور دەرچوونم ، لەوانەی تۆ باشتر دەیزانی لەمن ، ئەی خوایە لێم خۆشبە لەگاڵتەم، لەجددیم ، لەهەڵەم لەهەوەسکاریم ، هەموو ئەم جۆرانەیشم لا هەیە .

جا ئەگەر پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەمە حاڵی بووبێ و بفەرموێ (انه ليُغان على قلبي واني لاستغفر في اليوم مائة مرة) رواه مسلم ، رياض الصالحين باب الاستغفار /١٨٦٩

واتە: بەراستی هەندێ جار دڵم تاریك دەبێ وە من داوای لێبوردن دەکەم لەڕۆژێکدا صەد جار).

ئەگەر ئەو بەوشێوەبوبێ دەبێ ئێمە چیبلێن و چۆن بین؟

## هۆكارەكانی لێبوردن:

لەسەرەتاوە باسمانكرد داوای لێبوردن گەورەترین هۆكارە بۆ لێبوردنی گوناهەكانمان ، بەلاَم هەندێ هۆكاری تریش هەن پێویستە موسولْمان لێیان بێئاگا نەبێ دوای ئەوەی باوەڕی دامەزراو بەدوای كاری خێردا گەڕا.

١ - كۆچ كردن لەپێناوی خوا لە(دار الكفر)ەوە بۆ (دار الاسلام) وەك لەفەرمودەدا هاتووە: (...ان الهجرة تهدم ماقبلها ) اخرجه مسلم [1] .

واتە: كۆچ كردن پێش خۆی دەڕوخێنێ واتە هەرچی گوناهی رابوردوو هەیە دەیسڕێتەوە بەلاَم زۆر بەداخەوە ئەمڕۆ گەنجەكانی ئێمە(دار الاسلام) جێ دێلْن بەرەو(دار الكفر والفساد)ەكەی ئەوروپا كەئەمەیش كارێكی حەرامەو دوورە لەشەرعی خواوە.

٢ - حەج كردن و دەست دان لە(بەردەڕەشەكەو روكنی یەمانی) لەكەعبەدا وەك پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێ: (من حج ولم يرفث ولم يفسق رجع كيوم ولدته أمه) رواه البخاري.

واتە: هەركەسێك حەج بكات بۆ خواو شتی پڕوپووچ و كاری دوور لەشەرع نەكات تیایدا وەك ئەو رۆژەی لێ دێ كەلەدایك بووە .

هەروەها دەفەرموێ: (ان مَسح الحجر الاسود والركن اليماني يحطان الخطايا حطاً) رواه احمد وصححه الالباني.

واتە: دەست تێوەردانی بەردە رەشەكەو روكنی یەمانی . كەسووچێكن لەكەعبەدا گوناهەكان هەلْدەوەرێنێت بەگشتی .

٣ - زیكركردن لەكاتی بانگدا بەوشێوەی پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێ: (من قال حين يسمع المؤذن: وانا اشهد ان لا اله الا الله وحده لاشريك له ، واشهد ان محمداً عبده ورسوله ، رضيت بالله رباً وبمحمدرسولاً، وبالاسلام ديناً غفر له ماتقدم من ذنبه) رواه البخاري ومسلم .

واتە: هەركەس ئەم زیكرە بخوێنێ خوا لەگوناهەكانی رابووردووی دەبورێ. دیارە مەبەستی بەردەوام بوونە لەگەلْ یەككەوتنی دلْ و زمان.

٤ - هەركەس ئامینی نوێژی یەكگرێ لەگەلْ فریشتەكاندا وەك پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێ: (اذا أمّن الامام فأمنوا ، فانه من وافق تامينه تأمين الملائكة غفر له ماتقدم من ذنبه ).

واتە: هەركات ئیمام وتی: آمین ئێوەیش لەگەلْیا بلێن ، هەركەس ئامینەكەی لەگەلْ مەلائیكە یەكبگرێ خوا لەگوناهی رابوردووی خۆش دەبێ.

---

[1] رسالة مغفرة الذنوب من منشورات دار الوطن بالرياض برقم (٥٠).

بۆیه سوننەته پەلەنەکەن لەئامیندا بەیەك دەنگ لەگەڵ ئیمام دا بڵێن: امين .

٥ ـ نەخۆشی وەك پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێ: (ان العبد اذا مرض أوحى الله الى ملائكته ، انا قيدت عبدي بقيد من قيودي ، فان اقبضه اغفر له، وان اعافه فحينئذ يقعد لاذنب له) رواه الحاكم وحسنه الالباني .

واته: بەڕاستی بەندە هەرکات نەخۆش کەوت خوا نیگا دەنێرێ بۆ لای فریشتەکان کەمن ئەو بەندەی خۆم کۆت کردووە بەکۆتێکی خۆم ، ئەگەر گیانم کێشا لێی دەبوورم ئەگەر شیفاشم دا بەبێ گوناه هەڵدەسێتەوە لەنەخۆشی .

چەندین شتی تریش هەیە دەبێتە هۆی لێبوردنی گوناه وەك کۆبوونەوە لەسەر خوانی زیکرو دووڕکات نوێژی دوور لەسەهوو چاکە بەدوای خراپەدا. و دووعای خێری کەس و کارو دۆستان و سزای گۆڕو بەرزەخ و ، وەستانی عەرەساتی قیامەت و ، ڕەحمەتی فراوانی خوایش کەبێ سنوورە.

## (٣) بەلاو نەهامەتیەکان بۆچی ؟ : ٢٠٠١/١٠/١٩

کاتێ دەتەوێت قسە لەگەڵ نوێژ نەکەرێك یان دین لاوازێك بکەیت و بانگی کەیت بۆ ڕێگەی خوا جۆرەها بڕو بەهانە دەخاتە ڕوو، دیارە هەر هەموویشی هەڵبەستراوەو دەیەوێ ڕابکات لەڕاستیو بەقاڵەی دەم داشی خۆی سوار بکات و خۆی بەچاك بخاتە ڕوو، بەڵکو زۆرجار بەوەیشەوە ناوەستێ تۆی چاکەخوازو ئاشنا بەخوا بەتاوانبار دەخاتە ڕوو، بەشێوەیەك گەر وریانەبیو باوەڕت بەڕێبازی خۆت پتەو نەبێت لەوانەیە لەڕێگای ڕاستیشت لابدات.

بۆ نموونە پێی دەڵێی بابە بۆ نوێژ ناکەیت؟ بۆچ بەڕۆژو نابیت ؟ بۆ چ بیرێك لەمردنت ناکەیتەوە ؟ بۆچ توێشووی قیامەتت ڕێك ناخەیت ؟

لەوەلامدا دەڵێ: بابە شەرت هەر نوێژ نیە ، گرنگ ئەوەیە دڵت پاك بێت، کەس ناچێتە گۆڕی کەس ، من لەتۆ زیاتر بەزەییم بەفەقیرو هەژارادا دێتەوە، من نوێژ ناکەم زەرەم بۆ کەس نیە هەر بۆ خۆمە، یان ئەمڕۆ زۆرجار دەبیستین کەدەڵێن : من لەداخی ئەم ئیسلامی‌یە تازانە نوێژ ناکەم ، یان سەرپۆش ناکەم و خۆم داناپۆشم ...یان ...یان ... بۆ لێکۆڵینەوەی ئەم ڕاستی‌یە حەزم کرد منیش و ئێوەش بچینە خزمەت چەند ئایەتێکی قورئان و چەند فەرموودەیەکی پێغەمبەر(ﷺ) لەژێر ڕۆشنایی ئەو دوو سەرچاوە پیرۆزەدا بزانین:

١ ـ ئایا ڕاستە نوێژنەکەر هەر زیانی بۆ خۆی هەیە ؟

٢ ـ ئایا ڕاستە عەرەق خۆریو بلاوبوونەوەی مەشروب لەگوندو شاردا کارێکی ئازادانەیەو زەرەری بۆ کەس نییە مەگەر بۆ ئەو کەسانە نەبێت کەسەرگەرمی بوون؟

٣ ـ ئايا ئەمە ڕاستە کەدەڵێن: ئافرەت دەبێ سەر بەست و ئازادبێت لەجل و پۆشاکی‌داو نەدەوڵەت و نەکەس‌وکاری ئافرەت بۆیان نییە تەداخول بکەن لەوباسەدا؟

٤ ـ ئایا ڕاستە ئەم هەموو بەلاو موسیبەت و نەهامەتی و شەڕو ئاژاوەو زەلیلی و چوار ساڵ بێ‌بارانی و چل ساڵ ژێر دەستەیی‌یەی کەتووشی ئوممەتی ئیسلام بەگشتی و کوردستان بەتایبەتی هاتووە هیچ پەیوەندی بەگوناهو تاوان و لادان و عەرەق خۆری و ڕووتی ئافرەت و شکاندنی سنووری خواوەنی‌یە؟

جاپێش ئەوەی وەڵامی ئەم پرسیارانە بدەینەوە حەزدەکەم دوو خاڵتان بۆ باس بکەم:

**خاڵی یەکەم:** هەموو دڵنیابن. لەقیامەتیشدا لەسەر ئەم قسە لێم دەپرسنەوە. کەمن لەئاراستەکردنی ئەم پرسیارو وەڵامانەدا مەبەستم ئەوە نی‌یە هیچ کەسێك یان هیچ لایەنێك بریندار بکەم، بەڵکو مەبەستم تەنها ڕوون کردنەوەی ڕاستی‌یەو دەستنیشانکردنی نەخۆشینەکانە. انشاء الله ـ لەوتارێکی داهاتوودا چارەسەرەکەیشی باس دەکەین جا هەرکەس بەم پرسیارو وەڵام و چارەسەرانە ڕازی بوو(خوا لێی ڕازی‌بێت) هەرکەسیش پێی ناخۆش بوو ئەوە من خۆم داوەتە دەست خواو داوای ئەجرو پاداشت و دوورەوەییم هەر لەئەو دەکەم.

**خاڵی دووەم:** ئەگەر لەژێر ڕۆشنایی ئایەتەکانی قورئان و فەرموودەکانی پێغەمبەردا(ﷺ) دوور لەڕاو بۆچوونی شەخصی من و کەسانی‌تر ـ وەڵامی ڕاستمان وەرگرت بۆ ئەم پرسیارانە و دەستنیشانی نەخۆشینەکانمان کرد ئەوکاتە مانای(واجب) دەبێت لەسەر هەموو کەسێك بگەڕێت بەدوای چارەسەردا، بەرانبەر بەنەفسی خۆی ، بەماڵ و منداڵی، بەودایرەو فەرمانگاو قوتابخانەو دەزگایەی ئەو سەرپەرشتی دەکات، هەرکەس بەگوێرەی توانای خۆی ، بێگومان(مسؤولیة)ی گەورە پیاوان و سەرکردەکان لەهی هەمووان گەورەترەو بەرپرسن لەهەموو تاوانێکی ئاشکرا کەلەم وڵاتەدا بکرێت و ئەوان پێی بزانن و لێی بێدەنگ بن و هەوڵی گۆڕانکاری بۆ نەدەن.

دوای ئەم پێشەکی‌یە گوێ بگرن بۆ وەڵامی پرسیارەکان:

١ـ قال تعالى:﴿وما اصابكم من مصيبة فبما كسبت ايديكم ويعفوا عن كثير﴾ الشورى :٣٠.

واتە: هەرچی توشتان بووە لەبەلاو نەهاتی و نەهامەتی بەهۆی کردەوەی دەستی خۆتانەوەیە خوای گەورە لەزۆریشی دەبووری و ناتانگرێ لەسەری.

٢ ـ﴿ ظهر الفساد في البر والبحر بما كسبت ايدي الناس ليذيقهم بعض الذي عملوا لعلهم يرجعون ﴾ الروم :٤١. قال البيضاوي: المراد بالفساد : الجدب وكثرة الحرق والغرق ومحق البركات وكثرة المضار بشؤوم معاصي الناس أو بكسبهم اياه.

وقال ابن كثير: أي بأن النقص في الزرع والثمار بسبب المعاصي لأن صلاح الارض والسماء بالطاعة[1] .

واته: بەلاو گێرەشێوێنی لەوشکانیو دەریادا دەرکەوتو ئاشکرابوو بەهۆی کردەوەی دەستی ئادەمیزادەکانەوە بۆئەوەی هەر لەدنیا خواسزای هەندێ لەتاوانەکانیان پێ بچێژێ بەڵکو بگەڕێنەوە بۆلای خوا.

(بیضاوي)دەفەرموێ: مەبەست بە(فساد) گرانیو وشکە ساڵیو زۆربوونی ئاگر کەوتنەوەو خنکاندنو نەمانی بەرەکەتو زۆربوونی زیانەکانە بەهۆی تاوانی خەڵکەوە.

(ابن کثیر)دەفەرموێت: زەرعو بەروبووم کەم دەبێتەوە بەهۆی تاوانەوە چونکە چاکی ئاسمانو زەمین بەخواپەرستییە.

٣ . ﴿وضرب الله مثلاً قرية كانت امنة مطمئنة يأتيها رزقها رغداً من كل مكان فكفرت بأنعم الله فأذاقها الله لباس الجوع والخوف بما كانوا يصنعون﴾ النحل:١١٢.

واته: خوای گەورە نموونەی گوندێکتان بۆ دێنێتەوە لەخۆشیدا دەژیانو بەختەوەربوون، ڕزقو ڕۆزی، خێرو خۆشی دەباری بەسەریاندا، کەچی ئەوان شوکرانە بژێری خوایان نەکرد بەڵکو کوفرانەیان کرد نیعمەتەکانی خوایان بەکارهێنا لەگوناهو تاوانو عەرەقو زیناو ...هتد . بۆیە خوا جلو بەرگی برسێتیو ترسی کردن بەبەرداو مەحرومی کردن لەخێرو خۆشیو سەرەوتی دەروون بەهۆی کردەوەی خۆیانەوە.

٤ ـ عن النعمان بن بشير(ﷺ) عن النبي(ﷺ) قال: (مثل القائم في حدود الله والواقع فيها كمثل قوم استهموا على سفينة فصار بعضهم أعلاها وبعضهم أسفلها ، وكان الذين في أسفلها اذا استقوا من الماء مروا على من فوقهم فقالوا: لو انا خرقنا في نصيبنا خرقاً ولم نؤذ من فوقنا ، فأن تركوهم وما ارادوا هلكوا جميعاً، وان أخذوا على أيديهم نجوا ونجوا جميعاً ) رواه البخاري.

واته: نموونەی ئەوانەی کەوەستاون لەسنووری خواداو لێی دەرناچن، لەگەڵ ئەوانەی لێی دەرئەچنو دەکەونە حەرام وەك نموونەی کۆمەڵێکوەهان کەتیلو پشکیان کردووە بۆ گرتنی جێگایان لەناو کەشتییەکدا هەندێکیان کەوتونەتە قاتی خوارەوە هەندێکیان کەوتونەتە قاتی خوارەوە هەندێکیان قاتی سەرەوە، ئەوانەی خوارەوە گەربیانەوێ ئاوبخۆنەوە دەبێ بەسەر ئەوانەی سەرەوەدا بڕۆن هەتا دەستیان بگات بەئاوەکە، بۆیە دەڵێن: بائێمە کونێك بکەینە بەشەکەی خۆمان بۆئەوەی لێرەوە دەستمان بگاتبەئاوەکەو ئازاری ئەوانەی سەرەوە نەدەین، ئەگەر دانیشتوانی سەرەوە بێدەنگ بوون لەم نیازو کارە هەموویان دەفەوتێن ، بەلام ئەگەر دەستیان گرتن خۆیشیان سەرفراز دەبنو ئەوانیش سەرفراز دەبن.

---

[1] صفوة التفاسير ، الصابوني.

جابراو خوشكه بەڕێزەكان ئەمە(٣) بەڵگەی قورئانو بەڵگەیەكی فەرموودەیە من نامەوێ هیچی لەسەر بڵێم تەنها ئەوەم كرد بەئەمانەت بۆم وەرگێڕانە سەر زمانی كوردی خۆشەویست ئیتر خۆتان بەویژدانەوە حاكم بن بڕیار بدەن نوێژنەكەر چەندە تاوانبارەو عەرەق خۆر چەندە تاوانبارە، شەرواڵ پیس چەندە تاوانبارەو نەخۆشەو ئایدز ئامێزە، من هیچ ناڵێم بەڵام خۆتان بڕیار بدەن تاوان چ نەخۆشینێكی گەورەیە لەوڵاتدا؟

بازیاتر لەباسەكە لانەدەین پشت بەخوا لەجاری داهاتوودا دەچینە سەرباسی چارەسەری ئەم نەخۆشییە بەیەكێ لەچارەسەرەكان كەئامۆژگارییە.

## (٤) چارەی بەڵاو نەهامەتی :٢٠٠١/١٠/٢٦

جاری پێشوو بۆمان دەركەوت بەڕوونی كەنەگبەتیو نەهامەتیو شەڕو ئاژاوەی نێوان ئوممەتی ئیسلام بەگشتیو گەلی كوردی موسڵمان بەتایبەتی هۆكارەكەی دەگەڕێتەوە بۆ دووریمان لەخواو بۆ گوناهو تاوانی خۆمان.

لەم بارەیشەوە پشت بەخوا هەر لەژێر ڕۆشنایی ئایەتو فەرموودەدا چارەسەری ئەو نەهامەتیو نەگبەتییە دەخەینە ڕوو.

خوای تعالی لەقورئانەكەیدا دەفەرموێ:﴿إن الله لايغير مابقوم حتى يغيروا ما بأنفسهم واذا أراد الله بقوم سوء فلا مرد له ومالهم من دونه من وال ﴾ الرعد: ١١

واتە: خوا حاڵی هیچ گەلێك ناگۆڕێ هەتا ئەوان خۆیان نەگۆڕن، واتە: ئەگەر حاڵیان خۆش بوو هەتا ئەوان خراپ نەبن خوا خۆشییان لێناگرێتەوە، وەئەگەر حاڵیان خراپ بوو ، خواسەرفرازیان ناكات هەتا خۆیان چاك نەكەن، وەئەگەر خواویستی بوو گەلێك تووشی خراپە بكات كەس ناتوانێ ئەو خراپەیان لەسەر لابەرێت وەكەس پاڵ پشتیان نابێت جگە لەخوا.

ئەم ئایەتە ڕوونە لەوەی ئەمڕۆ ئێمە تەنها خوا دەتوانێ ڕزگارمان بكات .﴿يا ايها الذين امنوا لاتتخذوا اليهود ولا النصارى أولياء بعضهم أولياء بعض ومن يتولهم منكم فأنه منهم ان الله لايهدي القوم الظالمين ﴾المائدة:٥١.

واتە: ئەی باوەڕداران گاورو جوولەكەكان مەگرن بەگەورەو یاوەری خۆتان، ئەوان هەندێكیان گەورەی هەندێكیتریانن . واتا گاورو جوولەكە . دڵسۆزی یەكتری دەكەن لەدژی موسوڵمان. وەهەركەس لەئێوە گاورو جوولەكە بگرێ بەدڵسۆزو پرس پێكراو ئەوە ئەویش لەوانە، خوا گەلی ستەمكار سەركەوتوو ناكاتو ڕێنماییان ناكات. كۆتایی ئایەتەكەیش ئەوە دەگەیەنێت بەگەورە زانینی ئەوان گەورەترین ستەمە.

ئەم گۆڕانکاریەش هەروا شتێکی ئاسان‌و بێئەرك نی‌یە بەڵکو عەزمی ئەوێ باوەڕی پتەوی دەوێ ساڵەها ساڵی دەوێ هەروەك چۆن ئێمە بەئاسانی نەگەیشتوینە ئەم ئاستە لەخراپەدا بەڵکو دەیان ساڵە هەوڵمان لەگەڵ دەدرێ پیلانمان بۆدا ئەڕێژن لەلایەن دوژمنانی دینەوە هەتا گەیشتینە ئەم ئاستە ناهەموارەی ئەمڕۆ.

لەبیرتان دێ ئافرەتەکانمان کەواو فەقیانەو پەچەو عەبایان لەسەربوو کاتێکیش بەڕێگادا دەڕۆیشتن بەئەدەبەوە سڵاویان لەپیاوان دەکردو کەناریان دەگرت؟ ئەی ئێستە ؟ ئێواران بچن بۆ بازاڕی دەبۆکەو سەرجادەی ئۆرزدی‌و سەهۆڵەکەو تووی مەلیك وەڵامەکەی دەزانن.

لەبیرتان دێ هەر مزگەوتێ کۆمەڵێ فەقێی بەئەدەبی تیابوو خەڵك دەستی بۆ دەگرتن بەسینگەوە، دەیان وت: ئەمانە فریشتەی سەرزەمینن ئەوانیش چەند بەڕێزبوون لەناو خەڵکدا؟ بەنان‌و ئاو قەناعەتیان هەبوو؟ ئەی ئێستا ؟

لەبیرتان دێ گوندەکانی کوردستان چەند ئاوەدان‌و خۆش بوون ، سیلەی رەحم‌و هات‌وچۆی نێو گوندەکان‌و بارانی زۆرو باخ‌و میوەهات‌و دەمەتەقێی بەرئاگردانی زستان‌و کەپرو ساباتی هاوین‌و جومعەو جەماعەتی مزگەوتەکانیان ؟ ئەی ئێستا ؟ گەشتێك بکەن بەگوندەکانداو وەڵامتان لەوێیە ؟

براکانم مەبەستم لەخوێندنەوەی مێژوو ئەوەیە بەخۆماندا بچینەوە چونکە خانویەك بەدوو رۆژ دەڕووخێنرێ بەڵام بەدوو مانگ دروست ناکرێتەوە، ئەخلاق‌و رەوشتیش هەروایە ماوەی(٧٠)ساڵە دوژمنانی دین خەریکن ئێمە دەڕوخێنن هەروا بەئاسانی دروست نابینەوە بەڵام نابێ(مأیوس)و بێ هیوایش ببین ئەگەر بەڕاستی رووبکەینەوە خوا هەوڵ بدەین رەوشتی ئیسلامی‌و کوردەواری رەسەنمان زیندوکەینەوە خوا یارمەتیمان دەدات، ئەم زیندووکردنەوەیەش بەکورتی دوو هەنگاوی گەورەی دەوێ.

**یەکەم:** دەبێ مامۆستایان‌و زانایان چاکی مەردایەتی لێبکەن بەلاداو بوێرانەو چاونەترسانە﴿...یجاهدون في سبيل الله ولايخافون لومة لائم﴾ بکەن بەرێبەری کاروانەکەیان دەستنیشانی نەخۆشی‌و ناتەواوی‌یەکان‌و بکەن‌و چارەسەریشی بۆ دابنێن.

**هەنگاوی دووەم:** دەبێ ئەو خەڵکە بەگشتی(حاکم‌و محکوم) ئەمیرو فەقیر، پیاوو ژن ؛ مامۆستاو دڵسۆزەکان : ئەوانەی بۆ خوا تێدەکۆشن‌و مەبەستیان پلەوپایەو رەزامەندی فلان‌و فیسار نی‌یە؛ ئەوانە بکەن بەپێشەوای خۆیان‌و دوای ئامۆژگاریەکانیان بکەون‌و هیچ کەسێکی‌تر بەدڵسۆز نەزانن ئەوان نەبێت.

ئەمڕۆ بەکورتی باسێکی هەنگاوی یەکەم دەکەم کەدەوری مامۆستایان‌و کاریگەری ئامۆژگاری‌و رێنمایی دڵسۆزیانە.

یادخستنەوەی خوا زۆر کاریگەرە لەدڵی موسڵماناندا﴿وذکر فأن الذکر تنفع المؤمنین ﴾دڵەکان بەهۆی یادخستنەوەو ئامۆژگاری‌یەوە نەرم دەبن‌و راستی وەردەگرن چەندەها دڵی رەق پاراو بوویەوە بەیادی خواو نیشتەجێبوو لەسەر راستی ﴿...الا بذکر الله تطمئن القلوب ﴾ .هەندێ کەس وادەزانن زیکری خوا هەر ئەوەیە تەسبیحێ هەڵگرێو لەسوچێکدا بەدەم(لا الە الا الله)وە سەراوەشێنێ بێ‌ئەوەی لەماناکەی تێبگات. نەخێر (لا اله الا الله)ی راستی ئەوەیە بەدڵ یادی لێ بکەیتەوە. (لا الە الا اللە) بەیعەت‌و پەیمانە هەرکەس بەراستی بیڵێ ئیتر نابێ سنووری خوا بشکێنێ کەسی‌تر بەمامۆستا بزانێ (موعظة)و ئامۆژگاری زاناو دڵسۆزەکانیش باشترین رێگایە بۆ نەرم بوونی دڵی خەڵکی‌و گەرانەوەیان بۆ لای خوا.

عن عرباض بن سارية (ﷺ) قال: وعظنا رسول الله (ﷺ) موعظة وجلت منها القلوب وذرفت منها العيون فقلنا يا رسول الله كأنها موعظة مودع فأوصنا ، قال: اوصيكم بتقوى الله والسمع والطاعة وان تأمر عليكم عبد ، فأنه من يعش منكم فسيرى اختلافاً كثيراً، فعليكم بسنتي وسنة الخلفاء الراشدين المهديين ، عضوا عليها بالنواجذ ، واياكم ومحدثات الامور فان كل محدثة بدعة وكل بدعة ضلالة ، وكل ضلالة في النار *. رواه ابوداود والترمذي وقال حديث حسن صحيح[1].

واتە: لەعرباضی کوری ساریەوە ریوایەت کراوە دەفەرموێ: پێغەمبەر(ﷺ) ئامۆژگاریەکی کردین دڵانی خستە هەشۆکەو چاوان فرمێسکیان رژاند، وتمان ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەڵێی ئامۆژگاری خواحافیزی خوازێکە، زیاتر ئامۆژگاریمان بکە فەرمووی: ئامۆژگاریتان دەکەم بەتەقوای خواو گوێرایەڵی بەقسەکردنی پێشەوا با عەبدێکیش پێشەواتان بێت ، بەرا ستی هەرکەس لەئێوە بژی جیاوازیەکی زۆر دەبینێ، دەست بگرن بەسوونەتی منەوە ، وەسوننەتی خولەفای راشیدین، قەپی پیابکەن بەدانەکانی پێشینتان، نەکەن دوای شتی تازە پەیدابوو بکەون، هەمووشتێکی تازە بیدعەیەو هەموو بیدعەیەکیش گومراییە ، هەموو گومراییەکیش لەئاگردایە.

**پیاوێک هاتە خزمەتی حەسەنی بەصری وتی:**

دڵم زۆر رەشە نەرم نابێت فەرمووی: نزیکی کەرەوە لەیادی خوا ، کۆری زیکر زانستی زیندو دەکاتەوە، ملکەچی لەدڵدا دروست دەکات، دڵە مردووەکانیش بەیادی خوا زیندوو دەبنەوە)[2].

---

[1] الاربعين النووية :رقم :٢٨.

[2] لطائف المعارف ، زين الدين ابن رجب الحنبلي :٤٧.

ئامۆژگاری زانایان وەك شوڵی پەروەردەکاران وەهایە دەدرێ لەدڵەکان بۆئەوەی ژێر بن هۆش بکەنەوە، ئازاریان بگات و بەخۆیاندا بچنەوە، بۆیە هەرکات شوڵەکە زۆر بەهێز بوو کاریگەریشی لەسەر لاشە زیاتر دەمێنێ.

هەتا ئامۆژگاریش بەکوڵتر بێت لەدڵێکی پاکترەوە بێت کاریگەری بۆسەر دڵان زیاتر دەبێت ، تەنانەت هەندێجار لەکۆڕی ئامۆژگاریدا هەندێ کەس مردوون ، وەك دەگێڕنەوە: عبدالواحدی کوڕی زەید ڕۆژێ ئامۆژگاری موسڵمانانی دەکرد پیاوێك هاواری کرد ئەبا عوبەیدە بەسە پەردەی دڵت دڕاندم، کاتێ عبدالواحد ئامۆژگاریەکەی تەواوکرد کابرا مردبوو، جارێکی تریش لەکۆڕی(موعظة)ی (شبلي)دا پیاوێك مرد کەسوکارەکەی شکاتیان لە(شبلی)کرد بانگکرا بۆ لای خەلیفە فەرمووی: نفس رنت ، فحنت ، فدعيت فأجابت فما ذنبي ؟

دڵێك گوێی گرت بۆیادی خواو نەرم بوو ، بانگی لێکراو وەڵامی دایەوە ، تاوانی من چیە ؟

**قضى الله في القتلى قصاص دمائهم ولكن دماء العاشقين جُبار[1]**

واتە: خوا فەرمانیداوە بۆ کوژراوەکان بکوژەکانیان بکوژرێتەوە، بەلام خوێنی دڵداران هەدەرەو وەرناگیرێ.

ئەوان ئاوابوون لەئامۆژگاریەکانیاندا بەدڵ کردوویانە بۆیە خەڵکیش دڵی نەرم بووە بۆیان هەندێ لەپێشینان فەرموویانە: (ان العالم اذا لم يرد بموعظته وجه الله تعالى زلت موعظته عن القلوب كما يزل القطر عن الصف )[2] .

واتە: زانا ئەگەر مەبەستی خوانەبوو بەئامۆژگاریەکانی، ئەو ئامۆژگاریانە لەدڵ دەکەونە خوارەوە وەك چۆن دەنکی باران لەبەردی لووس دەکەوێتە خوارەوە.

خوایە دڵەکانمان نەرم کەیت بۆ وەرگرتنی ئامۆژگاری یا الله یارحمان مامۆستاو زاناکانمان ڕێنمایی بکە جوانترین و دڵسۆزانەترین ئامۆژگاریمان بکەن.

یاحی یاقیوم ڕێنمایی کاربەدەستەکانمان بکەیت ڕێز لەشەرعەکەی تۆ بگرن و هەرچی تازەیەو پێچەوانەی فەرمانەکانی تۆیە لەناومان دەری بکەن ...امین ..

## ( ٥ ) بۆخوابوون ( الاخلاص ):

خوای گەورە لەقورئاندا دەفەرموێ:﴿فادعوا الله مخلصين له الدين ولو كره الكافون ﴾ غافر:١٤

واتە: هەر لەخوا بپاڕێنەوە هەر ئەو بپەرستن هەر لەوبترسن باکافرەکانیش ئەمەیان لەبەرگران بێت.

---

[1] لطائف المعارف:٥١ ، ٥٢.

[2] لطائف المعارف: ٥٢،٥١.

زۆرجار مامۆستاو وتاربێژەکانمان کەباسی ئیخلاص دەکەن مافی خۆی نادەنێ، یان مەودا فراوانەکەی تەسك دەکەنەوە، چونکە بڕی دەکەن تەنها لەسەر نوێژو ڕۆژوو پەرستشەکان.

ڕاستە پەرستشەکان لەهەموو شتێ گرانترە وە لەهەموو کارێ زیاتر پێویستی بەئیخلاص و دڵسۆزی هەیە بۆ خوا بۆیە دەبێ موسڵمان زۆر دڵ وریابێت لەکاتی ئەنجامدانی نوێژو رۆژو هەموو جۆرە عیبادەتێکدا نەیەڵێ شەیتانی لەعین خوتکەی دڵی بداتو کارەکانی تێکەڵ بەڕیا بکات.

بەڵام دەبێ ئەوەیش بزانین ئیخلاص وشەیەکی ئەوەندە فراوانە مانایەکی ئەوەندە بەرینە هەموو لایەنەکانی ژیانی موسڵمان دەگرێتەوە نەك تەنها کردەوەکانی تەنانەت نیازو خواستەکانیشی ، بەڵکو زۆر زەق و ڕوونە سەرچاوەی هەڵقوڵانی ئیخلاص دڵ و دەروونەو لەوێوە بنەوان دەگریو جۆگەو ڕووباری کردەوەکان ئایا بۆ خوان؟ یان بۆخوانین ؟ لەدڵەوە جیادەبێتەوە، بۆیە پێغەمبەرمان (ﷺ) دەفەرموێ: (انما الاعمال بالنيات ، وانما لكل امرئ مانوى ، فمن كانت هجرته الى الله ورسوله فهجرته الى الله ورسوله ومن كانت هجرته لدنيا يصيبها أو امرأة ينكحها فهجرته الى ماهاجر اليه) متفق عليه.

واتە: هەموو کردەوەیەك ڕەهەندەیە بەنیازەوە وەهەرکەس بەگوێرەی نیازی پاداشتی دەدرێتەوە ، جاهەرکەس کۆچ و دابڕانەکەی بۆ لای خواو پێغەمبەر بوو (ﷺ) ئەوە بۆلای خواو پێغەمبەرە، وەهەرکەس کۆچ و دابڕانەکەی بەنیازی پەیداکردنی شتێکی دنیابوو، یان بۆمارەکردنی ژنێك بوو ئەوە کۆچەکەی بۆ ئەوشتەیە بۆی ڕۆیشتووە، ئەنجا دوای ئەوە ئیخلاص ڕوودەکاتە گوفتەیش تەنانەت وشەی(لا اله الا الله) ناودەبرێ بەوشەی ئیخلاص واتە: دەربڕینی باوەڕ بەتەنیایی خوا.

(لا اله الا الله) مانای یەك خوا هەیە، کەسیتر خوانیيە، کەسیتر شایستەی پەرستن و هاوار بۆ بردن نیيە ، کەسیتر شایستەی حوکم و یاسادانان نیيە، کەسیتر شایستەی مل بۆکەچکردن نیيە.

(لا الـه الا اللـه) پەیمانی دابڕانە بۆ خوا پەیمانی لێبڕانە بۆ بەرنامەکەی ، پەیمانی یەك لابوونەوەو دڵسۆزیيە لەگەڵ عەهدو پەیمانەکەی هەر بۆیە لەفەرموودەدا هاتووە(افضل الذكر لا اله الا الله).

واتە: گەورەترین زیکر وشەی(لا اله الا الله)یە ، هەر بۆیە کافران پێیان ناخۆشە موسڵمان بەڕاستی بڵێ: (لا اله الا الله) چونکە باش دەزانن هەرکەس بەڕاستی وتی(لا الـه الا اللـه) واز لەهەموو بەرنامەیەك دێنێ جگە لەبەرنامەی خوا، واز لەهەموو پەرستراوێ دێنێ جگە لەخوا، ڕوو هەر لەخوا دەکات، داوا هەر لەئەو دەکات بەجوانی تێدەگات لەمانای ئەم فەرموودە: (اذا سألت

فأسال الله ، واذا استعنت فاستعن بالله واعلم ان الامة لو اجتمعت على أن ينفعوك بشئ لم ينفعوك الا بشئ قد كتبه الله لك ...الخ)[1].

واته: ئەگەر داواتكرد هەر لەخوا داوابكە، وە ئەگەر كۆمەكيت خواست هەرلەخواى بخوازە، وەبزانە ئەگەر هەموو ئوممەت كۆببنەوە بۆئەوەى سودێكت پێ بگەيەنن ناتوانن هيچ سودێكت پێ بگەيەنن بەوشتە نەبێت خوا بۆى نوسيويت ...هتد

نياز ئەوەندە گرنگە جارى وا هەيە دەبێتە هۆى چوونە ناو ئاگرى كەسێك بێئەوەى هيچى كردبێت . وەك فەرموودەى پێغەمبەر(ﷺ) روونى دەكاتەوە: (اذا التقى المسلمان بسيفهما فالقاتل والمقتول في النار ، قلت يارسول الله فهذا القاتل فما بال المقتول ؟ قال: انه كان حريصاً على قتل صاحبه) متفق عليه[2].

واته: هەركات دوو موسڵمان رووبان كردەيەك بەشمشێرەكانيان بكوژو كوژراو ئەهلى دۆزەخن، راوى فەرموودەكە دەڵێ وتم: ئەوە بكوژ لەئاگردايە ئەى كوژراوو بۆچى؟ فەرمووى: ئەويش سوربووە لەسەر كوشتنى هاورێكەى.

نياز پاكى ئەوەندە دەور دەبينێ هەندێ جاركردەوەى خراپيش لەسەرخاوەنەكەى سوك دەكات بۆ نموونە گوێبگرن لەم فەرموودەى پێغەمبەر(ﷺ).

عن عائشة (رضي الله عنهما) قالت: قال رسول الله (ﷺ) يغزو جيش الكعبة حتى اذا كانوا ببيداء من الارض يُخسف بأولهم واخرهم قالت: قلت : يارسول الله كيف يُخسف بأولهم واخرهم وفيهم أسواقهم ومن ليس منهم ؟ قال:يُخسف بأولهم واخرهم ثم يبعثون على نياتهم)[3]. متفق عليه وهذا لفظ البخاري.

واته: عائيشە دەفەرموێ: پێغەمبەرى خوا(ﷺ) فەرمووى: سوپايەك دەچێت بۆ رووخاندنى كەعبە ، هەتا دەگەنە چۆڵەوانىيەك لەو زەمينەدا خواى گەورە بەرو دوايان دەكات بەناخى زەوىدا، عائيشە دەفەرموێ: وتم : چۆن بەرو دوايان رۆدەچن كەتيايشياندايە خەڵكى بازاڕن يان دەليلى رێگان؟ (واتە بەزۆر براون) پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووى: بەرودوايان رۆدەچن لەپاشدا زيندو دەكرێنەوە هەركەس لەسەر نيازى خۆى.

خوايە نيازمان پاك خاوێن كەيتەوە بۆ رەزامەندى خۆت لەهەموو كردارو گوفتارێكماندا ! مەبەستمان رەزامەندى تۆبێت...هتد امين.

---

[1] الاربعين النووية فەرموودەى /١٩.

[2] رياض الصالحين فەرموودەى /٩.

[3] رياض الصالحين باب الاخلاص٢.

## ( ٦ ) ترس و تەما ( الخوف والرجاء ):

(الخوف والرجاء) (ترس و تەما) دوو زاراوەن پێویستە هەموو موسڵمانێك بیانزانێ و لەقورئاندا پێكەوەهاتوون چونكە تەواوكەری یەكترن و لازم مەلزومن و پێكەوە بەستراون و باوەڕی هیچ كەس تەواو نابێ تا ئەم دووحاڵەتەی تیانەبێ، وە ئەم دوو حاڵەتە یەكێكە لەپلەو مەقامی ڕێبوارانی ڕێگای خوایی و دەروێزەن ، بۆچوونە ژوورەوەیان ئەوەتا خوا لەقورئاندا لەوەسفی باوەڕداراندا دەفەرموێ: ﴿تتجافى جنوبهم عن المضاجع يدعون ربهم خوفاً وطمعاً ومما رزقناهم ينفقون﴾ السجدة:١٦.

واتە: باوەڕداران بەئایەتەكانی خوا، حاڵیان وەهایە لاتەنیشتەكانیان بەرزدەبێتەوە لەجێگەی خەوی كاتی شەوی شیرین خەودا، لەخوا دەپاڕێنەوە هەم لەترسی دۆزەخ، هەم بەتەمای بەهەشت وەلەو ماڵ و سامانەی پێمان بەخشیون خێردەكەن. یان لەوەسفی بنەماڵەی(زكریا) پێغەمبەردا(عليه السلام) دەفەرموێ: ﴿انهم كانوا يسارعون في الخيرات ويدعوننا رغباً ورهباً...﴾ الانبياء :٩٠.

واتە: بەڕاستی ئەوان پێشبڕكێیان دەكرد لەچاكەكاریدا وەلەئێمە دەپاڕانەوە هەم بەهیوای بەهەشت و خۆشی دوارۆژ، هەم لەترسی دۆزەخ و سزای سەختی دوارۆژ.

لەم دوو ئایەتەدا جارێك(خوف) پێشخراوە بەسەر(رجاء)دا جارێكی تر بەپێچەوانەوە، بەڵام ئەمڕۆ وەك ئیمامی غەزالی دەفەرموێ: (زەمانێكە پێویستە هۆكارەكانی (رجاء)زۆر باس نەكەین بۆ خەڵكی دەبێ زۆر بیانترسێنین چونكە ئەوەندە لەڕێگا ترازێنراون زۆر ترساندیش نایانگێڕێتەوە سەر ڕاستە شەقام، بۆیە وەها كۆمەڵێك ئەگەر زۆر باسی(رجاء)و ڕەحمەتی خوایان بۆ بكرێت لەوانەیە بەیەكجاری تیابچن و زیاتر ڕۆبچن لەتاواندا.

باسی(رجاء)و ڕەحمەت لەگەڵ كۆمەڵی تاوانباراندا وەك هەنگوین وایە بدرێت بەكەسێكی تادارو لاشەگەرم لەوانەیە بۆی ببێتە ژەهرێكی كوشندە بەڵام هەر ئەو هەنگوینە ئەگەر بدرێ بەكەسێكی لاشە ساردوو لەرزگرتووە بۆی دەبێت بەشیفا.

لەبەر ئەمە پێویستە مامۆستای ئامۆژگاری كار زۆر بەوردی و نەرم و نیانی تەماشای نەخۆشینەكان بكات، بەرانبەر هەموو نەخۆشینێك دەرمانێك بەكاربهێنێ بنەبڕی بكات نەك پەرەی پێبدات چونكە مەبەست لەئامۆژگاری گرتنی ڕێگای مام ناوەندییە لەڕەوشت و خودا، وەباشترین كار ئەوەیە مام ناوەندی بێت !!

بۆیه ئێمه‌یش له‌م وتاره‌دا زیاتر جه‌خت ده‌كه‌ین له‌سه‌ر ئه‌و ئایه‌ت و فه‌رموودانه‌ی ترسی خوا له‌ده‌روونماندا زیندووده‌كاته‌وه‌، كۆتایی بابه‌ته‌كه‌ش به‌باسی(رجاء)و ره‌حمه‌تی خوادێنین انشاء الله :

یه‌كه‌م/ خوا ده‌فه‌رموێ:﴿فأما من طغى واثر الحياة الدنيا فأن الجحيم هي المأوى ﴾

واته‌: هه‌ركه‌س له‌خوایاخی ببێت و ژیانی دنیای به‌لاوه‌ له‌پێشتر بێت له‌قیامه‌ت ئه‌وه‌ به‌ڕاستی دۆزه‌خ جێگایه‌تی.

﴿واما من خاف مقام ربه ونهى النفس عن الهوى فأن الجنة هي المأوى ﴾ نازعات: ٣٧ . ٤٠

واته‌: هه‌ركه‌س بترسێ له‌و ڕۆژه‌ی له‌به‌رده‌م خوادا ده‌وه‌ستێ و نه‌فسی خۆی بگرێته‌وه‌ له‌ئاره‌زووپه‌رستی ئه‌وه‌ به‌ڕاستی به‌هه‌شت جێگایه‌تی له‌شوێنێكی‌تردا ده‌فه‌رموێ:﴿فليحذر الذين يخالفون عن امره ان تصيبهم فتنة او يصيبهم عذاب اليم ﴾ النور:٦٣.

واته‌: بابترسن ئه‌وانه‌ی له‌فه‌رمانی خوا ده‌رده‌چن ، له‌وه‌ی له‌دنیا تووشی به‌لایه‌كی سه‌خت بن یان له‌پاشه‌ڕۆژدا تووشی سزایه‌كی سه‌خت بن.

موسڵمان ئه‌گه‌ر بووردی بیربكاته‌وه‌ له‌تواناو ده‌سه‌لات و جه‌به‌روتی خوا ناتوانێ گوناه بكات و له‌فه‌رمانی ده‌ربچێت، به‌لام گوناه كردن هه‌ر له‌زه‌مانی باوكه‌ ئاده‌مو دایكه‌ حه‌واوه‌ له‌چاره‌ی بنیاده‌م نوسراوه‌، هه‌رده‌بێ گوناه بكه‌ین، به‌س گرنگ ئه‌وه‌یه‌ زوو به‌خۆماندا بچینه‌وه‌و به‌رده‌وام نه‌بین له‌سه‌رتاوان، به‌ترسی خواو به‌ فرمێسكی چاوان شوێنه‌واری گوناهه‌كان بسڕینه‌وه‌، هه‌ركه‌س زیاتر خوابناسێ زیاتر لێی ده‌ترسێ وه‌ك پێغه‌مبه‌ر(ﷺ) ده‌فه‌رموێ: (والله اني لأخشاكم لله واتقاكم )[1] واته‌: سوێند به‌خوا من له‌هه‌مووتان زیاتر له‌خواده‌ترسم و خۆم له‌سزای ده‌پارێزم . چونكه‌ ئه‌و له‌هه‌موو كه‌س زاناتر بوو به‌خوا.

هه‌روه‌ها خواده‌فه‌رموێ:﴿انما يخشى الله من عباده العلماء ...﴾ فاطر:٢٨ واته‌: ئه‌وه‌ی زیاتر له‌خوابترسێ زاناكانه‌ واته‌ ئه‌و زانایانه‌ی یاد له‌گه‌وره‌یی و ده‌سه‌لاتی خواده‌كه‌نه‌وه‌، نه‌ك ئه‌وانه‌ی ته‌نها به‌دنیازانابن.

غه‌زالی(ره‌حمه‌تی خوای لێبێت) ده‌فه‌رموێ: هه‌ركه‌س به‌ته‌واوی خوای ناسی به‌ته‌واوی لێی ده‌ترسێ، ئه‌و ترسه‌ دڵی ده‌سوتێنێ، پاشان شوێنه‌واری ئه‌و ترس و كڵپه‌ ده‌رده‌كه‌وێ له‌سه‌ر لاشه‌و له‌سه‌ركرده‌وه‌؛ لاشه‌ لاوازو زه‌رد ده‌بێ، ده‌گری و ده‌ناڵێ، ئه‌ندامه‌كانیش ده‌وه‌ستن له‌گوناه خۆ به‌ند ده‌كه‌ن به‌خواپه‌رستی‌یه‌وه‌ بۆئه‌وه‌ی قه‌ره‌بووی ڕابوردوو بكه‌نه‌وه‌و خۆیان ئاماده‌كه‌ن بۆ داهاتوو، بۆیه‌ وتراوه‌: له‌خواترس ئه‌وكه‌سه‌ نی‌یه‌ بگری و چاوی بسڕێ، به‌ڵكو ئه‌وكه‌سه‌یه‌ واز له‌و كرده‌وانه‌ بهێنێ سبه‌ینێ سزای له‌سه‌ر ده‌درێ.

---

[1] المغني على الاحياء: ١٤٥/٤.

(ابو القاسم ی حکیم) دەیفەرموو: هەرکەس لەشتێ بترسێ رادەکات لێی هەرکەس لەخوا بترسێ ڕادەکات بۆ لای [1].

بەڵێ گریانێك سوودی هەیە بمانگێڕێتەوە بۆلای خواو دەست بەرداری گوناهمان بکات، ئەو گریانە پێغەمبەر(ﷺ) مژدە دەدات بەخاوەنەکەی یەکێکە لەوحەوت کەسەی خوای گەورە دەیانخاتە ژێر سێبەری خۆی لەڕۆژێکدا هیچ سێبەرێك نی‌یە جگە لە سێبەری خوا (...ورجل ذكر الله خالياً ففاضت عيناه )واتە: حەوتەم کەس پیاوێکە بەتەنیا خەریکی یادی خوایە هەردوو چاوی فرمێسکی لێ هەڵ دەنیشێ.

هەروەها دەفەرموێ: (لايلج النار أحد بكى من خشية الله حتى يعود اللبن في الضرع) أخرجه الترمذي وقال حديث حسن صحيح والنسائي وابن ماجه[2].

واتە: ناچێتە دۆزەخ کەسێك گریابێت لەترسی خوا .

وقال(عقبه بن عامر) ما النجاة يا رسول الله؟

قال أمسك عليك لسانك ، وليسعك بيتك وابكِ على خطيئتك )[3] .

واتە: عوقبەی کوڕی عامر پرسی: بەچی سەرفراز دەبین ئەی پێغەمبەری خوا؟

فەرمووی: زمانت بگرە، بالەماڵەکەیشتدا جێگەت بێتەوە، واتا زۆر مەگەڕێ بێهودە . وەبگری لەسەرتاوانەکانت.

ئەبوبەکری صدیق دەیفەرموو: هەرکەس دەتوانێ بابگری ئەگەر نەیتوانی بابە زۆر خۆی بگرێنێت.

(محمدی کوڕی منکدر) هەرکات دەگریا لەترسی خوا، فرمێسکی چاوی دەهێنا بەڕوومەت و ریشی‌دا دەیفەرموو: بیستوومە ئاگر شوێنێ ناسوتێنێ فرمێسکی بەرکەوتبێ .

عبدالله کوڕی عومەر دەیفەرموو: ئەگەر یەك فرمێسك لەترسی خوا بڕێژم بەلامەوە ، خۆشترە لەوەی هەزار دینار بکەم بەخێر.

دوای ئەم گریان و فرمێسکە لەبیرمان نەچێت هەرچەند ئێمە گوناهبارین نابێ لەڕەحمی خوا نائومێد بین دەبێ رەجامان بەلێبوردنی ئەو بەهێز بێت ، چونکە ئەمین بوونەوە لەسزای خوا کوفرە، نائومێد بوونیش لەبەزەیی خوا هەر کوفرە خۆی دەفەرموێ: ﴿ورحمتي وسعت كل شئ﴾واتە: بەزەیی من هەمووشتێکی گرتۆتەوە ، تەنها کافر بێبەشە لەبەزەیی خوا لەقیامەتدا نەك لەدنیا.

---

[1] احياء علوم الدين : ٤/١٥٠ ، ١٥١.

[2] المغني على الاحياء: ٤/١٥٢.

[3] المغني على الاحياء: ٤/١٥٢.

کۆتایی باسەکە دێنم بەم ئایەتەی قورئان: ﴿قل یاعبادي الذین اسرفوا علی انفسهم لاتقنطوا من رحمة الله ، ان الله یغفر الذنوب جمیعاً انه هو الغفور الرحیم ﴾ الزمر:٥٣.

واتە: ئەی ئەو بەندانەی من کەزوڵمتان کردووە لەنەفسی خۆتان، نائومێد مەبن لەبەزەیی خوا بەڕاستی خوا لەتاوانەکان هەمووی دەبورێ بەڕاستی خوا زۆر لێبوردەو بەبەزەیی‌یە.

ئیتر هەتا جارێکی‌تر لەباسێکی‌تردا بەخواتان دەسپێرم خواتان لەگەڵ.

## ( ٧ ) چرای تەقوا :

قورئان چەندین ناوی هەیە وەك (کتاب ، نور ، فرقان) فورقان واتە: جیاکەرەوەی راستی لەناڕاستی، هەق لەبەتاڵ دانانی ئەم ناوەیش بۆ قورئان ئەوە دەگەیەنێ تەنها قورئانەکەی خوایە بتوانێت ئەو سنوورو پەرژینە دیاری بکات و مرۆڤەکان لەسەرگەردانی سەرفراز بکات، بۆیە هەرکەس بەدڵسۆزی دوای ئەو قورئانە بکەوێت بەجوانی ڕێنمایی‌یەکانی وەربگرێت ئیتر نەترسێ لەوەی وێڵ و چەواشە ببێت، هەرکەسیش قورئانی نەکردە پێشەواو چرای خۆی مسۆگەر سەرگەردان دەبێت.

دواکەوتنی قورئانیش بەدڵسۆزی بەوەدەبێت شوێن پێی ئەو پێغەمبەرە خۆشەویستە(ﷺ) هەڵگرین کەفرستادەی خوابووەو قورئان بۆ سەردڵی ئەو نازڵ بووە.

دواکەوتنی قورئانیش بەوە دەبێت لەناو جەنجاڵ و کێبەرکێی یاسا دەسکردەکانی ئەم زەمان و جیهانەدا وێڵ نەبین و بەچاوی ئیمان بڕوانینە ئەو نوورە پاکەی محمد(ﷺ) هەڵیکردووە تەنها ئەو بەڕۆشنایی بزانین بۆ سەرفرازبوونمان لەتاریکستانی دنیاپەرستی و بیکەینە کەشتی ڕزگاری بۆ دەربازبوونمان لەگێژاوو شەپۆلە قورسەکانی ناو دەریای پڕ لەفیتنەو ئاشووبی ئەم زەمانە کەبەڕاستی کەم کەس لێی دەرباز دەبێت و دەگاتە کەناری ئەمان.

پێغەمبەر(ﷺ) باشترین تەرجمانی قورئان بووە وەك عائیشە دەربارەی دەفەرموێ: (کان خلقه القران)جوانترین راڤە و تەفسیری قورئانی کردووە بەوتەو بەکردار.دوای وەفاتی پێغەمبەریش قورئان و فەرموودەکانی پێغەمبەر(ﷺ) کەلەپووری پیرۆزی ئەون و لەجێی خۆی داینـاون بۆ ئوممەتەکەی و فەرموویەتی: (ترکت فیکم ما ان تمسکتم به لن تضلوا بعدي ابداً کتاب الله وسنتي).

واتە: دوشتم لەناودا جێ هێشتوون گەر بەجوانی دەستیان پێوە بگرن قەت گومڕا نابن نامەکەی خواو فەرموودەو ڕەوشتەکانی خۆم .

بۆیە ئامۆژگاری و وەسێتی ئەم هەفتەیەم بۆ خۆیشم و بۆ ئێوەی بەڕێزیش ئەوەیە:

(كە ئەمڕۆ ئێمە كەوتوینە ناو گێژاوی فیتنەی زەمانەو ڕۆژەكەمان ئەو ڕۆژەیە پێغەمبەر(ﷺ) دەربارەی دەفەرموێ:(ان من اشراط الساعة ان يُرفع العلم ويظهر الجهل ويفشو الزنا وتشرب الخمر، ويكثر النساء ويقل الرجال ، حتى يكون لخمسين امراة قيم واحد) رواه الترمذي / التاج: ٥/٣٣٥ باب الفتن .

واتە: لەنیشانەكانی قیامەتە كەزانستی نەمێنیّو نەزانی بڵاوە بكاتو زینا زۆرو ئاشكرا ببێتو ، ئافرەت زۆر ببیّ و پیاوكەم ، تەنانەت وای لیّبێت پەنجا ئافرەت یەك سەرپەرشتیاری پیاویان هەبیّ.

ئەمڕۆ تەنها بەپەنا بردنمان بۆ قەڵای ئیمانو تەقوا دەتوانین دەرباز بین لەدەس ئەم فیتنە بارانە . دەخیلتان بم ئیمانەكەتان بپارێزن دووربن لەگوناه، دووربن لەگوناه ! گەر گوناهتان كرد زوو تەوبە بكەن ، بەشاپیۆی فرمێسك و گریان و خێركردن شوێنەواری ئەو گوناهە لەدڵتان بشۆنەوە ؛ چونكە گوناه هەركات كەڵەكەی كردو زۆر بوو ڕووبەری دڵ دادەگریّو دڵ ڕەش دەبیّ، كە دڵیش ڕەش بوو ئیتر هەقو ناهەق لەیەك جیا ناكاتەوە، ئامۆژگاری وەرناگرێت، لەبەرد ڕەقتر دەبێت ﴿ثم قست قلوبكم من بعد ذلك فهي كالحجارة او اشد قسوة ﴾البقرة : ٧٤.

واتە: دوای ئەوە دڵەكانتان ڕەق بوو وەك بەردی لێهات، بەڵكو ڕەق تر لەبەرد.

بەڵیّ دڵێك تاوانی چەشتو تێكلاّو بەحەرام بوو وەك ئاوێكی لێڵی لیّ دیّ وەك ئاوێنەیەكی چڵكنو پڕ لەپەڵەی ڕەشی لێدیّ ئیتر هیچی تیادەرناكەویّ بۆیە خاوەنەكەیشی وێڵ دەبیّ، سەرگەردان دەبیّ ، وەك دووربینی هەڵاوگەڕاو نزیك بەدوور دەبینیّ ، دۆستو دوژمنی خۆی ناناسێت ؛ هەق بەناهەق دەبینیّو ناهەق بەهەق ، بەیانی تائێوارە لەگەڵی بدوێی لەبۆچوونی خۆی دانابەزیّ لەخەوی غەفڵەتو سەرخۆشبوونی بەدنیاوە بێدار نابێتەوە، مەگەر بەتەپڵی ئەجەلو دیتنی ئامێرەكانی گیانكێشانی دەستی حەزرەتی(قابض)خۆ ئاگادار بوونەوەیش لەوكاتەدا جگە لەئاهی ساردو پەشیمانی قووڵ ـ بەقووڵایی تاوانەكانی ـ هیچ دادی نادات و سوودی بۆی نابێت !!

بەڵام هەر دڵێك ئالوودەی خواپەرستی بووبێت، شیرینی ئیمانی چەشتبیّ ، تامی تەقواو بۆنی عەترینی پەرستشەكانی هەڵمژبیّ ، ئەو دڵەیە دەبیّ بەعەرشی خوا، ڕاستی لەناڕاستی جیادەكاتەوە، هەرچەند فیتنەی زەمانە زۆر بێت ، هەرچەند ئاسمانی ژیان پڕ لەهەوری تارو ڕەش بێت ؛ هەرچەند بەچكەكانی شەیتان ڕووبەری زەوی دابگرنو لەهەر كوچەو جادەیەكدا دەیان سەنگەریان دانابێت ، بۆ وێڵكردنی نەتەوەی (محمد) (ﷺ) ؛ هەرچەند شەپۆلەكانی دەریای فیتنە پڕ لەمەترسی بێتو گێژەڵووكەی ناو دەریا ڕۆژانە دەیان كەشتی نوقم بكات ؛ بەڵام خاوەنی ئەو دڵانەی پڕ لەتەقوان وێڵ و سەرگەردان نابن ؛ بەفریوی زەمانە هەڵنا خەڵەتێن ، بەتەپڵو ئاوازی

شەیتان هەڵناپەڕن ، دنیا لەلایان کاوبایە ، خۆیان بەغەریبو ئاوارە دەزانن چونکە ئادەمی باوکیان دەرکرا کاتێ هاتە سەر ڕووی زەمین ، دیارە مرۆڤی ئاوارەیش ناسرەوێ تانەگەڕێتەوە نیشتمانی ڕاستی خۆی خاوەنی ئەو دڵانە، ئەوکەسانەن خوا دەربارەیان دەفەرموێ: ﴿یا ایها الذین امنوا ان تتقوا الله یجعل لکم فرقاناً... ﴾ الانفال : ٢٩.

واتە: ئەی باوەڕداران ئەگەر لەخوا بترسن و تەقوای بکەن خوا فورقانتان پێدەبەخشێ ئیتر وێڵ نابن .

بەڵێ ئەوانەن خوا دەربارەیان دەفەرموێ: ﴿یا ایها الذین امنوا اتقوا الله وامنوا برسوله یؤتکم کفلین من رحمته ویجعل لکم نوراً تمشون به ویغفر لکم والله غفور رحیم ﴾ الحدید :٢٨.

واتە: ئەی باوەڕداران تەقوای خوا بکەن‌و باوەڕ بەپێغەمبەرەکەی بهێنین خوا دوقات ڕەحمەتی خۆیتان بەسەردا دەرژێنێ‌و ، نورێکتان پێدەبەخشێ پێی بڕۆن‌و ڕێگای پێدەرکەن ، لەتاوانەکانیشتان دەبورێت ، خوا زۆر لێبوردەو خاوەن بەزەیی‌یە.

ئەوانەیش کەخاوەنی ئەم تەقوان پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەفەرموودەیەکیدا سێ نیشانەی بۆ دیاری کردوون کەدەفەرموێ: (ثلاث من کن فیه وجد حلاوة الایمان : أن یکون الله ورسوله أحب الیه مما سواهما ، وان یحب المرء لایحبه الا لله ، وان یکره ان یعود في الکفر کما یکره أن یقذف في النار) مختصر مسلم /٢٢.

واتە: سێ‌شت هەن هەرکەس ئەوسیانەی تیابوو شیرینی ئیمانی چەشتووە : دەبێ خواو پێغەمبەری خوای لەهەموو کەس لاخۆشەویستربێت ، دەبێ ئەگەر کەسێکی خۆشویست تەنها لەبەرخوا خۆشی بوێ، دەبێ پێی ناخۆش بێت بگەرێتەوە بۆ کوفر وەك چۆن پێی ناخۆشە فڕێبدرێتە ئاگر.

خوایە لەبەرخاتری ناوە جوانەکانی خۆت دڵمان بەنووری خۆت نوورانی بکەو هەق‌و ناهەقمان پێبناسێنە.

خوایە تەوفیقمان بدەیت دوای هەق بکەوین کۆمەکی هەق بکەین لەگەڵ هەق خوازان بین !

خوایە لاماندەیت لەزوڵم‌و زاڵمان ، لەناهەقی‌و ناهەق خوازان، خوایە لەم دنیایاری ئەوان نەبین‌و لەو دنیایش لەگەڵ ئەوان حەشر نەبین ...امین

## ( ٨ ) پەیمان پارێزی :

یەکێك لەو ڕەوشتە بەرزانەی ئاینی ئیسلام زۆر گرنگی پێداوەو ئایەت‌و فەرموودەی زۆر لەسەر هاتووە پاراستنی عەهدو پەیمانە وەك خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿والذین هم لاماناتهم وعهدهم راعون ﴾ المؤمنون/٨

واتە: ئەوانەی کەپارێزگاری سپاردەو پەیمانەکانیان دەکەن ، هەر ئەم ئایەتە جارێکیتر لەسوورەتی(معارج) دا دووبارە بووەتەوە.

(ابوحیان) دەفەرموێ: ئایەتەکە ئەوە دەگەیەنێ مەبەست بەپاراستنی ئەمانەت گشتییەو ئەو سپاردانەیش دەگرێتەوە لەنێوان خواو بەندەکانیدایەو ئەوەیش کەلەنێوان دووکەسدا هەیە لەسپاردەو بەڵێنەکان[1].

دەربارەی شکاندنی پەیمانی نێو دووکەس ئەم فەرموودەی پێغەمبەرمان (ﷺ) بەسە کەدەفەرموێ: (اربع من کن فیه کان منافقاً خالصاً ومن کانت فیه خصلة منهن کانت فیه خصلة من النفاق حتی یدعها : اذا حدث کذب ، واذاؤتمن خان ، واذا عاهد غدر واذا خاصم فجر ) رواه الشیخان.

واتە: چوار خوورەوشت هەن هەرکەس ئەوچوارەی بەکۆتێدابوو ئەوە دووڕوییەکی تەواو بێپەردەیە ، هەرکەسیش تەنها یەکێکیانی تێدابێت ئەوە رەوشتێکی دووڕووی تێدایە هەتا وازی لێدێنێ هەرکات قسەیکرد درۆی تێدا بکات گەر ئەمانەتی لادانرا خیانەتی لێبکات ، گەر بەڵێنی دا غەدری لێ بکات ، گەر دەمەدەمی کرد، قسەی ناشیرین بکات و جنێوبدات شکاندنی بەڵێن یەکێکە لەگوناهە گەورەکان، چونکە پاراستنی بەڵێن بەرپرسیاریە وەك قورئان دەفەرموێ: ﴿واوفوا بالعهد ان العهد کان مسؤولاً﴾ واتە: وەفا بکەن بەبەڵێن بەراستی بەڵێن پرسیاری دەربارە دەکرێت ، بەڵێن ئەوەندە گەورەیە بناغەی دینو ئاین لەسەر بەڵێن دامەزراوە ، چونکە هەموو موسوڵمانێك بەوشەی شایەتمان دینو باوەڕی دەردەبڕێ (اشهد ان لا اله الا الله واشهد ان محمدا رسول الله) واتە: شایەتی دەدەم هیچ خوایەکی بەهەق نیە جگە لەزاتی پاکی (الله) و شایەتی دەدەم محمد پەیام بەری خوایە ، ئەم وشە بۆ خۆی ئیقرارو دانپیانانو ملکەچ بوونە بۆ خواو پێغەمبەرەکەی ، ئەویش گەورەترین پەیمانو بەڵێنەو، واتاکەی زۆر بەروونی ئەوە دەگەیەنێ هەرکەس ئەم شایەتمانەی هێنا ئیتر دەبێ سەجدە تەنها هەر بۆ خوابباتو قورئانەکەی ئەو بەرێباز بزانێتو هەر محمدیش بەمامۆستای خۆی بزانێت بناغەی دەوڵەتی ئیسلامی هەر لەسەر پەیمان بەستراو دامەزرا، وەك لەپەیمانی(عقبە)ی دووهەمدا پێغەمبەر(ﷺ) لەگەڵ ئەوسو خەزرەجدا پەیمانی بەست ئەگەر کۆچیکرد بۆناویان دەبێ بیپارێزن وەك چۆن ماڵو منداڵی خۆیان دەپارێزنو ، دەبێ گوێڕایەڵی بکەنو ماڵ سامانی لەپێناودا بەخت کەن لەخۆشیو ناخۆشیدا ، دەبێ لەلۆمەی لۆمەکاران نەترسن ئەوانیش ئەم بەڵێنەیان داو دەستیان خستە ناو دەستی موبارەکی پێغەمبەر(ﷺ)[2] .

---

[1] صفوة التفاسیر : المؤمنون:٨.

[2] الرحیق: ١٣٤ ـ ١٣٦.

بناغـەی خـێزان لەسـەر پـەیمان دروسـت دەبـێ کـاتێ خوازبێنـی ئـافرەتێ دەکرێـتو کەسوکارەکەی بەڵێن دەدەنو دواتر خێزانێك پێکدێ.

بەکورتی هـەرچی کارو کردەوە هەیە لەسەر بەڵێنو پەیمان راوەسـتاوە بۆیـە بـەڵێن پـارێزی نیشانەی دینـداریو مەردایەتییەو هەرکەس بەڵێن پارێز بوو جێگای متمانـەی خـەڵکی دەبـێو خۆشیان دەوێو بەچاکە باسی دەکەن ، بەلام هەرکەس خاوەنی قسەی خۆی نەبوو ئەوە لەناو خەڵکدا ریسوا دەبێو لەقیامەتیشدا پێغەمبەر(ﷺ) دەربارەی دەفـەرموێ: (لکل غـادر لـواء یـوم القیامة یقال هذه غدرة فلان ابن فلان) رواه مسلم.

واتە: هەموو کەسێکی غەدرکار لـەرۆژی قیامـەتد ئالأیـەکی بۆ بەرزدەکرێتـەوەو هـاوار دەکرێت ئەمە غەدری فلأنی کوڕی فلأنە.

ئەمجا ئەوەیش بزانە پەیمان پارێزان خواناوی بردوون بە(اولو الالباب) .

واتە: خاوەنی عەقڵو ژیریو موژدەی بەهەشتیان دەداتێ.

وەك قورئان دەفـەرموێ: ﴿انمـا یتذکـر اولـوا الالبـاب،الذیـن یوفـون بعـهد الله ولاینقضـون المیثاق ﴾ الرعد : ١٩ ـ ٢٠.

واتە: بیروهۆش ناکەنەوە مەگەر ئەوانە کەخاوەنی عـەقڵو هۆشـن ، ئەوانـەیش ئەوانـەن کـەوەفا دەکەن بەبەڵێنەکانی خواو عەهدو پەیمان ناشکێنن.

هـەتا لـەکۆتایی ئایەتـەکاندا مـوژدەی بەهەشـتی یـان دەداتـێو دەفـەرموێ لەبەهەشـتدا پێیـان دەوترێ (سلام علیکم بما صبرتم فنعم عقبی الدار ﴾

واتـە: سلأوتان لەسـەر بـەهۆی صـەبرو خۆگریتانـەوە بەراسـتی پاشە رۆژتان زۆرچاك و جـوان بوو.

لەولایشەوە هەڕەشەی توند دەکات لەوانەی بەڵێن دەشـکێنن کەدەفـەرموێ: ﴿والذین ینقضـون عهد الله من بعد میثاقه ویقطعون ما امر الله به ان یوصل ویفسدون في الارض اولئك لهم اللعنة ولهم سوء الدار ﴾ الرعد: ٢٥.

واتە: ئەوانەی عەهدو پەیمانی خوا دەشکێنن دوای بڕیار لەسەردانی ، سیلەی رەحم دەبچڕنو گێرەشێوێنی ئەکەن لەزەویدا، ئەوانە نەفرینیان لێکراوەو خراپترین مەنزڵ جێگایانە کەدۆزەخە.

پـەیمان پـارێزی خۆگـری دەوێ دان بـەخوداگرتنی دەوێ، سـەرمابوونو گـەرمابوونو برسیبوونو تینوبوونی دەوێ بۆیە مەردی دەوێو بەنامەرد ناکرێت ، زۆرجار لـەپێناو بەڵێنێکدا خاوەن بەڵێن سەروو ماڵی دادەنێ بەلام بەڵێن ناشکێنێ.

لەغەزای ئوحودا پێغەمبەر(ﷺ) شمشێرێکی بڕنـدەی بـەرزکردەوەو فەرمووی: (من یـاخذ هـذا السیف بحقه ؟) واتـە: کێ ئـەم شمشـێرە وەردەگرێـت بەهـەقی خـۆی ؟ چـەند کەسـێك هەسـتان

(علی)کوڕی (ابو طالب) (زبیر)ی کوری (عوام)، (عومەر)ی کوری (خطاب) هەتا (ابو دجانە سماك)ی کوری (خرشة) هەستاو وتی: هەقی ئەو شمشێرە چییە ؟ئەی پێغەمبەری خوا فەرموی: هەقەکەی ئەوەیە بیمالّی بەرووخساری دوژمندا هەتا خواردەبێتەوە، وتی: دەی مـن وەریدەگرم بەهەقی خۆی ، هەر لەوجەنگەدا کاتێ موسوڵمانان تێکشکاو کافران گەمارۆی پێغەمبەریان داو خەریك بوو دەستیان پێی بگات تەنها نۆکەسی بەدەورەوەمابوو یەکی لەوانە(ابو دجانە) بوو کەپشتی خۆی کرد بەقەلّغان بۆ پێغەمبەر(ﷺ) تیر لەدوای تیردەیدا لەپشتی ، پشتی نەجولاّن تاشەهید بوو ...!!

هەروەها خوای گەورە لەوەسفی _اسماعیل) پێغەمبەردا (علیه السلام) دەفەرموێ: (انه كان صادق الوعد وكان رسولاً نبياً﴾ مريم : ٥٤.

واتە: بەراستی راست بوو لەبەلّێنەکانیدا (لەم بوارەدا پێویستە ئامارژە بەوەیش بکەین ئەگەر کەسێك بەلّێنی شتێکی‌دا بەکەسێکی‌ترو لەناخی دەروونیدا بەتەمابوو راستی لەگەڵ بکات ، بەلاّم رێگرێك هاتە رێگای‌و توانای نەبو وەفا بکات بەو وەعدە ؛ ئەوە بەر ئەم هەڕەشە ناکەوێت‌و نابێتە دووڕوو هەرچەند لەڕوالّەتدا یەکێکە لەوچوارکەسە ، بەلاّم پێویستە هەتا دەتوانێ بەڕوالّەتیش خۆی نەخاتە رێزی ئەوانەوەو ئاگای لەوەعدەکانی بێت) احياء العلوم /١٢٦/٣.

دەی برای موسوڵمان تۆیش بەلّێنت بەخوا داوە شایەتمانەکەت بەلّێنە ، بەلّێنەکانی رەمەزانت بەلّێنە ، هاتووچۆی مزگەوتت بەلّێنە فیتنەی زەمانەیش گەمارۆی داوین وەك گەمارۆی کافران بۆ پێغەمبەر(ﷺ) لەرۆژی (احد)دا تۆیش (ابو دجانە) ئاساو ، ئەنصار ئاسا پشتی پێغەمبەر(ﷺ) بەر نەدەیت، پشتی دینەکەت بەرنەدەیت، بەلّێنەکانی رەمەزانت نەشکێنی دینەکەت نەدۆڕێنی ، بەلّکو سبەی رۆژ بەڕوویگەشەوە بچیتە خزمەتی پێغەمبەرەکەت لەسەر حەوزی کەوسەر.

خوایە شادمان کەیت بەدیداری پێغەمبەر لەسەر حەوزی کەوسەر ، خوایە لەگوناهی دایك‌و باوکمان‌و مردوانمان ببوریت شیفای نەخۆشەکانمان بدەیت ...امین

## ( ٩ ) ئەمانەتپارێزی :

خوای گەورە لەقورئاندا دەفەرموێ:﴿والذين هم لاماناتهم وعهدهم راعون ﴾ واتە: ئەو موسڵمانانەی کەپارێزگاری سپاردەو عەهدو پەیمانەکانیان دەکەن ئەوانە بەختەوەری دنیاو قیامەتن، وەك لەسەرەتای سوورەتەکە دەفەرموێ:﴿قد افلح المؤمنون الذين هم ...الخ ﴾

سپاردە پارێزی لەهەموو دینە ئاسمانی‌یەکان‌و لای هەموو کەسێکی بەویژدانیش نیشانەی پاکی‌و ساغی ئینسانە ، بەپێچەوانەیشەوە گزی‌و دزی لەئەمانەت نیشانەی ناپاکی‌و نادادی‌و دەروون پیسی‌یەو هەر کۆمەلّێکیش ئەمانەتی نەپاراست چاوەڕوانی فەوتانی بە، بەلّکو گەر ژیان

ئەمانەتی تیا نەما بەتەمای قیامەت بە، وەك پێغەمبەرمان(ﷺ) دەفەرموێ: (اذا ضُيعت الامانة فانتظر الساعة )واتە: هەركات ئەمانەت زايەكرا چاوەڕوانی قیامەت بە وتیان: یارسول الله (وكيف اضاعتها ؟ زايەكردنی ئەمانەت چۆنە ؟

ئەویش فەرمووی: (اذا وسد الامر الی غير أهله فانتظر الساعة ).

واتە: ئەگەر كارو بار سپێردرا بەكەسێكی نەشیاو بۆئەو كارە ، ئەو چاوەڕوانی قیامەتبە.

ئەم فەرموودە ئەوە دەگەیەنێت كە ئەمانەت بریتی نیە تەنها لەماڵو سامانێك كەدادەنرێ لای كەسێك وەك هەندێ كەس وای تێدەگەن ، بەڵكو ئەمانەت جۆری زۆرە ، هەرشتێك كەوتە لاتو خاوەنەكەی لێت ئەمین بوو بەڵام تۆ دیارنەبوونی ئەوت بەهەلزانی بۆ بەكارهێنانی ئا رەزووی خۆت لەوشتەدا ئەوە گزیو دەسدرێژییە .

بۆ نموونە: سەیارەیەك لەماڵتا دانرا بەئەمانەتو بەبێ مۆڵەتی خاوەنەكەی بەكارت هێنا خیانەتە.

مامۆستای ناوەندیو ئامادەیییان زانكۆ بوویت ، خەڵكی كچۆڵەكانی دەنارده بەردەستت بۆ فێربوون بەڵام تۆ بەچاوی خراپ تەماشات كردن، یان وانەكانت بەجوانی پێنەوتن ئەوە خیانەتە.

بەڕێوەبەری دەزگایەك یان فەرمانگایەك دەوڵەت ئەمانەتی ئەو شوێنەی پێ سپاردووەو ئەویش بەرتیل دەخواو خزمو دۆستەكانی خۆی پێشدەخاتو ئیفادو پارەی زیاد هەر بەوان دەدات ئەوە خیانەتە.

مامۆستایەكی مزگەوت پرسیارێكی شەرعی ڕووی تێدەكات بەنەزانی جواب دەداتەوە یان فتواكانی لاردەكاتەوە بۆ رەزامەندی گەورە پیاووكار بەدەستەكان، یان درێغی لەوتارو ئامادەبوونی نوێژەكان دەكات خیانە تەلەئەمانەت ، شوانێك لەدەشتو چیایەكدا مەڕو بزنەكانی برسی دەكاتو لەكاتی پێویستدا نایانباتە سەر ئاو خیانەتە لەئەمانەت،ئەمانەو چەندین نموونەی تریش كەلەژمارە نایەن ، پێویستە هەركەس لەهەر لایەكدا بوو ترسی خوای گەورە لەدڵیدا بچێنێو مەبەستی تەنها رەزامەندی ئەوبێت، رەزامەندی كەس پێش رەزامەندی خوا نەخات ، ئەوسابەجوانی دەتوانێ پارێزگاری ئەمانەت بكات .

لەم وتارەیشدا جێگای خۆیەتی دوپاتی ئەو فەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ) بكەینەوە: (اربع من كن فيه كان منافقاً خالصاً ، ومن كانت فيه خصلة منهن كانت فيه خصلة من النفاق حتى يدعها اذا اؤتمن خان ، واذا حدث كذب ، واذا عاهد غدر ، واذا خاصم فجر )متفق عليه / رياض الصالحين .

واتە: چوارشت هەن هەركەس ئەو چوارشتەی تیابوو منافقی تەواوە هەركەسیش تەنها یەكێكیانی تیابوو ئەوە رەوشتێكی دووڕووی تیایە هەتا وازی لێدێنێ، ئەگەر ئەمانەتی لادانرا

گزی لیّ بکات ، ئەگەر قسەی کرد درۆبکات ، ئەگەر پەیمانی بەست غەدر بکات و بی وەفابێت ، ئەگەر دەمقاڵی بوو قسەو جنێوی ناشیرینی بەبەرانبەرەکەی بڵێت).

برای شیرینم خوشکی بەڕێزم زایەکردنی ئەمانەت یەکێکە لەنیشانەکانی هاتنی قیامەت ، دەبا هەوڵبدەین ئێمە هۆکار نەبین بۆ هاتنە دی ئەو نیشانە ، چونکە پاراستنی ئەمانەت بەهەموو جۆرەکانی لەئەمڕۆدا کارێکی زۆر گەورەیەو پاداشتەکەی دەیان قاتی پێشینانە ، لەبەرئەوەی زەمانەکە یارمەتیمان نادات و لەدژمان دەوەستیّ

گویّبگرە لەم فەرمودەی پێغەمبەریش(ﷺ)کە (حذیفة) (ﷺ) ریوایەتی دەکات : حدثنا رسول الله (ﷺ) حديثين قد رايت احدهما وانا انتظر الاخر حدثنا ان الامانة نزلت في جذر قلوب الرجال ثم نزل القران فعلموا من القران وعلموا من السنة ...)

واتە: پێغەمبەر(ﷺ) دوو فەرمودەی بۆ فەرمووین یەکێکیانم بینی و چاوڕێی ئەوی دیم ، فەرمووی: ئەمانەت دابەزیوەتە ناوەڕاستی دڵی مەردان و دوای ئەویش فێری قورئان و فێری فەرمودەبوون.

دوای ئەوە قسەی بۆ کردین دەربارەی هەڵگرتن و نەمانی ئەمانەت و فەرمووی: (ينام الرجل النومة فتقبض الامانة من قلبه ، فيظل اثرها مثل الوكت ، ثم ينام النومة فتقبض الامانة من قلبه، فيظل اثرها مثل اثر المجل ، كجمر دحرجته على رجلك فنفط فتراه مُنبترا وليس فيه شئ) ثم اخذ حصاة فدحرجه على رجله(فيصبح الناس يتبايعون فلايكاد احد يؤدي الامانة ، حتى يقال : ان في بني فلان رجلا أمينا ، حتى يقال للرجل: ما اجلده ما اظرفه ما اعقله ! وما في قلبه مثقال حبة من خردل من ايمان ح ولقد اتى عليَّ زمان وما ابالي ايَّكم بايعت ؛ لئن كان مسلماً ليردنَّه عليَّ دينه ، ولئن كان نصرانياً أو يهودياً ليردنه عليَّ ساعيه ، أما اليوم فما كنت ابايع منكم الا فلاناً وفلاناً متفق عليه . رياض الصالحين / باب الامر باداء الامانة ص: ١٣٢.

واتە: وایلێدێت پیاو خەوی لێدەکەوێت هەر بەو خەوە ئەمانەت لەدڵی هەڵدەگیریّ تەنها کەمێك شوێنەوار لەدڵیدا دەمێنیّ، جارێکی‌تر دەخەوێت ئەمانەت لەدڵی هەڵدەگیریّو شوێنەوارەکەی وەك تلۆقەیەکی بچووك دەمێنیّ هەروەك چۆن پشکۆیێ غل بکەیتەوە سەر قاچتا تلۆقە بکات دەبێنی بەرزدەبێتەوەو هیچیشی تیانیەدوایی بەردێکی بچکۆلەی هەڵگرت و غلی کردەوە بەسەر قاچیدا ع لەو رۆژەدا خەڵك وایان لیّدێت مامەڵەو کڕین و فرۆشتن دەکەن یەك کەس نامێنی سپاردە بپارێزێت، هەتا وای لیّدێت دەوتریّ فلاّن هۆز پیاوێکی سپاردە پارێزی تیایە ، هەتا دەوتری بەپیاوێك ئای چەندە بەهێزو توانایە ؟ ئای چەندە وریاو ژیرو ئاقڵە ؟ بەقەدەر یەك دەنکە خەرتەلەیش ئیمان لەدڵیدا نیە .

ئەمجا حوزەیفە وتی: ڕۆژێکم دیوە گوێم نەئەدایە لەگەڵ هەر کامتان مامەڵەم بکردایە ، چونکە ئەگەر موسوڵمان بوایە دینەکەی دەیگێڕایەوە بۆ لام ـ واتا ئەمانەتەکەی دەپاراستم ـ ئەگەر گاورو جوولەکەیش بوایە گەورەکەی دەینارردەوە بۆلام ، بەڵام ئەمڕۆ مامەڵە ناکەم مەگەر لەگەڵ فلانۆ فیسار.

گەورەترین ئەمانەتیش کاربەدەستیو سەرکارییە وەك ابوذر دەڵێ: بەپێغەمبەرم (ﷺ) وت: ئایا نامکەیت بەکار بەدەست؟ فەرمووی: (یا اباذر انك ضعیف وانها امانة ، وانها یوم القیامة خزي وندامة ، الاّ من اخذها بحقها وادی الذي علیه فیها) رواه مسلم .

واتە: ئەی ئەبو ذر تۆ لاوازیو کاربەدەستیش سپاردەیە ، ئەو سپاردەیەیش لەرۆژی قیامەتدا سەر شۆڕیو پەشیمانی مەگەر بۆ کەسێك بەهەقی خۆی وەریگرتبێت پێویستی سەرشانیشی تیایدا جێبەجێکرد بێت.

خوایە ئاخرمان بەخێر بگێڕەو دەستو دەم پاك بین لەدنیاداو سەرفرازبین لەقیامەتدا ... امین

## ( ١٠ ) شەیتان دوژمنی مرۆڤە :

کەم کەس هەیە لەم ژیانەدا دۆستو دوژمنی خۆی لەقەرارەی نەفسیدا دیاری نە کردبێت ، هەموو کەسێك لەم ژیانەدا پاش ئەوەی کەوتە گۆڕەپانی ژیانەوە دەبێ کەسانێك هەبن حەزی پێبکەنو کەسانێکیش حەزی پێنەکەن .ئەمە ئەگەر تاکە تاکەی مرۆڤ بگرین

بەڵام کۆمەڵی ئادەمیزاد بەگشتی دوژمنێکی سەرەکی و دێرینیان هەیە ، دوژمنێکی زۆر سەر سەختو کارامەو لێهاتووە ، هەزاران کەلێنو سەنگەری لەم مرۆڤە گرتووە ، شەوو رۆژ زستانو هاوین ماندو نابێت کوڵ نادات گەر رۆژی(١٠٠) جار لووتی بشکێنی و راوی بنێی ، لەجاری صەدو یەکەمدا بەشێوەیەك دێتەوە گیانت هەردەڵێی ئەبای دیووەو نەبۆران .

دوژمنێکی پەنهانە ، نیشتەجێی ناودڵو دەروونی مرۆڤەکانە ، حەسوودو چاوچنۆكو دوور لەرەحمو ویژدانە ، دیارە ئێستە دەزانیت کە ئەو دوژمنە شەیتانە ﴿الم أعهد الیکم یابني ادم الاّ تعبدوا الشیطان انه لکم عدو مبین ، وان اعبدوني هذا صراط مستقیم ، ولقد اضل منکم جبلاً کثیرا افلم تکونوا تعقلون﴾ یس: ٦٠ ـ ٦٢

واتە: ئەی بنیادەم ئایا پەیمانم لێ وەرنەگرتن فەرمانم پێنەدان کەدوای شەیتان مەکەونو بەقسەی مەکەن بەراستی ئەو دوژمنێکی ئاشکرایە بۆ ئێوە ، وەپێم نەوتن من بپەرستن ئەمە رێگەیەکی راستو دروستە . بەراستی شەیتان خەڵکێکی زۆر زۆری لێگومڕاکردن ئیتر بۆچ بیرناکەنەوە.

هەر لەو ڕۆژەوە خوای گەورە فەرمانی کرد بەفریشتەکان سەجدە بەرن بۆ ئادەم و ئەوانیش سەجدەیان برد ، بەلاّم ابلیس سەجدەی نەبردو وتی: من باشترم لەئادەم چونکە منت لەئاگر دروست کردوە ئەوت لەگلْ دروست کردووە ، بەهۆی ئەو سەرپێچی‌یەوە خوای گەورە لەژێرسایەو ڕەحمەتی خۆی دەریکردو لەبەزەیی خۆی بێبەشی کرد و پێی فەرموو: ﴿وان علیك لعنتي الى یوم الدین ﴾واتە: لەعنەتی منت لەسەر تا ڕۆژی قیامەت . واتە: بەهەتاهەتایی ئیتر لەوڕۆژەوە شەیتان دوژمنایەتی خۆی بۆ ئادەمیزاد ڕاگەیاند و داوای کرد لەپەروەردگار مۆلەتی ژیانی بداتیْ بۆئەوەی ئەم ئاواتەی بەدەس بهێنیْ لەبەر هەر حیکمەتێك بێت خوای گەورە مۆلەتی‌داو فەرمووی:﴿فانك من المنظرین الى یوم الوقت المعلوم ﴾واتە: تۆ مۆلەت دراوی تا ڕۆژی دیاریکراو ئەویش هەڕەشەی کرد لەنەوەی ئادەم وتی:﴿فبعزتك لأغوینهم اجمعین الاّ عبادك منهم المخلصین﴾ص: ٨٠-٨٣.

واتە: سوێندم بەبالاّدەستی‌و بلّندی تۆ دەبیْ هەر هەموویان وێلْو سەرگەردان بکەم جگە لەبەندە ڕاست‌و هەلّبژاردەکانی خۆت. خوای گەورە دەفەرمویْ:﴿ فالحق والحق اقول لأملأن جهنم منك وممن تبعك منهم اجمعین ﴾ ص:٨٤ ـ ٨٥.

واتە: من ڕاستم‌و ڕاست دەلّێم: دەبیْ دۆزەخ پڕ بکەم لەتۆو لەدواکەوتەکانت بەگشتی.

داستانی سەجدە نەبردنی شەیتان‌و لەعنەت لێکردن‌و دژایەتی بۆ مرۆڤ لەزۆر سوورەتی قورئاندا دووپات کراوەتەوە وەك سوورەتەکانی (البقرة ، الاعراف ، الحجر ، الاسراء ، الکهف ، ص).

ئەمەیش بۆ ئەوەیە مرۆڤ بەجوانی لەو ڕاستی‌یە بگات‌و دوژمنی سەرەکی خۆی بناسێت‌و خۆی لیْ پەنا بدات‌و لەخوای گەورە بپاڕێتەوە بیپارێزیْ لەفریوو فێلْو تەلّەکەی ئەو دوژمنە سەر سەختە بۆیە فەرمانی پێکردووین لەسەرەتای هەمووکارێکی پیرۆزماندا وەك نوێژو قورئان خوێندن بلّێین: ﴿اعوذ بالله من الشیطان الرجیم ﴾.

واتە: پەنادەگرم بەخوا لەشەیتانی ڕەجم کراوو دوورخراوە لەڕەحمی خوا.

مرۆڤی ژیرو بەئاگا قەت ڕاوێژ بەدوژمنی باوك کوشتەی خۆی ناکات‌و بەدلّسۆزی خۆی نازانێت و کاروباری ناخاتە دەستی‌و متمانە بەنەخشەو پلانەکانی ناکات ؛ کەچی ئەم ئینسانە ئەوەندە گێلْو کەم فامە شەیتان دەکات بەدۆستی خۆی‌و گوێی دلّی بۆ شل دەکات‌و خۆی پیْ دەسپێریْو سنوورو یاساکانی خوای بۆ دەشکێنیْ، بۆ خۆشی چەندساتێکی کەم قیامەتێکی هەتاهەتایی دەدۆڕێنیْ !

هەربۆیە من حەزم کرد لەم وتارەدا یادی خۆم‌و ئێوەش بخەمەوە بەو دوژمنە دێرینەی کەسەرەتای سەرگەردانی‌یەکەی لەوەوە دەستی پێکرد وتی: ﴿انا خیر منه ﴾ واتە: من باشترم

لەتۆ ، فەخرو شانازیکرد، تۆیش ئاگات لەخۆت بێت (انـا ، انـا )و (انانیـة)و خۆپەرسـتیو ڕەگەزپەرستی و خۆبەزلزانینو حەسوودیو فەرمان شکاندنی خوا کاری شەیتانەو بەرەو ئاگرت دەبات (نعوذ بالله من النار) .

برای ئادەمیزادم ژێر بەرەوەو گوێی سەرو گوێی دڵت هەڵخە بۆ ئامۆژگارییەکانی قورئـان ، لەسـەرچاوەی قورئانـەوە شـەیتان بناسـەو بزانـە گـەورەترین دوژمنـی تـۆ ئـەوە : ﴿یـا بـني ادم لایَفْتِنَنَّكُمُ الشیطان كما اخرج ابویكم من الجنة ینزع عنهما لباسهما لیُریهما سواَتِهِما انه یَریكم هو وقبیله من حیث لا ترونهم انا جعلنا الشیاطین اولیاء للذین لایؤمنون ﴾ الاعراف :٢٧.

واتـە: ئـەی ئـادەمیزاد! شـەیتان بـەفریوتان نـەدات وەك چـۆن بـاوكو دایكتـانی لەبەهەشـت دەرپـەڕاندو جلو پۆشاكی لەبەرداماڵین بۆئـەوەی عـەیبو عـەورەتیان بخاتـە بـەرچاوی یـەكتر ، بەراستی شەیتانو سەربازەكانی ئێوە دەبینن لەڕێگایەكەوە كەئێوە ناتوانن ئەوان ببینـن ، ئێمـە شەیتانەكانمان كردووە بەرێنماییكارو سەرگەورە بۆ ئەوانەی باوەڕیان بەخوا نیە.

گەر ئادەمیزادەكان بەجوانی بیریان بكردایەتەوە تەنها ئەم ئایەتەیان بەس بوو بۆئـەوەی بـاوەڕ بەخوا بهێننو لەشەیتان دوور كەونەوە چونكە ئایەتەكە زۆر بەنەرمو نیانی لەگەڵ مـرۆڤ دەدوێ دڵسۆزانە خیتـابی لەگـەڵ دەكاتو بـیری دەخاتـەوەو بەوكارەسـاتە سـەختەی كەشـەیتان بەسـەر باوكو دایكیدا هێنای كەلەبەهەشت دەریكردنو عەیبو عەورەتی خستنە ڕوو !

دەی كچەكانی حەووا ئێوەیش باش بزانن خۆ دەرخستنو پۆشاك داماڵینتـان لـەم سـەردەمەدا پیلانـی شـەیتانو سـەربازەكانی‌یەتی ، نوێكردنـەوەی ئـەو دوژمنایەتی‌یەیـە لەگـەڵ كچـەكانی حەواداو هـەوڵی حـەیاچوونی دنیـاو بـەرەو دۆزەخ بردنیانـە لەقیامـەتدا ؛ هەركەسـیش لەهـەوڵی ئـەوەدابێت كچەكانی حەووا پۆشاكی لاشەیان فڕێبـدەن ئـەوە سـەربازی شـەیتانن بـا ئـەمڕۆیش خۆیـان لەپشتی پـەردەی دۆسـتایەتیو پێشـكەوتنەوە حەشـاردابێت. چونكـە عـادەتی شـەیتانو سەربازەكانی وەهایە نەناسرێن پیلانەكانیان دەرنەكـەوێت مەگـەر تەنها لای بـەندە دڵسـۆزەكانی خوا. ﴿...انه یراكم هو وقبیله من حیث لاترونهم ﴾

ئەمجا ئایەتەكە روونە لەوەدا كەشەیتان سـەرگەورەی بێباوەڕانـە ﴿انـا جعلنـا الشـیاطین اولیـاء للذین لایؤمنون ﴾ .

باشترین هۆكاریش بۆ زاڵبوون بەسەر ئەو دوژمنە دێرینەدا:

١ ـ زیكرو یادی خوایە و پەناگرتنە بەو لەهەمموو كاتێكدا .

٢ ـ بپارێرەوە لەخوا لەشـەیتانی ئینسو جنۆكە بتبـارێزیٚ و زۆر سـوورەتی (قل اعوذ)وەكـان بخوێنە وشەوو رۆژخوات لەیادبێتو بزانە دوژمن وا لەسەنگەردایە بۆت ...

خوایە لەو دوژمنە پەنهانە بمانپارێزە ، ئاخرمان بەخێر بگێڕە ... امین .

## (١١) فێڵ و تەڵەکە(١) : ئابی ٢٠٠٢

فێڵبازیو تەڵەکەبازی لەئەمڕۆدا بەشێکی زۆر لەژیانی ئادەمیزادی گرتووە ، بەڵکو لەهەندێ شوێندا ناودەبرێ بە(فن)و هونەر ، یان ناوزەد دەکرێت بەسیاسەتو لێزانیو خەڵکی لەسەر پەروەردە دەکرێت.

جێگای داخەکە (غش) زۆر لەبوارەکانی ژیانی ئینسانی گرتووە لەئەمڕۆداو زۆر لەچینە جیاجیاکانی مرۆڤ تێوەی تلاون ، بۆیە منیش حەزم کرد باسەکە بەشێوەیەکی گشتی باس بکەم نەك تەنها رووی باسەکە بکەمە چینێك لەچینەکانی کۆمەڵگا ، چونکە کاتێ ورد دەبیتەوە لەم کۆمەڵگایە بەروونی دەبینی گزیو تەزویر زۆربەی بوارەکانی گرتۆتەوە وەك لەنموونەکاندا روونی دەکەینەوە(انشاء الله).

سەرەتای باسەکە بەم ئایەتە دەسپێدەکەم کەدووجار لەقورئاندا هاتووە: النحل/١٢٧ النمل/٧٠ ﴿ولاتحزن عليهم ولاتك في ضيق مما يمكرون ﴾.

واتە: ئەی محمد خەفەتبار مەبە لەسەرەئەوەی ئەو کافرانە باوەڕ بەخواو بەبەرنامەکەی تۆ ناهێنن ، خۆیشت تەنگەتاوو نارەحەت مەکە لەوفێڵ و تەڵەکەی بەرانبەر تۆو بەرنامەکەی تۆ دەیکەن ، لەسوورەتی(نحل)دا دوای ئەم ئایەتە دەفەرموێ: ﴿ان الله مع الذين اتقوا والذين هم محسنون ﴾خوای گەورە پاڵپشتە بۆ ئەهلی تەقواو چاکەکاران ئیتر بادوژمنانی دین هەر خەریکی فێڵ و تەڵەکەبن پیلانو تەڵەکەکانیان دوا رۆژ هەر لەدژی خۆیان تەواو دەبێت انشاء الله لەقورئاندا زیاتر لە(٢٥) جار وشەی( مكرَ ، يَمكرُ ، يمكرون ، مكر ، ماكرين)دووبارە بووەتەوە ئەمەیش ئەوە دەگەیەنێ فێڵ و (غش)زۆرەو دەبێ موسوڵمان پەنابگرێت بەخوا لەو فێڵبازانە.

لەم بارەیشەوە پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێ: ( من حمل علينا السلاح فليس منا ، ومن غشنا فليس منا).

واتە: هەرکەس چەك لەدژی ئێمە هەڵگرێت لەئێمە نیە، هەرکەس فێڵمان لێبکات لەئێمە نیە.

گەورەترینو تاوانترین جۆرەکانی فێڵ ئەوەیە بەرانبەر خواو دینەکەی خوابکرێت ، وەك چۆن کافرەکانی قورەیش بەرانبەر بەمحمد(ﷺ) دەیانکرد : تاوێ دەیانوت شێتە تاوێ دەیانوت جادووگەرە، تاوێ هەڕەشەیان لێدەکرد، تاوێ بۆسەیان بۆ کوشتنو لەناوبردنی دادەنا، خۆیشیان باش دەیانزانی (محمد) پاکەو ئەمینە چونکە لەخۆیان بوو برازای خۆیانبوو بەڵام دەیانویست فێڵ و چاو بەس لەو خەڵکە رەشو رووتە بکەنو محمدیان لەبەرچاو ناشیرینو بێزراوبکەن چونکە باش دەیانزانی هەر کاتێ راستی روون بوویەوە ئیتر خوا درۆینەکانی ئەوان باویان نامێنێو ناغایەتییان لەدەس دەردەچێ!

نموونەیەکی‌تر لەنموونەکانی گزی‌و تەڵەکە ئەوەیە ئەمڕۆ زۆر بەزەقی لەفەرمانگاکاندا بەرچاو دەکەوێت ، فەرمانبەرێکی دەوڵەت پارەی مانگانە وەردەگرێت بۆئەوەی ئیشی خەڵکی بەڕێبکات ، کەچی هەندێ لەو فەرمانبەرانە دەس بەخەڵکیوە دەنێن ، ئیشی رۆژێکی بۆ دەکەن بەهەفتەیەك ئیشی هەفتەیەکی بۆ دەکەن بەمانگێك زۆربەی کاتیان بەدەمەتەقێ‌و ژوراو ژوورو قسەکردن لەگەڵ ئافرەتەکاندا بەسەر دەبەن، کەسێ بیانەوێت بەساتێك هەمووشتێکی بۆ ڕادەپەڕێنن ، کەسێکیش نەیناسن‌و تەمایان پێی نەبێت توتناو دەکەن بەلووتیداو بێزاری دەکەن لەژیانی خۆی تائیمزایەکی بۆ دەکەن ، ئەمە لەگەڵ ڕێزو دوعای خێرمان بۆ هەندێکیان کەبەڕاستی خۆیان ماندو دەکەن‌و دڵسۆزییان پێوە دیارە لەبیرم ناچێت زیاتر لە(٨) مانگ من‌و حاجی ملا حسن علی ژووراو ژوورو دەس بەدەسیان پێکردین لەسەر ئیشی مزگەوتی بێخود/ بەشی ئافرەتان،ئاخری هەر نەیانکرد تاخوا دەلیلێکی بۆ نادرین خوا جەزای بداتەوە.

نموونەیەکی‌تر لەنموونەکانی (غش) ئەو بازاڕەیە بەتایبەت بەشی میوەو سەوزەکان بزانن چۆن چاکەکان دەخەنەڕوو خراپەکان دەدەن بەخەڵك کاتێ کیلۆیەك تەماتە یان میوەت بۆ دەکێشێ دەڵێی جادووگەرە دەستی سووڕدەدات تاتۆ دەکەویتە خۆت ئەو عەلاگەکەت بۆ فوول دەکات لەخراپەکانی ، دوسێیەکی چاکیشی تێدەکات زیاتر لەو دوو کیلۆی تۆ داوات کردووە ، کاتێ دەیکێشێ قوورسە چونکە خۆی قورس داینـاوە ، ئەمجا دەسدەبات چاکەکان دەردەهێنێ‌و خراپەکان بەشی تۆیە ، گەر قسەیەکیش بکەیت خۆی تورە دەکات‌و بازاڕەکەت لێ تێدەگەیەنێ، ناچار دەبێ سەرکز کەیت‌و رێگا بگریتە بەرو حساب‌و کیتابیان لەگەڵ هەڵگریت بۆسەر پردەکەو کاتی وەیل‌و سزا. ﴿ويل للمطففين، الذين اذا اكتالوا على الناس يستوفون، واذا كالوهم أو وزنوهم يخسرون، الا يظن اولئك انهم مبعوثون، ليوم عظيم ، يوم يقوم الناس لرب العالمين﴾. المطففين:١-٦.

واتە: وەیل‌و سزای سەخت بۆ ئەو گزیکارانەی ئەگەر کێشانەو پێوانەیان بۆ خۆیان کرد مافی تەواوی خۆیان وەردەگرن ، بەلاّم ئەگەر پێوانەو کێشانە بۆ خەڵك بکەن گزی لێدەکەن‌و مافی تەواویان نادەنێ ، ئایا ئەمانە بەتەمای ئەوەنین کەزیندوو بکرێنەوە بۆ رۆژێکی زۆر سەخت‌و دژوار ؟ ئیتر ئەوکێشانەو پێوانە تەنها بازاڕ ناگرێتەوە ، فەرمانگاکانیش دەگرێتەوە، ژیانی خێزانیش دەگرێتەوە ، کار بەدەست‌و سەرکردەکانیش دەگرێتەوە ...هتد.

ڕۆژێك پێغەمبەر(ﷺ) تێپەڕی بەلای خەرمانێکدا دەستیکرد بەناویدا پەنجەکانی تەڕبوون ، فەرمووی: ((ئەمەچی‌یە ئەی خاوەن خۆراك ؟ )) وتی: یارسول الله باران لێی‌داوە ، فەرمووی:((ئەی بۆچ تەڕەکەت نەخستوەتە سەر تاخەڵك ببینن؟ هەرکەس گزیمان لێبکات لەئێمە نییە))ریاض الصالحين النهي عن الغش.

خۆراكێك باران لێیداوە خۆی دەسكاری نەكردووە بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) ئەمە بەخیانەت دادەنێ دەفەرموێ: دەبێ تەڕەكە ـ كەخراپە ـ بیخەیتە سەرەوە بۆئەوەی خەڵك بیزانێت.

كاكی میوەفرۆشی بازاڕەكەی سلێمانیش چاكەكە دەخاتە ڕوو خراپەكە دەخاتە چاڵەكەی بەردەمی تاتۆ نەیبینی ، لەوەیش بۆ تۆ تێدەكات ، نوێژی جومعەیش خۆی دەگەیەنێتە خانەقاو بێخودو حاجی ئاواو دەڵێ: جومعەم كرد !!

گەر حەز لەنموونەی زیاترو روونتریش دەكەیت بابچین بۆ مەیدانی حەیوانەكەو لەوێ بزانە چی دەبینی ؟ چی دەبیستی ؟ بەڕاستی لەوێ سەرت سپی دەبێت و بێزت لەخۆت دێتەوە، لەوێ یادی جوولەكەكەو كاك احمدی شێخت دەكەوێتەوە كە: كاك ئەحمەد پێی فەرموو: جووەبۆچی موسڵمان نابیت ؟ وتی: كاك ئەحمەد ئەگەر دینداری وەك تۆ بێت بەمن ناكرێت ، ئەگەر وەك دزو درۆزنەكانی ناو بازاڕیش بێت دینەكەی خۆم باشترە !!

بەڵێ ئەو مەیدانە مەیدانی سوێندی درۆیە مەیدانی بێ موتمانەییە ، تەنانەت سوێندیش متمانەی نەماوە ، سوێندی درۆ كاری كردووە لەگۆشت و مۆخی ئاژەڵە بێ زمانەكانیش بۆیە گۆشتەكەیان بەرەكەتی نەماوەو لاشە پێی گەشەناكات ، لەومەیدانەدا گوانی ولاخەكان دەبەستن و دەمی گۆلكەكان دەبەستن بۆئەوەی شیرەكە لەگوانیاندا پەنگ بخواتەوەو بەمانگای شیرا بیفرۆشن.

لەومەیدانەدا سكی ئەو حەیوانە بێزمانە فوول دەكەن بەئاوو خوێ بۆئەوەی دووسێ كیلۆ زیاد بكات ، لەومەیدانەدا بەناو دەلاڵەكان سەر لەكڕیارو فرۆشیار دەشێوێنن بەجۆرەها پیلان و سوێندی درۆ. ئیتر گەر باسی هەموو توێژەكانی كۆمەڵ بكەین زۆر دەخایەنێ و (مشتێك نموونەی خەروارێكە) پێغەمبەریش بۆ هەموو ئەم جۆرانە دەفەرموێ: (لكل غادر لواء عند استه يوم القيامة يرفع له بقدر غدره ، الا ولاغادر أعظم غدراً من اميرعامة) مسلم . رياض الصالحين / باب تحريم الغدر .

واتە: هەموو گزیكارێك بەیداخێك لای كۆمیەوە هەیە لەرۆژی قیامەتدا بەئەندازەی غەدرەكەی بەرز دەكرێتەوە ، هیچ گزیكارێكیش غەدرەكەی لەسەركردەی گشتی گەورەتر نابێت.

## فێڵ و تەڵەكە (٢):

الحمد لله رب العالمين ....الخ

هەفتەی رابوردوو هەندێك دەربارەی فڕوفێڵ دواین و چەند نموونەیەكمان خستە ڕوو مەبەستیشمان لەو نموونانەدا شكاندنی هیچ كەس و لایەنێك نیە، بەبەڵگەی ئەوەی ناوی كەسمان نەبردووە ، بەڵكو مەبەستمان دووخاڵی گرنگە :

یەکەم/ باموسوڵمانان ئاگاداربن لەو جۆرە فێڵ‌و فێڵبازانەو هەوڵ بدەن خۆیانیان لێبپارێزن‌و نەکەونە داویان.

خاڵی دووەم/ بەڵکو هەندێك لەو فێڵبازانە خۆیشیان گوێیان لەم ئایەت‌و فەرموودانەبێت‌و لەو فێڵ‌و تاوانە بگەڕێنەوەو تەوبەبکەن‌و فریای خۆیان بکەون‌و بەکۆڵی گرانی زوڵم‌و خەڵەتاندنی موسوڵمانانەوە کۆچ نەکەن بۆ ژیانی ئەولا ، چونکە بەراستی لەوێ کەس فریامان ناکەوێت ، ئەو ماڵ‌و منداڵ‌و کەسانەی ئەمان لەدنیا بەفرۆفێڵ ماڵیان بۆ خڕکردوون هیچ بەکەڵکیان نایەن ، ئەمان لێرە یاری بەماڵ‌و سامان‌و کەلەپوورەکەیان دەکەن بەڵام ئەوان لەوێ پێیان دەوترێ﴿فذوقوا فما للظالمين من نصير ﴾ فاطر:٣٧.

واتە: بچەژن سزای سەخت ستەمکاران یارمەتی دەریان نیە .

دەبوا فێڵبازو تەڵەکەچی‌یەکان هەر بەوە وازیان لەو خووە پیسە بهێنایە، کەفێڵبازی خووی مونافیق‌و دوو ڕووەکانە ، چونکە ئەوانن شتێك ئاشکرا دەکەن‌و شتێکی‌تر لەدڵیاندا حەشار دەدەن ، بۆیە خوای گەورە لەزۆر ئایەتی قورئاندا باسیان دەکات‌و پیسی دەروونیان ئاشکرا دەکات‌و ڕەنجەڕۆیی و خەسارۆمەندیان رادەگەیەنێت ، وەك لەسوورەتی(البقرة)دا دەربارەیان دەفەرموێ:﴿يخادعون الله والذين امنوا ومايخدعون الا انفسهم ومايشعرون ﴾ البقرة:٩

واتە: فرۆفێڵ لەخواو لەباوەڕداران دەکەن ، بەڵام ئەو فرۆفێڵە تەنها ئەو باڵی خۆیان دەبێتەوە ، چونکە خوای گەورە فێڵی لێناکرێت‌و ئاگایە بەنیازە پەنهانیەکانی دەروون ؛ بەڵام ئەوان هەست بەوەناکەن . هەر لەوسوورەتەدا لەئایەتێکی تردا دەربارەیان دەفەرموێت:﴿اولئك الذين اشتروا الضلالة بالهدى فما ربحت تجارتهم وما كانوا مهتدين ﴾ البقرة/١٦.

واتە: ئەوانە گومراییان کڕیوەو ڕێگای راستیان داوە ، لەهەقیدا بەراستی بازرگانی‌یەکەیان قازانجی نەکردووەو ، ڕێگای راستیان نەگرتووە.

فێڵ تەنها لە(٣) حاڵەتدا دروستە ، لەحاڵەتی جەنگدا دژ بە کافران دروستە فێڵ بەکاربهێنرێت بەمەرجێ ئەو فێڵە پەیمان شکاندن نەبێت ، هەروەها لەحاڵەتی دوژمنایەتی نێوان دوو کەسدا یان دوو تاقمدا لەموسوڵمانان دروستە فێڵ‌و درۆ بخرێتە کار بۆ ئاشتبوونەوەیان ، ئەویش بەمەرجێك هەرکات ئەو فێڵە ئاشکرابوو نەبێتە هۆی زیاتر تێکدانیان ، هەروەها بۆ ئاشتبوونەوەو زیاتر خۆشەویستی نێوان ژن‌و مێرد، ئەوەیش وەهانا پیاو لەماڵەوە بەژنەکەی بڵێ: تۆ خۆشەویستی منی‌و لەدەرەوە دەس تێکەڵاو بکات لەگەڵ ئافرەتی تردا ، یان ژنەکە وەها بەپیاوەکەی بڵێ‌و لەدەرەوە بەنهێنی پەیوەندی تری هەبێت ، چونکە ئەمە خیانەتیشەو فرۆفێڵ‌و ناپاکیشە. بەڵکو مەبەست ئەوەیە ئەگەر ژن‌و مێرد زویربوون‌و ساردی‌یەك کەوتە نێوانیان ـ ئەمەیش هەردەبێ ببێ

ـ دروسته  هەركاميان بەرانبەری ئەوی تریان گفتو گۆی شیرین بەكاربهێنێ بازیادەڕەوی یان درۆیشی تیابێت بۆ سارێژی برینی دەروونیان.

جگە لەم(٣) حاڵەتە فرۆفێڵ حەرامەو ناڕەوایە تەنانەت بەرانبەر بەكافرانیش ، ئیتر ئەم هەموو بەزمو باوەی ئەمڕۆ لەناو میللەتی بەناو موسوڵماندا دەبینرێ ئیسلام لێی بەرییەو هەموو دەسكردو داهێنراوی خۆمانە كەدەبینین:

فێڵ هەموو كونو قوژبنێكی ژیانی گرتۆتەوە رۆژ لەدوای رۆژیش پەرە دەسێنێ.

فێڵ لەمامەڵەو كڕینو فرۆشتندا ، فێڵ لەپارەو دراودا ، فێڵ لەپەیوەندی خێزانیدا ، فێڵ لەرووموەتو مكیاجو سەرو ریشدا ، فێڵ لەمارەیی‌و قەرزاریدا ، فێڵ لەحوكمڕانی‌و هەڵبژاردنو سندوقەكانی دەنگداندا ، فێڵ لەلەش ساغی‌و نەخۆشیدا ، فێڵ تەنانەت لەناو گرۆی سواڵكەراندا...هتد

لەسەر هەموو ئەمانەیش دەیان نموونەی زیندومان هەیەو كاتمان نیە باسیان بكەین ، هەر هەموویشی هۆی دووریمانە لەخوا بۆیە سیقەو موتمانە لەهیچ لایەك نەماوەو كەس لەكەس ئەمین نیە ، ئەمەیش سەرەتای نەگبەتی‌و لەناوچوونە ـ والعیاذ بالله ـ .

برادەرێك تەلەفزیۆن سازە ، دەڵێ: ئێستا لەناو هەندێ لەو تەلەفزیۆن سازانەدا كاتێ تەلەفزیۆنێكیان بۆ دەبەیت بۆت چاك بكەنەوە ، گەر شاشەكەی چاك بێت ، شاشەكەی تۆدەر دەهێنن دەیفرۆشنو شاشەیەكی كۆنو ناتەواوت بۆ دادەنێن ، یان تەلەفزیۆنی كۆن دەكڕن بەهەرزانو هەندێ دەسكاری‌و فرۆفێڵی دیكۆریی لەگەڵ دەكەنو بەنرخی تازە دەیفرۆشن ، دیارە ئەم حاڵەتانە لەناو هەندێك لەسەلاجەسازو سەعات سازو زۆرئامێری تریشدا هەیە.

ئەمجا لەفەرمانگاو كۆمپانیای رێكخراوەكاندا لای هەندێ كەس هەر زۆر ئاسایی‌یە تەزویری وەصل بكاتو بەگوێرەی بۆ گونجانی كاتو شوێن پارەیەكی زیاد بنووسی‌و وەریشی بگرێت و خۆی بیخوات ، شەرعی خۆیشی دەكات دەڵێ: بابە خۆ من لەكەسم نەدزیوە پارەی حكومەتە ، یان هی فلان دەوڵەمەندە ، یان فلان رێكخراوەی بیانی‌یە ، ئیتر بۆ حەرامە ؟ لەبیری خۆی بردۆتەوە غەش لەجوولەكەش حەرامە (من غشنا فلیس منا)، بۆ نموونە بە(٤٠) دینار كرێوویەتی دەنووسیٰ(٤٨) ، هەشتەكەی خۆی دەیبات ، یان بە(٤٠٠) كرێوویەتی، دەنووسیٰ(٤٧٥)، یان بە(٤٠٠٠) كرێوویەتی دەنووسیٰ (٤٦٠٠) ، ئیتر مەپرسە لەدزی‌و جەردەیی‌و فرۆفێڵی قاچاخ چی‌یەكان كەجانبازی بەلاشەو ناموسی گەنجەكانەوە دەكەنو كەم كەس هەیە دەیان پیلانی ئەوانی نەبیستبیٰ.

خۆلـەبابی مـارەیی و ژنو ژنخوازیشـدا ئـەوەندە فێڵمـان دیـووەو بیسـتووە لـەژمارە نایـەت لەهەموویشی خراپتر ئەوەیە ناوی دەنێن(حیلە شەرعی) کەشـەرع قـەت حیلـەی تیانیـە ، ئێمـە خۆمان حیلەبازین.

بۆ نموونە: کچەکەی مارە دەبڕێت لەسەر دوازدە میسقاڵ ئاڵتوون یان زیاتر ، نیوەی دەدات بەکچەکەو نیوەکەی تریشی دادەنێ بۆ خۆی یان کوڕەکەی ژنی پێ دەهێنێ ! کەپێشی دەڵێت، دەڵێ مامۆستا مارەی بڕیوە لەسەری‌و کچەکە خۆیشی ڕازی‌یە ، ئیتر ئەوە دەشارێتەوە کچەکەی رووگیر کردووە ، یان پێی وتووە وانەبێ ناتدەم بەشو.

ئەوکەسانەی ئەو جۆرە کارانە دەکەن من لەخۆیان دەپرسم و ویژدانیان بخەنـەکار ــ ئەگـەر ویژدانیـان مـاوە ــ ئـەو ئیشـەی ئـەوان فـەرقی چی‌یـە لەگـەڵ ئیشـی جوولەکـەکاندا کـاتێ خـوا راوەماسی لەسەر حەرام کردن ڕۆژانی شەممە ، ئەوانیش ڕۆژی جومعە دەچوون قولاپ‌و تۆڕیـان بۆ دادەنان‌و حەوزیان بۆ دروست دەکردن‌و بەری حەوزەکەیان لێدەگرتن ئەمجا راویـان دەنـان بەرەو حەوزو قولاپـەکان ، ڕۆژی یـەك شـەممە دەچـوون دەیـانگرتن بـەهۆی ئەوکارەیانـەوە خـوا مەسخی کردن بەمەیمون‌و بەرازو لەعنەتیشی لێکردن ، وەك قورئان باسیان دەکات:﴿ولقد علمتم الذين اعتدوا منكم في السبت فقلنا لهم كونوا قردة خاسئين ﴾ البقرة:٦٥.

هەروەها پێغەمبەر(ﷺ) دەربارەی جوولەکەکان دەفەرموێ: (قاتل الله اليهود ، ان الله عزوجل لما حرم عليهم شحومها ، اجملوه ثم باعوه فاكلوا ثمنه) مسلم /١٥٨١ .

واتـە: لەعنـەتی خـوا لەجوولەکـە لـەکاتێکدا خـوا پیـوی مردارەوەبـووی لێحـەرام کـردن، تواندیانەوەو فرۆشتیان‌و نرخەکەیان خوارد.

نموونە لەم بارەوە زۆرەو کاتمان نیە کۆتایی ئەم باسە دێنم بەوەی کەقورئان لەزۆر شوێندا باسی رەنجەڕۆیی فێڵبازان دەکات روونـی دەکاتـەوە کەئـەنجامی رەشـی فێڵـەکانیان یەخـەگیری خۆیـان دەبێت. ﴿وقـد مكـروا مكرهـم وعنـد الله مكرهـم وان كـان مكرهـم لـتزول منـه الجبـال ﴾ ابراهيم/٤٦

واتە: ئەوان فێڵ‌و تەڵەکەی خۆیانیـان کـرد بەرانبـەر پێغەمبـەرو باوەڕداران، خوایش ئاگادارە بەکارو فێڵیان پاداش‌و سزا لای ئەوە بافێڵەکانیشیان ئەوەندە بەهێز بێت کێو لەبن بێنێت.

یان دەفەرموێ:﴿واملي لهم ان كيدي متين ﴾ ن/٤٥.

واتە: من مۆڵەتیان دەدەم فێڵی من زۆر بەهێزە ، دیارە خوا فێڵبازنیە ـ تعالى عن ذلك ـ بەلاّم هەر بەفێڵەکەی خۆیان لەناویان دەبات .

خوایەگیان تو ناوە جوانەکانت هەرکەس فێڵ لەموسوڵمانان دەکات بەفێڵەکـەی خـۆی لـەناوی بەریت ، خوایە هەرکەس چاڵیان بۆ هەڵدەکەنێت بیخەیتە ناوچاڵەکەی خۆیەوە ، خوایە هەرکەس

فێڵ لەخاکی کوردستان دەکات ئەو خاکە بکەیتە گۆڕستانی ... خوایە هەرکەس بەفێڵبازی بازرگانی بەئاینو ئایەتەکانی قورئانو پۆشاکی دینداریەوە دەکات پەردە لەرووی هەڵمالی و بەخەڵکی بناسێنی ، خوایە هەموو فێڵبازان بەخەڵك بناسێنەو بەداوی فێڵەکەیان خۆیان بتاسێنە !

## (١٢) پیاو کوشتن (القتل): ٢٠٠٢/١٢/١٣

بۆ ئەم باسە باشترین شت دەستی پیّ بکەین ئایەتێکی قورئانە کەدەفەرموێت:﴿ومن يقتل مؤمنا متعمداً فجزاؤه جهنم خالداً فيها وغضب الله عليه ولعنه واعد له عذاباً عظيماً﴾ النساء:٩٣.

واتە: هەرکەس باوەڕدارێك بەهەوەسو بەناهەق بکوژێت سزاکەی دۆزەخەو بەهەمیشەیی تیا دەمێنێتەوە خوا خەشمو قینی لێدەگرێتو نەفرینی لێدەکاتو سزایەکی سەختی بۆ ئامادەکردووە.

(ابن كثير) لەتەفسیری ئەم ئایەتەداو ئایەتەکەی پێش ئەمەیشدا دەفەرموێ: (ليس لمؤن ان يقتل أخاه المؤمن بوجه من الوجوه ، كما ثبت في الصحيحين عن ابن مسعود ان رسول الله(ﷺ) قال: (لايحل دم امرئ مسلم يشهد أن لااله الا الله واني رسول الله الا باحدى ثلاث: النفس بالنفس ، والثيب الزاني والتارك لدينه المفارق للجماعة).

واتە: دروست نیە باوەڕدار بەهیچ شێوەیەك برای باوەڕداری خۆی بکوژێت وەك چۆن لەبوخاریو موسلیمدا هاتووە لە(ابن مسعود)ەوە کەپێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: خوێنی هیچ مرۆڤێکی موسوڵمان کەشایەتی بدات (لا اله الا الله ، محمد رسول الله) حەڵاڵ نییە ، مەگەر بەیەکێ لەم سێ هۆکارە:

یەکەم/ کەسێ بکوژێت دەکوژرێتەوە .

دووەهەم/ پیاوێکی ژن هاوردوو یان ژنێکی شووکردو ئەگەر زینایان کرد دەکوژرێن (بەرەجم)

سێیەم/ کەسێك واز لەدینەکەی بێنێتو پاشگەز بێتەوەو لەکۆمەڵی موسوڵمانان دابڕێت.

ئەمجا (ابن كثير)دەفەرموێت: (ثم اذا وقع شئ من هذه الثلاث فليس لأحد من آحاد الرعية ان يقتله وانما ذلك الى الامام أو نائبه).

واتە: ئەگەر شتێکیش لەم سیانە روویدا هیچ کەس لەرعییەت بۆی نیە ئەوکەسە بکوژێت ، بەڵکو ئەمە تەنها کاری ئیمامو جێگری ئیمامە(واتە: خەلیفەی زەمان).

چیرۆکەکەی (قابیل)و (هابیل) کەقورئان فەرمان دەدات بەپێغەمبەرو(ﷺ) زانایان بۆ خەڵکی بگێڕنەوە گەورەترین وانەیە بۆ دوورکەوتنەوە لەم تاوانە گەورەیە:﴿واتل عليهم نبأ ابني آدم بالحق

اذ قربا قرباناً فتقبل من احدهما ولم يتقبل من الاخر قال لأقتلنك ، قال: انما يتقبل الله من المتقين﴾ المائدة:٢٧.

واتە: ئەی(محمد) تۆ داستانی دوو کوڕەکەی ئادەمیان بۆ بخوێنەرەوە کەهەریەك قوربانی‌یەکی کردو خوا لەیەکێکیانی قوبوڵ کردو لەوی تریانی قوبوڵ نەکرد، ئەوەیان کەڵی وەرنەگیرابوو: (قابیل) حەسوودی برد بەبراکەی‌و هەڕەشەی کوشتنی لێکردو وتی: دەبێ بتکوژم ، براکەی پێی وت: خوا قوربانی کەسێك وەردەگرێت ، کەتەقواکار بێت‌و لەخواترس بێت . دوایی پێی وت:﴿لئن بسطت الىَّ يدك لتقتلني ما انا بباسط يدي اليك لأقتلك اني اخاف الله رب العالمين ﴾المائدة: ٢٨.

واتە: ئەگەر تۆ دەستم بۆ درێژکەیت بۆ کوشتنم من دەس درێژناکەم بۆ کوشتنت چونکە من لەخوای پەروەردگاری جیهانەکان دەترسم.

﴿اني اريد ان تبوء بأثمي واثمك فتكون من اصحاب النار وذلك جزاء الظالمين ﴾.المائدة:٢٩ . من دەمەوێ تۆ تاوانی من‌و خۆیشت هەڵگری‌و ببیتە ئەهلی دۆزەخ بەکوشتنی من هەر ئەمەیش پاشە ڕۆژی ستەمکارانە.

﴿فطوعت له نفسه قتل اخيه فقتله فأصبح من الخاسرين ﴾ واتە: نەفسی بەدکاری کوشتنی براکەی لەلا جوان کردو ئەو هەموو ترساندن‌و ئامۆژگارییە کاری لێنەکردو کوشتی‌و گەڕا لەوانەی خەسارومەندی دنیاو قیامەت بوون.

﴿فبعث الله غراباً يبحث في الارض ليريه كيف يواري سوءة اخيه قال ياويلتى اعجزت ان اكون مثل هذا الغراب فاواري سوءة اخيه فأصبح من النادمين ﴾.

واتە: خوای گەورە قەلەڕەشێکی ناردو چاڵێکی هەڵکەند بۆ قەلەڕەشێکی تری مردارۆبوو ئەویش دامابوو بەدەست تەرمی براکەیەوە نەیدەزانی چی لێبکات؟ کاتێ قەلەڕەشەکەی دی قەلەڕەشێکی تری دەشاردەوە وتی: ئەی بەدبەختی‌و وەیلو سزا بۆ من ئایا ئەوەم لەدەس نەدەهات وەك ئەو قەلەڕەشەبم‌و تەرمی براکەم داشارم ؟ ئیتر پەشیمانی‌و حەسرەت دایگرت.

دوای باسکردنی ئەو چیرۆکە ، کەداستانی یەکەم کوشتنی ناهەقە لەمێژووی مرۆڤایەتیدا تێکلاوکردنی گێڕانەوەی چیرۆکەکە بەچەپکە گوڵێکی زۆر جوان لەئامۆژگاری‌و ئاشتیخوازی مرۆڤی باوەڕدارو قیامەتناس‌و، دڵڕەقی‌و حەسوودیی مرۆڤی بێباوەڕو دوور لەخوا. خوای گەورە جارێکی گەردوونی ئەدا بەگوێی هەموو مرۆڤەکانداو دەفەرموێ:﴿من اجل ذلك كتبنا على بني اسرائيل انه من قتل نفساً بغير نفس او فساد في الارض فكأنما قتل الناس جميعاً ومن احياها فكأنما احيا الناس جميعاً ﴾ المائدة:. ٣٢.

واتە: بەهۆی ئەوەی کە کوورەکەی ئادەم براکەی خۆی بەناهەق کوشت خوای گەورە ، شەرع‌و ڕێبازێکی دانا بۆ (بني اسرائيل) کە ئەمەیش شەرعە بۆ هەموو ئوممەتێکی دوای ئەوانیش تا

رۆژی قیامەت کەهەرکەس کەسیٚ بکوژێت ، بیٚ‌ئەوەی ئەو کوژراوە هەقی کوشتنەوەی لەسەر بێت یان کارێکی فەساد ئامێزی کردبێت و شیاوی کوشتن بێت ، ئەو وەك ئەوە وەهایە هەموو ئادەمیزادی کوشتبیٚ ، بەلاّم ئەگەر دەستی لەکوشتن گرتەوەو دەستی نەچووە خوێنی کەسێك وەك ئەوە وەهایە هەموو ئادەمیزادی ژیاندبێت . بۆیە لەفەرموودەی پێغەمبەردا هاتووە: (لا تقتل نفس ظلما الا كان على ابن ادم الاول كفل من دمها لأنه كان أول من سنَّ القتل ) اخرجه الجماعة سوى ابي داود تفسير ابن كثير :٢/٤٥.

واتە: هیچ کەسێك بەناهەق ناکوژرێت ئیللا کوڕەکەی ئادەم کەیەکەم پیاوکوژ بوو بەشێك لەتاوانی ئەو خوێنەی لەسەرە چونکە ئەو یەکەم کەس بوو کوشتنی داهێنا.

بەکورتی برا ئازیزەکانم ! خوشکە بەڕێزەکانم ! کوشتن تاوانێکی زۆر گەورەیەو لەزۆر شوێنی قورئان و فەرموودەدا دوا بەدوای شەریك بۆ خوا قەراردان باسی هاتووە، تەنانەت (ابن عباس)ی ئامۆزای پێغەمبەر(ﷺ) لەتەفسیری ئایەتی:﴿ ومن يقتل مؤمناً متعمداً ...﴾دا دەفەرمویٚ: ( ان الرجل اذا عرف الاسلام وشرائع الاسلام ثم قتل مؤمناً متعمداً فجزاؤه جهنم ولا توبة له) تفسير ابن كثير ج:١/٥٣٦ .

واتە: ئەگەر کەسێك ئیسلام و شەریعەتی ئیسلام شارەزابوو دوای ئەوە باوەڕدارێکی بەناهەق کوشت سزاکەی دۆزەخەو تەوبەی لیٚ وەرناگیرێت.

هەرچەند ئەم رایەی (ابن عباس) خیلافی رای جومهوری عولەماو صەحابەکانە ، بەلاّم جێگای خۆیەتی لەم رۆژەدا زیاتر لەوتاوانە گەورە بمانترسێنێ ، بەلاّم جمهوری زانایان لەسەر ئەوەن کە(قاتل) ئەگەر بەڕاستی تەوبە بکات خوا تەوبەکەی وەردەگرێت و هەقی(مقتول)ە کەیشی لادەمێنیٚ ، ئەمەیش کردنەوەی دەرگایەکی رەحمەتە لە(قاتل) بەڵکو بگەڕێتەوەو دەس لەخوێن بکێشێتەوە.

گوێگرە ئازیزەکان ئەمڕۆ زەمانی فیتنەو ئاشووبە لەهەموو جیهانی ئیسلامیدا خوێنی موسوڵمان حەلاّڵکراوە ، موسوڵمان دەکرێت بەگژی موسوڵماندا و ، کورد دەکرێت بەگژی کوردا ، بەڕاستی رۆژی ئەوەیە سەری خۆمان کز کەین بەهیچ شێوەیەك بەشداری خوێن رشتنی براکانمان نەکەین وەك ابو موسى (ﷺ) لەپێغەمبەرەوە (ﷺ) بۆمان دەگێڕێتەوە کەدەربارەی رۆژگاری فیتنە فەرموویەتی: (كَسِّروا فيها قِسِّيكم وقطِّعوا فيها اوتاركم والزموا فيها أجواف بيوتكم ، وكونوا كابن ادم ) رواه الترمذي التاج : ٥/٢٠٤.

واتە: لەو رۆژانەدا کەوانەکانتان بشکێنن ، تیرەکانتان پارچە پارچە بکەن بچنە ژوورەوەی ماڵەکانتان و وەك کوڕەکەی ئادەم بن واتا: دەستی کوشتن بۆ کەس درێژ مەکەن. یەکیٚ لەو

وەسیەتانەی کەپێغەمبەر (ﷺ) تەئکیدی لەسەر کردەوە لە(حجـة الـوداع)دا ئـەوەبوو فـەرمووی: (لاترجعوا بعدي كفاراً يضرب بعضكم رقاب بعض ) متفق عليه.

واتـە: دوای مـن کـافر مەبنـەوەو لـەدین وەرمەگـەڕێن کەهـەندێکتان بـدەن لەگـەردنی هـەندێکی ترتان.

زۆرجار تۆ های لەماڵ خۆتدا بەڵام هەر بەزمانت خۆت بەشداری قەتلێك دەکەیت کەدووربووە لەتۆ، وەك پێغەمبەرمان(ﷺ) دەفەرموێ: (من اعان على قتل مسلم بشطر كلمة لقى الله مكتوب بين عينيه آيس من رحمة الله ) الكبائر للذهبي /١٨.

واتە: هەرکەس یارمەتی کوشتنی موسوڵمانێك بدات بە نیوەی قسەیەك دەچێتە بارەگای خـوا لەناو چاوانی نووسراوە: بێبەش لەڕەحمی خوا .

تەنانەت کوشتنی (اهل الذمة)واتە: ئەو گاورو جوولەکانەی لـەژێر سایەی دەوڵـەتی ئیسلامدا دەژین و کوفـرو ئاشـووب عـەرەق و زینـا بـڵاو ناکەنـەوە کوشـتنی ئـەوانیش دروسـت نییـە وەك پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێ: ( ألاَ من قتل نفساً معاهداً لها ذمة الله وذمة رسوله فقد اخفر ذمة الله ولايُرح رائحة الجنة ، وان ريحها ليوجد مـن مسيرة سـبعين خريفاً ) صححه الـترمذي الكبـائر للذهبي/١٨.

واتـە: هەرکـەس کەسـێکی هاوپـەیمان بکوژێـت کەپـەیمانی خـواو پێغەمبـەری درابێتـێ ئـەوە پەیمانی خـوای شـکاندووەو بۆنـی بەهەشـت ناکات هەرچەند بۆنی بەهەشت ڕێگای حەفتا پـایز دەڕوات.

سـاخوایە دەسـتو دەممـان بپـارێزە لەبەشـداری کـردن لـەتاوانی قـەتڵو خوێـن ڕشـتن و هـەموو تاوانێکیتردا.

## ( ١٣ ) رووتـی ئافرەت: ٢٠٠١/٤/٢٠

الحمد لله رب العالمين ، وبعد اخوة الاسلام قال تعالى: ﴿ وقـرن في بيوتكـن ولا تـبرّجن تَـبَرُّج الجاهلية الاولى واقِمْن الصلاة وآتين الزكاة واطعن الله ورسوله انما يريد الله ليذهـب عنكم الرِّجس اهل البيت ويطهركم تطهيراً ﴾ الاحزاب : ٣٣.

پشووی هاوین بەحوکمی ئەوەی دەرگای قوتابخانەکان دادەخرێن هەق وابوو دیاردەی رووتـی ئافرەتو هاتنە دەرەوەیان کەمتر بەدی بکرایە، بەڵام زۆر بەداخـەوە مـرۆڤ کـاتێك دەچێتـە دەرەوە دیـاردەی رووتـی ئافرەتـاندەبینـێ لـەو بـازاڕەدا سەرسـام دەوەسـتێ! مرۆڤـی بـەغیرەت لـەخۆی دەپرسێ: بلێی راست بێ ئەمە میللـەتی کورد بێوای بەسـەر هـاتبێ؟... بلـێی راست بـێ ئەمـە

شاری سلێمانیو شارەکەی کاك ئەحمەدو شێخ معروفو مەولانا بێ؟ ئەمەی ئێمە دەیبینین واقعە یان خەوە؟

دەی ئەگەر خەو نییە زانایانی ئاین لەکوێنو بۆ نایەنە گۆ؟ بڵێی خوا نەخواستە ئەوانیش بەم بارو دۆخە راهاتبنو لایان ئاسایی بووبێتەوە؟ ئومێدم وایە وانەبێت،بەلاّم سەیرتر ئەوەیە دەڵێن: هەندێ لەمامۆستا ئاینییەکانو شێخانی تەریقەتیش کچەکانیان وەك کچی خەڵکی لێبەسەر هاتووە، سەرو ملو قاچو قۆڵو دەستو پل رووتنو حیجابی قورئانی بەدیاردەی سیاسی دەدەن لەقەڵەم... (انا لله وانا اليه راجعون ).

بەڕاستی ئێستا بەجوانی فەرموودەکەی پێغەمبەر(ﷺ) دەردەکەوێ: ( ماتركت بعدي فتنة هي اضر علی الرجال من النساء)(متفق عليه) واتە: دوای خۆم هیچ تاقیکردنەوەو مەینەتییەکم جێنەهێشتووە زیان بەخشتر بێت لەئافرەتان بۆ پیاوان.

لێرەدا بۆئەوەی زیاتر مەسەلەی خەتەرناکی ئافرەت دەربکەوێ قسەیەکی(جێب) کەراوێژکاری وەزارەتی خارجی ئینگلیز بووە لەسەردەمێکدا، دەخەمە روو کەلەشێوەی مژدەدا دەڵێت( ...فەرمانەکانی ئاینو یاساکانی رەوشتی ئیسلامی لەنێو موسڵماندا بەرەو گۆڕان دەڕۆن، ئەم گۆڕانەش وردە وردە لەخورەوشتی رۆژئاوایان نزیك دەکاتەوە کەئەو خورەوشتەیش لەهەمان کاتدا بریتییە لەدیاردە رەوشتییەکانی کڵێسای گاورێتی...).

ئەمجا دەڵێت: (گەشە کردنی زانست لەرێی قوتابخانەو رۆژنامەکانەوە کارێکی وای کردووە بە موسڵمانان ـ بێئەوەی بەخۆیان بزانن ـ لەرواڵەتی گشتیاندا لەبێ دین بچن ...).

کاریگەرترین چەك کەرۆژئاوا بەکاری هێنا بۆ بەدەستهێنانی ئەم مەبەستە مەسەلەی ئافرەت بوو، گوێ بگرن لەرۆژهەلاّتناسێ تریان بەناوی(جب)ەوە دەڵێ: (قوتابخانەی کیژان لەولاّتانی عەرەبیدا بیلبیلەی چاوی منن هەمیشە واهەست دەکەم کەپاشە رۆژی ئێمە وابەفێرکردنی کچان و ژنانەوە، هەولّو تەقەللای ئێمە لەم لایەنە بەلاوازی دەستی پێکرد بەلاّم وا ئەمڕۆ (کۆمەڵەی مژدەدەرەکان) (الجمعيات التبشريه) چاویان تێبڕیوە)[1].

دیارە ئافرەت دەورێکی زۆر کاریگەری هەیە لەبوونیەی کۆمەڵگاداو بەرەو باش بردنی، یان بەرەو خراپ بردنی، بۆیە قورئانیش بەیەکەم دەرگای ئارەزووەکانی دنیای داناوە: ﴿ زُين للناس حب الشهوات من النساء والبنين والقناطير المقنطرة...﴾ (ال عمران : ١١٣) واتە: جوانکراوە لەبەر دڵو چاوی ئادەمیزاد خۆشەویستی ئارەزووەکانی دەرون لەئافرەتو کوڕو منداڵو ماڵو سامانی زۆر و .... هتد).

---

[1] هەموو کیژێکی خاوەن باوەڕ (عمر احمد نظامي).

جامن لەم وتارەدا رووی ئامۆژگاریم دەكەمە هەموو ئەو ئافرەتانەی باوەڕیان بەخواو بەڕۆژی دوایی هەیە پێیان دەڵێم: خوشكەكانم بوونی ئێمە لەم ژیانەدا بوونێكی پڕمانایەو پاشە ڕۆژی لەدوایە، هیچ شێوە رابواردنێكی ئەم ژیانە پاشەڕۆژتان لەبەرچاو ون نەكات، لەیادتان بێت ژیانی دنیا بێ‌نرخ و كەم بایەخەو ئەم ژیانە ساتێكی كەمەو تاقی‌كردنەوەیەو ئافرەت گەورەترین وانەكانی ئەم تاقی‌كردنەوەیە، چونكە هەموو تاوان و خراپەیەك كەخوا حەرامی كردووە وەك دزی‌و درۆو عەرەق‌و... هتد لەگەڵ سروشتی پاكی مرۆڤایەتیشدا ناگونجێ بەلاّم تەنها شتێك لەم قاعیدەیە جیادەكرێتەوە ئارەزووی جنسی‌یە كەسروشتیش حەزی پێ‌دەكات، بۆیە شەرع بەكوللی حەرامی نەكردووە بەڵكو سنوری بۆ دیاری‌كردوە نابێت لەسنووری حەلاڵ تێپەڕی.

خوشكی بەڕێز لەوانەیە هەندێ كەس بەنیازی تایبەتی خۆی حیجابی شەرعی لاناشیرین كردبیت‌و پێت بڵێ: ئەمە دیاردەیەكی سیاسی یان سعودی یان عەرەبی‌یە... بەلاّم من یادت دەخەمەوە بەفەرموودەیەكی پێغەمبەر(ﷺ) كەئیمامی(مسلم) بۆمان دەگێڕێتەوە: ( صنفان من أهل النار لم أرهما، قوم معهم سياط كاذناب البقر يضربون بها الناس، ونساء كاسيات عاريات مميلات مائلات رؤوسهن كاسنمة البخت المائلة ، لايدخلن الجنة ولايجدن ريحها وان ريحها ليوجد من مسيرة كذا وكذا)(رواه مسلم) واتە: دوو جۆر كەس هەن ئەهلی دۆزەخن من نەمدیون: ئافرەتانێكی پۆشتە بەنیعمەتەكانی خوا بەلاّم رووت لەبەرگی شەرم‌و حەیاو شوكرانە بژێری، دڵی گەنجەكان دەبزوێنن دەڕۆن بەرێدا فیزو لەنجەو لار دەكەن سەریان خڕكردووە وەك پشتی وشتر ناچنە بەهەشت‌و بۆنیشی ناكەن...هتد) خوشكی بەڕێز دەتخەڵتێنن بەوەی ئەم جل‌و بەرگە سیاسی‌یە ئەی بۆچ توێش و ئەوانیش نازانن تادوێنێ دایك‌و نەنەكانی كوردەواری چەندە بەحەیاو حورمەت‌و داپۆشراو بوون؟ لەیادتان چوو كەكراسەكانیان فەقیانەی هەبو بۆئەوەی دەستیشیان بپۆشێت؟

ئەی بۆ تۆیش‌و ئەوانیش نازانن ئەم جل‌و بەرگەی ئەمرۆ ئافرەت لەبەری دەكاتو هەر ڕۆژەی بەمۆدێلێ دەیگۆڕێ و تابنبال‌و بنڕانی دەرخستووە ئەمە چاولێكەری كوێرانەی ئەورووپاو غەربی كافرە و دوورە لەڕەوشتی كوردایەتی، كوفرە بەم باوردۆخە بوترێ كوردایەتی‌و نیشتمان پەروەری، بەڵكو ئەمە عەینی كۆیلایەتی و دژایەتی عادەتی رەسەنی كوردە.

(روی ان جبريل نزل على النبي(ﷺ) فقال يا جبريل هل تنزل بعدي؟ فقال: نعم يارسول الله انزل عشر مرات ارفع العشر الجواهر، فقال ياجبريل وما ترفع منها؟ قال: الاول: ارفع البركة من الارض، الثاني: ارفع المحبة من قلوب الخلق، الثالث: ارفع الشفقة من قلوب الاقارب، الرابع: ارفع العدل من

الامراء، الخامس: ارفع الحياء من النساء، السادس: ارفع الصبر من الفقراء، السابع: ارفع الورع والزهد من العلماء، الثامن: ارفع السخاء من الاغنياء، التاسع: ارفع القران، العاشر: ارفع الايمان)[1].

واته: ريوايەتكراوە جبريل دابەزى بۆ سەر پێغەمبەر(ﷺ) لێی پرسی: ئەی جبريل دوای من دادەبەزی؟ فەرمووی: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا (١٠) جار دادەبەزم (١٠) گەوهەر لەسەر زەوی هەڵدەگرم، فەرمووی: ئەی جبريل چی هەڵدەگری لەسەر زەوی؟ فەرمووی: يەكەم: بەرەكەتی ئەرز هەڵدەگرم، دووەم: خۆشەويستی لەدڵی خەڵك هەڵدەگرم، سێيەم: سۆزو بەزەيی لەدڵی خەڵكە نزيكەكان( خزمەكان) هەڵدەگرم، چوارەم: دادوەری لەپاشاو سەرگەورەكان هەڵدەگرم، پێنجەم: شەرم لەئافرەتان هەڵدەگرم، شەشەم: سەبرو خۆگری لەهەژاران هەڵدەگرم، حەوتەم: وەرع و خۆپارێزیو دنیانەويستی لەزانايان هەڵدەگرم، هەشتەم: سەخاوەت لەدەوڵەمەندەكان هەڵدەگرم، نۆيەم: قورئان هەڵدەگرم، دەيەم: ئيمان هەڵدەگرم .

## (١٤) داوێن پيسی(١) : مايسی ٢٠٠٠

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ولاتقربوا الزنا انه كان فاحشة وساء سبيلا﴾(الاسراء:٣)

واتە: نزيكی زينامەكەون بەراستی زينا كارێكی زۆر ناشرينو رێگايەكی خراپە.

هەروەها پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێ:(لم تظهر الفاحشة في قوم قط حتى يعلنوا بها الا فشا فيهم الطاعون والاوجاع التي لم تكن في اسلافهم الذين مضوا) الحاكم وابن ماجه والبزار.

مانای: بەدكاریو زينا لەهيچ گەلێكدا دەرناكەوێ بەشێوەيەك ئاشكرای بكەن ئيللا جۆرە تاعونو وەباو دەردو ئازار لەناوياندا پەيدا ئەبێت كەلەپێشينانو رابوردووەكانياندا نەبووبێت .

وەك جاری رابوردوو باسمان كرد داوێن پيسی بەرهەمی تەماشای حەرامە بەری پيسی ئەو نەخۆشيە دەروونيەيە، خيانەتەو دەست درێژيە بۆسەر ناموسو تێكدانی خێزانەو، تێكەڵاو كردنی نەسلو رەگەزە چونكە ئەو ئافرەتەی ئەوكارە خيانەتكاريە بكات مانای منداڵێكی ئاوارە دەخاتە ناو عەشيرەتی مێردەكەيەوەو مێردەكەی وادەزانێ منداڵی خۆی بەخێو دەكات، بەڵام هی كەسێكیترە، وە ئەوپياوە نامەردەی نوتفەی خۆی لە سكی ئافرەتێكدا بەحەرامی دائەنێ مانای منداڵی خۆی خستۆتە ناوعەشيرەتێكی ترەوە .

ديارە پلەی داوێن پاكی لای خوا زۆر گەورەيە بۆيە خوای گەورە دەيكات بەيەكێك لەسيفەتەكانی برواداری سەرفرازو بەختەوەر ﴿ قد افلح المؤمنون الذين هم في صلاتهم خاشعون ﴾ تادەگاتە ﴿ والذين هم لفروجهم حافظون الا على ازواجهم أو ماملكت ايمانهم فانهم غير ملوميذ﴾المؤمنون (١ . ٦) واتە: بەختەوەرن ئەو موسڵمانانەی عەورەتی خۆيان لەحەرام دەپارێزن

---

[1] نور الابصار / ٥١ ،٥٢.

مەگەر لەگەڵ خێزانی خۆیاندا یان ئەو کەنیزەکانەی موڵكو حەلاڵی خۆیانن ئەوانە لۆمەنەکراون ﴿فمن ابتغى وراء ذلك فاولئك هم العادون ﴾ هەرکەس لەسنووری حەلاڵی خوا لابدات ئەوانە ستەمکارن.

ئاییینی ئیسلام کاتێك زینای حەرام کردووە مانای وانیە سروشتو ئارەزووی مرۆڤی سەرکوت کردووە، بەڵکو سنورێکی رەوای بۆ داناوە بۆ ئەوەی دیواری خێزانو حەیاو شەرمی خێزانی پتەوبێت، نەفس برسیو چڵێسەکان نەتوانن ئەو سنوورە بشکێنن، بەڵگەشمان ئەوەیە خوای گەورە بەدەقی ئایەت فەرمانمان پێ‌دەکات بەژنهێنانو بەشوودانی عازەبو گەنجەکان وەك دەفەرموێ: ﴿وانكحوا الايامى منكم والصالحين من عبادكم وامائكم ان يكونوا فقراء يغنهم الله من فضله والله واسع عليم﴾ النور: ٣٢. واتە: ئەوانەتان کەبێ ژنو بی مێردن لەخۆتانو لەعەبدو کەنیزەکە ساڵحەکانیشتان ژنیان بۆ بهێننو بیاندەن بەشوو تەنانەت ئەگەر هەژارو کەم دەستیش بن خوا دەوڵەمەندیان دەکات بەهۆی هاوسەرگرتنی حەلاڵەوە خوا رزقی فراوانەو زانایە بەبەندەکانی خۆی. بۆیە(ابن مسعود) دەیفەرموو: ( التمسوا الغنى في النكاح)واتە: بەدوای دەوڵەمەندیدا بگەرێن بەژنهێنان، هەروەها( ابوبکری سدیق) دەیفەرموو: (ئێوە فەرمانی خوا بەجێ بهێنن بەژنهێنان خواش بەڵێنی خۆی بەجێ دەهێنێ بەدەوڵەمەند کردنتان)[1] .

هەروەها ژن هێنانو خۆشەویستی نێوان ژنو مێرد نیشانەی گەورەییو دەسەڵاتی خوایە ﴿ومن آياته ان خلق لكم من انفسكم ازواجاً لتسكنوا اليها وجعل بينكم مودة ورحمة ﴾ الروم/ ٢١ واتە: لەبەڵگەو دەسەڵاتی خوایە کەهەر لەخۆتان خێزانو هاوسەری بۆ دروستکردوونو خۆشەویستیو سۆزی لەنێوانتاندا خوڵقاندووە، جاری واهەیە ژنومێرد یەکێ خەڵکی ئێرانەو یەکێ خەڵکی تورانە کەچی گەورەترین پەیوەندی و سۆز دروست دەبێت لەنێوانیاندا.

هەروەها پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێ: ( تناكحوا تناسلوا فاني مباه بكم الامم ) البيهقي[2] . واتە: ژن بهێننو شوبکەن دەبێتە هۆی زۆربوونی وەچەتان چونکە من شانازیتان پێوەدەکەم بەسەر ئوممەتەکانی تردا بەوەی کەئوممەتی من لەهەموویان زیاترە.

بەلام بێگومان زینا دەبێتە هۆی قەلاچۆکردنی وەچە چونکە منالی زینا یان هەر لەسەرەتاوە بەحەبو دەرمان لەناو دەبرێت، یان لەسکی دایکیدا لەبار دەبرێ یان ئەگەر بویش بێ‌باوك یان بێ‌باوكو دایك دەبێتو لەژیانا بەچاوی سووك تەماشا دەکرێت بێ‌ئەوەی ئەو هیچ تاوانێکی کردبێت. وە ئەوەش بزانین هەر گەلو ولاتێك رێگای حەلاڵیان لەسەر خۆیان گران کرد رێگای حەرامیان لێ‌دەکرێتەوە، بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) دەمانترسێنێ لەم دیاردە خەتەرناکەو دەفەرموێ: ( اذا

---

[1] تفسير ابن كثير ، سورة النور .

[2] منهل المؤمنين : ٥٤٨.

جاءكم من ترضون دينه وخلقه فانكحوه الا تفعلوه تكن فتنة في الارض وفساد كبير ) رواه الترمذي وحسنه[1] .

واته: ئەگەر كەسێك هاتە خوازبێنی کچەکانتان کەرازی بوون لە دینیو رەوشتی ژنی بدەنێ ئەگەر وانەكەن فیتنەو فەسادێکی گەورە بەرپادەبێت لەزەویدا.

لەكاتی زینادا ئیمان بارئەكاتو خاوەنەكەی جێ دەهێلێ وەك پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێ: ( اذا زنى الرجل خرج منه الايمان فكان كالظُّلَّة فاذا اقلع رجع اليه الايمان ) ابوداود والترمذي والحاكم[2].

واته: لەكاتێكدا پیاو زینادەكات باوەڕ لەدڵیدا دەردەچێ وەك چەترێك بەسەر سەریەوە دەوەستێ هەركات دەستی هەڵگرت دەگەڕێتەوە.

كەوابوو ئەگەر لەوحاڵەدا كەسێك بمرێ یان بكوژرێ مەترسی بێئیمانی لێدەكرێ. ئەو هۆكارە سەرەكیەی كەبتوانێ مرۆڤ لەم خوە پیسە بگێڕێتەوە ــ بەتایبەت لەم رۆژەدا كەتێكەڵاوی زۆر بووە، زۆربەی پیاوان ئاگایان لەماڵو منالی خۆیان نەماوە ــ تەنها ترسی خوایە، ترسی خواش لەهەر دڵێكدا دروست بوو كەفیلە بەوەی بیپارێزێ ئەوەتا پێغەمبەر(ﷺ) موژدەمان دەداتێ حەوت كەس لەرۆژی قیامەتدا دەچنە ژێر سێبەری خوا لەرۆژێكدا هیچ سێبەرێك نامێنێ جگە لەسێبەری خوایی، وەیەكێك لەو حەوت كەسە ( رجل دعته امراة ذات منصب وجمال فقال اني أخاف الله) پیاوێكە كەئافرەتێكی خاوەن جوانیو پلەوپایە بانگی بكات بۆ خراپە ئەویش لەوەڵامدا بڵێ: من لەخوا دەترسم.

غەزالی دەگێڕێتەوە: (سلیمانی كوری یەسار) جوانترین روومەتی هەبوو ساڵێك لەگەڵ هاورێیەكی چوون بۆ حەج لەناوچەی (ابواء) لایاندا پشووبدەن هاورێكەی توێشوودانەكەی هەڵگرتو چوو بۆ بازاڕ شت بكرێ، سلێمان لەخێمەكەدا دانیشت، ئافرەتێكی لادێنشین لەسەر لوتكەی چیاكەوە چاوی لێ بوو هاتە خوارەوە بۆلایو لەبەردەمیا وەستاو پەچەكەی لابرد روومەتی وەك پارچەیەك لەمانگەشەو وابوو، بەسلێمانی وت: دڵخۆشم كە ... ئەویش وایزانی خواردنی دەوێ پاشماوەی خواردنەكەی بۆ برد وتی: من ئەوەم ناوێ، ئەوەم دەوێ كەپیاو لەگەڵ خێزانی خۆی دەیكات، وتی تۆ ئیبلیس بۆ منی رازاندویتەوە، ئەمجا سەریكرد بەبەینی رانیاو دەستی كرد بەگریان زۆر گریا هەتا ئافرەتەكە پەچەكەی دایەوە بەسەریاو رۆیشت، كاتێك هاورێكەی هاتەوە بینی ئەوەندە گریاوە چاوی ئاوساوە، وتی: بۆچی گریاوی؟ وتی: یادی منالەكانمان كردەوە، وتی: یادی منال نیە شتێك روویداوە زۆری لەگەڵ وت هەتا راستی پێ وت.

---

[1] التاج الجامع للاصول : ٢/٢٨٤.

[2] منهل المؤمنين : ٥٤٨.

ئەمجا هاورێکەی دەستی کرد بەگریان وتی: تۆ بۆچ دەگری؟ وتی: بۆ ئەوە دەگریم ئەگەر من لەشوێنی تۆدا بوومایە خۆم نەدەگرت.

لەکاتێکدا(سلیمان) گەیشتە(مكة) طەوافی کردو هاتوچۆی نێوان صەفاو مەروەی کرد خۆی پێچابەجلەکانیەوە لە حیجری اسماعیلدا خەوی لێکەوت لەخەویدا پیاوێکی جوانی بالا بەرزی دی نیشانەیەکی جوان و بۆنێکی خۆشی هەبوو، سلێمان پێی وت: خوا رەحمت پێ بکات تۆ کێ ی؟ وتی: من یوسفم، وتی: تۆ یوسفی سدیقی؟ فەرمووی: بەڵێ؛ وتی: بەراستی رووداوی نێوان تۆو ژنەکەی عەزیزی میسر جێگای سەر سوورمانە! یوسف فەرمووی: رووداوی نێوان تۆو ژنەکەی (ابواء) زیاتر جێگای سەر سوورمانە[1].

خوایە تۆو ناوە جوانەکانی خۆت دڵ و دەروون و لاشەمان خاوێن کەیت لەتاوان و خراپەکاری...ئامین.

## داوێن پیسی(٢):

لەجاری رابوردوودا ئایەتێکی قورئان و فەرموودەیەکی پێغەمبەری ئازیزمان خوێندەوە لەسەرباسی وتارەکەماندا، ئەمجارەش دیسانەوە دەچینەوە خزمەت ئەو دوو دەقە پیرۆزە بۆئەوەی بزانین تاچ ئەندازەیەك تەفسیرەکەیان لەدنیای واقیعدا بەدی ئەکرێ ئایەتەکە دەفەرموێ: ﴿ ولا تقربوا الزنا انه كان فاحشة وساء سبيلا﴾الاسراء:٣٢.

بەراستی هەر قورئانە بتوانێ لەچەند وشەیەکی کورتدا ئەم واقعە خراپە بخاتە روو بەشێوەیەك هەموو مرۆڤێکی هەست زیندوو قێزی لێبکاتەوە، گومان لەوەدانیە قورئان فەرموودەی خوایە، خوایش خاوەنی راستەقینەی مرۆڤەکانەو دروستکاریانە، خۆی دەزانێ چی بۆیان خراپەو چی بۆیان باشە؟ کاتێك زینا بەفاحشەو خراپترین رێگا ناو دەبات هەردەبێ وابێ جا ئەگەر مرۆڤەکان رازی بوون بەفەرموودەی خواو دووربوون لەو خووە پیسە مانای سەرفرازن، ئەگەر وانەبوون مانای خۆیان خستۆتە بەر خەشم و قینی خوا، خەشم و قینی خواش دوو جۆرە:

یەکێکیان لەقیامەتدایە ئەمە لەجاری پێشوودا ئاماژەمان پێدا، جۆرێکی تریان لەژیانی دنیایە ئەمەیان باسی ئەمجارەمان دەبێت ـپشت بەخوا ـ ئەم جۆرەیان ئەوەیە پێغەمبەرمان(ﷺ) باسی کردووە بۆمان ( لم تظهر الفاحشة في قوم قط حتى يُعلنوا بها الا فشا فيهم الطاعون والاوجاع التي لم تكن مضت في اسلافهم الذين مضوا ) الحاكم وابن ماجة والبزار.

خوتبەی رابوردوو مانای فەرموودەکەمان کرد، ئەو نەخۆشیانەش کەبەهۆی زیناو نێربازیەوە پەیدابوون زۆرن ئاشکراکانیان ئەمانەن:

---

[1] احياء علوم الدين:٣/١٠٠.

١ ـ نەخۆشـــی(زهـــری) (الســـفلس): کەنەخۆخشـــیەکی ســـاریەو دەبێتـــە هـــۆی کـــون بوونـــی ئەندامەکانی نەخۆشەکەو لەکۆتاییدا شێوەی مرۆڤی لێ هەڵدەگرێ (٥٠) ملیۆن کەس گیرۆدەی ئەم دەردەیە[1].

٢ ـ نەخۆشی (سیلان): ئەمیش نەخۆشی‌یەکی ساریەو زۆر بـڵاوە لەجیـهاندا سـاڵانە( ٨٠ ـ ٢٠٠) بلیۆن دۆلاری دەوێ بۆ عیلاج، تائێستا (٢٥٠) ملیۆن کەس ساڵانە تووش دەبێت[2].

٣ـ (هَرْبس الجنسي): بڵاودەبێتـەوە لـەرێی زینـاو نێربازییـەوە بەشـێوەی خورانـدن‌و دومـەڵ‌و کێم لەسـەر ئەندامـەکانی ئـەو نەخۆشـە بەتایبـەت لەسـەر ئەندامـەکانی زاوزێ، تالەلایەکـەوە چـاك دەبێتـەوە لەلایـەکی تـرەوە سـەر هـەڵدەدات. (٢٠) ملیـۆن کـەس تـوش بـووە بـەم دەردە لەوڵاتـە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، ساڵانەش نیو ملیۆن زیاد دەکات.

٤ ـ نەخۆشی (ئایدن) کەتازەترین نەخۆشـیە لـەناوەندی داوێـن پیسـەکاندا سـەری هـەڵداوە، وەیەکەم کەس دۆزرایەوە تووشی ئەم نەخۆشیە بووە ساڵی ١٩٧٩ لەشاری نیویۆرك لەئەمەریکا، ئەمجا زۆر پـەرەی سەند وەك ئـاگری نـاو پـووش‌و بێشـە بـەربووە گیـانی ئەوکەسـانەی دژایـەتی سروشـتی مرۆڤایـەتی دەکـەن‌و دەیانـەوێ مرۆڤیـش وەك ئـاژەل بێ‌سـنوورو بێ‌یاسـا پـەیوەندی جنسی ئەنجام بدەن. ( ئایدز - AIDS) وشەیەکی کورت کراوەیە لەچوار وشە ماناکەی بەکوردی (تێکشانی هۆکارەکانی بەرگری سروشتی لەلاشەدا) واتە لاشەی ئەو مرڤە بەتـەواوی دەسەوسان دەبـێ لەبـەردەم ڤایرۆســی هــەموو نەخۆشـیەکدا توانـای بـەرگری نـامێنێ تەنانـەت بەرامبـەر بەهەلامەتێکی سووك، لەکاتێکدا لاشەی مرۆڤ سەدان هۆکاری بەرگری تێدایە.

ئایدز بەرهەمی جەنگێکی جیهانی سێیەم یان چەکێکی ئەتۆمی نی‌یە، بەڵکو سزای خوایە بۆ ئەو گەلانـەی کافربوون‌و لەراستە شەقام لایانداوە ﴿ ولنذيقنـهم مـن العذاب الادنـى دون العـذاب الاكبر لعلهم يرجعون ﴾ السجدة: ٢١. مانای ئێمە تاڵی سـزای دنیایـان پـێ دەچێژیـن پێـش سـزای گەورەی پاشە رۆژ بەڵکو پەشیمان ببنەوەو بگەرێنەوە.

ئـایدز دەردێکـە کەچارەسـەری یـەك نـەخۆش( ٥٠،٠٠٠ هـەتا ١٠٠،٠٠٠) دۆلاری دەوێـت درێژترین تەمەنی ئەو نەخۆشەش دوای تووشبوونی(٢ ـ ٣) ساڵە.

رێژەی مردن لەساڵی یەکەمیدا ٤٨٪

رێژەی مردن لەساڵی دووەمیدا ٧٥٪

رێژەی مردن لەساڵی سێیەمیدا ٩٢٪

---

[1] منهل المؤمنين ومورد الخطباء : ل ٥٥١ .

[2] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

نەخۆشی ئایدز ئەوەندە ساریە لەرێگای خوێنەوە لەرێگای پەیوەندی جنسییەوە تەنانەت لەرێگای ماچ کردنو لیکی نەخۆشەکەوە بۆ کەسانیتر دەگوێزرێتەوە، دوای مردنیش ئەوکەسانەی بەرپرسن لەشاردنەوەی مردوو دەستی لێنادەن، پزیشکەکان دەستکێش لەدەست دەکەن لەکاتی چارەسەردا دوای لێبونەوە دەستکێشەکان دەسووتێنن. هەندێ سەرژمێری ئەو نەخۆشییە وادەگەیەنێ کەسالی ١٩٨٠ (٦٠) حالەت دەست نیشان کرابوو لەئەمەریکا لەسالی ١٩٨١ ( ٨١٤٣٢) حالەت دەستنیشانکرا لەجیهاندا[١] هەروەها سەرژمێریەکانی دەری دەخەن کەلەکۆی(١٤٧٣٩) حالەتی ئایدز (١٠٦٥٣) کەسیان لەو کەسانەن نێربازنو کاری قەومی (لوط) ئەنجام دەدەن ، ( ٢٤٩٤) کەسیان ئەوکەسانەن کەماددە سڕکەرەکان بەکاردەهێنن لەرێی دەرزی دەمارەوە کەلەرێگای ئەو دەرزیانەوە نەخۆشیە دەگوێزرێتەوە، ئەوانی تریش ژنو منداڵی ئەو کەسانەن کەتووشی ئەو نەخۆشیە ترسناکە بوون[٢] . بەم شێوەیە ئەمەریکا کەسەرچاوەی یەکەمی ئەم نەخۆشیە کوشندەیە وا لەهەوڵی بڵاوکردنەوەیدا بەجیهاندا لەرێگای سەربازو رێکخراوە . بەناو خزمەت گوزاریەکانیەوە تەنانەت لەسالی (١٩٩٦) دا(٢٣) ملیۆن حالەتی ئایدز لەجیهاندا تۆمارکراوە کە(١٤) ملیۆنی لەباشووری سەحرای ئەفریقادا بووە، هەڵگرانی ڤایرۆسی ئایدز لە ئاسیادا نزیکەی (٧) ملیۆن کەس بووە[٣].

کۆریا کەدەکەوێتە رۆژهەلاتی ئاسیاوە گەورەترین مەڵبەندە بۆ بلاوبوونەوەی ئایدز تیایدا لەرێگای سەربازە ئەمەریکییەکانەوەکەبەشێوەیەکی رەسمی(٢٠) هەزار کچ خزمەتی (٤٠) هەزار سەربازی ئەمەریکییان دەکرد لەناوەراستی هەشتاکاندا[٤] وەهەزاران ئافرەتی داوێن پیس پێشکەشیان دەکرا.

لەئەمەریکاو زۆربەی ولاتەکانی ئەوروپا نێربازو داوێن پیسەکان بەشێوەیەکی یاسایی لەژێر ناونیشانی سەربەستیو ئازادیدا کاردەکەن، تەنانەت ئوسقوفو قەشەکانیش فتوایان بۆداونو چەندین کۆمەڵەی یاساییان دروست کردووە، وەئەم مرۆڤە جوانەی خوا دروستی کردووە ( فی احسن تقویم) لەجوانترین شێوەی روالەتو رەوشتەکاندا، ئەوان بردویانە بەرەو (اسفل السافلین) ئەمەش نەخشەی یەهودیەکانە کەلەجیهاندا پیادە دەکرێ وەك لە (پروتوکولات حکماء صهیون) دا هاتووە : (واجبە هەوڵ بدەین بۆئەوەی رەوشت لەهەموو شوێنێکدا بروخێت، ئەوکاتە بەئاسانی دەست بەسەر جیهاندا دەگرین، فرۆید لەئێمەیە ئەویش بەردەوام پەیوەندییە جنسییەکان

---

[١] منهل المؤمنین ومورد الخطباء.٥٤٣

[٢] غضب الله تعالی یلاحق المتمردین: ٨. ٩.

[٣] المنهل، ٥٤٣.

[٤] غضب الله تعالی : ١٣ ـ ١٦.

لەرۆشنایی رۆژدا ئاراستە دەکات بۆئەوەی هیچ شتێك بەپیرۆزی نەمێنێ لای گەنجەکان، وەهەرچی هەوڵو تەقەللایان هەیە بۆ تێرکردنی ئارەزووی جنسی بێت ئیتر کۆشکی رەوشت دەرِوخێ)[1]

گوێ بگرن لەفرۆیدیش ـ کە جولەکە دەڵێن لەئێمەیە ـ لەوتەیەکیدا دەڵێ: ( مرۆڤ ناتوانێ کیانی خۆی دروست بکات بەبێ تێرکردنی ئارەزووی جنسی، وەهەر سنورێك دابنرێت لەورێگایەدا ئایا دین بێت یان رەوشت، ئەوە سنوورێکی پووچەڵەو رووخێنەرە بۆ وزەی مرۆڤو سەرکوت کردنێکی نادروستە)[2].

براو خوشکی موسڵمان ئەم راستیانەم خستە پێش چاوی دڵت تابەرِوونی بزانی هەرلادانێك لەشەرعی خوا سزای بەدواداڕێت، بەتایبەت لادانی رەوشتی، هەرکات زۆر بوو ئاشکرابوو خوای گەورە سزای گشتی دەنێرێو باش‌وخراپ تێوە دەتلێ، عائشە لەپێغەمبەر(ﷺ) دەپرسێ( انهلك وفينا الصالحون ؟ قال: نعم : اذا كثر الخبث ).

واتە: ئایا لەناو دەچین لەکاتێکدا پیاوچاکمان تیابمێنێ؟ فەرمووی: بەڵێ هەرکات خراپە زۆر بوو .

هەروەها ئەم راستیانەم خستە پێش چاوت تاباش بزانی هەموو ئەو کەس‌و لایەنانەی برەو بەرووتی ئافرەت‌و تێکەڵاوی نێرومێ دەدەن‌و دەیانەوێ بەرگی شەرم‌و ئابڕوو لەبەری ئافرەت دابرِنن ئیتر بەهەر ناوێکەوە بێت، ئەوانە قوتابی گوێرایەڵی (فرۆید) ن‌و دەیانەوێ دڵی جولەکەمان پێخۆشکەن‌و کوردستان بەرەو ئەوپاشە رۆژە نادیارە بەرن کەئەمرۆ ئەمریکاو ئەورووپا پێوەگیربوون‌و پێوە دەناڵێنن.

ئەوەش بزانین تاکە چارەسەر بۆ سەرفرازیمان تەنها گەرانەوەیە بۆ ئیسلام ﴿ وننزل من القران ماهو شفاء ورحمة للمؤمنين ولا يزيد الظالمين الا خساراً ﴾ .الاسراء/٨٢

خوایە لەبەر ناوەجوانەکانی خۆت کۆمەڵگاکەمان خاوێن کەیتەوە لەهەموو رەوشتێکی پیس‌و چەپەڵو بمانگێرِیتەوە بۆسەر شارێگەی ئیسلام ... ئامین .

## ( ١٥ ) دیاردەی سواڵکردن :٢٠٠١/٤/١٣

الحمد لله نحمده ..اللهم صل وسلم وبارك على سيدنا محمد واله وصحبه اجمعين

پێشەکی پێویستە بزانین وشەی سواڵ بناغەکەی وشەی (سؤال)ەو لەبنەرِتدا وشەیەکی عەرەبی‌یەو کورد کردوویانە بەسواڵ واتە: داواکردن.

[1] سەرچاوەی پێشوو.

[2] سەرچاوەی پێشوو.

پێشینانی ئێمە زۆر بەکەمی ئەم دیاردانەیان تێدا دەبینرا بەڵکو زۆرناچاری و برسێتی یەخەگیریان نەبوایە روویان نەهاتووە سواڵ بکەن ، تەنانەت پێشینانی ئێمە لەتەکیەی قەرەداغ بۆمان دەگێرنەوە کەلەگرانی گەورەدا پیاوێك لەتەکیە هیچیان نامێنێ بیخۆن رووی نایەت داوای هیچیش بکات ، دەچێتە ژوورەوە دەرگاکە لەسەر خۆی دادەخات ، کەئەوکاتە دەرگا کلیلو کوڵۆم بووە ، کلیلەکەیشی ، یان دەیسوتێنێ یان دەیشکێنێ لەناوی دەبات نایەتە دەر هەتا لەبرسا دەمرێت ، ئەمجا خەڵك پێی دەزانن.

بەڵام زۆر جێی داخە ئەمڕۆ سواڵکردن بووە بەپیشەو بەڵکو کردوویانە بەهونەرو جۆرەها شێوازی بۆ دروست بووە ، جۆرەها هۆکار خراونەتە کار بۆ خەڵەتاندنی خەڵك لەژێر ناونیشانی سواڵداو زۆربەی سواڵکەرانیش روودەکەنە مزگەوتەکانو نوێژو جەماعەتو ویردەکانی دوای نوێژ لەخەڵك تێك دەدەنو هەیانە رۆژی (٣ ـ ٤) مزگەوت دەگەڕێ لەهەر لایەك بەشێوەیەك خەڵك دەخەڵەتێنێ.

لەمەیش خراپتر ئەو ئافرەتە گەنجانەیە کەبەناوی سواڵەوە لەناو بازاردا دەگەڕێنو دوکان بەدوکان پەردەی شەرمو حەیا لەرووی خۆیان هەڵدەماڵنو دەچنە بەردەرکی کەسو ناکەس ، کەلەوبارەوە خەڵکی بازاڕ جۆرەها رووداوی پڕ لەئێش و ئازاریان بۆم گێڕاوەتەوە کەپێنووسەکەم رووی نایەت تۆماری بکات ! (انا لله وانا اليه راجعون ).

لەوبارەیەوە قسەو رووداو زۆرە ، چاکتر وایە بچینەوە سەرباسی حوکمی شەرعی لەسواڵدا ،ئەویش زۆر بەروونی دەردەکەوێت لەم فەرموودەی پێغەمبەرەوە(ﷺ) کە(قبیصە) ی کوڕی (مخارق) ی (الهلالی)(ﷺ) بۆمان دەگێڕێتەوەو دەفەرموێ: (تَحَمَّلتُ حمالة فأتيت رسول الله أساله فيها فقال: اقم حتى تاتينا الصدقة ، فنامر لك بها ، ثم قال: ياقَبيصَةُ ان المسألة لاتحل الاّ لأحد ثلاثة: رجل تحمل حمالة فحلت له المسألة حتى يصيبها ثم يمسك ، ورجل اصابته جائحة اجتاحت ماله فحلّت له المسالة حتى يصيب قواماً من عيش أو سداداً من عيش، ورجل اصابته فاقة حتى يقول ثلاثة من ذوي الحجا من قومه لقد اصابت فلاناً فاقة فحلّت له المسالة حتى يصيب قواماً أو سداداً من عيش فما سواهنّ من المسالة ـ ياقبيصة ـ سُحت يأكلها صاحبها سحتاً) رواه مسلم وابوداود والنسائي / التاج/ه/٣٠.

واتە: (قبیصە) دەڵێت: خوێنێکم هاتە سەر ، چووم بۆ خزمەتی پێغەمبەر(ﷺ) داوایماڵم لێکرد فەرمووی: لای ئێمە بمێنە تاماڵی زەکاتمان بۆ دێت فەرمان دەدەین بەشت بدەن لێی ، دوای ئەوە فەرمووی: ئەی (قبیصە) داواکردن دروست نیە بۆیەکێ لەم سێکەسە نەبێت: پیاوێك خوێنێکی کەوتبێتە سەر دروستە سواڵ بکات تا خوێنەکەی دەسدەکەوێت ئیتر وازبێنێت ، پیاوێکیش بەلایەك رووی کردبێتە ماڵەکەی هەمووی تیاچووبێت دروستە سواڵ بکات هەتا

ئەوەندەی دەس دەکەوێت پێی بژی‌و نەمرێت لەبرسا ، پیاوێکیش هەژاری‌و نەبوونی رووی تێکردبێت بەشێوەیەك سێ‌کەسی ژیر لەهۆزەکەی بڵێن بەراستی فلان کەس تەواو هەژارو بێ‌دەستە ؛ ئەویش دروستە سواڵ بکات هەتا بژێوی دەسدەکەوێت‌و لەمردن دەگوزەرێت جگە لەم سیانە ـ ئەی قبیصە ـ هەموو سواڵێك حەرامەو خاوەنەکەی بەحەرامی دەیخوات !

فەرموودەیەکی تریش لەم بارەوە: ( عن سهل بن الحنظلية (ﷺ) عن النبي (ﷺ) قال: من سأل وله مايغنيه فأنما يستكثر من النار ، وفي رواية من جمر جهنم ، قالوا يارسول الله وما يغنيه ؟ قدر مايغديه ويعشيه ، وفي رواية ان يكون له شبع يوم وليلة) رواه ابوداود وابن حبان وصححه/التاج:٢/٣٦.

واتە: سەهلی کوڕی (حنظلیة) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی : (( هەرکەس بەشی خۆی هەبێت‌و سواڵ بکات ئەوە ئاگر بۆخۆی زۆر دەکات ، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا چەندە بەشی خۆی ؟ فەرمووی: ئەوەندەی هەبێت نیوەڕۆو ئێوارە بەشی بکات ، لەریوایەتێکی‌تردا (ئەوەندەی هەبێ شەوو رۆژێك تێری بکات ).

هەروەها لە(ابن عمر)ەوە کەپێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: (مايزال الرجل يسأل الناس حتى يأتي يوم القيامة ليس في وجهه مزعة لحم ) رواه الشيخان / التاج : ٢/٣٦.

واتە: پیاوی وا هەیە دەست هەڵناگرێت لەسواڵکەری هەتا رۆژی قیامەت دێت‌و تۆزێك گۆشت بەروومەتیەوە نەماوە.

ئەمەیش مانای وانیە هەرکەس سواڵی کرد هاتە بەرماڵەکەت تۆ دەریبکەیت‌و بچیت بەگژیدا ، ئێمە هیچ کات مەبەستمان ئەوە نیە لەم باسۆلکەیەدا چونکە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ فاما اليتيم فلا تقهر ، واما السائل فلاتنهر ﴾ الضحى : ٩ ، ١٠

واتە: هەتیو دڵزویرمەکە بەچاوی سووك تەماشای مەکە ، لەسواڵکەریش تووڕە مەبەو قسەی زبری لەروودامەکە بەڵکو بەنەرمی بەرێی بکە.

دەگونجێ ئەمڕۆ هەندێ لەسواڵکەرەکان راستگۆ بن یان نەبوونی یان هەتیو باری یان قەرز باری خوێن چوبێتە ملیان لەبەرئەوە باش وایە بەدوادا چوونی‌ا حاڵیان بکەیت ئەگەر شیاو بوو خێری پێ بکە ، ئەگەر پێت وابوو شیاو نیە یان دڵی خۆت نەیهێنا هیچی بدەیتێ ئەوە بەقسەی خۆش‌و ئامۆژگاری جوان بەرێی بکە ، چونکە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ: ( الكلمة الطيبة صدقة) واتە: وتەی جوان‌و شیرین خێرە .

بەڵام ئایا چارەسەری ئەم کێشەو دیاردەیە چۆن دەکرێت ؟

ئێمەی وتاربێژو قەڵەم بەدەس تەنها توانای وتارو نوسینمان هەیە ، سواڵکەریش هیچی نامەمان ناخوێننەوەو گوێ لەوتاریشمان ناگرن بەڵکو ڕۆژێك من باسی سواڵکەرم کرد لەمزگەوتی بێخود سواڵکەرەکانم لێ زویر بوون.

کەوابوو چارەسەری ئەم کێشەیە لەدەستی دەوڵەتدایە .

من لەیادمە لەڕۆژی ٢٠٠١/٤/١٤ وەزارەتی کاروباری کۆمەڵایەتی حەملەیەکیان کرد بۆ قەلاچۆکردنی دیاردەی سواڵکردن و لەڕێی ئەوقافەوە وتاربێژەکانیشیان ئاگادارکردو بەوتاری ڕۆژی هەینی ٤/١٣ هەموو هاوکاریمان کردن ، بەڵام بەداخەوە بەردەوام نەبوون لەسەر بڕیارەکەیان ، بۆیە بەرای من ئەم دیاردەیە ئەم هەنگاوانەی دەوێت بۆ چارەسەرکردنی :

١ ـ یەکەم هەموو کەناڵەکان بەشداربن بۆ بڵاوکردنەوەی وتاری ئاینی و ڕۆشنبیری بۆ نەهێشتنی ئەم دیاردە دزێوە.

٢ ـ وەزارەتەکانی شارەوانی و کاروباری کۆمەڵایەتی بەوردی ناونووسی سواڵکەرەکان بکەن و هەرچیان بەراستی هەژارن کاریان بۆ بدۆزنەوەو خەمی دڵسۆزانەیان بخۆن ئەوانەیشیان کەبە درۆ سواڵ دەکەن هەڕەشەیان لێبکرێت ئەگەر سەرپێچیان کرد غەرامەو بەندکردنیان لەسەر دابنرێت ، ئەوانەیشیان کەتوانای کاریان هەیە کاریان بۆ بدۆزێتەوە وەك دەگێڕنەوە پیاوێکی ئەنصاری هاتە خزمەتی پێغەمبەر(ﷺ) داوای خۆراکی کرد ئەویش فەرمووی: لەماڵەوە هیچت نیە ؟ وتی: بەڵێ پۆشاکێکی زبرو جامێك ئاوی پێ دەخۆینەوە ، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: بڕۆ بیانهێنە ، ئەویش هێنانی پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: کێ ئەم دووشتە دەکڕێت ، پیاوێك درهەمێکی پێدا ، پیاوێکی‌تر وتی: من دەمەوێت بەدوو درهەم فرۆشتی بەدوو درهەم ، ئینجا دوو درهەمەکەی دا بەئەنصاری‌یەکەو فەرمووی: بەدرهەمێکیان خۆراك بکڕە بۆ ماڵ و منداڵت و بەدرهەمەکەی تریش تەورێك بکڕەو بۆم بهێنە ، کاتێ هێنای پێغەمبەر(ﷺ) کلکێکی داری خستە تەورەکەو فەرمووی: بڕۆ داربکەرەوەو پازدە ڕۆژ نەتبینم کاتێ کابرا هاتەوە دەدرهەم دەستکەوتی هەبوو* .

بەڵام گومان لەوەدا نییە دیاردەی عەرەبانە گرتن و شکاندن و قلپکردنەوەی شت و مەکەکانیان چارەسەری هەژاری و بێکاری ناکات چونکە ئەو خەڵکە عەرەبانەی دەشکێنن و بێکاری دەکەن لەیەکێ لەم حاڵەتانە بەدەر نیە :

١ ـ یان دەبێ بەسواڵکەر.

٢ ـ یان دەبێ بەدزو جەردە.

٣ ـ یان سەری خۆی هەڵدەگرێ و وڵات بەجێ دێڵێ و لەدەست کوردستان دەردەچێ.

خۆزگە ئەگەر کەسێ‌بوو ئەمانەیشی نەکرد دەبێ هەر بەکزی و داماوی بژی .

---

* التربية الاسلامية / الصف السادس الابتدائي ل:٣٨.

چارەسەری ئەم حاڵەتانەیش هەر هەمووی لەدەستی کاربەدەستاندایەو ئەوانیش بەرپرسی بەردەم جەماوەرن لەدنیاداو ، بەردەم بارەگای خوان لەپاشەرۆژدا ، وەك پێغەمبەر(ﷺ) بە(ابو ذر)ی فەرمووی: (انها امانة وانها يوم القيامة ندامة ، الاّ من اخذها بحقها وادى الذي عليه فيها).

واتە: بەراستی کار بەدەستی سپاردەیەو ، لەرۆژی قیامەتیشدا پەشیمانییە مەگەر کەسێ بەهەقی خۆی وەریگرتبێتو سپاردەی سەرشانی جێبەجێ کردبێت.

خوایە تو ناوە جوانەکانی خۆت رێنماییمان بکەیت بۆ راستیو بتوانین سپاردەی سەرشانمان جێبەجێ بکەین ، خوایە توو ناوە جوانەکانی خۆت روو زەردی دنیاو پاشە رۆژ نەبین ...امین

## ( ١٦ ) ماڵئاوایی : جەژنی قوربانی ١٤٢٣ك ـ ٢٠٠٣/٢/١١

الله اكبر ... ﴿انا أعطيناك الكوثر ...السورة ﴾ والحمد لله ولا اله الا الله والله اكبر ، اللهم صل على سيدنا محمد النبي الانور، وعلى اله وصحبه ماطلعت الشمس وبزغ القمر.

جەژنی قوربان واتە: جەژنی قوربانی دان بەماڵو سامان و خوێن رشتن لەپێناوی خوادا ، جەژنی قوربان جەژنی دڵخۆشکردنی هەژارانو هەتیوانو بێخانەو لانەکان.

جەژنی قوربان ئەو جەژنەیە کەمێژووی (ابراهيم)و (اسماعيل)ی تێدا تۆمار کراوەو هەتا هەتایە دەمێنێ.

(انس)ی کوڕی (مالك) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) سەرخەوێکی شکاندو ئەمجا بەزەردەخەنەوە سەری بەرزکردەوە یان خۆی فەرمووی: بەو خەڵکە ، یان ئەوان لێیان پرسی: بۆ پێکەنیت ؟ فەرمووی: ئا ئێستا سوورەتێك دابەزییە سەرمو ئەم سوورەتەی خوێندەوە : (انا اعطيناك ..السورة ئینجا فەرمووی: هل تدرون ما الكوثر ؟ ئایا دەزانن کەوسەر چییە ؟ وتیان: خواو پێغەمبەرەکەی باشتر دەزانن ، فەرمووی: (هو نهر اعطانيه ربي عزوجل في الجنة عليه خير كثير ترد عليه امتي يوم القيامة آنيته عدد الكواكب يختلج العبد منهم فاقول يارب انه من امتي ، فيقال: انك لاتدري ما أحدثوا بعدك ) رواه الامام احمد ، تفسير ابن كثير.

واتە: کەوسەر رووبارێکە خوای گەورە بەخشیویەتی بەمن لەبەهەشتدایە خێرێکی زۆری تێدایە ئوممەتەکەی من لەرۆژی قیامەتدا هەموو دەچنە سەری ، هەندێ کەسیان لائەدرێن لێی ، دەڵێم: ئەی خوایە ئەوە ئوممەتی منە پێم دەوترێ: تۆ نازانی دوای تۆ ئەوانە چییان کردووە؟ جاکەخوای گەورە ئەوخێرە زۆرەی داوە بەتۆو ئوممەتت تۆیش نوێژبکە بۆ خواو قوربانی بۆ سەربڕە، هەر بەناوی ئەوەوە سەری ببڕە . قوربانی بۆ خوا رەمزی ئیخلاصو تەقوایە وەگەرنا خوا پێویستی پێی نییە ﴿لن ينال الله لحومها ولا دماؤها ولكن يناله التقوى منكم ﴾الحج :٣٧ .

واتە: نەگۆشتو نەخوێنی ئەو قوربانییە ناگات بەخوا بەلاّم تەقوای ئێوە پێی دەگات.

منيش ئەم وتارى جەژنە بەهەل دەزانم بەكورتى چەند خالێكتان بۆ روون بكەمەوە.

خالى يەكەم/ ئەم جەژنە هاوكاتە لەگەڵ دەنگ‌و باسى ليدانى عێراق‌و مەترسى دەسكردنەوەى عێراقيش لەكوردستان ، بۆيە پێويستە ئێمەيش لەم وەختەدا زياتر لەجاران پشتمان بەخوا قايم كەين‌و بەزمان‌و بەدڵ بڵێين:﴿قل لن يصيبنا الا ماكتب الله لنا هو مولينا وعلى الله فليتوكل المؤمنون ﴾التوبة:٥١ واتە: تۆ پێيان بڵێ: ئەى (محمد) بەتەئكيد تووشى هيچ نابين تەنها ئەوە نەبێ كەخوا لەچارەى نوسيو.ين.

مرۆڤ لەهەر وەرزێكدا كەش‌و هەوايەك دەبينێت‌و ، لەهەر رووداوێكى نوێدا چەند وانەيەكى نوێ فێردەبێت بائێمەيش لەم رۆژانەدا باشتر فێرى (توكل) ببين‌و هەموو بەيانى‌يەك هەستاين لەخەوو هەموو ئێوارەيەك حەوت جار بڵێين:﴿حسبي الله لا اله الا هو عليه توكلت وهو رب العرش العظيم).

ئەمەيش ماناى وانيە خۆتان مەشارنەوە (احتياط) مەكەن بەڵكو چەندەدەتوانى خۆت‌و ماڵ‌و منداڵت دوور بگرە لەناوچەى مەترسى و بەلا، چەندە دەتوانى هۆكارەكانى خۆپارێزى پەيدابكە ، خۆزگە ئێمەيش وەك ولاتانى دراوسێ‌و خواپێداو قيناع‌و جل‌و بەرگى دژ بەچەكى كيمياويمان هەبوايە بۆ هەموو كەسێك. چونكە پێغەمبەر(ﷺ) بەيەكێك لەيارانى دەفەرموێ:(اعقلها ثم توكل)واتە: وشترەكە ببەستەوە ئەمجا پشت بەخوا ببەستە.

خالى دووەم/ مەردى چاك بن لەم رۆژانەدا زياتر لەجاران سەرو ماڵى يەكتر بپارێزن ئەگەر ماڵى دراوسێكەت چۆڵ بوو وەك ماڵى خۆت چاودێرى بكە ، ئەگەر منداڵەكانى تەنياكەوتن ئاگات لێيان بێت، تكايە نەكەن دەست بۆماڵى هيچ موسوڵمانێك درێژ بكەن لەهەر لايەكدا تووشى ماڵێك بوويت ئەگەر زانيت بۆت دەپارێزرێ تادەگاتەوە دەس خاوەنى بيپارێزە ، ئەگەر ئەوەت بۆ نەكرا دەستى بۆنەبەيت، ماڵى كەس بۆ كەس حەلاڵ نيە، داستانەكەى رۆژانى (انفال) و راپەرين و جەنگى كوەيت دووبارە مەكەنەوە ، ئەم ئايەتەى قورئانتان لەبيربێت كەدەفەرموێت: ﴿يا ايها الذين امنوا لاتاكلوا اموالكم بينكم بالباطل الا ان تكون تجارة عن تراض منكم ...﴾. النساء:٢٩

واتە: ئەى ئەوانەى باوەڕتان هەيە ماڵ‌و سامانتان لەنێو خۆتاندا بەناهەق مەخۆن مەگەر مامەڵەو كڕين‌و فرۆشتن لەبەينا هەبێت‌و بەڕەزامەندى خۆتان ئاڵوگۆڕى بكەن ـ انشاء الله ـ هيچيش نابێت‌و بەسەلامەتى دەرباز دەبين.

خالى سێيەم/ خوانە خواستە ئەگەر منداڵێك يان گەورەيەك لەنزيكتەوە پێكرا چەندە خێرە يارمەتى بدەيت‌و لەمەترسى رزگارى‌كەيت ﴿من نفس عن مؤمن كربة من كرب الدنيا نفس الله عنه كربة من كرب يوم القيامة) الاربعين النووية/٣٦.

واتـە: هەركەسـێك سـەختییەك لەسـەختی‌یەكانی دنیـا لەسـەر موسـوڵمانێك لابـەرێت خـوا سەختی‌یەك لەسەختی‌یەكانی قیامەتی لەسەر لادەبان.

خاڵی چوارەم/ نوێـژی جەژن سوننەتێكی گەورەیـە تەنانـەت هـەندێك دەڵێن: فـەرزی كیفایەیـە سوننەتە بۆ تاك و كۆمەڵ، ژن و پیاو نیشتەجێ و كاروانی، وەختەكەیشی لەخۆركەوتنەوەیە بـۆ نیوەڕۆ لەركاتی یەكەم(٧)جار، لەركاتی دووەم (٥)جار (الله اكبر) هەیە باش وایە ئەم صیغەیە بڵێ: (سبحان الله والحمد لله ولا اله الا الله والله اكبر).

(ام عطیـة)ی انصاری دەڵێت: (اُمِرْنا اَنْ نُخرِج الی المصلی العواتق والحیض في العیدین یشـهدن الخیر ودعوة المسلمین ، ویعتزل الحیض المصلی )متفق علیه.

واتە: ئێمە فەرمانمان پێكرابوو كچە عازەبەكان و ئافرەتە حەیزدارەكانیش لەرۆژی جەژنەكاندا بەرێ بكەین بۆ جـێ نوێـژی دەشـتەكە بۆئـەوەی ئامـادەی ئـەو خـێرەبن و بەشـداری پاڕانـەوەی موسوڵمانان بن ، ئەوەندە هەیە دەبێ حەیزدارەكان نەچنە ناو گۆڕەپانی نوێژەكەوەو كەنار بگرن. (سبل السلام : ٦٥/٢).

خاڵی پێنجەم/ قوربانی زیندوكردنەوەی سوننەتی حەزرەتی(ابراهیم)و پێغەمبەری خۆمانە(ﷺ) وەك دەفەرموێ: ( ما عمل ادمي من عمل یوم النحر أحب الی الله من اهراق الدم ، انها لتأتي یوم القیامة بقرونها واشعارها واظلافها ، وان الدم لیقع عند الله بمكان قبل أن یقع علی الارض فطیبوا بها نفساً) رواه الترمذي.

واتە: بنیادەم لەرۆژی جەژنی قورباندا هیچ كارێكی نەكردووە خۆشەویستربێت لای خوا لەخوێن ڕژاندن ـ قوربانی ـ بەڕاستی ئەو قوربانی‌یە دێت لەرۆژی قیامـەتدا بەشـاخەكانی‌یەوە ، بەمووەكانی‌یـەوە ، بەسمەكانیـەوە ، بەڕاستی ئـەو خوێنـە لای خـوا جـێ دەگرێـت بـەر لـەوەی بكەوێتـە سـەر زەوی كەوابوو زۆر بەخۆشحاڵی یەوە سەری ببڕن.

مەرج و شەرتەكانی قوربانیش زۆر جار باسمان كردووە هەركەسیش ئیشكالی هەیە ئەوە دوای نوێژ من ئامادەم لەمزگەوت و لەماڵەوە یان بچنە خزمەت مامۆستایانی‌تر.

خـاڵی شەشـەم/ ئـەم جەژنـە زیـاتر لەجەژنـەكانی رابـوردوو پێویسـتمان بەگـەردن ئـازادی و بەسـەركردنەوەی یـەكتر هەیە چونكـەو ڕۆژانێكـی نادیـار لەپێشـمانە خواسـووكی‌كات لەسـەرمان، كی‌بەخۆی دەزانێت زوڵمێكی كردووە ، ناهەقێكی كردووە بەهـەق یـان بەپێچەوانەوە بائەم ڕۆژانە بەهەل بزانێت بۆ پەشیمانی و گەردن ئازادی.

منیش لەم شوێنە پیرۆزەوە ئەم جەژنە بەهەل دەزانم ، دوای هەشـت سـاڵی تـەواو لـەوتاربێژی و بەخـەمـەوە بوونـی ئـەم مزگـەوت و مینبـەرە، كەئـەوەندەی بۆم كرابێـت درێغیـم نـەكردووە ، ئـەوەی بەهەقم زانیبێت هەر ئەوەم پێڕاگەیاندوون ، بیرتانە زۆرجاریش دەپاڕامەوە :

(خوایە گیان من ئەم مینبەرەم لەبەرخاتری تۆ دەویٚ هەتا مانەوەم تیایدا خێرە بم هێڵە هەرکاتیش خۆت وات بەچاك زانی دامگریت،دامگرە بەر لەوەی ناڕەوا بەسەر زارمابێت).!

ئێستایش دوای ئەوەی کەخواستی خوا وەهابوو هۆکارەکانی جووت کردو منی لەم شوێنە داگرت،من داوای گەردن ئازادی لەجەنابتان دەکەم رەنگە قسەیەکم کردبێت لەوتاردا،یان لەدەرەوەی وتاردا دڵی کەسێك یان بنەماڵەیەکم ئازاردابێت ، یان هەندیٚ جار لەبەر سەرقاڵیم ئامادەی جەنازەیەك نەبووبم ، یان پرسەیەك نەچووبم ، یان لای نەخۆشێك نەچووبم لەخەڵکی گەڕەكو خزمان و دۆستان ، بۆ ئەمانەو غەیری ئەمانەیش داوای گەردن ئازادیتان لێدەکەم کێش هەقی لەسەرمە بەدڵی فراوانەوە ئامادەم پێم رابگەیەنیٚ، یادم بخاتەوە دوعای خێری بۆ دەکەم.

منیش لەلایەنی خۆمەوە هەرچیم کردووەو تووشی هەرچی بووم ، ﴿ما اسالكم عليه من أجر ان اجري الا علىٰ رَبِّ العالمين﴾ هیچ کرێیەکم لەئێوە ناوێت ئەجرو پاداشتم لای خوای پەروەردگاری جیهانەکانە ، بەڵام داوای دوعای خێرتان لێدەکەم.

دەربارەی هۆکاری لادانیشم لەوتار: هۆی چی بوو ؟ بۆچی وابوو ؟ هەرکەس لەنزیکەوە پرسیاری کردووە باشدەزانێت هۆی راستەقینە چییە ؟ هەرکەسیش دوور بەدوور هاوردو بردی قسەی کردووەو قسەو قسەڵۆکی هەڵبەستووەو تفەنگی بەتاریکیوە ناوە ؛ ئەوە هەڵدەگرم بۆ ئەو رۆژەی خوا دەربارەی دەفەرمویٚ:

﴿ونضع الموازين القسط ليوم القيامة فلا تظلم نفس شيئاً وان كان مثقال حبة من خردلٍ اتينا بها وكفى بنا حاسبين ﴾ الانبياء:٤٧.

واتە: ئێمە ترازووی دادوەری دادەنێین لەرۆژی قیامەتدا هیچ کەس ستەمی لێناکرێت ، ئەگەر کردەوەکەی بەئەندازەی دەنکە خەرتەلەیەکیش بێت ئێمە دەیهێنین و دەیخەینە روو کافی‌یە ئێمە حساب و لێکۆڵینەوە بکەین.

یا الله یارحمان یارحیم لەم رۆژی جەژنەدا ئازادمان کەیت لەئاگری دۆزەخ خۆمان و دایك و باوك و دۆست و خۆشەویستانمان.

خوایە کوردستان بە گشتی و جیهانی ئیسلامی بەگشتی‌تر بپارێزە لەبەڵاو وەبای شەڕو کیمیاباران و کۆکوژی و هەموو بەڵایەکی‌تر.

خوایە خۆمان و ماڵو منداڵو دین و دنیاو مزگەوتەکانمان سپارد بەتۆ بیانپارێزە لەدەستی تاڵانچی و شەڕە خۆرو ستەمکاران . خوایە شیفای نەخۆشەکانمان بدەیت.

# کۆتایی

ئەی مامۆستای خۆشەویست هەرکەس هەیتو لەهەرکوێ هەیت، دڵنیابە ئەم پەڕاوەم بۆ جەنابت نوسیوە، زۆر بەدڵسۆزی نووسیومە، مەبەستم لەماندووکردنی مێشكو هەستو هۆشم نەپارەو پووڵ بووە، نەناوو شورەت بووە، بەڵکو تەنها مەبەستم لادانی ئەرکێك بووە لەسەرشانم، بەو هیوایەیش منو تۆ هەردووکمان بچین بەدەم ئەو ئەرکە گەورەوە کەخوای گەورە لەسەر شانی زانایانی ئیسلام داینـاوە: ﴿واذ اخـذ الله میثـاق الذیـن اوتـوا الکتـاب لتُبیّنُننـه للنـاس ولا تکتمونه...﴾ ال عمران : ١٨٧.

چونکە ئاشکرا کردنو روونکردنەوەی پەیامی خوایی، کەهەر ئەو پەیامە فەرموودەکانی پێغەمبەرو ئیجتهادی زانا دڵسۆزەکانیش دەگرێتە باوەش؛ واجبە لەسەر زانایان لەهەموو چەرخو سەردەمێکدا، خۆگەر وانەکەین؛ دەبێ لەهەڕەشەی بەشی دووەمی ئایەتەکە بترسین: ﴿... فنبذوه وراء ظهورهم واشتروا به ثمناً قلیلاً فبئس مایشترون ﴾.

ئەی مامۆستای بەڕێز ئەی برای ئازیز ئەمڕۆ ئیسلامو موسوڵمانان بوونەتە نێچیری سەدان داوی کوشندەو تیری ژەهراوی دەیانەوێ داخی پازدە سەدە بەئێمە برێژن، هیچ هۆکارێکیش نەماوە موسوڵمان راستی پێ‌روونکاتەوە جگە لەوە پشت بەخوا ببەستینو زمانو پێنووسەکانمان بخەینەکار بۆ بەگژا چوونەوەی ئەم شاڵاوە جیهانی‌یەی ئەمڕۆ دژ بەموسوڵمانان خراوەتە کار بۆ ناشیرین کردنی سومعەو شۆرەتیانو ، تێکدانی هەستو بیریانو ،نامۆکردنی عەقیدەو ئادابو رەوشتیانو، وشك کردنی سەرچاوەکانی بانگەوازیانو، لەکارخستنی رەوڕەوەی هەموو نەخشەو پلانێکیان.

ئەی براگەورەو مامۆستای ئازیزم! ئەی کاکەی فەقێو رۆڵەی شیرینم، ئەی لاوی خوێن گەرمو خەمخۆری دینم! ئەمڕۆ واخەریکین تەنیا دەکەوین لەگۆڕەپانی بانگەوازی خواییداو دەورمان چۆڵ دەبێت، بەڵام دڵنیابین: گەر ئێمە بەڕاستی نیازمان پاڵفتە بکەین بۆخوا، خوا فریشتەکانی دەنێرێتە کۆمەکیمان : (ان الملائکة لتضع اجنحتها لطالب العلم رضا بما یصنع )[1] اخرجه احمد وابن حبان والحاکم. فریشتەکان باڵی بەزەییان ڕادەخەن بۆ زانستخوازان چونکە رازین بەوکارەی ئەوان دەیکەن.

ئەی مامۆستای ئازیز لەبیرت بێ ئێمە بۆ لای خوا بانگ دەکەین خوایش دروستکاری ئەرزو ئاسمانە، پەروەردگاری هەردوو جیهانە، لەبەرئەوە گەر دەروونمان ساف بکەین بۆ خوا خەڵکی

[1] المغني على الاحياء : ١٣/١ .

ئاسمان‌و زه‌مین دڵیان بۆمان دێته جۆش ( ان الله وملائكته واهل السموات واهل الارض حتى النملة في جحرها وحتى الحوتَ في البحر ليصلّون على معلّم الناس الخير )[1] اخرجه الترمذي.

خواو فریشته‌كانی‌و ، خه‌ڵكی ئاسمانه‌كان‌و زه‌مین، ته‌نانه‌ت مێرووله‌ له‌كونه‌كه‌یداو ماسی له‌ده‌ریادا سڵاوات ده‌ده‌ن‌و دوعا ده‌كه‌ن بۆ كه‌سێك خه‌ڵك فێری چاكه‌و خێر بكات.

ئه‌ی مامۆستایانی مزگه‌وت، ئه‌ی پاسه‌وانانی میحراب‌و مینبه‌ری پێغه‌مبه‌ر(ﷺ) ئه‌وه‌ی به‌كه‌ڵكی ئێمه‌ بێت له‌م رۆژه‌دا نیازپاكی‌و كار بۆ خوا كردنه‌، چونكه‌ هه‌موو گرۆهو تاقمێك له‌موسوڵمانان به‌هێزتره‌ له‌لایه‌نی ئابووری‌و رامیاری‌و هێزی سه‌ربازیه‌وه‌، به‌ڵام ئه‌وه‌نده‌ هه‌یه‌ ناتوانن له‌م لایه‌نه‌وه‌ بگه‌ن به‌موسوڵمان، ئه‌گه‌ر موسوڵمان به‌راستی كاره‌كانی بۆ خوابێت، خۆ هه‌ركات رووپایی‌و دنیاویستی‌و كورسی په‌رستی تێكلاو به‌كاری موسوڵمان بوو ئه‌وه‌ بێگومان بێت گره‌و ده‌دۆڕێنی‌و به‌ربه‌ره‌كانی‌ی لایه‌نه‌كانی تری پێناكرێت‌و، له‌پاشه‌ رۆژیشدا ره‌نجه‌ڕۆو خه‌سارۆمه‌ند ده‌بێت وه‌ك پێغه‌مبه‌رمان(ﷺ) ده‌فه‌رموێت: (من طلب علماً مما يُبتغى به وجه الله تعالى ليُصيب به عرضاً من الدنيا لم يجد عرف الجنة يوم القيامة )[2] اخرجه ابوداود وابن ماجه باسناد جيد.

واته‌: هه‌ركه‌س به‌دوای زانستێكدا بگه‌ڕێت له‌و زانستانه‌ی مه‌به‌ست تیایاندا ره‌زامه‌ندی خوایه‌، بۆئه‌وه‌ی خۆشی‌یه‌كی دنیای پێ به‌ده‌ست بێنێ ئه‌وه‌ له‌رۆژی قیامه‌تدا بۆنی به‌هه‌شت ناكات.

ئه‌ی مامۆستای ئازیز باش بزانه‌ تۆ شوانی خه‌ڵكی، شوانیش ده‌بێ ماندووبێ، تینوو برسی ببێ، هه‌ردوو دۆڵ‌و چاڵ‌و چۆڵ بێته‌ رێگای، چونكه‌ شوانیی ئه‌مانه‌تداری‌یه‌، خوایش به‌ڵێنی پێنه‌داوین له‌م شوانی‌یه‌دا بێ‌ئه‌رك‌و ئازاربین به‌ڵكو خوا فه‌رمانی پێكردوین خۆگربین له‌به‌رده‌م ئه‌و زه‌حمه‌ت‌و ئازاره‌ی له‌وپێناوه‌دا رێمان ده‌گرێت.وه‌ك قورئان ده‌فه‌رموێت: (يا بُنَيَّ اقم الصلاة وامر بالمعروف وانه عن المنكر واصبر على ما اصابك ان ذلك من عزم الامور ) لقمان: ١٧.

واته‌: ئه‌ی كوڕی شیرینم نوێژه‌كانت ئه‌نجام بده‌و، فه‌رمان بكه‌ به‌چاكه‌و ، رێگری بكه‌ له‌خراپه‌و خۆگریشبه‌ له‌سه‌ر ئه‌و كۆسپ‌و ئازارانه‌ی توشت دێن له‌وپێناوه‌دا ، به‌راستی ئه‌م خۆگری‌و كۆڵنه‌دانه‌ له‌كاره‌ گرنگ‌و پێویسته‌كانه‌ .

ئه‌مجا باش بزانن مامۆستا به‌رێزه‌كانم ، برا دڵسۆزه‌كانم، مینبه‌رو میحراب‌و كاری مه‌لایه‌تی له‌ئه‌مرۆدا، سه‌نگه‌ره‌و باشترین سه‌نگه‌ره‌، جیهاده‌و گه‌وره‌ترین جیهاده‌، ئه‌مانه‌ته‌و ترسناكترین

---

[1] المغني على الاحياء: ١٥/١.

[2] المغني على الاحياء: ٥٩/١.

ئەمانەتە، لێپرسینەوەی بەدوا دێتو کەمتەرخەمی تیایدا گەورەترین پەشیمانی‌یە لەبەردەم خوای پەروەردگاردا.

دیسانەوە باش بزانن و وریابن مزگەوتو مینبەر گەورەترین پیلانی جیهانی بۆتەنراوە بۆئەوەی گێروشەل بکرێتو لەکار بخرێتو دەوری خۆی نەبینێت بۆ وریاکردنەوەی رۆڵەی ئیسلامو نەوەی داهاتوو.

جا ئیتر دەستم دامێنتان خۆتان و غیرەتی دینتان بەڵکو سبەی رۆژ لەبەردەم خوای گەورەدا لەکۆمەڵی ئەو زانایانە بین کاریان بەزانستەکەیان کردووە (العلماء العاملون) کە لەورۆژەدا خوێنی شەهیدانو مەرەکەبی پێنووسی زانایان دێن بەپیری خاوەنەکانیانەوە.

ئیتر لەمنەوە دوعا بۆ ئێوە یاخوا بتوانن ئەرکی سەرشانتان بەجێ بهێنن. ئێوەش لەدوعا بەکوڵەکانتاندا منو دایکو باوکمو مامۆستاو ماڵو منداڵم لەیاد نەکەن.

**واخر دعوانا ان الحمد لله رب العالمين .**

# سەرچاوەکان

## ا ـ قورئانی پیرۆزو تەفسیر .

١ ـ قورئانی پیرۆز.
٢ ـ تفسير القران العظيم / ابن كثير
٣ ـ في ظلال القران / سيد قطب
٤ ـ مواهب الرحمان في تفسير القران / عبدالكريم محمد المدرس
٥ ـ صفوة التفاسير / محمد علي صابوني

## ب/ فەرموودە

٦ ـ رياض الصالحين / الامام النووي
٧ ـ الاربعين النووية / الامام النووي
٨ ـ المغني عن حمل الاسفار في الاسفار / العلامة زين الدين العراقي
٩ ـ التاج الجامع للاصول / منصور علي ناصف
١٠ ـ فتح الباري بشرح صحيح البخاري .
١١ـ شرح القسطلاني على البخاري .
١٢ ـ اقتران النيرين ملا رشيد بەگی بابان.

## ج/ فیقه

١٣ ـ المجموع شرح المهذب/ الامام النووي
١٤ ـ مغني المحتاج في شرح المنهاج / الشيخ محمد الشربيني الخطيب.
١٥ ـ تحفة المحتاج في شرح المنهاج / ابن حجر الهيتمي
١٦ ـ الفقه الاسلامي وادلته/ الدكتور ـ وهبة الزحيلي
١٧ ـ الفقه المنهجي / الدكتور مصطفى الخن، الدكتور مصطفى البغا، علي الشربجي
١٨ ـ المفصل في احكام المرأة / الدكتور عبدالكريم زيدان
١٩ ـ فقه السنة سيد سابق .

## د/ سیره

٢٠ ـ نور اليقين في سيرة سيد المرسلين/ الشيخ محمد الخضري بك

٢١ ـ فقه السيرة / الدكتور محمد سعيد رمضان البوطي

٢٢ ـ الرحيق المختوم / الشيخ صفي الرحمان المباركفوري

## هـ / چەند پەڕاوێکی تایبەت بەوتارو وتاربێژەوە:

٢٣ ـ الخطابة لأرسطو / ترجمة ابن رشد

٢٤ ـ الخطابة لأرسطو / ترجمة / الدكتور عبدالرحمن بدوي.

٢٥ ـ العقد الفريد / احمد محمد عبد ربه الاندلوسي

٢٦ ـ تاج الخطب المنبرية / مصطفى ابو سيف الحمامي

٢٧ ـ منتهى آمال الخطباء / مصطفى ابو سيف الحمامي

٢٨ ـ كيف تكون خطيباً / الشيخ علي الرفاعي

٢٩ ـ فن الخطابة / الدكتور احمد محمد الحوفي.

٣٠ ـ من هدي الجمعة/ كمال الدين الطائي.

٣١ ـ جمهرة خطب العرب/ احمد زكي صفوت.

٣٢ ـ ٥٥٥ طريقة ووصية لتصبح خطيباً مؤثراً/ الدكتور علي الحمادي

٣٣ ـ محاضرات في اصول الخطابة / فاروق رسول يحى

٣٤ ـ منهل المؤمنين / الدكتور محمود احمد البرشة

٣٥ ـ للخطباء والوعاظ / عمر كۆچەر

٣٦ ـ چۆن دەبیتە وتاربێژێکی سەرکەوتوو / انور احمد مصطفى

## و/ پەڕاوەکانی زمانو ئەدەب

٣٧ ـ لسان العرب / ابن منظور

٣٨ ـ المنجد في اللغة

٣٩ ـ ديوان الامام الشافعي

٤٠ ـ گلستان / سعدی شیرزای

٤١ ـ بەهارو گوڵزار / مەلا عبدالكريم مدرس

٤٢ ـ الادب والنصوص للسادس العلمي

## ز/ چەند پەڕاوێکی تر:

٤٣ ـ مختصر تذكرة القرطبي / عبدالوهاب الشعراني

٤٤ ـ احياء علوم الدين/ الامام الغزالي.
٤٥ ـ لطائف المعارف/ ابن رجب الحنبلي.
٤٦ ـ مختصر منهاج القاصدين / ابن قدامة المقدسي
٤٧ ـ قوارب النجاة / فتحي يكن
٤٨ ـ رضينا بالاسلام ديناً / ابراهيم النعمة
٤٩ ـ ماذا بعد الموت / شاكر عبدالجبار
٥٠ ـ العقائد النسفية / سعدالدين التفتازاني
٥١ ـ العقائد الاسلامية / الدكتور رشدي عليان ، الدكتور. فرج توفيق الوليد
٥٢ ـ كيف ندعو الناس / عبدالبديع صقر
٥٣ ـ صناعة الحياة/ محمد احمد الراشد
٥٤ ـ منهج البحث الادبي/ الدكتور علي جواد الطاهر
٥٥ ـ غضب الله تعالى يلاحق المتمردين / فؤاد سيد عبدالرحمان الرفاعي .
٥٦ ـ بۆ هەموو كیژێكی خاوەن باوەڕ / عمر احمد نظامي
٥٧ ـ كاریگەری عەقیدە ... / عمر احمد نظامي .
٥٨ ـ صلاح الدینی ئەیوبی / هادي علي
٥٩ ـ گۆڤاری دوانگە ژمارە( ٤ ،١٠ ، ١١)
٦٠ ـ في ظل الله ـ محمد ابراهيم الهسنياني .
چەند پەڕاوێكی تریش .





| بابەت | لاپەڕە |
|---|---|

فەسلی دووەم / بۆنە ئاینیو كۆمەلایەتییەكان

## فەسلی سێیەم / دووفەرمووده لەیازده وتاردا

## فەرموودەی دووەم /



## فەسڵی چوارەم / چەند وتارێکی جیاجیا

## بەرهەمەكانی نووسەر

| ژ | ناوی كتێب و پێناسەیەكی كورت | ساڵ و شوێنی چاپ |
| --- | --- | --- |
| ١ | **بۆ هەموو كیژێكی خاوەن باوەڕ:**<br>نامیلكەیەكی مۆژگاری و پڕ لە سۆزە لە زنجیرەی (ابحاث في القمة) بۆ كیژانی خاوەن باوەڕ<br>نوسینی: د. محمد سعید رمضان البوطي- وەرگێڕانی نووسەر | چاپی یەكەم- ١٩٨٥<br>بغداد-مطبعة الأرشاد<br>چاپی چوارەم -٢٠٠٢<br>سلێمانی |
| ٢ | **مرۆڤو دادپەروەری خوا لە ژیاندا:**<br>نامیلكەیەكە دەربارەی دادوەری و سۆزی خوایی بۆ مرۆڤەكان لە كاتی خۆشی و ناخۆشیدا.<br>نوسینی: د. البوطي- لە زنجیرەی ناوبراو. وەرگێڕانی: نووسەر | چاپی یەكەم -١٩٨٦<br>بغداد-مطبعة الأسعد |
| ٣ | **ڕێبازێكی پەروەردەیی تاقانە لە قورئاندا:**<br>نامیلكەیەكی زنجیرەی ناوبراوە. نوسینی: د. البوطي<br>دەربارەی چۆنێتی پەروەردەی قورئانی. وەرگێڕانی نووسەرە | چاپی یەكەم-١٩٩٨<br>سلێمانی- چاپخانەی ژین |
| ٤ | **دۆستایەتی و برایەتی:**<br>وەرگێڕانی (كتاب آداب الصحبة و الأخوە)ی (أحیاء علوم الدین)ی پێشەوا غەزالی كە باسی ئادابی برایەتی دەكات. | چاپی یەكەم-١٩٩٨<br>چاپخانەی زانكۆی سەلاحەدین- هەولێر |
| ٥ | **پاڕانەوەی بانگخوازان:**<br>كۆمەڵێ دۆعاو نزای قورئان و فەرمودەو پیاو چاكانە- كۆكردنەوەی نووسەر | چاپی یەكەم-١٩٩٨<br>سلێمانی- چاپخانەی ژین |
| ٦ | **توێشووی بانگخوازان:**<br>وەرگێڕانی باسی (زاد الدعاة)ی پەڕاوی (قوارب النجاة)ە<br>نوسینی: (فتحی یكن) | چاپی یەكەم-١٩٩٣<br>گۆڤاری پەیامی ڕاستی چاپی كردووە |
| ٧ | **خۆ بە زل زانین:**<br>ئەڵقەی ٢٥ لە زنجیرەی (پەروەردەیی) باخەڵی | چاپی یەكەم-١٩٩٦<br>سلێمانی |
| ٨ | **كاریگەری عەقیدە لە پەروەردەی نەوەی نوێدا:**<br>ئەڵقەی هەشت لە زنجیرەی سەد كتێبی كوردی<br>نامیلكەیەكی عەقیدەییە لە قەبارەی (٨٠) لاپەڕەی مام ناوەندی،<br>دانراوی د. عبدالله عزام- وەرگێڕانی نووسەر | چاپی یەكەم-١٩٩٧<br>كتێبخانەی ڕۆشنبیر چاپی كردووە – چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە – هەولێر |

# الخطبة والخطيب

## انواع الخطبة، كيفية الخطابة، ستون خطبة مُعَدَّة لشتّى المناسبات

تأليف/ عمر أحمد نظامى

امام جامع بيخود في السليمانية




وتار وێنەیەکی جوان و بێگەردە لە ئاوێنەی سافی سینەی وتار بێژەوە دەردەکەوێ، ڕەوشت بەرزی و سۆز و بەزەیی و چاکەخوازی و نەرم و نیانی و بەختەوەری تاك وکۆمەڵی تیا دەدرەوشێتەوە، بۆیە دەبێ وتار بێژ لەکاتی دانان و خوێندنەوەی وتاردا لە( ساتێکی ) لەسەرخۆیی و سینەسافی و ئیخلاص بۆ خوادا بژی.

چەندە جوانە ئەگەر پێش وتارەکە دەم و زمانی بەخوێندنی چەند ئایەتێك لە قورئانی پیرۆز خاوێن بکاتەوەو داوای یارمەتی و سەرکەوتن لەخوا بکات.

وتاربێژ دەبێ باش بزانێت جۆرەکانی جیهاد دوو جۆرە:- جیهاد بە شمشێر و جیهاد بە وشە ( جهاد بالسیوف وجهاد بالحروف ) بۆیە وتار لەجۆری دووەمیـــانە هەندێ کات شان بەشانی جۆری یەکەم دەڕوات یان شتێك لەو کەمترە دەگونجێ لەهەندێ کات و شوێن دا لەویش زیاتر بێت وەك پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ ( أفضل الجهاد كلمة حق عند سلطان جائر ) واتا: گەورەترین جیهاد وشەیەکی ڕاستە لەبەردەم پادشایەکی ستەمکاردا. لەبەرئەوە وتاربێژیی ماندوبونی دەوێ لێبرانی دەوێ شەونخونی دەوێ وردبونەوەی دەوێ ئازایەتی دەوێ وریایی دەوێ ..